# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

بەرگی نۆزدەیەم

سوورەتەکانی

(الشعراء) و (النمل)

عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتەکانی

# الشُّعَرَاءِ و النَّمْلِ

نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز

٥٧٥ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أَمَّا بَعْدُ: فَإنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلَامُ اللَّهِ، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1].

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!**

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و، خاوەنەکەی لە دنیاو دواڕۆژدا لێی بەهرەمەندە.

---

(١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد، پێش هەر قسەیەکی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتدو، ئەم وتارە، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجه: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، الطَّبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی یەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەڕێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّر بَعْضُهُ بَعْضَاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه تعالى)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[1]. بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووردار بوونی توانا و برستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویەکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، ئەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاکرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

شـــارەزا نیم، یـان خوێنـــەر پێویســـتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیـــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانێ خـوا (تبـارك وتعـالـی) ڕاسـتەوخۆ چـی پـێ فـــەرمووە؟!

ئنجا هـــەر لێرەشـەوە بە پێویسـتی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح ســـووك و گـورج و گـۆڵ و دڵســـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگـیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجـیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شـێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هـــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەوە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشـتـرین شـێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هـــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و سـەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشــە کـە ئێمـە لـەم تەفسـیـرەماندا بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکـە هـــەر ســـوورەتێك بۆخـــۆی شـــتێکی سـەربەخۆیـــەو، سـەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەشـدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســـوورەتەکان، بەرگــەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـــرا دڵســـۆزە ئێســـتاش پـاش تەواوکردنـی نیـوەی زیاتـری قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـی جـەزم کـردوە، کـە ئەگـەر تەمەنمـــان بـەردەوام بـێ، هەتـــا کۆتـــایی ئـەم تەفسـیـرە ســەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قســەشــم ئەوەیــە کە:

ئــەم تەفســیرە - وەك پێشــتــر گوتمــان - لــە ئەسـڵدا بەشـێوەی دەرس و وتــار پێشـکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیـدا چوومــەوەو، بەپێـی پێویسـت دەسـتکارییم کـردوە، دیـارە هــەموو دەرسـێکیش بەنـاوی خـواو سـتایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێکـردوە، بـەڵام ئێمـە لـە سـەرەتای دەرسـەکانەوە، ئەوانەمـان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونـەوەو، ئـەو (خطبـة الحاجـة)یەی لـە سـەرەتای ئـەم پێشـەکەییەوە هاتـوە، لەجیـاتی سـەرەتای ســەرجەم دەرســەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هـەولێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ
# لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنن، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، نیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ،

وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

الحمدلله حق حمده والصلاة والسلام والبركات على عبده محمد النبيّ الأمي المبعوث رحمةً للعالمين وآله أجمعين صحبا وأزواجاً وقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين.

خوێنەرە بەڕێز و خۆشەویستەکانم ! سوپاس و ستایش بۆ خوا یارمەتیداین ئەم بەرگی نۆزدەیەمەش ئامادەی چاپ بکەین، کە هەردووك سووڕەتی : (الشعراء) و (النّمل)ی تێدان واتە بەشی نۆزدە (الجزء التاسع عشر) بەپێی دابەشکردنی قورئان لەلایەن زانایانەوە بۆ سی بەش (ثلاثین جزءاً) شایانی باسیشە ئەم بەرگەش وەك سەرجەم بەرگەکانی دیکە و بەهەمان شێواز و بەرنامەیە و، وێڕای تەفسیرکردنی ئایەتەکان بە حەوت هەنگاو، ژمارەیەك کورتە باسیش لە تەفسیرکردنی هەردووك سووڕەتەکەدا هەن و ناوێتەیان کردن، گرنگترینیان ئەمانەن:

أ - لە سووڕەتی (الشعـراء)دا :

١- وەڵامی دوو پرسیار.

٢- کورتەباسێك لەبارەی ڕووەکەوە لە شەش بڕگەدا.

٣- کاریگەریی شیرك و کوفر لەسەر تێکچوونی دەروونیی و جەستەیی مرۆڤ.

٤- کورتەباسێك لەبارەی شیعر و شاعیرانەوە.

ب- لە سووڕەتی (النّمل) دا:

١- کورتەباسێك: شەش وردە سەرنج لەو ئایەتە موبارەکانە (١-٣).

٢- ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی زەقی (محمد الطاهر بن عاشور).

٣- حیكمەت و حوكمە شەرعییەكانی بەسەرهاتی سولەیمان علیه السلام.

٤- حەوت نموونە لەهەڵە ڕاستكردنەوەكانی قورئان بۆ خاوەن كتێبەكان.

٥- كورتەباسێك لەبارەی بیستنی مردووانەوە.

هیواداریشم ئێوەی بەڕێز و خۆشەویستیش - خوێنەرەوانی ئەم تەفسیرە - بەشێنەیی و سەرنجدانی وردو ئێوەڕامانی قووڵەوە ئەم تەفسیرە بخوێننەوەو باشترین بەهرەی لێ وەربگرن.

خواش پشتیوان بێ بەرگەكانی دیكەی ئەم تەفسیرە بەخێرایی و یەك لەدوای یەك چاپ و بڵاو دەكرێنەوە.

والسلام علينا وعلى عبادين الصالحين

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، والسلام على المرسلين والحمدلله رب العالين

٢ / جمادي الأولى / ١٤٤٢ك

٢٠٢٠/١٢/١٧ز

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کە ٢٦/ی ڕەمەزانی، ساڵی (١٤٤٠)ی کۆچیی، بەرانبەر (٣١/ ٥/ ٢٠١٩)ی زاینییە، خوا پشتیوان بێ، دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سووڕەتی (الشُّعراء)، کە تێمە سەرەتا پێناسەی دەکەین و، نێوەڕۆکەکەی دەردەخەین، بەر لەوەی بێینە سەر شیکردنەوەی چەمك و واتای ئایەتەکانی لە چەند دەرسێکدا و ئەمە وەك پێشەکییەکە، بۆ تەفسیر کردنی کۆی ئایەتەکانی سووڕەتەکە.

## نێوەڕۆکی سووڕەتی (الشُّعَرَاء) و بابەتەکانی

لە حەوت (٧) برگەدا پێناسەی ئەم سووڕەتە دەکەین و، نێوەڕۆکەکەی دەخەینە ڕوو:

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئەم سووڕەتە زیاتر یەك ناوی بۆ بەکارهاتوە، ئەویش بریتییە لە ناوی (الشُّعرَاء)، چونکە وشەی (الشُّعراء) لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا هاتوە، بۆیە زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئەم سووڕەتەیان هەر لە سەرەتاوە بە سووڕەتی (الشُّعراء) ناسیوە، بەڵام کەمێکیش ناوی (طسم)یان بۆ بەکارهێناوەو گوتوویانە: سووڕەتی (طسم)، هەندێکیش ناوی (الجامِعَة)یان بۆ بەکارهێناوە لەو ڕووەوە

کە بەسەرهاتی حەوت لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، لەم سووڕەتەدا هاتوە کە بەسەرهاتەکانی: مووسا ﷺ و هارِوونی برای، پاشان ئیبراهیم، دوایی نووح، ئنجا هوود و، صالح و لووط و، شوعەیب (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)ن.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سووڕەتە مەککەییەو لە شاری مەککە دابەزیوە و، بەسەرنجدانی ئایەتەکانی و نێوەڕۆکیان بە ئاشکرا ئەوە دەزانرێ.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

لە ڕیزبەندیی موصحەفدا ژمارە (٢٦)ە واتە: کە لە سووڕەتی فاتیحەوە پێدادێی، بەڵام لە ڕیزبەندیی دابەزین (تَرْتِيبُ النزول)دا بە ڕای زۆربەی زانایان ژمارە (٤٧)ە، دوای سووڕەتی (الواقعة) و، پێش سووڕەتی (النمل) دابەزیوە و، لە هەندێک گێڕدراوان (ڕوایات)دا هاتوە کە هەندێک ئایەتی ئەم سووڕەتە مەککەیی نەبن، بۆ نموونە هەرکام لە (ابن الزبير) و (ابن عباس)ەوە، (خوا لە خۆیان و باییان ڕازی بێ) هاتوە کە:

أ)- ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ﴾، تاکو کۆتایی سووڕەتەکە، لە مەدینە دابەزیێ.

ب)- (مُقاتل)یش کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین، لێی گێردراوەتەوە کە ئایەتی: ﴿أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، لە مەدینە دابەزیوە، وەك (إبن عاشور) لە تەفسیرەکەی هێناویەتی[1].

هەندێک لە تەفسیرەکانی دیکەش ئاماژەیان بەوە داوە، بەڵام بێگومان ئەوانە هیچیان بەڵگە نین لەسەر مەککەیی نەبوونی سووڕەتەکە و، لەسەر مەدینەیی

---

(١) التحرير والتنوير، ج ١٩، ص ٩٠.

بوونی ئەو ئایەتانەش کە ئاماژەیان پێداون، چونکە بە نسبەت ئەو ئایەتەوە کە باسی (الشُعَراء) دەکات لە کۆتایی سوورەتەکەدا، لە ڕاستییدا شاری مەککەش شیعری لێبووە و شاعیری لێبوون، هەم شاعیری مسوڵمان هەم شاعیری نامسوڵمان، بەڵکو مەککە مەڵبەندی شیعر و شاعیران بووە.

بە نسبەت ئەو ئایەتە شەوە کە باسی ئەوە دەکات کە: [ئایا بۆ ئەوان نیشانە و بەڵگە نیە کە زانایانی بەنو ئیسرائیل ئەم قوڕئانە بزانن؟!] لە مەککەش جۆرێك لە تێکەڵیی لەگەڵ خاوەن کتێبان دا هەبووە و، لە زۆر ئایەتی سوورەتە مەککەییەکاندا، ئەوە هاتوە، نەك تەنها لە سوورەتی (الشُعراء)دا بۆ وێنە:

أ)- لە سوورەتی (الرعد)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾ ﴾ واتە: بڵێ: خوا بەسسە شایەد بێ لە نێوان من و ئێوەداو، ئەو کەسە کە زانیاریی کتێبە پێشووەکانی لە لایە (خاوەن کتێبان).

ب)- لە سوورەتی (القصص)یش خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی پێش ئەم قوڕئانە، یان پێش پێغەمبەر موحەممەد ﷺ کتێبمان پێداون، ئەوانە بڕوای پێ دێنن یانی: ئەوانەیان کە ئەهلی ئینصاف و ویژدانن.

ج)- لە سوورەتی (العنكبوت)یش دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَمِنْ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە {کە هەر دەبێ بە خۆی بچوێنرێ} کتێبمان بۆ لای تۆ دابەزاندوە، ئنجا ئەوانەی کتێبمان پێداون {واتە: پێشتر} بڕوای پێ دێنن و تەنیا بێبڕوایان {ئەوانەی کە نایسەلمێنن ئینصاف و عەقڵ و ویژدان بەکارناهێنن} نکووڵیی لێ دەکەن.

د)- هەروەها لە سوورەتی (الأحقاف)دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: پێم بڵێن: ئەگەر ئەم قوڕئانە لە لایەن خواوە

بێ و، ئێوەش پێی بێبڕوابن و لە بەنوو ئیسرائیل شایەدێك شایەدیی بدات، ئەو بڕوا بێنێ و ئێوەش خۆتان بە زل بگرن، {هەڵوێستتان چی دەبێ؟!} بە دڵنیایی خوا خۆبە زلگران ڕاستەڕێ ناكات.

هەڵبەتـە سـوورەتی دیكـەش هـەن لـە سـوورەتە مەككەییـەكان، لەوجـۆرە، بـۆ نموونـە: لـە سـوورەتی (الكهف)یشـدا ئامـاژە كـراوە، بـە بەسـەرهاتێك كـە قورەیشـییەكان چوونـە مەدینـە و ڕاوێژیـان بـە خـاوەن كتێبـان كـردوە: ئایـا ئێمـە چـۆن بزانیـن موحەممـەد ڕاسـتە، یـان ڕاسـت نیـە؟! ئەوانیـش فێریـان كـردوون سـێ پرسـیاری لـێ بكـەن: دەربـارەی: ڕووح و، (ذِي القَرنَين)، و (أَصحَاب الكَهف)، ئەوانیـش پرسـیارەكانی لـێ دەكـەن، وەك كاتـی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (الكهـف) دا باسـمان كـردوە، كەواتـە: ئـەوە نابێتـە بەڵگـەی ئـەوە كـە ئـەم سـوورەتە ئـەو ئایەتانـەی مەككەیـی نیـن، بەڵكـو ئـەم سـوورەتە هەمـوو ئایەتەكانـی مەككەییـن.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

ئـەم سـوورەتە ژمـارەی ئایەتەكانـی: (٢٢٦)ە، یاخـود (٢٢٧)ە، بـەڵام زیاتـر ژمـارەی (٢٢٧)یـان داناوە، لـەو موصحەفانـەدا كە لەبەردەستمانن.

## پێنجەم: ناوەڕۆكی:

ناوەڕۆكی ئـەم سـوورەتە، وەك نەخشـەی گشـتیی ئـەم سـوورەتە، ئەگـەر تەماشـای بكەیـن، بەمجۆرەیە:

ئـەم سـوورەتە نـۆ ئایەتـی سـەرەتای: ئایەتەكانـی (١ - ٩)، وەك پێشـەكیی وان بـۆ ئـەم سـوورەتە، كـە باسـی هەڵوێسـتی نەرێنییانـەی بێبڕوایانـە لـە بەرانبـەر قورئانـداو، ئاماژەیەكـی كـورت بـە ڕووەكـە بەپیـت و پێزەكانـی زەوییـە.

پاشـان بەسـەرهاتی حـەوت لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) دێنـێ، ئەگـەر هـارووون و مووسـا بەیەکـەوە حیسـاب بکەیـن، ئەگەرنـا دەبـن بـە هەشـت، لـە پانتایـی: (١٨٣) ئایـەت دا.

دوایـی (٣٦) ئایەتـی کۆتایـی (١٩١ - ٢٢٧) دیسـان بـە پلـەی یەکـەم هـەر باسـی قورئـان و هەڵوێسـتی کەللەڕەقانـەی کافرانـە لـە بەرانبـەر قورئانـدا، وێـڕای پووچـەڵ کردنـەوەی قسـە و تۆمەتەکانیـان، کەواتـە: (٩+ ٣٦ = ٤٥) پێشـەکیی و پاشـەکیی، ئـەم سـوورەتە (٤٥) ئایەتـی زیاتـر بـۆ بـاس و خواسـی قورئـان تەرخانکـراوە، (٤٥) ئایـەت لـە (٢٢٧)دکـە، (٢٢٧- ٤٥ = ١٨٢) واتـە: (١٨٢) ئایـەت تەرخانکـراون بـۆ گێڕانـەوەی حـەوت بەسـەرهات لـە بەسـەرهاتی پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم)، کـە بەسـەرهاتەکانی:

١- مووسا و هارووونی برای (عَلَيْهِما السَّلاَم)و، گەلەکەیان لەگەڵ فیرعەون و داروودەستەکەیدا.

٢- بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ بابی و گەلەکەیدا.

٣- بەسەرهاتی نووح ﷺ و، گەلەکەی.

٤- بەسەرهاتی هوود ﷺ و، گەلەکەی (عاد).

٥- بەسەرهاتی صاڵح ﷺ و، گەلەکەی (ثمود).

٦- بەسەرهاتی لووط ﷺ و، گەلەکەی گەلی لووط.

٧- بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ و، گەلەکەی مەدیەن (أصحابُ الأَيكَة).

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە:

دەتوانیـن کۆمەڵێـک تایبەتمەندیـی لـەم سـووڕەتە دەربێنیـن، کـە تایبەتـن بـە خۆیـەوە، ئـەو چوارەیانـم لـەلا زەق و دیـار بـوون:

١- ئەم تەعبیرە: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾، هەشت جاران دووبارە بۆتەوە، ئەم تەعبیرە کە دوو ئایەتە بەیەکەوە، هەشت جاران لەم سووڕەتەدا هاتووە، تەنها لەم سووڕەتەدا وایە.

٢- پێنج جاران لەسەر زمانی هەر کام لە: نووح و هوود و صاڵح و لووط و شوعەیب (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، ئەم تەعبیرە دووبارە بۆتەوە: ﴿ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، ﴿ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، ﴿ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، ئەمەش تەنها لەم سووڕەتەدا بەم شێوەیە.

٣- وشەی (الشُّعراء) لە هەموو قورئاندا تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە.

٤- تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە کە: فیرعەون لە ماڵی ئەواندا بەخێوکرانی مووساو، کوشتنی کابرای قیبتیی، بە چاوی مووسادا بداتەوە، تەنیا لێرەدا هاتوە کە فیرعەون وەك منەتێك لەسەر مووسای ﷺ بکات، کە لە ماڵی ئەواندا بەخێو کراوە، کەچی ئەو لە بەرانبەر ئەو چاکەیەدا، بێنمەك دەرچووە - بە حیسابی فیرعەون - ئەو کابرایە قیبتییەشی لێ کوشتوون، کە لە سووڕەتی (القصص)دا بەسەرهاتەکەی هاتوە، وەك خوای پەروەردگار ئاوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴿١٩﴾ ﴾، واتە: فیرعەون گوتی: ئایا بە گچکەیی تۆمان لە نێو خۆماندا بەخێو نەکرد و، چەند ساڵان لە تەمەنت لەنێو ئێمەدا نەمایەوە؟! ئەو کەتنەشت کرد کە کردت و، تۆ لە ناسوپاسان بووی، لە سپڵە و بێنمەکان بووی؟! حاشای مووسا ﷺ لەوە، کە دوایی دەیگەیەنێ، مووسا ﷺ چ وەڵامێکی ددانشکێنی ئەو دوو قسانەی فیرعەون دەداتەوە!

شایانی باسە: ئێمە بەسەرهاتی هەرکام لە: نووح و هوود و لووط و شوعەیبمان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لە تەفسیری سووڕەتی هووددا بە درێژیی باس کردوە، بەسەرهاتی (صاڵح)یشمان لە سووڕەتی (الحجر)دا باسکردوەو، بەسەرهاتی ئیبراهیمیشمان لە سووڕەتی ئیبرهیمدا و، بەسەرهاتی مووسا و هارِوونی برای و

گەلەکەیان (بەنوو ئیسرائیل) لەگەڵ فیرعەون و داروودەستەکەیدا، لە سوورەتی (الأعراف)دا هەشت قۆناغمان لێ باسکردووە، پێنج قۆناغ ماون، پێنج قۆناغی سەرەتای ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ هاروونی برای و گەلەکەیان و فیرعەون و داروودەستەکەی، ئەو پێنج قۆناغەش لە کاتێک دا دەگەین بە تەفسیری سوورەتی (القصص) لەوێدا، خوا ﷻ یارمەتییمان بدات باسی دەکەین، بۆیە ئێمە لێرەدا بە کورتیی بەسەر بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرانەدا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، دەڕۆین، چونکە لەو شوێنانەدا کە ئاماژەم پێیاندا، ئێمە کردوومانە بە عادەت کە بەسەرهاتی هەرکام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، بە وردیی و بە وردەکارییەکانەوە، هەموو ئایەتەکانی کە پەیوەستن بە بەسەرهاتی هەرکام لەم پێغەمبەرانەوە کە دەیتوێژینەوە، هەموویان پێکەوە دێنین، ئنجا ئێستا ئەوەی کە مابێ لە بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، جگە لە موحەممەد ﷺ کە سەروەری پێغەمبەرانە، بیست و چوار پێغەمبەرەکەی دیکە، هەموویان کەم و زۆر بەسەرهاتەکانیانمان باسکردوە، بەڵێ ئێمە لە تەفسیر کردنی سوورەتەکانی ڕابردوودا، ژیان و بەسەرهاتی ئەو (٢٤) پێغەمبەرەی ناویان لە قورئاندا هاتوە، لە ئادەمەوە تاکو عیسا، بەسەرهاتی هەموویانمان باسکردوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سوورەتە بۆ چەند دەرسێك:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی: (١ - ٩) دەگرێتە خۆی، کە وەك پێشەکیی وایە بۆ کۆی سوورەتەکە.

دەرسی دووەم: بەسەرهاتی مووسا و هاروون (عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ) و گەلەکەیان بەنو ئیسرائیل و فیرعەون و داروودەستەکەی، ئایەتەکانی: (١٠ - ٦٨) واتە: ( ٥٩) ئایەت دەگرێتەوە.

دەرسی سێیەم: بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ بابی و گەلەکەیدا کە ئایەتەکانی: (٦٩ - ١٠٤) واتە: (٣٦) ئایەت دەگرێتە خۆی.

دەرسی چوارەم: بەسەرهاتی نووح ﷺ و گەلەکەی کە ئایەتەکانی: (١٠٥ - ١٢٢) واتە: (١٧) ئایەت دەگرێتە.

دەرسی پێنجەم: بەسەرهاتی هوود ﷺ و، گەلەکەی عاد، کە ئایەتەکانی: (١٢٣ - ١٤٠) ئەویش دیسان (١٧) ئایەت دەگرێتەوە.

دەرسی شەشەم: بەسەرهاتی صاڵح ﷺ و، گەلەکەی (ثمود) کە ئایەتەکانی: (١٤١ - ١٥٩) واتە: (١٨) ئایەت دەگرێتە خۆی.

دەرسی حەوتەم: بەسەرهاتی لووط ﷺ و، گەلەکەی کە ئایەتەکانی: (١٦٠ - ١٧٥) واتە: (١٥) ئایەت دەگرێتە خۆی.

دەرسی هەشتەم: بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ و، گەلەکەی کە لێرەدا ناویان بە: (أصحابُ الأيكة) هاتوە، کە ئایەتەکانی: (١٧٦ - ١٩١) ئەویش (١٥) ئایەت دەگرێتەوە.

دەرسی نۆیەم: پاشەکیی ئەم سوورەتە، کە ئایەتەکانی: (١٩٢ - ٢٢٧) واتە: (٣٦) ئایەت دەگرێتە خۆی.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە نـۆ (٩) ئایـەت پێکـدێ، ئایەتـەکانی: (١ - ٩)، کـە وەك پێشـتر باسـمانکرد، ئـەم دەرسـە وەك پێشـەکیی ئـەم سـوورەتە وایـەو، تـەوەری سـەرەکیی ئـەم نـۆ ئایەتـەش، بریتیـە لـە باسـی قورئـان و هەڵوێسـتی خـراپ و کەللەڕەقانـەی بێبڕوایـان لـە بەرانبەریـدا.

پاشـان ئاماژەیەکیـش بـۆ ڕووەکـە بـە پێـز و بەرهەمدارەکانـی زەوی کـراوە، بـە گشـتیی، دواییـش باسـی نیشـانە بوونـی ڕووەك لەسـەر پەروەردگارێتیـی خـواو تەنیا پەرسـتراوێتیی خـوا، کـراوە.

دوایـی باسـی بێبـڕوا بوونـی زۆربـەی خەڵکـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ کـراوەو، خـواش ﷻ بـە هـەردوو سـیفەتی بـەرز و مەزنـی: ﴿ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾، وەسـف کـراوە، ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾، کـە وەك گوتمـان ئـەو تەعبیـرە هەشـت جـاران لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا دووبـارە بۆتـەوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ لَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٣﴾ إِن نَّشَأۡ نُنَزِّلۡ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةٗ فَظَلَّتۡ أَعۡنَٰقُهُمۡ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴿٤﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ مُحۡدَثٍ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهُ مُعۡرِضِينَ ﴿٥﴾ فَقَدۡ كَذَّبُواْ فَسَيَأۡتِيهِمۡ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَمۡ أَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

{طسم ﴿١﴾ ئەوانـە ئایەتەکانـی کتێبێکـی ڕوون و ڕوونکـەرەوەن ﴿٢﴾ (ئـەی موحەممـەد!) ڕەنگـە بـە هـۆی ئـەوەوە (کـە خەڵکەکـە) نابنـە بـڕوادار، لـە خەفەتـان خـۆت بفەوتێنـی ﴿٣﴾ ئەگـەر بمانـەوێ بـە زۆر بیانکەینـە بـڕوادار و ملیـان پـێ کـەچ بکەیـن، لـە ئاسـمانەوە بەڵگـە و نیشـانەیەکیان دادەبەزێنینـە سـەر، ئنجا گەردنیـان بۆی زەبـوون و کـەچ دەبـێ ﴿٤﴾ هەر بیرخستنەوەیەکی تازەشیان لـە (خـوای) بەبەزەییەوە بـۆ بـێ، ڕووی لـێ وەردەگێـڕن ﴿٥﴾ بێگومـان ئـەوان ئـەو پەیامـەی لـە خـواوە بۆیـان هـات بـە درۆیـان دانـا و، بـە مسـۆگەریی هەواڵەکانـی ئەوەیـان بـۆ دێ کـە گاڵتەیـان پێدەکـرد ﴿٦﴾ ئایـا سـەرنجیان نەداوەتـە زەوی، چەنـدان جـۆرە ڕوودکـی بەپێـز و بەرهەمدارمـان تێـدا ڕوانـدوون؟! ﴿٧﴾ بـە دڵنیایـی لـەوەدا نیشـانە ( و بەڵگـە) هەیـە (لەسـەر تەنیا پەروەردگارێتیـی و تەنیا پەرستراوێتیی خـوا) لـە حاڵێکـدا کـە زۆربەیـان بـڕوادار نیـن ﴿٨﴾ بـە دڵنیاییـش تەنیا پـەروەردگارت باڵادەسـتی میهرەبانـە ﴿٩﴾}

## شیکرنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلۡمُبِينِ): وشـەی (مبیـن) دەگونجـێ لـە (أبـانَ)ی (لازم) هاتبـێ، کـە پێویسـت بـە بـەرکار (مَفعـول بـە) نـاکات، وەك (أبـانَ القَمَـرُ) یانـی: (ظَهَـرَ) مانگەکـە دەرکـەوت، دەشـگونجێ لـە (أبـانَ)ی تێپەڕکـەر (مُتَعَـدِّي)ەوە هاتبـێ کـە پێویسـتیی بـە بـەرکار (مَفعـول بـە) دەکات، وەك (أبـانَ المُـدَرِّسُ الـدَّرسَ) مامۆسـتایەکە دەرسـەکەی ڕوونکردە، لێـرە هـەردوو واتایـەکان هەڵدەگرێ، چ بـە مانـای (ظَهَـرَ) بـێ، چ بـە مانـای (وَضَـحَ)

بـێ واتـە: ئـەم ئایەتانـە هـی کتێبێکـی ڕوونـن، ڕۆشـنن، یـان: ئـەم ئایەتانـە هـی کتێبێکـی ڕوونکـەرەوەن.

(بَٰخِعٌ نَّفۡسَكَ): واتـە: فەوتێنـەری خۆتـی، (البَاخِـعُ: القَاتِـلُ، وَحَقيقَـةُ البَخْـعِ: إعـماقُ الذَّبـحِ، قَـالَ الزَّمَخـشَرِي: إذَا بَلَـغَ السِّـكينُ البِخَـاعَ، وَهُـوَ عِـرقٌ مُسـتَبطَنُ الفِقَـارِ) (باخِـع) بە مانـای بکـوژ دێ، ئەصڵـی مانـای (بَخـع) بڕینیـە لـە سـەربڕینی شـتێك بـە شـێوەیەك کـە چەقۆکـە قـووڵ داگـری، زەمەخشـەریی گوتوویەتـی: ئەگـەر چەقـۆ گەیشـتە (بِخَـاع) کـە بڕیتیـە لـە دەمارێـك لـە نێـو بڕگەکانـی گەردندایـە.

(أَعۡنَٰقُهُمۡ): (أعنَـاق: جَمـعُ عُنُـق وَهُـوَ الرَّقَبَـة) (أعنَـاق) کـۆی (عُنُـق)ە، (عُنُق)یـش واتـە: گـەردن، مـل.

(مُّحۡدَثٍ): (أَي جديـد، أَي ذِكـرٌ بَعـدَ ذِكـرٍ، يُذَكِّرُهُـم بِمَـا أُنـزِلَ مِـنَ القُـرآن)، (مُحْـدَث) واتـە: تـازە پەیدابـوو بـەو واتایـە کـە: خـوا ﷻ بیرخـەرەوە لـە دوای بیرخـەرەوە لـە قورئـان ناردوویەتـە خـوار، واتـە: بـە نسـبەت ئەوانـەوە تـازە بـووە، ئنجـا لەگـەڵ ئـەوەدا تێکناگیـرێ کـە فەرمایشـتی خـوا ﷻ سـیفەتی خوایـە و بـێ سـەرەتایە.

(كَمۡ أَنۢبَتۡنَا)، (كَمۡ): لێـرەدا (خَبَرِيَّـةٌ إِسـمٌ دَالٌّ عَـلى الكَـثرَةِ، وَمَنصُوبَـةٌ بِـ ﴿أَنۢبَتۡنَا﴾، أَي: أنبَتنـا كَثـيراً) (کـم) لێـرەدا پێـی دەگوتـرێ: (کـم الخبريـة) ناوێکـە مانـای زۆریـی دەگەیەنـێ، یانـی: (أنبَتنا كَثيراً) کـە بـە ﴿أَنۢبَتۡنَا﴾ مەنصووبـە کـە لـە دوای خۆیـەوە دێ، زۆر ڕووەکـمان ڕوانـدوون.

(زَوۡجٍ): (صِنف) واتە: جۆر، پۆل.

(كَرِيمٍ): (أَي: نَفيـسٌ مِـن نَوعِـهِ، أَو الحَسَـنُ مِـنْ كُلِّ شَيء) (کریـم) هـەر شـتێکی باشـە لـە جـۆری خـۆی، یاخـود: شـتی نایـاب و پەسـند، لێـرەدا بـە نسـبەت ڕووەکـەوە یانـی: ڕووەکـی بەپێـز، بەرهەمـدار و بـاش، ئەگـەر زەوی بـە (کریـم) وەصـف بکـرێ، یـان باسـی مـرۆڤ بکـرێ، باسـی هـەر شـتێك بکـرێ، هـەر کاتێـك سـیفەتی (کریـم) بـۆ هەر شـتێك بەکارهـات واتـە: باشـترین یاخـود، جۆریکـی زۆر بـاش لـەو شـتەی باسـکراوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، بـە نـاوی خـوای بەبەزەیـی بەخشـندە، وەك زۆرجـار باسـمانكردوە، واتـە: دەسـت پێدەكەم، یان دەسـت پێكردنـم، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندەیە، ئنجـا ئـەم ڕسـتە موبارەكـە دەبـێ ئینسـان چـوار واتایـان لـە دڵـی خـۆی بگـرێ، كاتێـك كـە دەیڵـێ، واتـە:

١- ئەم كارەم دەست پێدەكەم بە ناوی خوا، نەك بە ناوی خۆم، یان بە ناوی خەڵك، یان ناوی هەر كەسێك.

٢- ئەم كارە دەكەم بە پێی بەرنامەی خوا.

٣- ئەم كارە دەكەم بە توانایەك كە خوا ﷻ پێی داوم.

٤- ئەم كارە دەكەم بۆ ڕازیی كردنی خوا ﷻ.

ئنجـا خـوا ﷻ سـێ پیتـان لـە سـەرەتای ئـەم سـوورەتەوە دێنـێ ﴿طسٓمٓ﴾، كـە ئاوا دەخوێندرێنـەوە: (طا سیـــن میـــــم) ئەمانـە سێ پیـتن لـە (٢٨) پیتەكـە، كـە زمانـی عەرەبیـان لـێ پێكـدێ و، قورئانیـش بـە زمانـی عەرەبیـی هاتـوە، ئێمـەش لـە سـەرەتای تەفسـیری سـوورەتی (یونـس)دا بـە درێژیـی باسـێكی سـەربەخۆمان لـە بـارەی ئـەو (٢٩) سـوورەتەوە كـردوە، كـە بـەو پیتانـە دەسـتیان پێكـردوە، كـە دووانیـان مەدینەییـن و ئـەوانی دیكـە مەككەییـن، ئـەو پیتانـەش پێیـان دەگوتـرێ: (الحُرُوف المُقَطَّعَة) پیتـە پچـڕ پچـڕەكان، واتـە: پیتـەكان وەك وشـەیەك نیـن، بـۆ وێنە: ناكـرێ بڵێـی: (طَسَـم) یـان بـە ﴿الٓمٓ﴾، بڵێـی: (أَلَـمْ)، چونكـە ئەوانـە پیتـی پچـڕ پچـڕن، بەڵـێ بەسـەر یەكـەوە نـووسراون، بـەڵام بـە جیاجیـا دەبێژرێـن، ئێمـە لـەوێ باسـێكی تێـر و تەسـەلمان كـردوە، لە بـارەی هـەركام لـەو (٢٩) سـوورەتەوە، كـە بـەو

پیتە پچڕپچڕانە، دەست پێدەکەن، باشترین ماناش بۆیان کە من پێی گەیشتووم، هەر ئەوەیە کە خوا ﷻ دەیەوێ بە هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێتەوە، بە تایبەت ئەوانەی کە نەیاری قورئانن پێیان بفەرموێ: ئەو قورئانە، هەر کام لە سوورەتەکانی کە (١١٤) سوورەتن، هەر لەو پیتانە پێکهاتوە کە ئێوە قسەیان پێ دەکەن و، شتیان پێ دەنووسن لە (أ، ل، م، ن، ص، ق، ... هتد).

کەواتە: ئەو کەرەستەیەی کە ئەم قورئانەی لێ پێکهاتوە، ئەو فەرمایشتە بێوێنەیە، ئەو کەرەستەیە لەبەر دەستی ئێوەشدا هەیە، ئنجا ئەگەر ڕاست دەکەن قورئان فەرمایشتی خوا نیە، بۆ پێغەمبەری کۆتایی خۆی موحەممەد ﷺی ناردوە، فەرموون ئێوەش ئەوە عەرز و ئەوە گەز، (مەیدان مشکان نەیانکێڵاوە)! ئەو کەرەستەیە کە قورئان لێی پێکهاتوە، لەبەر دەستی ئێوەشدا هەیە، فەرموون ئێوەش قورئانێکی وا بێنن، وەك خوا ﷻ تەحەددای کردن: ﴿ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾الطور، واتە: با قسەیەکی وەك قورئان بێنن، ئنجا کە نەیانتوانی فەرمووی: ﴿ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ ﴿١٣﴾ ﴾هود، واتە: با دە (١٠) سوورەتی هەڵبەستراو بێنن، ئێوە کە دەڵێن: قورئان هەڵبەستراوە! ئنجا کە هەر نەیانتوانی، فەرمووی: ﴿ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ ﴿٢٣﴾ ﴾البقرة، وێنەی یەك سوورەتی بێنن، وەك سوورەتەکانی: (العصر، الكوثر، النصر)، ئەو سوورەتانە کەیەکی تەنیا سێ ئایەتن، بەڵام هەر نەیانتوانی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟ ﴿٢٤﴾ ﴾البقرة، ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیزیش ناتوانن، ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ البقرة، خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی خەڵکە و بەردە، بۆ بێبڕوایان ئامادە کراوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، ئەو ئایەتانە هی کتێبێکی ڕوونن، یان: هی کتێبێکی ڕوونکەرەوەن، وشەی ﴿ ٱلْمُبِينِ ﴾، هەردوو واتایەکان هەڵدەگرێ.

بۆیەش بە ئامـاژەی دوور فەرموویەتـی: ﴿ تِلْكَ ﴾، چونكـە لـە زمانـی عەرەبییـدا نـاوی ئامـاژە: (هـذا) بـۆ نێـر و (هـذه) بـۆ مـێ، ئەگـەر بـۆ نیزیـك بـێ، ئـاوا دەڵێـی، ئەگـەر تـۆزێ دوورتـر بـێ دەڵێـی: (ذَاكَ) ئـەوە بـۆ تـۆزێ دوورتـر، بـەڵام ئەگـەر دوورتـر بـێ دەڵێـی: (ذَلِـكَ)، ئنجـا لێـرە ﴿ تِلْكَ ﴾، لـە بەرانبـەر (ذَلِكَ)یـە، یانـی ئـەو ئایەتانـە، بۆچـی بـە نـاوی ئامـاژەی دوور هاتـوە؟! ئەمـە دەگونجـێ بـە چەنـد شـێوەیەك وەڵام بدرێتـەوە:

أ)- لەبەر ئەوەی پێگە و مەقامی ئەو ئایەتانە زۆر بەرز و دوورە.

ب)- ئەو ئایەتانەی ئێوە زۆر بە دووریان دەزانن، فەرمایشتی خوا بن.

ج)- ئەو ئایەتانەی عەقڵی كوڵی ئێوە دوورە تێیان بگات.

ئنجـا خـوا ڕوو لـە پێغەمبـەر ﷺ دەكات: ﴿ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾، ڕەنگـە، نیزیكـە تـۆ فەوتێنـەری خـۆت بـی بەهـۆی ئـەوەوە كـە نابنـە بـڕوادار، یـانی: زۆر خەفەتیـان لـێ دەخـۆی و زۆر نارەحـەت دەبـی نیزیكـە خـۆت بفەوتێنـی و لـە خەفەتیـان خـۆت خەفەتخـان كـردوە، ﴿ إِن نَّشَأۡ نُنَزِّلۡ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةٗ فَظَلَّتۡ أَعۡنَٰقُهُمۡ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴾، ئەگـەر بمانـەوێ لـە سـەرێوە نیشـانەكیان بـۆ دادەبەزێنیـن، كـە ملەكانیـان، گەردنەكانیـان بـۆی كـەچ دەبـن، زەبـوون دەبـن، بـە تەئكیـد لێـرەدا مەبەسـت لـە (ءَايَةٗ) واتـە: نیشـانەیەك، موعجیزەیـەك، وەك هـی پێغەمبەرانـی پێشـوو (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) بـە تایبـەت نیشـانەكانی كـە مووسـا ؈ بـۆ بەنـوو ئیسـرائیلی هێنـاون، یـان نیشـانەكانی كـە مووسـا پێشـانی فیرعەون و گەلەكەیانـی داون، كـە نەیانتوانیـوە لـە بەرانبـەر ئـەو نیشـانانەدا لام و جیـم بكـەن، ئەگـەر بمانـەوێ لـە سـەرێوە نیشـانەكی ئاوایـان بـۆ دادەبەزێنیـن، كـە نەتوانـن لـە بەرانبەریـدا هیـچ بڵێـن، ﴿ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ مُحۡدَثٍ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهُ مُعۡرِضِينَ ﴾، لـە خـوای خـاوەن بەزەییـەوەش، هیـچ بیرخەرەوەیەكـی تازەیـان بـۆ نایـەت، مەگـەر ڕووی لێوەردەگێـڕن.

﴿ فَقَدْ كَذَّبُواْ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان بە درۆیان دانا، {پێغەمبەریان ﷺ بە درۆ دانا، قورئانیان بە درۆ دانا، پەیامی خوای پەروەردگاریان بە درۆ دانا} بە دڵنیایی لەمەودوا هەواڵەکانی ئەوەی کە گاڵتەی پێدەکەن، بۆیان دێ، ئەوەی گاڵتەیان پێکردوە چییە؟! پێغەمبەر ﷺ بووە، قورئان بووە، کە هەمیشە ئەوانەی گاڵتە بە شتێك دەکەن، بە زۆریی وایە لەبەر نەفامیی خۆیانە، لەبەر ئەوەیە کە تێیناگەن، نایناسن و شارەزای نین.

ئنجا خوا ﷻ ئەوە کە نیشانە و بەڵگەیەکی وایان بۆ دانابەزێنێ، کە گەردنیان بۆی کەچ بێ و، نەتوانن لە بەرانبەریدا تەکان بخۆن و، نەتوانن لام و جیم بکەن، نەیفەرموە: بۆچی نایێنێرم، بەڵام بە تەئکید کە باسی قورئان دەکات، یانی: لە جیاتی ئەوەی خوا ﷻ نیشانە و موعجیزەیەك بنێرێ، بە ناچاریی بڕوا بێنن، ئەوە موعجیزەیەکی بۆ ناردوون، بەڵگە و نیشانەیەکی بۆ ناردوون کە بە ئیختیاریی بڕوابێنن، چونکە مرۆڤایەتیی کاتی خۆی لە قۆناغێکی ساوادا بووە، بۆیە لە قەدەر قۆناغی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، کە موعجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) موعجیزەی بەرهەست بوون، نیشانە و بەڵگەی بەرهەست و پاسادر بوون، بەڵام لە دوای هاتنی پێغەمبەری کۆتایی، مرۆڤایەتیی گەیشتۆتە قۆناغێکی پێگەیشتووتر، بۆیە دەبێ لە قەدەر ئەو قۆناغەی کە پێیگەیشتوە، کە قۆناغی کامڵ بوونە، قۆناغی زیاتر گەشەکردن و بەرەو پێشچوونە، لە قەدەر ئەو قۆناغە بدوێنرێن، ئەویش ئەوەیە کە خوا بەو موعجیزەیە، کە موعجیزەیەکی ئەدەبیی، فیکریی، عیلمیی، کە لە قورئاندا بەرجەستەیە، بەوە خوای پەروەردگار ئەو مرۆڤایەتییە دەدوێنێ، کە سەرپشکیی و هەڵبژاردنیان هەیە لە بەرانبەریدا، بڕوای پێ بێنن، یاخود بڕوای پێ نەهێنن، بەڵام بۆ وێنە: کاتێك خوا ﷻ کێوی طووری بەرزکردۆتەوە بەسەر بەنو ئیسرائیلدا وەك سێبەر، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾ ﴾الأعراف، واتە: کاتێك کە چیایەکەمان بەسەر سەریانەوە وەك

هەورێك بەرز كردەوە و پێیان وا بوو، بەسەریاندا دەكەوێ، ئەوە لەو حاڵەتەدا مرۆڤ ویست و هەڵبژاردنی نامێنێ.

هەروەها خوا ﷻ ئەو نۆ (٩) موعجیزەیەی كە داونی بە مووسا ﷺ كە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍ بَيِّنَٰتٍ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ ﴾الإسراء، كە لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا بە درێژیی باسمان كردوون، لە ڕاستییدا ئەوە جۆرێك لە ناچاركردنی تێدا بووە، بەڵام قورئان ناچاركردنی تێدانییە، بەڵكو ئیقناع كردنی تێدایەو، ئەوەش جۆرێكە لە ڕێزگرتنی خوا ﷻ لە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ كە هەموو بەشەرییەت ئێستا ئوممەتی موحەممەدە ﷺ، چ وەڵامی دابێتەوە، كە ئەهلی ئیمان و ئیسلامن، چ وەڵامیان نەدابێتەوە، كە بەردەوام بانگ دەكرێن و هەموویان لەسەر میلاكی موحەممەدن ﷺ، ئەوە جۆرێكە لە ڕێزگرتنی خوا لە مرۆڤایەتیی، لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ كە موعجیزەیەك و بەڵگەیەكیان بۆ بنێرێ، ویست و هەڵبژاردنیان لە بەرانبەریدا هەبێت.

دوایی خوا ﷻ ئاماژە دەكات بە یەكێك لە نیشانە گەورە و گرنگەكانی خۆی، كە ئەویش دیسان هەر لەو نیشانە و موعجیزانەن، كە دەبێ مرۆڤ بە عەقڵ لێیان ورد بێتەوە و لێیان تێبگات، نەك بە هەستەوەرەكانی مامەڵەیان لەگەڵدا بكات، ببینێ و دەنگەكەی ببیستێ، بەڵكو دەبێ بە عەقڵ تێیبفكرێ، دەفەرمووێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴾، ئایا سەرنجیان نەداوەتە زەوی، لە زەوییان نەڕوانیوە، كە زۆر ڕووەكی بەرهەمدار و بە پیت و پێزمان تێدا ڕواندوە، ئایا سەرنجیان نەداوە؟! كە دەڵێین: ڕووەك واتە: لە پنجە گیایەكی گچكەوە بگرە، تاكو هەموو جۆرەكانی ڕووەك كە لەسەر زەوی دەڕوێن، هەموو جۆرە سەوزەكان، هەموو جۆرە میوەكان، هەموو جۆرە درەختەكان، هەموو ئەوەی كە دەڕوێ، چ بەردار بن، چ بێبەر بن، هەمووی دەگرێتەوە، كە ئەوە بۆ خۆی گەورەترین، بەڵگەیە لەسەر باڵادەستیی و میهرەبانیی خوا، لەسەر ئەوە كە

خـوا ﷻ ئەوپـەڕی مشـووری خـواردوە لـە مرۆڤـەكان و، هەمـوو پێداویسـتییەكانی بـۆ دابیـن كـردوون، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، لـەوەدا كـە باسـكرا، واتـە: لـە ڕووەك دا كـە سـەر زەوی دادەپۆشـێ - كـە دوایـی ئێمـە باسـێكی تایبـەت لـە بـارەی ڕووەك و جۆرەكانـی ڕووەكـەوە دەكەیـن - لـەوەدا نیشـانە هەیـە، نیشـانەیەكی گـەورە و گرنـگ هەیـە، ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، بـەڵام زۆربەیـان بـڕوادار نیـن، واتـە: خەڵكەكـەی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی كـۆی مرۆڤایەتیـی بـێ، زۆربەیـان نابنـە بـڕوادار، لەگـەڵ ئەوەشـدا كـە پەكیـان نەكەوتـوە لەسـەر بەڵگـە، ئەگـەر بیانـەوێ بـڕوا بێنـن، بـەڵام بەڵگەكـە ئـەوە نیـە كـە ناچاریـان بـكات و، ویسـت و بژاردەیـان لـە بەرانبەریـدا لـە دەسـت بـدەن.

﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾، بـە دڵنیایـی تەنیـا پەروەردگارت زاڵـی میهرەبانە، باڵادەسـتی بەبەزەییـە، كـە وەك گوتمـان، ئـەم تەعبیـرە: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾، هەشـت جاران لـەم سـوورەتە موبارەكـەدا دووبـارە بۆتـەوە.

ئنجـا وەك دوایـی لـە بەسـەرهاتی ئـەو حـەوت پێغەمبەرانـە (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ)، كـە لـەم سـوورەتەدا بەسـەرهاتەكانیان گێڕدراوەتـەوە، دەیگەیەنـێ، ئـەم تەعبیـرە كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾، (بـە دڵنیایـی تەنیـا پـەروەردگارت زاڵـی میهرەبانـە، یاخـود: باڵادەسـتی بەبەزەییـە) زۆر لەگـەڵ نێوەڕۆكـی بەسـەرهاتی پێغەمبەرانـدا دەگونجـێ، چونكـە خوا زاڵ و باڵادەسـتە بەسـەر دوژمنان و ناحەزانـی پێغەمبەرانـداو، میهرەبان و بەبەزەییشـە، بـۆ پێغەمبەران و شـوێنكەوتووانیان صـەڵات و سـەلامی خـوا لـە پێغەمبـەران و، لـە شـوێنكەوتووانیان ڕازی بـێ.

## مەسەلە گرنگەكان

**مەسەلەی یەكەم:**

**ئایەتـە ڕوون و ڕوونكەرەوەكانـی قورئـان، هـەر لـەو پیتانـە داڕێـژراون كـە مرۆڤـەكان پێیـان دەدوێـن، كەچـی ئایەتـەكان دەستەوسانكەریشـن بـۆ تێكـڕای مرۆڤـەكان، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە كـە فەرمایشـتی خوایـە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:**

١)- ﴿ طسٓمٓ ﴾، ئەوانە سێ پیتن: پیتی (طا)، پیتی (سین)، پیتی (میم)، سێ پیتن لەو (٢٨) پیتەی زمانی عەرەبییان لێ پێكدێ، قورئانیش بە زمانی عەرەبیی هاتوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا، بە درێژیی قسەمان لەبارەی ئەو پیتانەوە كردوە، كە لە سەرەتای (٢٩) سووڕەت لە سووڕەتەكانی قورئاندا هاتوون.

با لێرەش تەنیا هۆشـداریی و ئاگاداریيەكـی گچكە بخەینـە ڕوو، لەبـارەی ئـەو پیتـە پچـڕ پچڕانـەوە، كـە لـە سـەرەتای (٢٩) سـووڕەتی قورئـان دا هاتـوون، هەمـوو ئـەو پیتانە كـە هاتـوون ژمارەیـان چـواردە (١٤) پیتـە، ئـەو (١٤) پیتـەش ئـەم دەقـە كۆیـان دەكاتەوە: (نَصٌّ حَكيـمٌ قَاطِـعٌ لَـهُ سِرٌّ) واتـە: دەقێكـی كاربەجێیـە زۆر ڕاسـتە نهێنییەكـی تێدایە.

هەڵبەتـە دەشـگونجێ بـە شـێوەیەكی دیكـەش ئـەو (١٤) پیتـی دابڕێژرێـن، بـەڵام ئـەوە یەكێكـە لـە داڕشـتنەكانیان و، ڕسـتەیەكی زۆر گـەورە و گرنـگ لـەو (١٤) پیتـە پێكـدێ، واتـە: ئـەم قورئانـە دەقێكـی كاربەجێیانەیـە، گومانـی تێـدا نیـە، گومـان و تۆمەتـەكان دەبـڕێ و نهێنییەكیشـی تێدایـە.

ئنجا (الزمخشري) گوتوویەتی: وەك (ابن كثير) لە تەفسیرەكەی خۆیدا[1] لێی خواستۆتەوە: (هَـٰذِهِ الحُرُوف الأَرْبَعَةَ عَشَر، مُشتَمِلَةٌ عَلى أَصنَافِ أَجنَاسِ الحُروف مِنَ: المَهمُوسَةِ، وَالمَجهُورَةِ، وَالرِّخوَةِ، وَالشَّدِيدَةِ، وَالمُطبِقَةِ، وَالمَفتُوحَةِ، وَالمُستَعلِيَةِ، وَالمُنخَفِضَةِ، وَالقَلقَلَةِ) (ئەمانە جۆرەكانی پیتەكانن) گوتوویەتی: ئەم چواردە (١٤) پیتە هەموو جۆرەكانی پیتان دەگرنەوە، چ ئەو پیتانەی بە دەنگی كپ دەگوترێن، چ ئەوانەی بە دەنگی بەرز دەگوترێن، مەیلە و نەرمن، یاخود توندن، ئنجا داخراون، یان كراوەن، ئنجا بەرزن، یاخود نزمن، یاخود (قَلقَلَة)ن كاتێك دەبێژرێن، دەنگیان دێ، هەموو جۆرەكانی پیتەكان، لەو (١٤) پیتەدا، كە لە سەرەتای ئەو (٢٩) سوورەتەدا هاتوون، هەن.

٢)- ﴿ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، ﴿ تِلْكَ ﴾، ئاماژەیە بۆ دوور:

أ- یان لەبەر ئەوەی پێگەی ئەو ئایەتانە زۆر دوور و بەرزە.

ب- یان لەبەر ئەوەی ئەو ئایەتانە پێگەكەیان دوورترە و، چەمك و واتایەكەیان دوورترە، لەوەی عەقڵی كولی ئەوان تێیبگات.

ج- یان لەبەر ئەوەی ئەوان بە دووریان زانیوە، فەرمایشتی خوا بێ.

﴿ ٱلْمُبِينِ ﴾، دەگونجێ لە (أَبانَ الآزم)ەوە بێ، واتە: ڕوون و ڕۆشن و دیار و بەرچاو، وەك (أَبانَ القَمَرُ) مانگەكە دەركەوت، دەشگونجێ: ﴿ ٱلْمُبِينِ ﴾، لێرەدا لە (أَبانَ المُتَعَدِّي)ەوە هاتبێ، چونكە وشەی (أَبانَ) هەم بە (قَاصِر) هاتووە، هەم بە (مُتَعَدِّي)یش، كە ئەوكاتە ﴿ ٱلْمُبِينِ ﴾، دەبێتە ڕۆشنكەرەوە، ڕوونكەرەوە، (المُجَلِّي للحَقَائِق) ڕوونكەرەوە بۆ ڕاستییەكان، ئنجا لە ڕاستییدا: قورئان، هەم ڕۆشنە بۆ ئەهلی خۆی، هەم ڕۆشنكەرەوەشە.

---

(١) ج١، ص٣١.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئامۆژگاریی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەرەکەی کە لە خەفەتی کافرەکان خۆی نەفەوتێنێ، چونکە ئەگەر خوا بیەوێ ناچاری بڕوا هێنانیان بکات، نیشانەو موعجیزەی مل پێ کەچکەریان بۆ دادەبەزێنێ و، لەمەودواش هەواڵی ئەوەی کە گاڵتەی پێدەکەن بۆیان دێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ لَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٣ إِن نَّشَأۡ نُنَزِّلۡ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةٗ فَظَلَّتۡ أَعۡنَٰقُهُمۡ لَهَا خَٰضِعِينَ ٤ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ مُحۡدَثٍ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهُ مُعۡرِضِينَ ٥ فَقَدۡ كَذَّبُواْ فَسَيَأۡتِيهِمۡ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٦ ﴾الشعراء.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:**

١)- ﴿ لَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾، ڕەنگە فەوتێنەری خۆتبی لە سۆنگەی ئەوەوە کە نابنە بڕوادار، واتە: خەڵکەکە نابنە بڕوادار، **(لَعَلَّ: للتَرَجّي لكن إذَا جَاءَت فِي تَرَجّي شَيءٍ مَخوفٍ، سُمِّيَت إشفاقاً وَتوقُّعاً)**، (لَعَلَّ) بۆ ئومێدەوار بوونە، لە کوردییدا دەبێتە: ڕەنگە، لەوانەیە، نیزیکە، پێدەچێ، بەو وشە کوردییانە مانا دەکرێ، بەڵام ئەگەر بۆ ئومێدەوار بوون بۆ شتێکی مەترسیلێکراو بێ، ئەو کاتە پێی دەگوترێ: دڵ پێسووتان و پەرۆش بوون و، چاوەڕوانکردنی شتێک کە ببێ.

کە لێرە دەفەرموێ: ﴿ لَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾ یانی: نیزیکەو ڕەنگە خۆت بفەوتێنی لەبەر ئەوەی ئەوانە نابنە بڕوادار، وشەی (بَٰخِعٞ ) وەك پێشتریش باسمان کرد **(البَخعُ: إعمَاقُ الذَّبحِ حَتّى يَبْلُغَ البِخاعِ)**، (بَخع) لە ئەصڵی زماندا بریتیە لەوە کە کەسێك شتێك سەردەبڕێ، ئاژەڵێك نێچیرێك سەردەبڕێ، چەقۆیەکەی وا داگرێ، تاکو دەگاتە (بِخاع)، (بِخاع)یش ئەو ڕەگەیە لەلای کرکراگەکانی گەردنە.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴾، واتە: (لأن لا يكونوا مؤمنين) بە هۆی ئەوەوە کە نابنە بڕوادار، واتە: لە داهاتوودا نابنە بڕوادار، بە هۆی ئەوەوە خەریکە خۆت بفەوتێنی.

هەڵبەتە ئەمە لەسەرێکەوە ئامۆژگارییە بۆ پێغەمبەر ﷺ، لەلایەکی دیکەشەوە، مەدح و پەسندی پێغەمبەریشە ﷺ کە ئەوەندە بەپەرۆش و دڵسۆز بووە لەگەڵ خەڵکەکە، خەریک بووە لەداخ و خەفەتی ئەوان، کە بڕوا ناهێنن و خۆیان لەو هیدایەت و بەرەکەتەی خوا بێبەش دەکەن، خۆی بفەوتێنێ لە خەفەتان، هەڵبەتە لە سوورەتی (الكهف)یش دا نزیک لەو تەعبیرەو، لەچەند شوێنێکی دیکەشدا شێوەی ئەوە هاتوە، کە دیارە پێغەمبەر ﷺ زۆر بەپەرۆش و بەزەیی بووە و زۆر خەفەتی خواردوە، زۆر نارەحەت بووە بە هۆی بڕوانەهێنانی خەڵکەکە، بۆیە پێویستی بەوە کردوە خوا ﷻ چەند جار ئاوا ئامۆژگاریی بکات کە: زۆر خۆتیان پێوە نارەحەت مەکە، ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە مرۆڤی مسوڵمان، ئەوانەی کە میراتگرو شوێنکەوتووی پێغەمبەرن ﷺ، دەبێ ئەوانیش وەک پێغەمبەرەکەی خۆیان بن، بەخەم خەڵک و، کۆمەڵگاو، دەورو بەریانەوە بن، خەفەتیان لێ بخۆن، مشووریان لێ بخۆن، پەرۆشیان بن، بەزەییان لەگەڵ بنوێنن، چونکە پێغەمبەر ﷺ وابووە، بۆیە جاری وابووە لەو سیفەتە باشەیدا تێپەڕاندوە، کە بریتیە لە شەفەقەت و بەزەیی و، پێویستیی بەوە کردوە خوا ﷻ ئاگاداری بکاتەوە، کە تێمەپەڕێنەو زۆر خۆت نارەحەت مەکە.

٢)- ﴿ إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً ﴾، ئەگەر بمانەوێ لەسەرێوە نیشانەیەکیان بۆ دادەبەزێنین، وشەی (نُنَزِّلْ ) خوێنراویشەتەوە: (نُنْزِل) هەردوو خوێندنەوەکانیش یەک واتایان هەیە، نیشانەیەکیان بۆ دادەبەزێنین ئەو نیشانەیە، ئەو موعجیزەیە، چی دەکات؟

٣)- ﴿ فَظَلَّتْ أَعْنَـٰقُهُمْ لَهَا خَـٰضِعِينَ ﴾، گەردنەکانیان بە درێژایی ڕۆژ بۆی کەچ دەبن، بۆی زەبوون دەبن، بۆ ئەو نیشانەو موعجیزەیە کە دامانبەزاندوە.

(باتَ) بۆ کاری شەوێ بەکاردێ و، (ظَلَّ) بۆ کاری ڕۆژێ بەکاردێ، یانی: ئەگەر ئەو ئایەتە دابەزێنین، بەدرێژایی ڕۆژێ ملی ئەوانە بۆی کەچ دەبێ و، گەردنیان بۆی زەبوون دەبێ، چونکە نامرازی مەرج (إن الشرطية) کرداری ڕابردوو دەکاتە داهاتوو، کە دەفەرموێ: (إِن)، (إِن)ی (شَرطية)یە، ئەگەر بمانەوێ ئایەتێک دابەزێنین لەسەرێوە بۆیان، یانی: لە داهاتوودا، (فَظَلَّتْ) هەرچەندە ڕابردوە، بەڵام بە هۆی (إِن)ی (شَرطية)وە دەچێتە داهاتوو، لە داهاتوودا ملیان بۆی کەچ دەبێ.

٤)- ﴿ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ ﴾، لەلای خوای خاوەن بەزەییەوە، هیچ زیکرێك (قورئانێك)ی تازەیان بۆ نایەت، (مُحدَثٍ) یانی: (جَدید)، لێرەدا (ذِکر) مەبەست پێی قورئانە، یانی: چەند ئایەتێك، یاخود سوورەتێکی تازەو، بە نسبەت ئەوانەوە تازە پەیدا بوو، قورئان بۆیە ناوی لێنراوە (ذِکر) چونکە ڕاستییەکان بیر خەڵك دەخاتەوە، هەر قورئانێکی تازەیان لەلایەن خوای خاوەن بەزەییەوە بۆ بێ.

٥)- ﴿ إِلَّا كَانُوا عَنْهُ مُعْرِضِينَ ﴾، مەگەر ئەوان پشتی تێدەکەن و، ڕووی لێ وەردەچەرخێنن.

٦)- ﴿ فَقَدْ كَذَّبُوا ﴾، بە دڵنیاییەوە ئەوان بە درۆیان دانا، واتە: ئێستا دەرکەوت ئەوانە پشت هەڵکردنەکەیان، پشت هەڵکردنی بەدرۆ دانانەو بڕوا پێ نەهێنانەیە، نەك سەرنجیان دابێ و بۆیان دەرکەوتبێ کە ناهەقە، ئنجا پێی بێبڕوابن، بەڵکو هەر لە سەرەتاوە پشتیان لێ هەڵکردوەو بڕوایان پێی نەهێناوە، نەك لێی ڕامێنن و سەرنجی بدەن.

٧)- ﴿ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنبَاءُ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، بە دڵنیایی لەمەودوا هەواڵەکانی ئەوەی کە گاڵتەیان پێ دەکرد، بۆیان دێت، (أَنْباءُ) کۆی (نَبَأ)ە، کە بریتیە لە هەواڵدان لە شتێکی مەزن، یانی: لەمەودوا ڕاستیی هەواڵەکانی ئەوەی گاڵتەیان پێ دەکرد، بۆیان دێ، ئەو هەواڵە ڕاستانەیان بۆ دێن و بۆیان دەردەکەوێ: خراپ بە هەڵە داچووبوون.

وشەی (أَعْنَاقُهُمْ) کۆی (عُنُق)ەو، بە مانای (رَقَبة)یە، بە کوردیی دەڵێن: مل، گەردن، ئەستۆ، بەڵام هەندێ لە زانایان گوتوویانە: ﴿ فَظَلَّتْ أَعْنَاقُهُمْ لَهَا

خَٰضِعِينَ ﴿٤﴾، (أَعْنَاقُ) وەك چۆن مانای گەردن و ملی هەیە، بە مانای گەورەی قەومیش دێ، کەواتە: (أَعْنَاقُ) واتە: گەورەکانیان، سەرۆکەکانیان، هەروەها: (عُنُقٌ مِنَ النَّاس، أَي: جَمَاعَةٌ مِنَ النَّاس) (عنق)بە مانای: کۆمەڵە خەڵکێکیش دێ.

بەڵام وەك (الطبري)و زۆربەی توێژەرەوان گوتوویانە: هەر مانای یەکەمیان زیاتر گونجاوە، واتە: ملیان کەچ دەبێ و، گەردنیان زەبوون دەبێ، لە بەرانبەر ئەو نیشانەیەدا کە خوا ﷻ لە ئاسمانەوە بۆیان دایبەزێنێ.

## وەڵامی دوو پرسیار:

یەکەم: بۆچی خوا ﷻ نەیویستوە نیشانەیەکی وا بنێرێ، ملیان بۆی کەچ بێ و، لە بەرانبەریدا تەکان نەخۆن؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: کە خوا ﷻ ئەم ژیانی دنیایەی داناوە، مرۆڤی تێدا تاقی بکاتەوە، ئنجا ئەگەر خوا ﷻ نیشانەیەکی وای بناردایە، ئەو کاتە خەڵك ناچار دەبوون بڕوا بێنن و، بڕواهێنان ئازایەتیی نەدەبوو، واتە: ئەو کاتە دەرچوون لە تاقیکردنەوەکە، دەبوو بە ئیجباریی و، هیچ هەڵبژاردن و سەرپشك بوونی مرۆڤی تێدا نەدەما!

بەڵام خوا ویستوویەتی: ئێمە لەم ژیانی دنیایەدا تاقیبکاتەوەو، کاتێك مرۆڤیش تاقیدەکرێتەوە کە دەرفەتی هەبێ ئاوا بڕوا، یان ئاوا بڕوا، ئاوا وەڵام بداتەوە، یان ئاوا وەڵام بداتەوە، بەڵام ئەو کاتە وەڵامەکە مسۆگەر دەبوو، بۆ وێنە:

ئەگەر خوا ﷻ وەك لەسەر بەنوو ئیسرائیل کێوەکەی ڕاگرتوە، ئاواش شتێکی بەسەر سەری ئەو خەڵکەوە ڕابگرتایە، ئایا بەسەرتان دا بکەوێ، یان بڕوا دەهێنن؟ ئەو کاتە بڕوا هێنانەکە دەبوو بە شتێکی ناچاریی و، ئەو حیکمەتەی

خـوا ﷻ مرۆڤـی بـۆ هێناوەتـە دی، کـە بریتیـە لـە تاقیکرانـەوە، ئـەو حیکمەتـە تێدەچـوو.

دووەم: لەوانەیە یەکێ پرسیارێکی دیکە بکات: ئەدی خوا ﷻ بۆ بەنوو ئیسرائیل بۆچی وایکردوە؟ دەڵێین: لە ڕاستییدا بۆ بەنوو ئیسرائیل کە وایکردوە، بۆ ئەوە نەبووە ئیمان بێنن، چونکە بەنوو ئیسرائیل ئیمانیان هەبووە بەخواو بە مووسا سەلامی خوای لێبێ، بەڵکو بۆ ئەوە بووە پابەند بن، چونکە خوای پەروەردگار کە کتێوەکەشی بەسەرەوە بەرز کردوونەوە، ئەوە نەبووە بفەرمووێ: ئیمان بێنن، بەڵکو فەرموویەتی: ئایا پابەند دەبن یان نا؟ ملکەچ دەبن بۆ شەریعەتێك کە خوا بە مووسادا سەلامی خوای لێبێ ناردوویەتی، یان نا؟ ئەگەرنا بۆ فیرعەون و قەومەکەی خوا ﷻ بەڵێ، چەند موعجیزەی دابوون بە مووسا، کە ئەگەر ئەهلی ئینصاف بان، دەیانزانی ئەوانە نیشانەو بەڵگەن، لەسەر ئەوە کە مووسا ڕاست دەکات، کە لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا، بە تەفصیل باسمان کردوون، کە خوا ﷻ ئاوا دەست پێدەکات:

﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣١﴾ وَقَالُوا۟ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾ الأعـراف.

ئەمانـە حەوتیـان بـە دوای یەکـدا: سـاڵانی گرانیـی، کەمیـی بەروبـووم، تۆفـان، کوللـە، ئەسـپێ، بۆقـەکان، خوێـن، هەروەهـا گۆچانەکـەی مووسـا لەگـەڵ دەسـتی ڕاستیشـی، ئـەوە نـۆ، ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴿١٠١﴾ ﴾ الإسراء، نـۆ بەڵگـەی ڕوون و ئاشـکرامان دابـوون بـە مووسـا، بەڵام ئـەو بەڵگە ڕوون و ئاشـکرایانە، هیچیـان ئـەوە نەبـوون کـە: بـە تۆبزیـی دەبـێ ملکەچ بکـەن، بەڵکـو: فەرمـوون ئەوە

بەڵگەیـەو، ئاشـکرایە، بـە چـاوی سـەر دەیبینـن و بەهەسـتەوەرەکانتان مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکـەن.

بـەڵام دیسـان دەرفەتـی ئـەوە مـاوە، کـە ئینسـان ویسـتی خـۆی بەکاربێنـێ، بـەڵام بـۆ بەنـوو ئیسـرائیل لەبـەر ئـەوەی گوتوویانـە: ئێمـە ئیمانمـان هەیـەو، ئیمانیـان هەبـووە، بـەڵام ناچـار کردنەکـە بـۆ پابەنـد کردنیـان بـووە بـە تەوڕاتـەوە، بـەو شـەریعەتەوە کـە مووسـا ﷺ لـە خـواوە بـۆی هێنـاون، بـۆ ڕێکخسـتنی ژیانـی خێزانیـی و، کۆمەڵایەتیـی و، سیاسـییان.

**مەسەلەی سێیەم:**

**سەرنجڕاكێشانی خوا ﷻ بۆ جۆرە پڕ بەرهەم و، پیزەكانی ڕووەك لە زەویدا، كە نیشانەیەكی مەزنی تێدایە، بۆ هەر كەسێك لە خواناسیی بگەڕێ و بیەوێ خوا پەرست بێ، بەڵام زۆربەیان بڕوادار نین و خواش زاڵی میهرەبانە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿٩﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ ﴾، ئایا بۆ زەوییان نەڕوانیوە، لێرەدا بۆیە (یَرى) بە (إلى) بەركاری ویستوە، ئەگەرنا (یَرى) (یَراهُ) خوا بەركار دەخوازێ و پێویستیی بە (إلى) نیە.

بۆ ئەوەیە كە مانای تەماشا كردن و تێوەڕامان بگەیەنێ، [عُدِّيَ يَرى بـ (إلى) لِتَضْمينه مَعنى النَّظَر المُؤَدِّي إلى الإعْتِبار] بۆ ئەوەی مانای تەماشاكردنێكی گەیەنەر بە عیبرەتی بخرێتە نێو، بۆیە بە (إلى) تەعەددای كردوە، وەك زۆر جاران گوتوومانە: لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە پێی دەگوترێ: (تَضْمين) واتە: خستنە نێو، نێواخنكردن، وشەیەك بۆخۆی واتایەك دەگەیەنێ، بەڵام تەعەددای پێ دەكرێ بۆ بەركار (**مفعول به**) بە پیتێكی دیكە، كە پێویستیی پێی نیە لە حاڵەتی ئاساییدا، بۆ ئەوەی وێڕای مانایەكەی خۆی، مانایەكی دیكەش بگەیەنێ.

لێرەدا (یَرى) هەم مانای دیتن، هەم مانای سەرنجدان و، لێوردبوونەوەو، پەند لێوەرگرتنیش دەگەیەنێ، بە هۆی ئەو (إلى)یەوە كە بەركاری پێ خواستوە.

(دیتن) بریتییە لەبەچاو نەنگاوتنی شتێك، ئنجا چ بە چاو بێ، چ بە خەیاڵ، یان بە فیكر، یان بە عەقڵ، خوا دەفەرموێ: ئایا سەرنجیان نەداوەتە زەوی، لێی ورد نەبوونەوە؟

٢)- ﴿كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾، گەلێك ڕووەكی بەرهەمدارمان تێدا ڕواندووون. (أنبتنا كثيراً فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ كَرِيم) (زوج)یش بەمانای جۆر (نوع) دێ و بەمانای پۆل (صنف) دێ، یانی: زۆر پۆل لە ڕووەكی بەرهەمدارمان لە زەوییدا ڕواندووون.

وشـەی (كَريـم) یانـی: باشـترین لـە جـۆری خـۆی، دەگوتـرێ: (نخلـة كريمـة، أي: فاضلـة كثـيرة الثمـر) واتـە: دارخورمایەكـە بەروبوومـی زۆرە، بەرهەمـی زۆرە.

وشـەی (أَنبتْنا) (نَبَتَـتِ الأرضُ) یاخـود (أَنْبَتَـت الأرضُ) هەردووكیـان چ بـە سـێیانیی (ثُـلاثي) چ بـە چواریـی (رُباعـي) هـەر یـەك واتایـان هەیـە، بـەڵام جـاری وایـە (أَنبـتَ) بـۆ حاڵەتـی (تَعَـدّي)ش بەكاردەهێـنرێ، بـەڵام حاڵەتـی (لازم)یشـی هـەر هەیـە، وەك: (أَنبَتَـتِ الأَرضُ العُشـبَ الكَثـير) یانـی: زەوییەكـە گژوگیایەكـی زۆری ڕوانـد.

٣)- ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانەیەك (ی گەورەو گرنگ) هەیە، واتە: لەو حاڵەتی سەوز كردنی خوا ﷻ بۆ زۆر جۆرە ڕووەكی بەرهەمداری بەپیت و پێز لە زەویدا، نیشانە هەیە، نیشانەیەكی گرنگ و مەزن هەیە، بۆ كەسانێك بخەفتێن لە خواناسیی و، بیانەوێ خواو خاوەنی خۆیان بناسن و بەندایەتیی بۆ بكەن، ئەوە یەكێكە لە نیشانەكان.

٤)- ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾، [لەوەدا نیشانەیەكی گەورە مەزن هەیە]، بەڵام زۆربەیان بڕوادار نین، واتە: خەڵكی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ دەشگونجێ مەبەستی پێ مرۆڤەكان بێ بەگشتیی، زۆربەیان نابنە بڕوادار و بەهرە وەرناگرن لەو نیشانەو بەڵگانەی خوا پێشانی داون.

٥)- ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگاری تۆش هەر ئەوە زاڵی میهرەبان، چونكە (ل)ی (لهو) بۆ تەئكیدە، (إنَّ)ش بۆ جەختكردنەوەیە، واتە: بەدڵنیایی تەنها پەروەردگارت زاڵی میهرەبانە، باڵادەستی بەبەزەییە، بە مانای پڕ بەپێستی وشە، ئەگەرنا خەڵكی دیكەش جۆرێك لە دەستەڵاتی هەیە و جۆرێك لە بەزەیی هەیە، بەڵام مانای تەواوی باڵادەستیی و زاڵیی، هەروەها میهرەبانیی و بەزەیی و پەرۆش، بە مانای تەواوی وشە، تەنیا لەلای خوای پەروەردگارە.

## کورتە باسێک لە بارەی ڕووەکەوە لە شەش بڕگەدا[1]

ڕووەك (نبات) هەر شتێکە کە بڕوێ لەسەر زەویی، هەر لە پنجە گیایەکی بچووکەوە، کە ڕەنگە بە ئاستەم بەچاو ببینرێ، هەتاکو هەموو ئەو درەختە گەورانەی کە هەڵدەچن، کە درەختی وا هەیە گوریسێك لە قەدەکەی ناگاتەوە، من لە هەندێ لە وڵاتان بینیومە، هەندێ درەخت هەن کە تەمەنیان چەند هەزار ساڵ دەبێ، بەڵکو دەڵێن: لە میسر دارخورمای لێن، تەمەنیان شەش هەزار (٦٠٠٠) ساڵە، واتە: هی پێش فیرعەونەکانیش، ئێستاش بەر دەگرن، ئەگەر تەماشای جیهانی ڕووەك بکەین، جیهانێکی زۆر قەرەباڵغە، زۆر جۆراو جۆرە، با سەرنج بدەین:

### ا)- سوودەکانی ڕووەك:

ئێمە سێزدە (١٣) سوودی ڕووەکمان باسکردوون:

**یەکەم:** لە سوودەکانی ڕووەك، کە دەکەوێتە بەرچاومان، ئەوەیە کە دارو درەختێکی زۆر هەیە خوا ﷻ بۆ ئەوە دروستی کردوون، دنیا سەوز بکەن، کاتێك ئینسان تەماشای دارستانێك دەکات، ڕەنگە هیچی بەردار نەبێ، بەڵام هەمووی سەوز دەچێتەوە، دیمەنی سەر زەوی زۆر جوان دەکات.

زانایانی شارەزای ڕەنگەکان دەڵێن: باشترین ڕەنگ بۆ دڵ پشکوتنی مرۆڤ، ئەگەر خەم و خەفەتێکی هەبێ، بریتیە لە ڕەنگی سەوز، هەروەها ڕەنگی

---

(١) ئەم کورتە باسە ڕاستەوخۆ لە تەفسیرەکەی (د. محمد راتب النابلسي)دوە ودری دەگرین، ج٦ ص ٢٩٨ - ٣٠٠. هەڵبەتە ئەو بە تێکەڵیی گوتوویەتی، بەڵام من خاڵبەندیی دەکەم و، تۆزێ ڕوون کردنەوەی خۆشمی لەسەر دەدەم.

شـین، ئنجـا خـوا ﷻ ڕەنگـی شـینی زۆر کـردوە، ئـەو گومـەزەی ئاسـمان کـە بەسـەری داداویـن، هەمـووی شـین دەچـێ، شـینی ئاسـمانیی، هەروەهـا ڕەنگـی دەریاکانیـش کـە سـێ لەسـەر چـواری پانتایـی زەوی دادەپۆشـن، ئەویـش هـەر شـین دەچـێ، ئـەو دوو جـۆرە ڕەنگـەش زانایانـی شـارەزای ڕەنگـەکان دەڵێـن: زۆر ئاسـوودەیی بـە ئینسـان دەبەخشـن، ئـەوە یەکـەم حیکمەتـی سـەوزاییە کـە خـوای پـەروەردگار لەسـەر زەوی دایـناوە.

**دووەم:** شتێکی ئاشکرایە کە ئێمەی مرۆڤ، هەروەها ژیانداران بە گشتیی بە ئاژەڵ و، دڕندەو پەڕەورو ... هتدەوە، ئۆکسجین هەڵدەمژین کە لە (٢١٪)ی بەرگە هەوای زەوی، ئۆکسجین پێکی دێنێ، ئێمە هەمووماں ئۆکسجین هەڵدەمژین، کە ملیۆنان ساڵە ئاژەڵ و ژیانداران لەسەر زەوی دەژین، ئۆکسجین بۆچی هەر تەواو نەبوو؟

چونکـە دارو درەختـەکان هەمووـیان بەبـێ هـەڵاواردن، ئۆکسـجینمان بـۆ بەرهـەم دێنـن، ئـەو دووەم ئۆکسـیدی کاربۆنـەش کـە ئێمـە دەیدەینـەوە، وەك زبـڵ و زاڵ و پاشـەڕۆکێك وایـە، کـە لـە ڕێگـەی هەناسـە دانـەوە فڕێـی دەدەیـن، دەبێتـە خۆراکـی ڕووەکـەکان، ئـەوەی خۆراکـی ئەوانـە، پاشـەڕۆکی ئێمەیـە، کە لـە ڕێگەی سـییەکانەوە فڕێـی دەدەینـە دەرو، ئـەوەش کـە ئـەوان وەك پاشـەڕۆك فڕێـی دەدەنـە دەرێ کـە ئۆکسـجینە، خۆراکـی ئێمەیـە[1].

**سێیەم:** سوودێکی دیکەی ڕووەکەکان بە گشتیی، بە تایبەتی درەختەکان ئەوەیە کە سێبەریان هەیە و مرۆڤ لە سێبەریاندا پشوو دەدات، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێ: **{مَا أَنَا وَالدُّنْيَا! إِنَّمَا أَنَا فِي الدُّنْيَا، كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا} (أخرجه أحمد: ٣٧٠٩، والترمذي: ٢٣٧٧، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٤١٠٩).**

واتـە: مـن و دنیایـان نەگوتـوە! مـن لـە ژیانـی دنیـادا هـەروەك ڕێبوارێکـم کـە لـە سـێبەری درەختێـك دا پشـوو دەدا، دوایـی دەڕواو بەجێـی دێڵـێ.

---

(١) ئەم خاڵە (د. محمد راتب النابلسي) باسی نەکردوە.

لە ڕاستیدا کەسێك قەدری سێبەر دەزانێ کە لە بیابانێك، لە شوێنێکی وشك و قاقڕو دێمەکار، لە شوێنێك کە خۆرەتاوێکی زۆر گەرم بێ، لێی بقەومێ، خوا خوای پەنایەکیەتی، تۆزێك سێبەرێکی لێ بکات! کە دارو درەختەکان ئەو ڕۆڵە دەبینن، سێبەری دارو درەختەکانیش وەك سێبەری ئەشکەوت و کەپرو سابات نیە، چونکە وێڕای ئەوە کە سێبەرە، ئۆکسجینیش دەدەنەوە، بۆیە ئینسان لە کاتێك دا لە ژێر سێبەری دارو درەختێك دادەنیشێ، هەست بە ئاسوودەیی دەکات، چونکە ئۆکسجینی بۆ بەرهەم دێنێ و، هەناسەی خۆشتر بۆ دەدرێ.

**چوارەم**(١): سوودێکی دیکەی ڕووەکەکان ئەوەیە، کە ئەو ڕووەك و دارو درەختانە: هەم گڵی زەوی، هەم گڵی چیاکان دەپارێزن لە داڕووخان، ئەگەرنا کە باران و بەفرو تەرزە، بەلێزمە لە گڵ دەدات، بە تایبەت گڵی چیاکان و گردۆلکەو تەپۆلکەکان، هەمووی دادەشۆرا، بەڵام ئەو ڕووەکانە چ ڕووەکی بچووك، گیاو پنجە گیا، چ گیای گەورەو گچکە و درەختەکان، بە ڕەگ و ڕیشەکانیان توێژی سەر زەوی ڕاگیر دەکەن، کە دانەڕووشێ و، ئەو گڵەی لێ دانەشۆرێ.

**پێنجەم**: سوودێکی دیکەی ڕووەکەکان، ئەوەیە کە جوانیی بە گۆی زەوی دەبەخشن، پێشتر باسی ڕەنگم کرد، بەڵام هەر لەڕووی جوانییشەوە وان، ئنجا مەرج نیە هەر گیایەکان، جاری وا هەیە پەڵە گەنمێك پەڵە جۆیەك، پەڵە مەرەزەیەك، پەڵە هەرزنێك، یاخود پەڵە گەنمە شامییەك، ئینسان کە تەماشای دەکات، چاو لە جوانییەکەی تێر نابێ، یاخود دارو دەرەختێك، بۆ وێنە: شۆڕەبی، یاخود ئەسپیندارو چنار، داربەڕوو، دارەبەنی چیاو گردەکانی کە لەدەرێ هەن، جوانییش یەکێکە لە بەرهەمەکانی ڕووەکەکان.

**شەشەم**: سوودێکی دیکەی هەندێ لە جۆرەکانی ڕووەك، ئەوەیە کە لە میوەکەیان دەخۆین، میوەکانیان زۆر جۆرن: سێوە، خۆخە، هەرمێیە، هەنارە، ترێیە، هەنجیرە، ... هتد، ئنجا ئەوانەی کە لە چیاو کێون بۆ وێنە: بەڕوویە، چەقالەیە، کرۆسکە، ...هتد،

---

(١) ئەم خاڵەشیان (نابلسي) باسی نەکردوە، بەڵام من هاتە زەینم.

هەر کەسە لە وڵاتی خۆیدا، بەڵام لە وڵاتان، هەر شوێنێك و ڕووەکی تایبەتی خۆی لێیە، میوەی تایبەتی خۆی لێیە، کە لەگەڵ هەواو کەشی ئەوێدا گونجاوە.

**حەوتەم:** سوودێکی دیکەی درەختەکان، بە تایبەت درەختە گەورەکان ئەوەیە: سوود لە تەختەو دارەکەیان دەبینرێ، ئنجا تەختەکانیش بەپێی جۆری درەختەکان دەگۆڕدرێن، تەختەی کەنەدیی هەیە بۆ دروستکردنی پەنجەران، تەختەی (زان) هەیە بۆ دروستکردنی کەل و پەل، زۆر جۆرە درەخت هەیە کە دارو تەختەی جۆراوجۆریان، لێ جیادەکرێتەوە.

**هەشتەم:** سوودێکی دیکەی ڕووەك بەگشتیی و بەتایبەت دارودرەختە گەورەو قەبەکان، ئەوەیە کە، بۆ سووتەمەنیی بەکاردێن، لە کۆن دا زیاتر و ئێستاش کەم و زۆر هەر بەهرەیان لێوەردەگیرێ[1].

**نۆیەم:** درەخت هەن کە زۆر نەرمن، لەگەڵ نەرمیشدا زۆر پتەون، بۆ وێنە: بابای ئاسنگەر کۆلکێك لە درەختی توو، دەیخاتە ژێر سندانەکەی، کە بەچەکوش دوایی بیەوێ ئاسنێك نەرم بکات، چونکە درەختی توو ڕیشاڵەکانی زۆر پتەون و نەرمیشن، ئەو چەکوشە کە بەهێز لە ئاسنەکە دەدا، فشارەکەی دەمژێ و دەستی ئازاری پێناگات، بەڵام ئەگەر لەسەر شتێکی ڕەق بێ، هەڵدەبەزێتەوە.

**دەیەم:** بەشێك لە ڕووەکەکان دڕکیان هەیە، کە ئەوانە زانایانی ڕووەکناس پێیان دەڵێن: ڕووەکە سنوورییەکان، دڕکیان هەیە، ئنجا سبحان الله! هەندێك لە ژیانداران، هەندێك لە ئاژەڵان تەنیا ئەوە دەخۆن، حوشترخۆرکە هەیە لەلای ئێمە، هەروەها زۆر ڕووەکی دڕکاویی دیکە هەیە لە بیابان دەڕوێ، کە حوشتر ئەوانە دەخوات و، باشترین ئاڵف و ئالیکە بۆ حوشتر.

**یازدەیەم:** هەندێك ڕووەك هەن (لفکە) یان لێ دروست دەکرێ، بۆ ئەوەی خۆمانی پێ پاك بکەینەوە.

---

(١) ئەمیش (النابلسي) باسی نەکردوە.

**دوازدە:** هەندێك ڕووەك هەن سیواكیان لێ دروست دەكرێ، بۆ ئەوەی ددانی خۆمانی پێ پاك بكەینەوە، ئەو درەختانەی كە ڕیشاڵیان هەیە، زۆربەی خەڵك وا دەزانێ سیواك دەبێ بەس لە داری ئەڕاك دروست بكرێ، بەڵام نەخێر داری تووش ڕیشاڵی هەیە، ئەو درەختانەی كە ڕیشاڵیان هەیە، دەگونجێ سیواكیان لێ دروست بكرێ.

**سێزدە:** هەندێ لە بەرهەمی ڕووەكەكان، یاخود ڕووەكەكان خۆیان، بێ ئەوەی بەرو میوەكەشیان بێ، بەكاردەهێترێن بۆ چارەسەری نەخۆشیی گورچیلە، بەردی گورچیلە لادەبەن، یاخود لم (رَمْل)ی گورچیلە ناهێڵن و گورچیلە پاك دەكەنەوە.

## ٢) جۆری ڕووەكەكان

بیست و یەك (٢١) جۆری ڕووەكیشمان باسكردووە:

**یەك:** جۆریان هەیە لە زەویدا پاڵدەخرێن، وەك: كاڵەك و، شووتیی هەروەها هارووێ (خیار)و ترۆزیی و، كدوو و كوولەكە...

**دوو:** هەندێ لە ڕووەكەكان خۆیان هەڵدەواسن وەك: لاولاو.

**سێ:** هەندێكی دیكە خۆیان لەشت دەئاڵێنن.

**چوار:** ڕووەك هەیە زۆر باڵایان بەرزە، وەك سپیندارو، چنارو، دارەبەن و، سنەوبەرو، دارخورما، بەرز هەڵدەچن.

**پێنج:** هەندێ ڕووەكی دیكە هەن، ڕووەكی زەمینیین، وەك: تووفەڕەنگیی و مۆزو گەنمەشامیی (گوڵەدان) ئەوانە كە زۆر بەرز نابنەوە.

**شەش:** هەندێ ڕووەك هەن كە لەژێر زەوی میوەمان بۆ دەردەكەن، بەرهەممان بۆ دەدەن، وەك كارگ و دومەڵان و پەتاتەو گڕگاز...

**حەوت:** هەندێ ڕووەك هەن لە ڕووی نرخەوە گرانن، بەڵام هەندێكی دیكە هەن هەرزانن.

**هەشت:** هەندێ ڕووەك هەن ئێمە ڕەنگەكانیان لێوەردەگرین، ئەو ڕەنگانەی وەردەگیرێن هەموویان لە ڕووەكان وەردەگیرێن، لە خودی ڕووەكەكە.

**نۆ:** هەندێ ڕووەك هەن، بەكاردەهێترێن بۆ دەرمان، چەندان جۆرە دەرمان.

**دە:** هەندێ ڕووەك هەن، ئێمە ڕۆنیان لێ وەردەگرین، وەك درەختی زەیتوون، گوڵەبەڕۆژە، كونجیی.

**یازدە:** هەندێ ڕووەك هەن، بۆ دەفرو قاپ و قاچاغ بەكاردەهێنرێن، دیارە لە وڵاتی ئێمە كەمتر بەكار دێن، بەڵام لەزۆر وڵاتان لە: ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، لە ئەفریقیا، بۆ وێنە: لە گوێزی هیندیی قاوغەكەی، بەكار دێنن.

**دوازدە:** هەندێك ڕووەك هەن كە لە قەدەكەی وەك: خۆراك بەهرە وەردەگیرێ.

**سێزدە:** هەندێكی دیكە هەن لە گەڵاكانیانەوە، بۆ خۆراك بەهرە وەردەگیرێ.

**چواردە:** هەندێ ڕووەكی دیكە هەن، لە گوڵەكەیان بەهرە وەردەگیرێ، وەك، گوڵەباغ، كە بۆ چا بەكار دەهێنرێ، هەروەها نێرگز و گوڵە حاجیلە، هەروەها زۆر جۆرە دەرمان لە گوڵی هەندێ لە درەختەكان دروست دەكرێ، یان زۆر جۆرە خۆراك.

**پازدە:** هەندێ ڕووەك هەن، كە لە میوەكەیان بەهرە وەردەگیرێ.

**شازدە:** هەندێ ڕووەك هەن، كە لە ڕەگ و ڕیشەكەیان، خۆراك یاخود دەرمان وەردەگیرێ، بۆ وێنە: توورو، سیرو، پیاز.

**حەڤدە:** هەندێ ڕووەك هەن، كە بەرهەمەكانیان دادەكرێ و هەڵدەگیرێ، وەك گەنم و، جۆو، نیسك و، نۆك و، برنج و، هەرزن، بەڵام هەیانە كە نەخێر ناگونجێ هەڵبگیرێ، بۆ وێنە: ترۆزیی و خەیارو شووتیی، لە كوێ هەڵدەگیرێ، هەروەها بامیەو تەماتەو باینجان، مەگەر بە مەبەستی پاشەكەوت كردن وشك بكرێنەوە.

**هەژدە:** هەندێ ڕووەك هەن، لەیەك كاتدا پێدەگا، وەك: گەنم و جۆو، نیسك و، نۆك و، برنج و، مەرزەو، هەرزن.

کـە بـەوە چاکـە خـوا ﷻ وای خولّقانـدوون لەیـەک کاتـدا پێبگـەن، ئەگەرنـا پەڵـە گەنمێـك، یـان پەڵـە جۆیـەك، یـان پەڵـە هەرزنێـك، پەڵـە زوڕاتێـك، هەندێـكی ئێسـتا پـێ بـگات و، هەندێکـی دوای مانگێـك و، هەندێـك و دوای دوو مانگـی دیکـە، خاوەنەکـەی چۆنـی درەو بـکات و چـۆن لێـی بەهرەمەنـد بـێ؟ بـەڵام پەڵـە گەنمەکـە هەمـووی پێکـەوە پێـدەگات، بەڵـێ، ڕەنگـە هەندێکـی چەنـد ڕۆژێکـی بەیـن بـێ، بـەڵام هەمووی پێکـەوە پێـدەگا، جۆیـە، نیسـك و نۆکـە، زوڕاتـە، هەمـووی پێکـەوە پێـدەگات.

بـەڵام دەبینیـن: میـوە، مـاوە مـاوە پێـدەگات، بـۆ وێنـە: دەرەختـی هەنجیـر هەیـە، ساڵی دوو سـێ جـار بـەر دەدا، هەروەهـا تـەڕەکار، بـۆ وێنـە: کاڵـەك هەیـە، شـووتی هەیـە، ترۆزیـی هەیـە، خەیـار هەیـە، نـەك هەمـووی بەیەکجـار بـەر بـدات، هەرمـێ و خـۆخ، سـاڵی وا هەیـە چەنـد جارێـك بـەردەدەن، تـرێ سـاڵی وا هەیـە چەنـد جارێـك بـەردەدا، هەروەهـا میوەکانـی دیکـە، بۆچـی؟ چونکـە ئەگـەر هەمـووی بەیەکـەوە پـێ بـگات، خاوەنەکـەی چـی لـێ بـکات؟ هەندێکـی ئێسـتا پێـدەگات، هەندێکـی دوای دە (١٠) ڕۆژی دیکـە، هەندێکـی دوای مانگێـك، هەندێکـی دوای دوو مانگـی دیکـە.

**نۆزدە:** هەندێ ڕووەکی دیکە هەن، زۆر بە تەمەنن، هەندێکی دیکەیان هەن کەم تەمەنن، بۆ وێنە: لە دەرەختە بە تەمەنەکان دارخورما، هەڵبەتە دارخورماش جۆری زۆرە، ڕەنگە هەزاران جۆری هەبێ، هەر لەم عێراقەی خۆمان لە خەڵکی شارەزام بیستوە هەشت سەد (٨٠٠) جۆری دارخورما هەیە، بەڵکو ڕەنگە زیاتریش هەبێ، هەرکەسە بەپێی شارەزایی خۆی قسان دەکات، بەڵام دارخورما بەگشتیی تەمەنی زۆر زۆرە، هەندێك جار شەش هەزار (٦٠٠٠) ساڵ لە تەمەنەکەی تێدەپەڕێ.

(محمـد راتـب النابلـسي) دەڵـێ: هەندێـك دار خورمـا، هـی سـەردەمی فیرعەونەکانن و ئێسـتاش هەموو سـاڵێك بـەردەدا.

**بیست:** سەدان و، بگرە هەزاران جۆرە گوڵ هەیە، هەر گوڵە ڕەنگێکی هەیە، هەر کامێکیان سروشتێکی تایبەتیی هەیە، هەر کامێکیان بە جۆرێکی تایبەت بەهرەی لێ وەردەگیرێ.

بیست و یەك: ڕووەك هەیە پێویستیی بە تیشکی خۆرە، ڕووەکی دیکە هەیە تەنیا پێویستیی بە هەوایە، هەوای بۆ بچێ بەسیەتی، ڕووەکی دیکە هەیە پێویستی بە سێبەرە، ئەوانەی کە لە خانووە پلاستیکییەکاندا بەخێو دەکرێن، ڕووەکی دیکە هەیە پێویستی بە ئاوی زۆرە، بەڵام ڕووەکی دیکە هەیە پێویستی بە ئاوی کەمە، ئاوی زۆری بدەیە، زەرەری لێ دەدا، بە تایبەتی ئەو ڕووەکانەی کە لە چیاو بەندەنەکان هەن، دارەبەن و، دار گوێنیی و دار مازو و، دار بەڕو و، ئەوانە پێویستییان بە ئاوی کەمە، چونکە شوێنەکەیان وایە، خوای پەروەردگار توانایەکی وای داونێ، بە ئاوێکی کەم قەناعەت بکەن، وەك دار بی و چنارو سپیندارنین، کە لەسەر قەراغی ڕووبارەکان دەڕوێن و، هەموو دەمێ ئاویان دەست دەکەوێ.

### ٣) جوگرافیای ڕووەکەکان:

ڕووەکەکان هەیانە پێویستیی بە شوێنی بەرزو سارد هەیە، هەندێ لە ڕووەکەکان هەن بۆ وێنە: سنەوبەرو داربەڕوو و دارەبەن و، مازو و، ئەوانە پێویستییان بە شوێنی سارد هەیە، هەروەها گوێنیی، کە درەختێکی بچووکە، هەیانە پێویستی بەشوێنی نە سارد نە گەرم هەیە، میانجیی، هەشیانە ڕووەکی هێڵی یەکسانیین و پێویستییان بە شوێنی گەرم هەیە، هەر ڕووەکە جۆرە سروشتێکی هەیەو، بەگوێرەی سروشتەکەی ژینگەو شوێنێك و دۆخێکی تایبەت دەخوازێ.

### ٤) جووتێتیی لە ڕووەك دا:

دێینە سەر باسی حاڵەتی جووتیەتیی لە ڕووەکەکان دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾الذاریات، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنْفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾یس!

جاران وایاندەزانی: تەنیا هەندێ لە ڕووەکەکان نێرو مێیان هەیە، بۆ وێنە دارخورما، ئەوە دیارە نێرەو مێیەی هەیە، دەبێ تۆوی نێرەکە ببەی بۆ سەر مێیەکە، هەندێ ڕووەکی دیکەش دەیانزانی، نێرو مێی هەیە، بەڵام ئێستا زانست دەری خستوە، ئەوەی کە خوا دەفەرموێ: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾یس، واتە: پاکی بۆ ئەو خوایەی کە هەموو جووتەکانی دروستکردوون، لەوەی کە زەوی دەیڕوێنێ (هەرچی زەوی دەیڕوێنێ جووتی تێدایە) لە خۆشیان (نێرو مێیان هەیە، پیاوو ئافرەت)و لەوەی کە ناشیزانن.

ئەو کاتە نەیانزانیوە کە ماددەش لە بارگەی موجیب و سالیب پێك دێت: نێوك لە پرۆتۆن و نیوترۆن پێکدێ، کە پرۆتۆن بارگەیەکی موجیبی هەیەو نیوترۆن بێ لایەنە، ساردو گەرمی نیە، ئەلیکترۆن کە لەدەوری سورگەی گەردیلە دەخولێتەوە، بارگەیەکی سالیبی هەیە، کەواتە: لەوێشدا ساردو گەرم، یان نێرو مێ، یان پێچەوانەی یەکدی هەن، دەگونجێ ئەمە ئاماژە بەوە بێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، ئەوکاتە نەیانزانیوە.

دەشگونجێ ئەوە پەیوەندیی بە هەندێ شتی دیکەشەوە بێ، کە تاکو ئێستا زانست بۆی ئاشکرا نەبووەو بۆی دەرنەکەوتوە، ئێستا دەرکەوتوە کە لە هەموو ڕووەکێکدا نێرو مێ هەیە، ئنجا هەیە نێرو مێیەکەی جیان وەك دارخورماو، هەیە نێرو مێیەکەی لەنێو خۆیدایەو، پێویستیی بە هەنگ و پەپوولەو باو مرۆڤ ناکات، تۆوی نێرەکە بەرێ بۆ مێیەکە، بۆ خۆی لە نێو خۆیدایە.

٥) بەرنامە داربوونی ڕووەك (برمجة البنات):

ئنجا ئەگەر لە ڕوویەکی دیکەوە سەرنجی ڕووەکەکان بدەین، ئەویش بریتیە لەو بەرنامەو پرۆگرامەی کە لە نێو ڕووەکدا دانراوە، کە بە عەرەبیی (برمجة)ی پێ دەڵێن، ئەگەر تەماشا بکەین:

ئینسان دەنکە تۆیەك دەڕوێنێ، ئەو دەنکە تۆوە دەبێتە درەختێك، ئەو دەنکە تۆوە دیارە بەرمەجە کراوە، بەرنامەی بۆ دانراوە، کە دەتوانێ دوایی ببێتە درەختێك، زۆر گەورە بێ و بەرز هەڵبچێ، بەتەئکید لەنێو ئەو دەنکە تۆوەدا ئەو بەرنامەیە دانراوە.

ئنجا ئەوانەی کە سەریان بۆ ئیلحادو بێ دینیی دەخورێ دەڵێن: پێویست ناکات دەستی خوا بهێنرێتە نێو بابەتەکەوە: ئەو دەنکە تۆوە هی هەر شتێکە، بۆ وێنە: خۆخە، هەرمێیە، دارخورمایە، هەرچی هەیە، لەنێو خۆیدا ئەو تۆوە، بەرنامەکەی تێدایەو جێبەجێ دەبێ.

بەڵام ئەوە بەوێنەیەك ڕوون دەبێتەوە: ئەگەر تۆ باڵە خانەیەکی گەورە بێنی، لەسەر کاغەز ئەندازیار نەخشەی ئەو باڵەخانەیە بکێشێ، نەخشەی ئەو باڵەخانەیە، لە چەند قاتێك پێك دێت، لەچەند بەشێك پێك دێت، باڵەخانەیەکی فەبەو گەورە، چەند ئەندازیارێك چەند ڕۆژێك خەریك دەبن بۆ نەخشەی ئەو باڵەخانەیە، ئایا لەخۆوە دەبێتە باڵەخانە؟ نەخێر!

گریمان هەرچی کەرەستەی بۆ دروست کردنی ئەو باڵەخانەیە پێویستە، لە چەوو چیمەنتۆو، لم و، ئاوو، خشتی سوورو، شیلمان و، ئاسن و، دەرگاو، پەنجەرەو، هەرچی پێویستە لەوێی دانێ، ئایا لەخۆوە دەبێتە باڵەخانە؟! نەخێر، گریمان کۆمەڵێك وەستاو کرێکاریش هاتن لەوێ ڕاوەستان، ئایا لەخۆوە دەبێتە باڵەخانە؟ نەخێر، ئەدی کەی دەبێتێ؟ دەبێ بەپێی ئەو نەخشەیە کە دانراوە،

ئەندازیارەکان بێن، وەستایەکان بێن، وەستایەکان بە کرێکارەکان بڵێن: کەرەستە خاوەکە بێنن، هەر کامێکی بە ئەندازەی خۆی، بەرێژەی خۆی، بەکاربهێنرێ، لە شوێنی خۆیدا دابنرێ، چەند شەوو ڕۆژان، چەند مانگان، جاری وایە چەند ساڵان، خەریك بن، ئنجا ئەو باڵەخانەیە دروست دەبێ، بەڵێ: بەرنامەکە هەیە لەسەر کاغەزەکە، بەڵام کەی دەبێتە واقیعێك؟ دەبێ کۆمەڵێك دەستە لە ئەندازیاران و وەستای شارەزاو کارامە، کرێکاری چاپووك و گورج و گۆڵ بێن دەست بەکاربن، ئنجا لە دنیای واقیعدا ئەوە دێتە دی، کەواتە: ئەو درەختەش بەڵێ: خوا بەرنامەی بۆ داناوە، بەڵام دەستی خوا لەمیانی سیستم و یاساکانیدا کار دەکات، ئەگەرنا لەخۆوە ئەو دەنکە تۆوە بچووکە نابێتە ئەو درەختە گەورە لە دنیای واقیعدا.

کەواتە: مەسەلەکە دەگەڕێتەوە سەر ئامادەیی، ئامادەییەك کە لە ڕووەکاندا دروستکراوە، ئەو تواناو ئامادەیی و شایستەییە، بۆ وێنە: دەنکە فاسۆلیایەك لە نێو لۆکەدا دابنرێ، دوای چەند ڕۆژێك دەبینی چەکەرە دەدات و دەبێتە دوو بەش، بەشێکی بەرەو خوار دەچێ، وەك ڕەگ و ڕیشە، بەشێکی بەرەو سەر دەچێ وەك چەکەرە، بەڵام ئەوە خوا ﷻ لەوێدا بەرنامەی بۆ داناوەو سروشتەکەشی وا هەڵخستوە، کە لەو شوێنە کە ژینگەیەکی لەبارو گونجاوی بۆ هەڵکەوت، بتوانێ گەشە بکات، ئەگەرنا دەنکە فاسۆلیایەك لەسەر بەردێکی ڕەقدا دانێ، یان بیکە نێو ئم، هەرگیز سەوز نابێ.

جاری وا هەیە دەنکە تۆویەکی هەنجیر کە بە ئەندازەی سەری دەمبووسێکە، دەبێتە درەختێکی گەورە، چونکە ئەوەی کە لە نێو هەنجیر دایە، تۆوەکەی، بە ئەندازەی دەمبووسێکە، ئەوەیە کە دوایی دەبێتە درەخت، هەمووی وەك ئەمام (شتل) ناڕوێ.

دکتور موحەممەد ڕاتب نابلسیی دەڵێ: بەچاوی خۆم دەنکە گەنمی وا هەیە بینیومە، یەك دەنکە گەنم سێ هەزار (٣٠٠٠) دەنکی لێ پەیدابووە، یەك

دەنکە گەنم سی و پێنج (٣٥) گوڵە گەنمی دەرکردوە، هەر گوڵە گەنمەی، هەشتا تاکو نەوەد دەنکی تێدا بووە، ئنجا سی و پێنج جارانی (٨٠ - ٩٠) بکە دەکاتە نیزیکەی سێ هەزار (٣٠٠٠) لەیەك دەنکە گەنم!

## ٦)- پێداویستییەکانی جەستەی مرۆڤ لە ڕووەك دا:

خوا ﷻ هەموو ئەو شتانەی کە جەستەی مرۆڤ پێویستنی، لە پرۆتینات و نەشەویات و کاربۆهیدرات و ڤیتامینات و کانزاکان و چەورییەکان، هەرچی جەستەی مرۆڤ پێویستیەتی، خوا ﷻ لە نێو ئەو شتانەدا کە لە زەوی دا بەرهەم دەهێنرێن، مەبەستم ئاژەڵ و پەڕەورو ئەوانە نیە و هەر باسی ڕووەك دەکەم، چونکە هەندێك کەس هەیە ڕووەك خۆرە، ڕووەکیی (نباتي)یان پێ دەڵێن و بەلای ئاژەڵدا هەرناچن، هەندێ لە هیندۆسەکان و هەندێ لە خەڵکانی ئەورووپا هەر عەقیدەیان وایە، بەلای هیچ پەڕەورو ئاژەڵێك دا ناچن، نەزیندەرەوەر، نە هی دەریا نە هی وشکانیی، بەلایدا ناچن، بەس ڕووەك خۆرن، ئنجا هەرچی جەستەی مرۆڤ پێویستیی پێیەتی، خوا ﷻ لەنێو ئەو ڕووەکانەدا داناوە.

ڕەنگە هەندێ کەس وا بیر بکاتەوە بڵێ: بەهەموو جۆرە ڕووەکەکان، پێداویستییەکانی جەستەی مرۆڤیان تێدایە.

بەڵام وانیە، بەڵکو زۆربەی بەرهەمی ڕووەکەکان، زۆربەی پێداویستییەکان دابین دەکەن، بۆ وێنە: گەنم و جۆ تەماشا بکەن، هەروەها نیسك و نۆك، هەر کامێکیان کۆمەڵێك پێداویستیی زۆری تێدان، هەروەها خورما، خورما دەڵێن کارگەیەکە بۆخۆی، خەزنەیەکە بۆخۆی، ئەوەندەی پێداویستییەکانی مرۆڤی تێدا هەن، هەروەها ترێ دەڵێن: دەرمانخانەیەکە بۆخۆی، دیسان هەنجیر دەڵێن: مرۆڤ بە تەنیا پێی دەژی.

بەڵـی پێداویسـتییەکانی جەسـتەی مـرۆڤ، خـوای پـەروەردگار خسـتوونیە نێـو زۆر لـە میـوەکان و، زۆر لـە بەرهەمـی ڕووەکـەکان، نـەك هـەر میـوە، ڕووەکـەکان و گیایەکانیـش.

چونکـە ئـەو خوایـەی ﷻ جەسـتەی مرۆڤەکانـی خوڵقانـدوە، زانیویەتـی پێویسـتییان بەچـی هەیـە، هـەر ئەویـش ڕووەکەکانـی خوڵقانـدوون، ئـەو ڕووەکانـە، ئـەو میوانـە، ئـەو درەختانـە، کـە دەڕوێـن لەسـەر زەوی، وەڵامگـۆی پێداویسـتییەکانی جەسـتەی مرۆڤـن، بەڵکـو هـی جەسـتەی ئاژەڵەکانیـش، بـا ئێمـە بـەس خۆمـان نەبینیـن، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ۝٧ ﴾الشعراء، واتـە: ئایـا تەماشـای زەوییـان نەکـردوە چەنـد جـۆرە ڕووەکـی بەپیـت و پێزمـان تێـدا ڕوانـدوون ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ۝٨ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ۝٩ ﴾ الشـعراء.

خـوا بـە لوتـف و کەڕەمـی خـۆی یارمەتیـمان بـدات نیشـانەکانی خـوا ببینیـن، لـە خۆمـان و، دەوروبەرمـان و، لـە گەردوونـدا، تاکـو ئـەوەی کـە لەسـەرمان پێویسـتە، وەك ئەرکـی بەندایەتیـی بـۆ خـوا جێبەجێـی بکەیـن، بـۆ ئـەوەی لەدنیـاو دواڕۆژدا سـەربەرزو سـەرفراز بیـن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە پەنجاونـۆ (٥٩) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتەکانـی: (١٠ - ٦٨) لـەو پەنجـاو نـۆ ئایەتـەدا، خـوای زانـاو شـارەزا بەسـەرهاتی مووسـاو هارِوونـی بـرای (علیهـما السـلام) و، گەلەکەیـان بەنـی ئیسـرائیل لەگەڵ فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی و، گەلەکەیـدا دەگێڕێتـەوە.

شـایانی باسـە ئـەم پەنجـاو نـۆ ئایەتـە، نێوەرۆکەکەیـان دەشـوبهێتە نێوەرۆکـی ئـەو سـی و پێنـج (٣٥) ئایەتـەی سـوورەتی (الأعـراف) (١٠٣ - ١٣٧)، کـە پێشـتر لـە بەرگـی شەشـەمی ئـەم تەفسیرەدا قسـەمان لەبـارەوە کـردوون و شـیمان کردوونـەوە.

هەروەهـا دەشـوبهێتە نێوەرۆکـی سی و پێنـج (٣٥) ئایەتەکـەی سـوورەتی (طـه) (٤٢ - ٧٦)، کـە پێشـتر ئەوانیشـمان تەفسـیر کـردوون.

﴿ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِى وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَـٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّا ۖ فَٱذْهَبَا بِـَٔايَـٰتِنَآ ۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ

(٢٥) قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ (٢٦) قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ
(٢٧) قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ (٢٨) قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا
غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ (٢٩) قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ (٣٠) قَالَ فَأْتِ
بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ (٣١) فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ (٣٢) وَنَزَعَ يَدَهُۥ
فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ (٣٣) قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ (٣٤) يُرِيدُ أَن
يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ (٣٥) قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى
ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ (٣٦) يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ (٣٧) فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ
يَوْمٍ مَّعْلُومٍ (٣٨) وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ (٣٩) لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُوا۟ هُمُ
ٱلْغَٰلِبِينَ (٤٠) فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ (٤١)
قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ (٤٢) قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ (٤٣) فَأَلْقَوْا۟
حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ (٤٤) فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ
فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ (٤٥) فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ (٤٦) قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ
(٤٧) رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ (٤٨) قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى
عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ
(٤٩) قَالُوا۟ لَا ضَيْرَ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ (٥٠) إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ
ٱلْمُؤْمِنِينَ (٥١) ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ (٥٢) فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ
فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ (٥٣) إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ (٥٤) وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ (٥٥) وَإِنَّا لَجَمِيعٌ
حَٰذِرُونَ (٥٦) فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ (٥٧) وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ (٥٨) كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا
بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ (٥٩) فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ (٦٠) فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ
إِنَّا لَمُدْرَكُونَ (٦١) قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ (٦٢) فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب
بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ (٦٣) وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْءَاخَرِينَ (٦٤)
وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ (٦٥) ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ (٦٦) إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا
كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ (٦٧) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ (٦٨) ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{یادیش بکەوە کاتێك پەروەردگارت بانگی مووسای کرد، کە بچۆ لای کۆمەڵی ستەمکاران ﴿١٠﴾ کۆمەڵی فیرعەون، ئایا پارێز لە خوا ناکەن؟! ﴿١١﴾ (مووسا) گوتی: پەروەردگارم! من دەترسم بەدرۆم دابنێن ﴿١٢﴾ سەرەنجام دڵ و سینەم تەنگ ببێ و، زمانم بگیرێ و، قسەم بۆ نەکرێ ﴿١٣﴾ هەروەها گوناهێکیشیان لەسەرم هەیە، یەکێکم لێیان کوشتوە، بۆیە دەترسم بمکوژن، {پەیامەکەی تۆم بۆ نەگەیەنرێ} ﴿١٤﴾ (خوا) فەرمووی: نا، ناتوانن بتکوژن، هەردووکتان (تۆو هارون) بە نیشانەکانمانەوە بچن، ئێمەش لەگەڵتان دا گوێگرین {لە قسەی ئێوەو ئەوانیش} ﴿١٥﴾ هەردووکتان بچنە لای فیرعەون و پێی بڵێن: ئێمە نێردراوی پەروەردگاری جیهانیانین ﴿١٦﴾ هاتووین، وەچەی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێری ﴿١٧﴾ (فیرعەون) گوتی: ئایا بە منداڵیی لە نێو ماڵی خۆماندا بەخێومان نەکردی و، ساڵانێك لە تەمەنت لە نێومان نەمایەوە؟ ﴿١٨﴾ کەچی لە سپڵان بووی و، ئەو کەتنەت کرد کە کردت! ﴿١٩﴾ (مووسا) گوتی: کاتێك ئەو کارەم کرد (ئەو کابرا قیبتییەم کوشت) کە من لە گومڕایان بووم (نەکرابوومە پێغەمبەر) ﴿٢٠﴾ ئیدی چونکە لێتان ترسام (بمکوژنەوە) لە دەستتان ڕامکردو، پەروەردگارم حیکمەتی پێدام و، لە پێغەمبەرانی گێڕام ﴿٢١﴾ ئەو چاکەیەش کە منەتی پێ لەسەرم دەکەی، لە سۆنگەی ئەوەوە بوو، کە وەچەی ئیسرائیلت بندەست کردبوو، {لە ترسی سەربڕان دایکم خستمیە صندووق و، بە ڕووباری نیلی دادام و، لەلایەن ماڵی ئێوەوە گیرامەوەو بەخێو کرام} ﴿٢٢﴾ فیرعەون گوتی: پەروەردگاری جیهانییان چییە؟ ﴿٢٣﴾ (مووسا) گوتی: خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانە، ئەگەر زانیاریی دڵنیاکەرتان هەبێ (ئەوە دەزانن) ﴿٢٤﴾ (فیرعەون) گوتی: ئایا گوێ ڕاناگرن {قسەکەی چەندە سەیرە!} ﴿٢٥﴾ (مووسا) گوتی: (خوا)

پـەروەردگارو مشـوورخۆری خۆتـان و بـاب و باپیرانـی پێشـووتانە ﴿٢٦﴾ (فیرعـەون) گوتـی: بێگومـان ئـەو پێغەمبەرەتـان کـە بۆتـان نێرراوە شـێتە! ﴿٢٧﴾ (مووسـا) گوتـی: خـوا پـەروەردگاری ڕۆژهـەڵات و ڕۆئـاواو ئـەوەی نێوانیانـە، ئەگـەر بفامـن (عەقڵتـان هەبـێ) ﴿٢٨﴾ (فیرعـەون) گوتـی: بـە دڵنیایـی ئەگـەر جگـە لـە مـن پەرسـتراوێکی دیکـە بگـری، دەتخەمـە گـەڵ گیـراوان ﴿٢٩﴾ مووسـا گوتـی: ئـەدی ئەگـەر شـتێکی ڕوون و، ڕۆشـنکەرەوەم بـۆ هێنـای (وەك بەڵگـەو نیشـپات)؟ ﴿٣٠﴾ (فیرعـەون) گوتـی: ئەگـەر لـە ڕاسـتانی بیهێنـە (بیخـە ڕوو) ﴿٣١﴾ ئەویـش گۆچانەکـەی فڕێـدا، یەکسـەر بـووە مارێکـی (زەبەلاحـی) ئاشـکرا ﴿٣٢﴾ دەستیشـی (خسـتە بـن باڵـی و)، هێنایـە دەر، یەکسـەر سـپیی ( و درەوشـاوە) بـوو بـۆ بینـەران ﴿٣٣﴾ (فیرعـەون) بەدەسترۆیشـتووانی دەوروبـەری گـوت: بێگومـان ئەمـە جادووگەرێکـی زانـاو شـارەزایە ﴿٣٤﴾ دەیـەوێ بـە جادووەکـەی لەسـەر زەمینـی خۆتـان وەدەرتانبنـێ، ئنجـا فەرمانتـان بەچییـە؟ ﴿٣٥﴾ گوتیـان: خـۆی و برایەکـەی دوابخـە (جـارێ سـزایان مـەدە)و، کۆکـەرەوان بنێـرە شـاران، کـە هەرچـی جادووگـەری زەبـر دەسـت و شـارەزا هەیـە بـۆت بێنـن ﴿٣٧﴾ ئیـدی جادووگـەرەکان لـە ژوانگـەی ڕۆژێکـی زانـراودا کۆکرانـەوەو ﴿٣٨﴾ بـە خەڵـك گوتـرا: ئایـا ئێـوە کۆبوونەتـەوە؟ ﴿٣٩﴾ بەڵکـو شـوێن جادووگـەرەکان بکەویـن، ئەگـەر ئـەوان زاڵ بـبن! ﴿٤٠﴾ ئنجـا کاتێـك جادووگـەرەکان هاتـن بـە فیرعەونیـان گـوت: ئایـا ئەگـەر ئێمـە زاڵ بوویـن کـرێ و پاداشـتمان دەدەیـە؟ ﴿٤١﴾ (فیرعـەون) گوتـی: بەڵـێ، (سـەربارەش) ئێـوە ئـەو کاتـە لـە زۆر وەنیزیـك خراوانیـش دەبـن (لـە مـن) ﴿٤٢﴾ مووسـا (بێباکانـە) پێیگوتـن: ئـەوەی ئێـوە فڕێدەرنـی، فڕێیبـدەن (لـە گۆچـان و پەتـەکان) ﴿٤٣﴾ ئەوانیـش پـەت و گۆچانەکانـی خۆیانیـان هاویشـت و گوتیـان: بـە هـۆی عیزەتـی فیرعەونـەوە هەرئێمەیـن زاڵبـوان ﴿٤٤﴾ مووسـاش گۆچانەکـەی هەڵـدا، یەکسـەر هەرچـی درۆو فێڵـی کردبوویـان قووتـی دان ﴿٤٥﴾ یەکسـەر جادووگەرەکانیـش بـە کڕنـووش داخـران ﴿٤٦﴾ گوتیـان: بڕوامـان بـە پـەروەردگاری جیهانییـان هێنـا ﴿٤٧﴾ پـەروەردگاری مووسـاو هـاڕوون ﴿٤٨﴾

(فیرعەون) گوتی: چۆن بەر لەوەی مۆڵەتتان بدەم بڕواتان بۆ هێنا؟ بە دڵنیایی ئەو (مووسا) ئەو گەورەیەتانە کە جادووی فێر کردوون، بێگومان لەمەودوا دەزانن (چیتان پێدەکەم!) دەستەکانتان و لاقەکانتان بە پێچەوانەوە (دەستی ڕاست و لاقی چەپتان) دەبڕم و، تێکڕاشتان هەڵدەواسم (و لە سێدارەتان دەدەم) ﴿٤٩﴾ (جادووگەرەکان) گوتیان: (ئەوەی بەسەرمان بێ لەسەر ئیمان) زیانی نیە، چونکە ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە ﴿٥٠﴾ ئێمە ئومێدمان وایە لە سۆنگەی ئەوەوە کە یەکەمینی بڕوادارانین، پەروەردگارمان لە گوناهەکانمان ببورێ ﴿٥١﴾ (دوایی) سروشمان بۆ لای مووسا کرد کە شەوڕۆ بەبەندەکانم بکە، چونکە بێگومان ئێوە لە ڕاوەدوونراوانن (لەلایەن فیرعەون و سوپاکەیەوە) ﴿٥٢﴾ ئنجا فیرعەون (خەڵک) کۆکەرەوانی لە شاراندا ناردن ﴿٥٣﴾ (کە پێیان ڕابگەیەنن) ئەوانە (کە لە دەستمان ڕایانکردوە) کۆمەڵێکی پەڕاگەندەی کەمن و ﴿٥٤﴾ بەدڵنیایی ئێمەیان زۆر پەست و تووڕە کردوەو ﴿٥٥﴾ ئێمەش کۆمەڵێکی تۆکمەو وردو ئامادەین ﴿٥٦﴾ ئیدی سەرەنجام ئەوان (فیرعەونییەکان)مان لە باغ و بێستانەکان و، کانیی و سەرچاوەکان و، ﴿٥٧﴾ لە نێو خەزنەکان و پێگەو شوێنی چاک دەرهێنان و ﴿٥٨﴾ بەو جۆرە ئەو شتانەمان کردنە میراتی وەچەی ئیسرائیل ﴿٥٩﴾ ئنجا دەمەو خۆرکەوتن، کەوتنە دوایان ﴿٦٠﴾ کاتێکیش دوو کۆمەڵەکە لەیەك وەدەرکەوتن، هاوەڵانی مووسا گوتیان: بێگومان ئێمە گیراوین ﴿٦١﴾ (مووسا) گوتی: نەخێر، بە دڵنیایی (پەروەردگارم) لەگەڵم دایە، ڕێنماییم دەکات (چۆن دەرباز بین!) ﴿٦٢﴾ ئنجا سروشمان بۆ لای مووسا کرد کە: بە گۆچانەکەت لە دەریاکە بدە (کە لێیدا) یەکسەر شەق بوو (داڵان داڵان بوو) هەر پارچەیەك (ی دەریایەکە) وەك چیایەکی مەزن وابوو ﴿٦٣﴾ لەو کاتەشدا ئەوانی دیکەمان (لە دەریا لەت بووەکە) وەنیزیك خستن ﴿٦٤﴾ مووساو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون تێکڕایانمان قوتار کردن ﴿٦٥﴾ دوایی (پاش لە دەریا دەرچوونی مووساو گەلەکەی) ئەوانی دیکەمان خنکاندن (نغرۆ کردن) ﴿٦٦﴾ بە دڵنیایی لەوەدا نیشانەیەك (ی

گـەورە) هەیـەو (لەگـەڵ ئەوەشـدا) زۆربەیـان بـڕوادار نیـن و﴿٦٧﴾ بێگومـان هـەر پەروەردگاریشـت زاڵـی بـە بەزەییـە﴿٦٨﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي ): (إِنطَلَقَ: مَرَّ مُتَخَلِّفاً، الإِنطِلاَقُ مُطاوِعُ أَطْلَقَهُ إِذَا أَرْسَلَهُ وَلَم يَحْبِسهُ، وَاستُعِيرَ هُنا لِفَصَاحَةِ اللِّسانِ وَبَيانِ الكَلَامِ)، کەسێك کـە دواکەوتبێ، دوایـی بەخێرایـی دەرچـێ، ئـەوە پێـی دەگوتـرێ: (إِنطَلَـق)، لێـرەدا (وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي ) واتـە: زمانـم گـۆ نـەکات، زمانـم بـاش بـۆ نەیەتـە جووڵـەو، قسـەم بـاش بـۆ ناکـرێ، (إِنْطـلاق) (مُطـاوِع)ی (أَطْلَقَ)یـە، (أَطْلَـقَ، يُطلِقُ، إِنطِلاَقاً) کاتێـك کـە شـتێك بنێـرێ و حەپسـی نـەکات، لێـرەش خوازراوەتـەوە بـۆ زمـان پاراویـی و دەربڕینـی مەبەسـت، واتـە: دەترسـم کـە نەتوانـم مەبەسـتی خـۆم بـاش بکەیەنـم.

(فَعْلَتَكَ ): (الفَعْلَـة: المَـرَّة الوَاحِـدَةُ مِـنَ الفِعْـلِ، وَالمُـرادُ بِـه التَّفْضِيـحُ)، وشـەی (فَعْلَتَكَ )م بـە (کەتـن) لێکداوەتـەوە، ئـەو کەتنـەت کـرد، چونکـە مەبەسـتی ئـەوە بـووە کاتێ خـۆی ئـەو پیـاوە قیبتییـەت کوشـتوە (فَعْلَة) یەکجـارە لـە وشـەی (فِعْـل) (فَعَـلَ، يَفْعَـلُ، فِعْـلاً، فَعْلَـةً) مەبەسـت لێـرەدا ناشـیرین کردنـی کردەوەکەیـە، بـە کوردیـی دەبێتـەوە بـە کەتـن، ئـەو کەتنـەت کـرد، ئـەو تاوانـەت کـرد.

(أَرْجِهْ ): (أَرْجَأَ، أَيْ: أَخَّرَ)، واتە: دواى بخە، جارێ پەلە مەکە لە سزادانی.

(تَلْقَفُ ): واتـە: قـووتی دەدا، (لَقِـفَ الـشَّيءَ أَلْقَفَـهُ، يَلْقَفُـهُ، تَلَقَّفَـهُ: تَنَاوَلَـهُ بِالحِـذْقِ، بِالفَـمِ أَو اليَـدَ)، (لَقِـفَ الـشَيءَ يَلْقَفُـهُ، تَلَقَّفَـهُ) یـانی: ئـەو شـتەی زۆر بـە کارامەیـی گـرت، ئنجـا بـە دەسـت، یـان بـەزار، ﴿ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴾، واتـە: ئـەوەی بـە درۆ هەڵیاندەبەسـت، قووتـی دا و هەڵیلووشـی.

(يَأْفِكُونَ): (يَكذِبـون، يُمَوِّهـون، يَصْرِفـون) (إفـك) يانــي: شــتی هەڵبەســتراو، درۆی هەڵبەســتراو، جـا لێـرەدا (يَأْفِكُونَ) واتــە: ئـەو درۆيــەی کـە هەڵيانبەســت واتــە: چاوبەســتيان پــێ لــە خەڵــك کــرد، چونکــە جــادوو کــردن لــە ڕاســتييدا زياتــر کاريگەريــی ڕواڵەتييــە بــۆ ســەر هەســتەوەرەکانی مــرۆڤ، وەك لــە ســووڕەتی (الأعـراف)دا دەفەرمـوێ: ﴿ سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ ﴿١١٦﴾ ﴾، واتــە: چـاوی خەڵکيـان جـادوو لێکـردو ترسـاندیانن، نەگەرنـا جـادوو لـە دنيـای دەرەوەدا حەقيقەتــی نيــە، بــەڵام بــۆ ســەر مرۆڤــەکان کاريگەريــی هەيــە.

ئێمـە لـە تەفسـيری سـووڕەتی (البقـرة)دا، باسـێکی تايبەتمـان لەبـارەی جـادووەوە کـردوە.

(مِّنۡ خِلَٰفٖ): يانـی: بـە پێچەوانـەوە، (إِحْدَاهُـمَا مِـنْ جَانِـبٍ، وَالأُخْـرَى مِنْ جَانِـبٍ آخَر) يەکێکيـان لەلايـەك و ئـەوەی ديکەيـان لەلايـەك، ﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ ﴾، واتــە: دەســتەکانتان و پێيەکانتــان بــە پێچەوانــەوە دەبــڕم واتــە: دەســتی ڕاســت و لاقـی چـەپ.

(لَا ضَيۡرَ): هيــچ زيانــی نيــە، (ضَـارَّ فُـلَانٌ فُلَانَـاً، فَهُـوَ يَضِـيرُ ضَـيْراً، لاضَيْـرَ: لاَ ضَرَرَ) واتــە: فـڵان زيانــی بــە فـڵان کــەس گەيانــد، (فَهوَ يَضِـيرُ) زيانــی پێدەگەيەنــێ، (ضَـيْراً) زيانگەيانــدن، کەواتــە: (لا ضَـيْرَ) يانــی: (لا ضَرَرَ) هيــچ زيانــی نيــە، (ضَرَّهُ يـضُرّه ضراً) بــەڵام نەمەيـان (ضـارَه، يَضـيرُهُ).

(لَشِرۡذِمَةٞ): (شِرذِمـة: جَمَاعَـةٌ مُنقَطِعَـةٌ، ثَـوبٌ شَراذِم أَي: مُتَقَطِّـع) (شِرذِمـة) کۆمەڵێکی لێـك دابـڕاوو بـەش بـەش، کە تۆکمـە نەبـن، دەگوتـرێ: (ثَـوبٌ شَراذِم) واتە: پۆشـاکێکی بـەش بـەش، لێـك دابـڕوا چەنـد پارچە.

(لَمُدۡرَكُونَ): دەمانگەنــێ، (أَدْرَكَ: بَلَـغَ أَقْـصَى الـشَّيء) واتـە: گەيشـتە ئەوپـەڕی شـتەکە، کەواتـە: (مُدْرَكـون) ئەوەيـە کـە لايـەنی بەرانبـەر بيگاتـێ، يانـی: (إِنَّـا لَمُلْحَقـون) ئێمـە لـە پێگەيشـتوانين، واتـە: پێـمان دەگـەن، ئەوانەی بەدوامـان کەوتوون، فيرعەون و سـوپايەکەی.

(فَٱنفَلَقَ): واتە: شەق بوو، لەت و پەت بوو، (الفَلْقُ: شَقُّ الشَّيءِ، وَإِبانَةُ بَعْضِهِ عَنْ بَعْضٍ) (فلق) بریتیە لە شتێك لەتی بکەی و هەندێکی لە هەندێکی جیا ببێتەوە، یانی: مووسا ﷺ کە گۆچانەکەی لە دەریاکە داوە، دەریاکە شەق بووە.

(فِرْقٍ): (الفِرْقُ: يُقَارِبُ الفَلْقَ، الفِرْقُ: القِطْعَةُ المُنفَصِلَةُ، وَمِنْهُ: الفِرْقَةُ لِلجَمَاعَةِ المُتَفَرِّدَةِ مِنَ النَّاس) (فِرْق) لەگەڵ (فَلْق) مانایان لێك نیزیکە، (فِرْق) بریتیە لە پارچەیەکی جیابووەوە لە شتێك، هەر بۆیە کۆمەڵە خەڵکێك، کە لە خەڵکی دیکە دابڕابن، پێیان دەگوترێ: (فِرْقَة) کە دەفەرمووێ: ﴿كُلُّ فِرْقٍ﴾، دەبێتە چەند داڵانێك، وەك لە پەیمانی کۆندا باس کراوە کە بووەتە دوازدە (١٢) داڵان، بە ئەندازەی ژمارەی تیرەو هۆزەکانی گەلی بەنوو ئیسرائیل، بۆ ئەوەی هەریەکێکیان بە داڵانی خۆیدا بڕوا.

(كَٱلطَّوْدِ): واتە: وەك چیای مەزن (الطَّوْدُ: الجَبَلُ العَظِيم)، (طَوْد) بە چیایەکی مەزن دەگوترێ.

(وَأَزْلَفْنَا): (أي: قَرَّبْنَا، الزُّلْفَةُ: المَنْزِلَةُ وَالحُظْوَة) (زُلْفَة) بەمانای پێگەو شانس و بەختی کەسێك لەلای کەسێك، کەواتە: (أَزْلَفْنَا) یانی: وەنیزیکمان خستن، مەبەست ئەوەیە دوای ئەوەی مووسا ﷺو گەلەکەی لە دەریاکە دەرچوون، خوا ﷻ فیرعەون و سوپایەکەشی وەنیزیك خستوون و هاتوونە نێو دەریا، ئنجا دوای ئەوەی کۆتا کەسی گەلی بەنوو ئیسرائیل لە دەریاکە دەرچوون و، کۆتا کەسی سوپاکەی فیرعەون هاتۆتە نێو دەریاوە، دەریاکە وێکهاتۆتەوەو هەموویان نغرۆ بوون.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا دەڵێین: بەسەرهاتی مووساو هارووون و گەلەکەیان لەلایەك و، فیرعەون و دارو دەستەکەی لەلایەکی دیکەوە، کاتی خۆی ئێمە لە کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (الأعراف)دا، ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٧١) واتە: شەست و نۆ (٦٩) ئایەت، قسەمان لەبارەوە کردوەو دابەشمان کردوە بۆ سێزدە (١٣) قۆناغ.

ئنجا ئێمە لەکاتی تەفسیر کردنی ئەو شەست و نۆ (٦٩) ئایەتەی سوورەتی (الأعراف)دا، هەشت قۆناغیمان باسکردوون (٦ - ١٣)، کە لە هیچ شوێنێکی دیکەی قورئاندا بەسەرهاتی مووساو هارووون (علیهما السلام) و، گەلەکەیان و، لە بەرامبەریشدا فیرعەون و دارو دەستەکەی، ئەوەندە بە درێژیی نەهاتوە.

پێنج ئاڵقەی سەرەتای ژیانی مووسا ﷺ شمان هەڵگرتوون بۆ کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (القصص) خوا پشتیوان بێ، کە لە دوای ئەو سوورەتەو سوورەتی (النمل)، پێی دەگەین، چونکە تەنیا لەوێدا بە تەواویی وردەکارییەکانی ئەو پێنج قۆناغە هاتوون، بەڵکو هەندێ شت تەنیا لەوێ باس کراوە، بۆیە ئێمە ئەو پێنج قۆناغی سەرەتای تەمەنی مووساو هارووونی برای و بەنوو ئیسرائیل لەلایەك و، فیرعەون و دارو دەستەکەی لەلایەکی دیکەوە، هەڵگرتوون بۆ کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (القصص). لە سوورەتی (القصص)دا چل و سێ (٤٣) ئایەت تەرخان کراوە بۆ بەسەرهاتی مووسا ﷺ، لەگەڵ ئەو شەست و نۆ (٦٩) ئایەتەی سوورەتی (الأعراف)دا، (٦٩+٤٣=١١٢) ئایەت، ئەو سەدو دوازدە (١١٢) ئایەتەی (الأعراف) و (القصص) بە هەموویان کۆی سێزدە (١٣) قۆناغەکەی بەسەرهاتی مووساو هارووونی برای و گەلەکەیان و، فیرعەون و دارو دەستەو سوپایەکەی لەبەرامبەریاندا، پێك دەهێنن.

بۆیە ئێمە لێرەدا بە خێرایی بەسەر مانای گشتیی ئەو پەنجاو نۆ (٥٩) ئایەتەدا دەڕۆین، بەر لەوەش دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم کە پێشخرانی بەسەرهاتی مووسا لە هی نووح و ئیبراهیم (علیهما الصلاة والسلام) حیکمەتەکەی ئەوەیە کە ئەو ملهووڕییەی فیرعەون و گەلەکەی و، شوێنکەوتووان و دەستەو دایەرەکەی، بوویانە، ئەوانی دیکە نەیانبووە، هەروەها ئەو هەموو مەینەتیی و ناڕەحەتییانەی مووساو هاروونی برای و، گەلەکەیان بەسەریان هاتوە، بەدەستی فیرعەون و دارو دەستەکەی، ئەوە زیاتر شوبهاوەتە ئەو حاڵەت و بارودۆخەی کە پێغەمبەری خاتەم ﷺو، هاوەڵانی بەڕێزی تێیدابوون، لەگەڵ هاوبەش بۆخوا دانەرەکانی قوڕەیش و غەیری قوڕەیش لەو کاتیدا.

ئنجا ئەوەش زیاتر جێگای دەرس و پەندە، بۆیە خوا ﷻ لێرە، لە ڕیز کردنی ئەم بەسەرهاتانەدا، ڕیزبەندیی کاتیی (الترتیب الزمني) ڕەچاو نەکردوە، بەڵکو ئەوەی ڕەچاو کردوە: کام لەو بەسەرهاتانە زیاتر دەشوبهێتە ئەو حاڵەتەی کە پێغەمبەر ﷺو، هاوەڵانی بەڕێزی لەگەڵ نەیارو ناحەزەکانیدا تێیدا بوون، ئنجا بەسەرهاتی مووساو هاروونی برای و، گەلەکەیان، لەگەڵ دەستەو دایەرەی فیرعەون، ئەوە زیاتر شوبهاوەتە حاڵەتی ئەوان، تاکو بەسەرهاتی ئیبراهیم و نووح (علیهما الصلاة والسلام).

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، یاد بکەوە! کێ یاد بکاتەوە؟ پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەر لە هەر کەسێك و، هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێ و، هەر کەسێکی دیکەش کە پێویستە یاد بکاتەوە، چونکە: ﴿ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ ﴾ (و) بۆ بادانەوەیە، واتە: وێڕای ئەوە کە ڕووەکەکانی سەر زەوی، وەك نیشانەیەکی خوا ﷻ سەرنجیان دەدەی، وێڕای ئەوە یادیش بکەوە کاتێك کە پەروەردگارت بانگی مووسای کرد، چۆنی بانگ کرد؟ دوایی ئێمە خوا پشتیوان بێ لە سوورەتی (النمل)دا کە لەوێش ئەوە دووبارە

دەبێتـەوە، لـەوێ چۆنیەتیی بانـگ کردنـی خـوا ﷻ بـۆ مووسـا ﷺ بـاس دەکەیـن، بـەڵام نـەك چییەتەکـەی، بـەڵام لـەو بابەتـەوە، لـەوێ زیاتـر قسـەی لـێ دەکەیـن.

لێـرە دەفەرمـوێ: یـاد بکـەوە! کاتـێ پـەروەردگارت بانگـی مووسـای کـرد، ئایا چـی پـێ فەرمـوو؟ ﴿ أَنِ ٱئۡتِ ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئـەوە نێوەڕۆکـی بانگکردنەکـە بـوو: کـە بچـۆ بـۆ لای کۆمەڵـی سـتەمکاران، دوایـی بـۆی ڕوون دەکاتـەوە کۆمەڵـی سـتەمکاران کێـن؟ چونکـە سـتەمکار زۆرن لـە دنیـادا، ﴿ قَوۡمَ فِرۡعَوۡنَ ﴾، وا دیـارە ئـەو کاتـە لەگەڵـی فیرعـەون سـتەمکارتر لەسـەر زەوی نەبـووە، بۆیـە خـوای دادگـەر گەلـی فیرعەونـی بـە نموونـەی بەرجەسـتەی خەڵکـی سـتەمکار دانـاوە، ستەمەکەشـیان ئـەوە بـووە گەلـی مووسـا واتـە: بەنـوو ئیسـڕائیل، نەوەکانـی یەعقـووب کـە بوونـە نەتەوەیـەك ساڵانێکی زۆر لـە میسـڕ بـوون، هـەر لـەو کاتـەوە کـە یەعقـووب و ﷺ یوسـوفی کـوڕی ﷺ و برایەکانـی دیکـەی یوسـوف، هـەر یـازدە برایەکـەی دیکـەی، هەموویـان پێکـەوە چـوون لـە میسـڕ نیشـتەجێ بـوون و، لـەوێ هاوسـەگیرییان کـردوەو، زۆر بـوون و بوونـە نەتەوەیـەك.

گەلـی فیرعـەون، ئـەو بەنـوو ئیسـڕائیلە، ئـەو وەچـەی ئیسـڕائیل، ئـەو نەتەوەیـە، {ئیسـڕائیل نازنـاوی یەعقووبـە ﷺ} کـە لـە یەعقـووب ﷺ پەیـدا بـوون، چەوسـاندوونیەوە، چەنـدان سـاڵ چەوسـاندوونیەوە، چەوسـاندنەوەکەش ئەوەبـووە کـە خـوا دەفەرمـوێ:

﴿ وَيُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡ ۚ ﴿٦﴾ ﴾إبراهيـم، واتـە: نێرینەکانیـان سـەردەبڕین و ئافرەتەکانیـان دەهێشـتنەوە، پیاویـان سـەردەبڕین هـەر بـە مەلۆتکەیـی، بـە گچکەیـی، یـان بـە گەورەیـی دەیانکوشـتن، بـە سـتەم، ئافرەتەکانیشـیان دەهێشـتنەوە بـۆ خزمـەت و بـۆ کارەکەریـی و، بـۆ پێڕابـواردن، کـە هیـچ سـتەمێك لـەو سـتەمە گەورەتـر نیـە، پیاوەکانیـش ئەوانـەی کـە مابـوون سـۆغرەو بێگاریـان پـێ دەکـردن، ئەشـکەنجەیان دەدان، بۆیـە مووسـا ﷺ کاتـێ

دەچێتــە لای فیرعــەون وەك لەشــوێنی دیکــە دەفەرمــوێ: ﴿ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ﴿٤٧﴾ ﴾طـه، گــوتی: بەنــی ئیســڕائیلم لەگــەڵ بنێــرەو چــی دیکــە ئەشــکەنجەیان مــەدە! ئنجا ئایا مووسا کــە چــوو بــۆ لای کۆمەڵــی ســتەمکاران، کــە گەلــی فیرعەونــە، چییــان پــێ بڵــێ؟ ﴿ أَلَا يَتَّقُونَ ﴾ واتــە: ئایا پارێــز لەخــوا ناکــەن؟ ئایا خۆتــان ناپارێــزن لــە ســزای خــوا، بــەوەی چیدیکــە ســتەم لــەو نەتــەوە بندەســت و ســتەملێکراوو کەساســە نەکــەن؟!

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴾ مووســا فەرمــووی: پــەروەردگارم! مــن دەترســم بــەدرۆم دابنێــن، مەترســیی ئــەوەم هەیــە بــڕوام پــێ نەکــەن و بــەدرۆم دابنێــن، ﴿ وَيَضِيقُ صَدْرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَـٰرُونَ ﴾، لــە ئەنجامــی بــەدرۆ دانانــی ئەوانــدا بــۆم، ســینەم تەنــگ بــێ و زمانیشــم گــۆ نــەکا، نەجووڵــێ، زمانیشــم حەپــس بــێ، وا دیــارە مووســا ﷺ وەك لــە ســوورەتی (طــه)دا دەفەرمــوێ: ﴿ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُواْ قَوْلِي ﴿٢٨﴾ ﴾، گرێیــەك کــە لەزمانمــە، بیکــەوە، تاکــو لــە قســەم تــێ بگــەن، هەســتی بــەوە کــردوە کــە زمانــی ئاســایی نەبــووە، هەرچەنــدە ئــەو کاتــە لــە ســووڕەتی (طــه)دا خــوای ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَـٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتــە: ئــەی مووســا! داواکارییەکانــت جێبەجــێ بــوون، کــە یەکێکیــان ئەوەبــوو خــوا زمانــی بکاتــەوە، دیــارە لــەو کاتــەوە کــە خــوا دەفەرموێ: داواکارییەکــەت جێبەجــێ بــوو، مووســا گەڕاوەتــەوە بــۆ حاڵەتــی ئاســایی و، ئــەو زمان گیرانــەی نەمــاوە.

بــەڵام ئــەوەی ئێــرە هــەر ئــەو کاتەیــە کــە خــوا دەینێــرێ و جــاری داوای نەکــردوەو وەڵامــی نەدراوەتــەوەو زمــانی چــاك نەبــووە. ﴿ فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَـٰرُونَ ﴾، ئنجــا بنێــرە بــۆ لای هــاڕوون، واتــە: هاوڕوونیــش بکــە بــە پێغەمبــەر، بۆچــی؟ لەشــوێنی دیکــە دەفەرمــوێ: ﴿ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا ﴿٣٤﴾ ﴾القصص، ئــەو زمانــی لــە مــن پاراوتــرە، بــا ئەویشــم لەگەڵــدا بــێ، ئەگــەر مــن زمانــم گیــرا، ئــەو لەجیاتــی مــن قســان بــکات، ﴿ وَلَهُمْ عَلَيَّ ذَنۢبٌ ﴾، هەروەهــا بــۆ ئــەوان گوناهێــك لەســەر مــن هەیــە، واتــە:

گوناهێکم بەرانبەر کردوون، یان هەقی گوناهێکیان لەسەر من هەیە، ﴿ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ ﴾، دەترسێم بمکوژن، مووسا ﷵ بە تەئکید لە خودی کوشتنەکە نەترساوە، یانی: دەترسم بمکوژن و، سەرەنجام نەتوانم پەیامەکەی تۆ بگەیەنم، واتە: کوشتنەکەی ئەوان بۆ من ببێتە پەرچ و ڕێگر لە بەردەم ئەو ئەرکەدا، کە تۆ پێم دەسپێری جێبەجێی بکەم.

ئاوا دەبێ تەماشای قسەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بکرێ، نەك بگوترێ: مووسا ﷵ لە کوشتنێ ترساوە! چونکە زۆر کەس کە پێغەمبەریش نیە لە بەندە چاکەکانی خوا، لە مردن و کوشتن، ناترسێ لە پێناوی خوادا، پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوا، چۆن لە کوژران و مردنێ دەترسێ؟ یانی: دەترسێم بمکوژن و، بە هۆی کوژرانەکەشمەوە، نەتوانم پەیامەکەی تۆ بگەیەنم، هەروەك چۆن دەترسێم بەدرۆم دابنێن و، لە ئەنجامی ئەوەش دا سینەم تەنگ بێ و، زمانیشم بگیرێ و، نەتوانم پەیامەکەی تۆ بگەیەنم، بۆیە بۆ مەسەلەی زمانەکەم، با هاڕوونی برام لەگەڵم دابێ، ئنجا ئەو گوناهەشیان لەسەرم هەیەو بۆ خوای پەروەردگاری باس دەکات، بێگومان خوا ﷻ هەموو شتێك دەزانێ، بەڵام بەیانی حاڵی خۆی بۆ دەکات، تاکو بزانێ خوا چ تەگبیرێکی بۆ دەکات؟

﴿ قَالَ كَلَّا ﴾، خوا فەرمووی: نا، نەخێر ناتوانن بتکوژن، ﴿ فَاذْهَبَا بِآيَاتِنَا ﴾، یەکسەر وەڵامی داواکارییەکەشی دایەوە: هەردووکتان بچن بە نیشانەکانی ئێمەوە، ﴿ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴾ ئێمەش لەگەڵتان گوێگرین، گوێ هەڵدەخەین، داخۆ چیتان لەبەیندا دەگوزەرێ؟

﴿ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَا إِنَّا رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، بچنە لای فیرعەون پێی بڵێن: ئێمە نێردراوی پەروەردگاری جیهانیانین.

بێگومان فیرعەون گوتوویەتی: ﴿ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾النازعات، من پەروەردگاری هەرە مەزنتانم، هەروەها گوتوویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ

غَيْرِى ﴿٣٨﴾ القصص، واتـە: ئـەی قسـە ڕۆیشـتووان! جگـە لەخـۆم پەرسـتراوێکی دیکـەم بـۆ ئێـوە پـێ شـك نایـەت، یـانی: هـەم لافـی پەروەردگارێتیـی (ربوبیـة)ی لێـداوەو هـەم لافـی پەرسـتراوێتیی (اُلوهیـة)!! بۆیـەش خـوا ﷻ بـە مووسـاو هـاروون دەفەرمـوێ: پێـش هەمـوو شـتێك پێـی بڵێـن: ئێمـە لەلایـەن پـەروەردگاری جیهانییانـەوە نێردراویـن، کەواتـە: تـۆ هیـچ نـی، بـەس دروسـتکراوێك و بەندەیەکـی خـوای.

ئنجـا پێـی بڵێـن: ﴿ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، هاتوویـن کـە وەچـەی نیسـرائیلمان لەگـەڵ بنێـری، (بَنِىٓ ) یانـی: وەچـە، نـەوەکان (إسرائیـل) نازنـاوی (یعقـوب)ە، ؏، یەعقـووب کـوڕی ئیسـحاقەو ئیسـحاق کـوڕی ئیبراهیمـە، سـەلامی خـوا لەسـەر هەموویـان بـێ، ئیسـرائیل بەزمانـی عیبریـی (ئیسـرا) یانـی: عەبـد، (ئیـل) یانـی: (اَللـە)، واتـە: (عبداللـە)، بەنـدەی خـوا.

ئنجـا نـەوە هەمـووی پێچراوەتـەوە کـە: چـوون و پێیـان گـوت و... هتـد، چونکـە بـە سـیاق و سـەلیقە دەزانـرێ، یەکسـەر دێتـە سـەر ئەسـڵی مەبەسـت، واتـە: پێیـان گـوت، ئەویـش یەکسـەر: ﴿ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴾ گوتـی: ئایـا تـۆ بـە گچکەیـی، بـە منداڵ لەماڵیـی ئێمەدا بەخێـو نەکـرای و، سـاڵانێکی زۆر لەتەمەنی خـۆت لەنێـو ئێمـەدا نەمایـەوە؟ فیرعـەون بەچاوی دادەداتـەوە کـە ئـەوان بـە خێویـان کـردوە! ﴿ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، هەروەهـا ئـەو کـردەوە خراپەشـت کـرد، ئـەو کەتنەشـت کـرد، کـە کـردت و تـۆ لـە سـپڵان بـووی، (کافـر) لێرەدا بەمانـای بـێ بـڕوا نیـە، واتـە: تـۆ لـە سـپڵەو ناسپاسـان بـووی، لـە جیاتـی ئـەوەی لـە بەرانبـەر چاکـەدا، چاکەمـان بدەیـەوە، کەچـی ئێسـتا بەگژمانـدا هاتـی!

دەشـگونجێ: ﴿ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ واتـە: تـۆ ئـەو کاتـە بێبـڕوا بـووی بـە ئاییـن و بەرنامـەی ئێمـە.

ئنجـا بـا تەماشـای ئینصافـی مووسـا ؏ بکەیـن و، تەماشـای ڕاسـتگۆیی و سـەر ڕاسـتیی پێغەمبـەران بکەیـن: ﴿ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾، مووسـا لەبـەر

ئەوەی کاتی خۆی یەکێ لە قیبتییەکانی کوشتوە، نکووڵیی لێ ناکات، فەرمووی: ئەو کاتە ئەو کردەوەیەم کردوە - کە تۆ بە کردەوەیەکی ناقۆڵاو دزێوو بە کەتنی دادەنێی، بەڵێ من کردوومە - بەڵام ئەو کاتە من لە گومڕایان بووم، واتە: لەو کەسانە بووم کە نەمدەزانی بەپێی بەرنامەی خوا، ڕەفتار بکەم، چونکە ئەوکاتە من پێغەمبەر نەبووم، منیش کەسێك بووم وەك ئێوە، ئەو کەسەشم بینی (کوژراوەکە) ستەمی دەکرد لە ئیسرائیلییەك، منیش بەزەییم پێدا هاتەوەو، هەست و عاتیفەم بەسەرمدا زاڵ بوو، بۆکسێکم لێداو کوشتم، بەڵام ئەگەر وەك ئێستا بوومایە، بە جۆرێکی دیکە مامەڵەم دەکرد، بەڵام ئەو کاتە من لەوانە نەبووم کە بەڕێیە بزانم و، هەڵس و کەوت و ڕەفتار چی پێویستە، وا بکەم، بەڵکو ئەو کاتە ڕەفتارم بەپێی عاتیفەو سۆز بوو، بەپێی کلتووری کە من تێیدا گەورە بوو بووم، بە تایبەتییش کە مووسا لە ماڵی فیرعەوندا گەورە بووبێ، ڕەنگە هەر بەکوڕی فیرعەونیشیان ناوبردبێ، ئنجا کوڕی فیرعەون، کوڕی پادشا، ببینێ کەسێك ستەم لە کەسێك دەکات، لێی قبووڵ ناکات، یانی: ئەو کاتە منیش هەر لەسەر کلتوو فەرهەنگی ئێوە بووم، - ئەوەم نەبینیوە تەفسیرەکان باسی بکەن، بەڵام پێم وایە ئایەتەکە دەیگەیەنێ - نەك هەر ئەوەندە کە: ئەو کاتە من وەحییم بۆ نەهاتبوو نەبووبووم بە پێغەمبەر! یانی: ئەو کاتە منیش هەر بەپێی ئەو کلتوورو فەرهەنگەی تێیدا گەورە بووبووم، کە کلتوورو فەرهەنگی ئێوەیە، ئەو کاتە هەر بەو شێوەیە مامەڵەم دەکرد.

﴿ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ ﴾، ئنجا کاتێك لێتان ترسام، لە دەستتان ڕامکردو هەڵاتم، ﴿ فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْمًا وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، پەروەردگاریشم حیکمەتی پێدام، حیکمەت واتە: زانیاریی و کرداری ڕاست، یاخود زانینی ڕاستییەکان و کارکردن بەو زانینە، کە زۆر لە زانایان وایان پێناسە کردوە: (الإصابَة في القَوْلِ وَالفِعْلِ أو: عِلْماً وَعَمَلاً) ئەوەیە کە ئینسان لەڕووی زانیاریی و لەڕووی کردەوەوە، یان لەڕووی قسەو لەڕووی کردەوە، بپێکێ، ﴿ وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، منیشی

گێڕا بەیەکێ لە پێغەمبەران، ﴿ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ ﴾، ئەو چاکەیەش کە منەتی پێ لەسەر من دەکەی، بە هۆی ئەوەوە بوو: ﴿ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، کە تۆ کە بەنوو ئیسرائیلت بندەست کردبوو، کردبووتن بە کۆیلە، دایکم بۆ ئەوەی سەرنەبڕدرێم، خستوومیە سندووقەوەو بە ئاوێی داداوم، چونکە دەڵێن: هەر ساڵ نا ساڵێك، فیرعەون نێرەوەزەکانی بەنی ئیسرائیلی سەربڕیوە، ئنجا ئەو ساڵە کە مووسای تێدا لەدایك بووە، نۆرەی سەربڕانێ بووەو، ئەوەی هارووني تێدا لە دایك بووە، نۆرەی ڕزگار بوونێ بووە، دایکی مووسا کە هاروونی دەبێ پێویست ناکات، هیچ بکات، چونکە ئەو ساڵە سەربڕان لە گۆڕێ دا نیە، بەڵام ئەو ساڵەی مووسای تێدا لە دایك بووە، ساڵی سەربڕانێ بووە، بۆیە وەك باسکراوە لە سووڕەتی (القصص) و لە سووڕەتی (طـه)دا، خوای پەروەردگار ئیلهامی بۆ دەکات و دەیخاتە دڵی، کە بیخاتە سندووقێکەوە، تابووتێکەوەو بەڕووباری نیلی دابدات و ماڵی فیرعەون بیگرنەوە، ئنجا لەماڵی فیرعەوندا گەورەبێ و بەخێو بکرێ، یانی: بە هۆی ئەوەوە بوو کە لە ماڵی ئێوەدا بەخێوکرام!

واتە: ئەگەر تۆ بەنوو ئیسرائیلت ژێر دەستە نەکردبان و نەتچەوساندبانەوەو منداڵە نێرەکانیانت سەر نەبڕیبایە، منیش دایکم ناچار نەدەبوو، مەلۆتکەی خۆی بخاتە تابووتێکەوەو، بە ڕووباری دابدات!

کەواتە: ئەوە چ چاکەیەکە بەچاوی منی دادەدەیەوە؟ لە ڕاستییدا تۆ نەك چاکەت لەگەڵ مندا نەکردوە، بەڵکو تاوانێکی گەورەت بەرانبەر هەموو گەلەکەم کردوە، ئێستا تۆ دەتەوێ ئەو تاوانە گەورەیەی بەرانبەر بە گەلەکەم کردووتە، کە بەڕووبار دادرانی من و، گیرانەوەی من لەلایەن ئێوەوەو بەخێو کرانم لەماڵی تۆدا، هەمووی دەرهاویشتەی ئەو تاوانە گەورەیەتە، کە بەرانبەر بە گەلەکەی من کردووتە، ئەو جینۆسایدە، ئەو قڕە بڕ کرانە، ئێستا دەتەوێ بیکەیە چاکەو بەچاوی منی دابدەیەوە؟!

تەماشا بکەن! وەڵامێکی چەند حەکیمانەو لێزانانەیە، هەر شایستەی پێغەمبەرانی خوایە (علیهم الصلاة والسلام)!

﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، فیرعەون کە ئەو دوو قسەیەی چرووک دەکەن، کە: أ- لە ماڵی ئێمەدا بەخێو کراوی، ب- کەتنێکیشت کردوە، مووسا ﷺ وەڵامی هەردووکیان دەداتەوە، کە هەردووکیان ڕۆنی خۆتانن لەسەری خۆتان دەدرێنەوە:

أ- ئەمما کە نەفەرەکەم کە کوشتوە، ئەو کاتە وەك ئێوە گومڕا بووم و، بەپێی کلتوورو فەرهەنگی ئێوە مامەڵەم دەکرد، بۆیە وامکردوە.

ب- ئەوەش کە لەماڵی تۆدا بەخێو کرام، بە هۆی ئەوەوە بوو کە تۆ گەلەکەی منت کردبوو بە کۆیلەو ژێر دەست و دەتچەوساندنەوە.

ئنجا دوای ئەوەی فیرعەون ئەو دووەی چرووك دەکەن، ئەو دوو تیرەی نیشانە ناپێکن، دەگوازێتەوە بۆ قسەیەکی دیکە: ﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، فیرعەون گوتی: پەروەردگاری جیهانیان چییە؟ ناشڵێ: کێیە!

﴿ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴾، مووسا فەرمووی: پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەیە کە دەکەوێتە نێوانیان، ئەگەر زانیارییەکی دڵنیاکەرتان هەبێ (ئەوە دەزانن، کە ئەم گەردوونە شاری بێ خاوەن نیە) ﴿ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴾، (فیرعەون) بە دەوروبەرەکەی خۆی گوت: ئەرێ گوێتان لێ نیە، چ قسەیەکی سەرسوڕهێنەر دەکات؟

ئنجا مووسا ﷺ بەڵگەیەکی دیکە دێنێتەوە:

﴿ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، مووسا فەرمووی: خوا پەروەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باب و باپیرانی پێشووشتانە، ﴿ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴾، فیرعەون دووبارە ئاوڕی لە کۆڕو مەجلیسەکەی خۆی دایەوەو

گوتی: ئەو ڕەوانە کراوەی بۆ لاتان نێردراوە، بەدڵنیایی شێتە! واتە: ئەوەی کە بانگەشە دەکات ڕەوانە کراوو پێغەمبەرە، ئەگەرنا فیرعەون دانی بەوەدا نەهێناوە، پێغەمبەری خوایە، بەڵکو بە تەوسەوەو بە گاڵتەو توانجەوە، ئەوەی گوتوە.

مووسا ﷺ بەڵگەیەکی دیکەی بۆ دەهێنێتەوە: ﴿ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، هەتا فیرعەون قسەکان توندتر دەکات، مووساش توندتر دەبێ، خوا بە خۆڕایی مووسای بەگژ فیرعەوندا نەکردوە، وەك گوتراوە: (لِكُلِّ فِرعونٍ مُوسى) ئەگەر فیرعەون توندە، مووسا لەو توندترە، بەڵام بەهەق، مووسا فەرمووی: پەروەردگاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، ئەگەر عەقڵتان هەبێ، یانی: ئەگەر بفامن ئەو خۆرە کە هەڵدێ و ئاوا دەبێ و، ئەو زەوییەو، ئەو ئاسمانە، خاوەنێکیان هەیە!

ئنجا دوای ئەوەی فیرعەون لەبواری بەڵگاندا تێدەشکێ و دەدۆڕێ، دەگوازێتەوە بۆ شێوازێکی دیکە، دوای ئەوەی هێزی لۆژیکیی بەدەستەوە نامێنێ، پەنا دەباتە بەر لۆژیکی هێز: ﴿ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴾، (فیرعەون) پێی گوت: ئەگەر جگە لە من پەرستراوێکی دیکە بگری، دەتخەمە گەڵ گیراوان، واتە: زۆری دیکەشم گرتوون، ﴿ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴾، مووسا ﷺ فەرمووی: ئەدی ئەگەر شتێکی ڕوون و ئاشکرات بۆ بێنم، بەڵگەیەکی ئاشکرا، یان بەڵگەیەکی ڕوونکەرەوە کە بیسەلمێنێ: من پێغەمبەری خوام؟ ﴿ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، فیرعەون گوتی: ئەگەر لەڕاستانی بیهێنە، بیخە ڕوو؟

﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴾، مووسا ﷺ گۆچانەکەی فڕێدا بوو بە ئەژدیهایەك، مارێکی گەورەو ئاشکرا، ﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴾، دەستیشی خستە بن هەنگڵی و دەری هێنا، یەکسەر سپیی و درەوشاوە بوو،

بـۆ هـەر کەسێ ببینێ، ﴿ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴾، فیرعـەون بـە دەستوپێشـتووان و دەسـتەو دایەرەکـەی خـۆی گـوت: ئەمـە جادووگەرێکـی زانایـە، شـارەزایە، ﴿ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴾، دەیەوێ بـە جادووەکـەی خـۆی لەسـەر زەمیـن و نیشـتیمانی خۆتـان دەرتـان بـکات، وەدەرتان بنـێ، ئنجـا ئایـا فەرمانتـان بـە چییـە؟

هەڵبەتـە مووسـا بـەس گوتوویەتـی: بەنـوو ئیسـرائیلم لەگـەڵ بنێـرە، بـەڵام فیرعـەون دەیـەوێ خەڵکەکـە هانبـدان، کـە مووسـا دەیـەوێ وڵاتەکەتـان لـێ کاول بـکات و ئێـوە شـار بـەدەر بـکات! ﴿ قَالُوٓاْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴾، ئەوانیـش گوتیـان: خـۆی و برایەکـەی دوابخە، [سـزایان مـەدەو پەلە مەکـە]و کۆکەرەوان بنێـرە بـە شـاراندا ﴿ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴾ بـا هـەر جادووگەرێکـی زۆر کارامـەو زۆر زانـاو شـارەزات، بـۆ بێنـن.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴾، ئنجـا جادووگەرەکان بـۆ ژوانگـەی ڕۆژێکـی دیاریکـراو کۆکرانـەوە، ناکرێ یەکیـان ئەمـڕۆ، ئـەوی دیکـە سـبەینێ و، یەکـی دیکـە دووسـبەی بـێ، لـە ڕۆژێکـی دیاریکـراودا، ئەوانیـش دیـارە مێژوویـان هەبـووەو، شـوێنێکی دیاریکراویشـیان هەبـووە، هەموویـان کۆکرانـەوە.

﴿ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴾، بـە خەڵکیـش گوتـرا: ئایـا ئێـوە کۆبـووەوەن، خـڕ بوونەتـەوە؟

﴿ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴾، بەڵکـو بـەدوای جادووگـەرەکان بکەویـن ئەگـەر ئـەوان زاڵبـن، یانـی: ئەوانـە لەگـەڵ ئـەو کەسـەدان کـە زاڵ بـێ و لـەلای سـەرەوە بـێ، ئەگـەر جادووگەریـش بـن، بـە زۆریـی خەڵـك و جەماوەرێـك کـە لەسـەر ڕێـی ڕاسـت نەبـن و، هیدایەتـدراو نەبـن، عەقـڵ و دڵیـان ڕۆشـن نەبووبێتەوە بـە هیدایەتـی خـوا، تەماشـا دەکـەن: کـێ لـەلای سـەرێیەو کـێ زاڵـە؟ تەماشـا ناکـەن: کـێ هەقـە؟ تەماشـا دەکـەن: کـێ بەهێـزە، ئـەوە لۆژیکـی خەڵـك و جەمـاوەرە، لـە

کاتێکدا کە چەواشە کراوە، لە کاتێکدا کە لەخشتە براوەو، هیدایەت دراو نیە، عەقڵ و دڵی ڕۆشن نەبۆتەوە بە هیدایەتی خوا، ئەگەرنا ئەو وەختەی عەقڵ و دڵیان ڕۆشن دەبێتەوە بە هیدایەتی خوا، تەماشا ناکەن: کێ بەهێزە؟ تەماشا دەکەن: کێ هەقی بەدەستەوەیە؟

﴿ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴾، ئنجا کاتێك جادووگەرەکان هاتن بە فیرعەونیان گوت: ئایا ئەگەر ئێمە زاڵ بووین، پاداشت و خەڵات و بەرامان دەبێ؟ ﴿ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴾، فیرعەون گوتی: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە، ئێوە ئەو کاتە لەزۆر وەنزیکخراوانیش دەبن، واتە: لەو کەسانە دەبن کە من زۆر لەخۆمتان نیزیك دەخەمەوە یانی: کرێ و پاداشتیشتان دەدەمێ و خەڵاتیشتان دەکەم، زۆریش لەخۆمتان وەنیزیك دەخەم، بۆیە دڵخۆشبن و هەرچی تواناتان هەیە سەرفی بکەن، بەس زاڵ بن!

ئنجا خوا ﷻ دووبارە ئەوەی هەموو پێچاوەتەوەو قرتاندوویەتی، کە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ: یانی: کاتیان داناوەو، مووساو هارون ئاگادار کرانەوەو، شوێنێکیان دیاریکردو، کاتێکیان دیاریکرد، وەك لە سوورەتی (طه)دا مووسا ﵇ پێیان دەفەرموێ: ﴿ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ ﴾، لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ ﴾طه، شوێنێکی تەخت بێ بۆ ئەوەی دیار بێ، ڕۆژەکەشی ڕۆژی جەژن بێ و، خەڵك دەمەو چێشتەنگاو کۆبکرێنەوە، لەبەر ئەوە چێشتەنگاو وردە وردە خۆر دەکەوێتە نێوەڕاستی ئاسمان، ڕۆژی جەژنیش بێ، ڕۆژێکیان هەبووە ڕۆژی جوانیی (یوم الزینة) خۆیان تێدا ڕازاندۆتەوە، جەژن و بۆنەیەك بووە، شوێنەکەش تەخت بێ، گردۆلکەو تەپۆلکەی لێ نەبن، بۆ ئەوەی هەموو خەڵك ببینێ، ئەو کەسەی هەقی پێبێ، پێی خۆشە لە تەختایی خەڵك کۆبێتەوە، نەك لەپەناو پەسیوان و، لەپشت گردۆلکەو دۆڵ و شیوان، هەروەها هەتا خەڵکی زیاتر لێبێ، پێی خۆشترە، چونکە هەقی پێیە، (ئەوەی پاکە بێ باکە)، دیسان پێشی خۆشە کاتێك بێ، خۆر بە نێوەڕاستی ئاسمانەوە بێ، بۆ ئەوەی

هیچ حەشارگەو نەدیوێک نەبێ خەڵک خۆی تێبکرێ، بوولێڵی تێوارە نەبێ، یاخود بوولێڵی بەیانی، یاخود تاریکایی شەو.

ئنجا لەو کات و حاڵەدا: ﴿ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴾، مووسا ﷺ پێی فەرموون: ئەوەی ئێوە فڕێدەرینی، فڕێی بدەن، زانیویەتی گۆچان و پەت و گوریسیان هێناون و، جادووەکەیان بە هۆی گۆچانەکان و گوریس و پەتەکانیانەوە دەکەن، هەرچی فڕێی دەدەن فڕێی بدەن و بێ منەت بن، ﴿ فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾، پەتەکانیان و گۆچانەکانیان فڕێ دان و گوتیان: بە هۆی عیززەتی فیرعەونەوە بەدڵنیاییەوە ئێمە زاڵ دەبین، یاخود سوێند بە عیززەتی فیرعەون، ئێمە زاڵین.

﴿ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ ﴾، مووساش گۆچانەکەی فڕێدا [خۆی و گۆچانی و هاروونی براشی] ﴿ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴾، یەکسەر کت و پڕ گۆچانەکەی، ئەوەی کە ئەوان بەدرۆ هەڵیان بەستبوو، قووتی دا، لەشوێنی دیکە دەفەرموێ: گۆچانەکەی بوو بە مارێک، ئنجا ئەو شتانەی کردبوویانن، هەرچی گۆچان و پەت و گوریس بوو، هەموویانی قووت دان، دەبێ بووبێتە ئەژدیهایەک و حەزیایەکی زۆر گەورە، لە کتێبەکاندا باس دەکات، کە بۆتە ئەژدیهایەکی زۆر زۆر گەورەو ئەو پەت و کوریس و گۆچانانە، هەر خوا دەزانێ: سەدان گۆچان و پەت و گوریسیان هێناوە، هەموویانی قووت دابن، دیارە گەورە بووە.

لە هەندێک لە گێڕدراوەکاندا هاتوە: مارەکە هێندە گەورە بووە، دەوری هەموو ئەو خەڵکەی داوە کە کۆبوونەتەوەو سەری خستۆتە سەر کلکی و دەمیشی کردۆتەوە! بەڵام بە هەر حاڵ ئەو وردەکارییانە لە قورئانێدا نەهاتوون، گرنگ ئەوەیە ئەو هەموو گوریس و گۆچان و پەتانەی قووت دابن، دیارە زۆر گەورە بووە.

﴿ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴾، ئنجا یەکسەر جادووگەرەکان بەکڕنووش داخران، وەک ویستی ئازادی خۆیان لەدەست دابێ، لە بەرانبەر ئەو موعجیزەیەی

مووسادا ﷺ، چونکە هەر خاوەن هونەرێك دەزانێ هونەرەکەی هەتا کوێ بڕ دەکات، ئەوان کە جادووگەر بوون، زانیویانە جادووەکەیان هەتا کوێ بڕ دەکات! ئنجا کە ئەوەی مووسایان ﷺ دیوە، گوتوویانە: جادووی چی! ئەوە جادوو نیەو شتێکی دیکەیە، بۆیە یەکسەر ئەوانە بە کڕنووشدا کەوتوون، ﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، گوتیان: بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری جیهانییان، نەك بە فیرعەون کە خۆی بە پەروەردگاری ئەو خەڵکە دەزانێ، پەروەردگاری جیهانییان کێیە؟ ﴿ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴾، (بە تایبەت) پەروەردگاری مووساو هاڕوون کە بەم شێوەیە خەم دەخوات لە مووساو هاڕوون، بەم شێوەیە پشتیوانییان دەکات و شتێکی پێداون نیسپاتی پێغەمبەرایەتییان بکات، ئا ئەوە پەروەردگارە، ئا ئەوە مشوورخۆرو خاوەنە!

ئنجا فیرعەون لێرەدا چی بڵێ؟ ﴿ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ﴾، (فیرعەون) گوتی: ئایا بڕواتان بۆ هێنا، بەر لەوەی مۆڵەتتان بدەم؟ فیرعەونەکان پێیان وایە: خەڵك نەك دەبێ ئازادیی بیرو ڕای نەبێ، بەڵکو دەبێ ئازادیی بیر کردنەوەشی نەبێ، دەبێ عەقڵیشی بە مۆڵەتی ئەوان ئیش بکات و، دڵ و ئیرادەشی لە ژێر کۆنترۆڵی ئەواندا بێ! ئایا بڕواتان پێ هێنا؟ ئایا بڕواهێنان بە دەست مرۆڤە؟ دەبێ هەڵقوڵاوی قەناعەتی زاتیی مرۆڤ بێ، بەڵام فیرعەونەکان زۆر لەخۆیان ڕادەبینن، پێیان وایە کە نەك هەر خاوەنی ڕواڵەتی مرۆڤەکانن، بەڵکو خاوەنی دڵ و دەروونیشیانن، خاوەنی ویستیشیانن، خاوەنی دیوی پەنهانیشیانن!!

﴿ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ﴾، ئنجا یەکسەر فیرعەون تۆمەتباریان دەکات و دەڵێ: ئەوە ئەو مامۆستایەتانە، ئەو گەورەیەتانە کە جادووی فێر کردوون، ئاخر فیرعەون! تۆ خۆت جادووگەرەکانت کۆکردوونەوەو، بە مسۆگەریی پێشتر ئەو جادووگەرانە دەرسیان خوێندوە، خولیان هەبووە، خەڵکی شارەزاکەریان هەبووەو، هەر لەخۆڕا نەبوونەتە جادووگەر، جادووش زانستێکە

دەخوێنرێ، ئەدی چۆن فیرعەون وا دەڵێ؟ مووسا کەی ئەوانەی بینیوە؟ مووسا دوای ئەوەی کابرا قیبتییەکەی کوشتوە، قاچاغ بووەو دە (١٠) ساڵان شوانیی کردوە لەلای مەدیەن، ئەو شوێنەی دەسەڵاتی فیرعەونی بەسەردا نەشکاوەو لەوێش هاوسەرگیریی کردوە، دوایی خوا کردوویەتی بە پێغەمبەرو هاتۆتەوە، جادووگەرەکانی هەر نەبینیوە، بەڵام حوکمڕانە خۆسەپێنەکان ئاوان، چەکی تۆمەت، چەکی ناشیرین کردن، چەکی چەواشە کردنی خەڵك، بەکاردەهێنن لە دژی ئەوانەی هەڵگری پەیامی خواو پەیامی هەقن.

ئنجا فیرعەون هەڕەشەیان لێدەکات: ﴿ فَلَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴾، بە دڵنیایی لەمەودا دەزانن، یانی: دەزانن چیتان پێ دەکەم! ئایا چییان پێ دەکات؟

﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾، بە مسۆگەریی دەستەکانتان و لاقەکانتان بە پێچەوانەوە دەبڕم (واتە: دەستی ڕاست و لاقی چەپ، هی هەر کامێکتان) بە دڵنیاییش هەمووتان تێکڕا هەڵدەواسم، لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ ٧١ ﴾، واتە: بە قەدەکانی دارخورمایانەوە هەڵتان دەواسم، بە گلۆپکی دارخورما، دەستی ڕاستیان دەبڕێ و لاقی چەپیان دەبڕێ، هەڵیشیان دەواسێ تاکو خوێنیان لێ دەبڕێ!

ئنجا جادووگەرەکان چی دەڵێن؟ ﴿ قَالُواْ لَا ضَيۡرَۖ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴾، گوتیان: ئەوە هیچ زیانی نیە، چونکە ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەچینەوە، کە بۆ لای ئەو دەچینەوە، هەرچی تۆ لێمان دەستێنی، خوا زۆر بەزیادەوە دەمانداتێ، پاداشتمان دەداتەوە.

پێشێ کە ئیمانیان نەهێنابوو، چاوەڕێی خەڵات و بەراتێکی بچووکیان دەکرد، بەڵام ئێستا نەك لە خەڵات و بەراتەکەی فیرعەون بێ منەتن، لە کوشتنیش بێ منەتن.

﴿ إِنَّا نَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، ئێمە ئومێدمان وایە کە پەروەردگارمان لە گوناهەکانمان ببوورێ، لەو جادووەی کە کردوومانەو،

لێرە لە دژی دوو پێغەمبەرەکەی خوا هاتووینە مەیدانێ: مووساو هارووون، ﴿ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بە هۆی ئەوەوە ئێمە بووینە یەکەمی بڕواداران، واتە: لە خەڵکی میسر، دەنا بەنوو ئیسرائیل پێش ئەوان ئیمانیان هێنابوو.

ئنجا خوا ﷻ دەگوازێتەوە لە بەسەرهاتی مووساوە، بۆ قۆناغێکی دی، کە لێرەدا زۆر شت پێچراوەتەوە، چونکە مووسا ﷺ چەندان موعجیزەو نیشانەی دیکە پێشانی فیرعەون و دارو دەستەکەی دەدا، کەچی ئەوان هەر بڕواناهێنن، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا بە تەفصیل باسمان کردوە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴾، سروشمان کرد بۆ لای مووسا وەحییمان بۆ کرد، کە سەفەری شەوێ بەبەندەکانی من بکە، شەوڕۆیان پێ بکە، بەشەو دەربازیان بکە، چونکە ئێوە لە ڕاوەدوونراوانن، (مُتَّبَع) کەسێکە یەکێ دیکە ڕاوی بنێ و بەدوای بکەوێ، یانی: ئێوە خەڵك بەدواتان دەکەوێ، کە فیرعەون و دارودەستەکەیتی، ﴿ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَـٰشِرِينَ ﴾، فیرعەون بەشاراندا کۆکەرەوانی ناردن، جارچییانی نادرن، تاکو چی بڵێن؟ ﴿ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴾، بڵێن: ئا ئەمانە کۆمەڵێکی بەش بەشی، کەمن، واتە: ئەو بەنوو ئیسرائیله کە مووسا خۆی لێکردنە خاوەن و، گەلێکی ستەملێکراون و مووسا بەرگرییان لێدەکات و دەیەوێ دەربازیان بکات، ئەوانە کۆمەڵێکی پەڕاگەندەی کەمن.

هەڵبەتە ئەوە کاتێك بووە کە مووساو هارووونی برای و گەلەکەی دەرچوون لە میسر، ئنجا دوایی کە فیرعەون پێی زانیوە، یەکسەر بە خێرایی جارچیی ناردوون بە شاراندا خەڵك کۆبکەنەوەو هەرچی سوپایە بێ، بۆ ئەوەی ڕاوەدوویان بنێن و بڵێن: ئەوانە کۆمەڵێکی پەڕاگەندەی کەمن، ﴿ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴾، هەروەها ئەوانە بۆ ئێمە زۆر پەستکەرن، زۆر بێزارکەرن، ئێمەیان زۆر تووڕە کردوە، ﴿ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَـٰذِرُونَ ﴾، ئێمەش کۆمەڵێکی تۆکمەین و زۆریش وریاین و ئامادەین،

چـەك و چۆڵـمان، هێـزو پێزمـان، تۆكمەیـمان، كەچـی ئـەوان لـە دەسـتی ئێمـە ڕایـان كـردوە! یەڵـڵا بـا بڕۆیـن بەدوایـان دا، ﴿ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴾، ئیـدی ئێمـە فیرعـەون و دەسترۆیشـتووانی و سـوپایەكەیمان، هێنانـە دەرێ لـە بـاغ و بێسـتانەكان و لـە كانیـی و سـەرچاوەكان، ﴿ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴾، هەروەهـا لـە خەزنـەكان و لـەو جێـگاو ڕێـگا خۆشـە كـە تێیـدا بـوون، ئـەو كۆشـك و تەلارانـە كـە تێیـان دا بـوون، ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾، هـەر بـەو شـێوەیە، كـە ئەوەنـدە شـتێكی سەرسـوڕهێنەر بـوو، هـەر دەبـێ بـە خـۆی بچوێـنرێ، بـەو شـێوە سەرسـوڕهێنەرە، ﴿ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، لـە شـێوەی ئـەوەی فیرعـەون و دارو دەسـتەكەی لـە میسـر بەجێیـان هێشـت، لـە شـێوەی ئەوەمـان كـردە میراتـی بەنـوو ئیسـرائیل، وەچـەی ئیسـرائیل، لـە كـوێ؟ بێگومـان لـەو شـامە كـە دوایـی سـەفەری بـۆ دەكـەن و، كۆچـی بـۆ دەكـەن، نەگەرنا هەرچەنـدە هەنـدێ لـە توێـژەرەوان گوتوویانـە: دوایـی بەنـوو ئیسـرائیل گەڕاونـەوە بـۆ میسـر، دوای ئـەوەی كـە فیرعـەون و دارو دەسـتەكەی خنـكاون، بـەڵام ئـەوە لـە قورئانـدا بـاس نەكـراوەو ڕاسـتیش نیـە، ئـەوان كـە لـە دەریـای سـوور پەڕینـەوەو لـە دەسـتی فیرعـەون و سـوپایەكەی ڕزگاریـان بـوو، فیرعـەون و سـوپایەكەی نغـرۆ بـوون، ئەوانیـش كـە پەڕینـەوە لـە دەریـای سـوور، یەكسـەر پەڕینـەوە بـۆ دەشـتی سـیناو، دوایـی بـەرەو شـام و فەڵەسـتین هاتـوون.

كەواتـە: كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، یانـی: شـێوەی ئـەوە كـە فیرعـەون و سـوپاو دارو دەسـتەكەی بەجێیـان هێشـت، لـە میسـر لـە باخـەكان و كانیـی و سـەرچاوەكان و، جێـگاو ڕێـگای خـۆش، شـێوەی ئەوەمـان كـردە میراتـی گەلـی یەعقـووب و وەچـەی یەعقـووب ﷺ، ﴿ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴾، ئنجـا دەمـەو خۆرهـەڵات كەوتنـە شـوێنیان، بەدوایـان كەوتـن، سـوپایەكە ئامـادە بـوو و كەوتنـە شـوێنیان، دیـارە لـە میسـرەوە تاكـو دەگاتـە دەریـای سـوور، مەسافەیەكی زۆری هەیـە، گرنـگ ئەوەیـە لەوێـرا كەوتنـە دوایـان، ﴿ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ ﴾، ئنجـا كاتێـك دوو كۆمەڵەكـە لێـك وەدەركەوتـن، لێـك ئاشـكرا بـوون، بەنـوو ئیسـرائیل

گەیشـتوونە لای دەریـای سـوور، سـوپای فیرعـەون و دارو دەستەکەشـی بـە دوایانـەوەن، گوتیـان: پێشـمان دەریایـەو دوامـان سـوپایە، ﴿ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴾، [کاتێـك دوو کۆمەڵەکـە لێـك وەدەرکەوتـن] هاوەڵانـی مووسـا گەلەکـەی گوتیـان: ئێمـە گیرایـن، دەگیرێیـن و فریامان دەکـەون، دەمانگەنـێ، ﴿ قَالَ كَلَّآ ۖ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴾، مووسـا ؊ فەرمـووی: نەخێـر، هەرگیـز وانیـە، مـن پـەروەردگارم لەگەڵـم دایـە، ڕێـم پێشـان دەدا چـی بکـەم و چـۆن بکـەم؟ چـۆن دەربازبـم لـەو حاڵـە کـە تێیکەوتوویـن؟ ﴿ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ ﴾، یەکسـەر سروشـمان بـۆ لای مووسـا کـرد: کـە بەگۆچانەکـەت لـە دەریاکـە بـدە، بـەس گۆچانێکـی لـێ بـدە، ئـەو گۆچانـە بـەس ئـەوە نیـە ببێتـە ئەژدیهـاو جـادووی جادووگـەرەکان قـووت بـدات، زۆر شـتی دی پـێ دەکـرێ، گۆچانێـك لـە دەریاکـە بـدە، گۆچانێکـی لـە دەریاکـە دا، شـەق بـوو، ﴿ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ﴾، هـەر بەشـێکی، هـەر پارچەیەکـی ئـەو دەریایـە کـە لـەت بـوو، وەك چیایەکـی مەزنـە. چونکـە دەریـای سـوور وەك هـەر دەریایەکـی دیکـە لـە دەریـا گـەورەکان، جـاری وایـە چەنـد کیلۆمەترێـك قووڵـە، لەوانەیـە چـوار پێنـج کیلۆمەتـر بـێ، بەڵکـو شـوێنی قووڵـی وا هەیـە، دەگاتـە (١٠ - ١٥) کیلۆمەتـر.

ئنجـا تـۆ بێنـە چیایـەك زۆر بـەرز بـێ، هـەر دە (١٠) کیلۆمەتـرە، چیـای هیمالایـا دەوری نـۆ کیلۆمەتـرە (٨٨٦٤)م، بێگومان دە پـازدە (١٠ - ١٥) کیلۆمەتر زۆر زۆرە، ئنجا کـە دەریاکـەش شـەق بـووە، گەیشـتۆتە تەختـی بنـی، ئنجـا لـە تەختـی بنیـڕا تاکـو سـەری سـەرێ بـێ، هـەر بەشـێکی وەك پارچـە چیایەکـە، بۆیـەش ئـەم ئایەتـە ئامـاژە بـەوە دەکات، کـە وەنەبـێ هەمـووی بووبێتـە داڵانێـك و هەموویـان بـەو داڵانـەدا بـڕۆن، بەڵکـو ﴿ كُلُّ فِرْقٍ ﴾، هـەر بەشـێکی وەك چیایـەکی مـەزن بـووە، ئەگەرنـا دەیفەرمـوو: (فَكَانَ فِرْقَيِ البَحْرِ) دوو بەشـەکەی دەریـا، بـەڵام ﴿ كُلُّ فِرْقٍ ﴾ وەك لـە پەیمانـی کۆنـدا هاتـوە دەڵـێ: بـوو بـە دوازدە (١٢) داڵان، چونکـە بەنـوو ئیسـرائیل دوازدە تیـرە بـوون، بـە ژمـارەی کوڕەکانـی یەعقـووب، یەعقـووب ؊ دوازدە کـوڕی

هەبوون، یوسوف و بنیامینی برای لەگەڵ برایەکانی دیکەیان، دوازدە برا بوون، ئنجا هەر کامێك لە کوڕەکانی یەعقووب، کوڕو کچ و نەوەو وەچەیان بووەو بوونە دوازدە هۆز و تیرە، کە بێگومان هەر هۆزو تیرەیە سەرپەرشتیارێکی خۆی هەبووە، بۆیە خوا ﷻ دەریاکەی بۆ کردوونە دوازدە (١٢) داڵان، تاکو هەر تیرەو هۆزە بەداڵانی خۆیدا بڕوا، ﴿ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ﴾، دوایی ئەوانی دیکەمان وەنیزیك خستن، واتە: لە دەریاکەمان نیزیك خستن ﴿ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ﴾، مووساو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون هەموویانمان دەرباز کردن، ﴿ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴾، دوایی ئەوانی دیکەمان نغرۆ کردن، دوای ئەوەی کە کۆتا کەسی بەنوو ئیسرائیل لە دەریادا دەچێتە دەر و، کۆتا کەسی فیرعەون و سوپاو دارو دەستەکەشی دێنە نێو دەریاوە، بەبێ ئەوەی بیانگەنێ، دەریا وێك دەکەوێتەوە! کەواتە: بۆ مووساو گەلە ستەملێکراوەکەی، خوا دەریاکەی لەت کردوە، هەروەها بۆ ئەوەش کە فیرعەونیشی تێدا بخنکێ، لەگەڵ سوپا ستەمکارەکەی دا.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانەیەکی مەزن هەیە، بەڵام زۆربەیان بڕوادار نین، واتە: زۆربەی خەڵکی ڕۆژگاری تۆ ئەی موحوممەد! یان زۆربەی ئەوانە کە پەیامی خوایان پێ دەگات، نابنە بڕوادار، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیاییش تەنیا پەروەردگاری تۆ زاڵی میهرەبانە، زاڵ و دەسترۆیشتوویە، باڵادەستە بۆ ناحەزو دوژمنەکان، میهرەبان و بەبەزەییشە بۆ دۆستەکانی.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، هەم عیززەتی خۆیمان پێشان بدات، لە ڕۆژگاری خۆماندا لەبەرانبەر دوژمن و ناحەزانماندا، کە دوژمن و ناحەزی پەیامی خوان، هەروەها نەرم و نیانیی و بەزەیی خۆیشیمان پێشان بدات و، ئێمە لەو کەسانە بین کە شایستەی ئەوەبین دۆستی خوا بین و، خوا بەزەیی و میهرەبانیی خۆیمان بۆ بەکاربێنێ و، مشوورمان لێ بخوات و سەرمان بخات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**نێردرانی مووسا لەلایەن خواوە بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی و، مەترسیی پێشاندانی مووسا، لە بەدرۆ دانانیان لەلایەن فیرعەون و گەلەکەیەوە، زمان پاراو نەبوون و دڵتەلک بوونی، لە تۆڵە لێکرانەوەی، بە هۆی کوشتنی کابرایەکی قیبتییەوە، دڵنیاکردنەوەی لەلایەن خوای میهرەبانەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِى وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّا ۖ فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ ۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ ﴾، یاد بکەوە! کاتێ پەروەردگارت بانگی مووسای کرد (إذ: إسم الزمان مَنصوب بِاذكر) یاد بکەوە! کەی یاد بکاتەوە؟ ئەو کاتەی پەروەردگارت بانگی مووسای کرد، بۆچی دەفەرموێ: (نَادَى) و نافەرموێ: (أَوْحَينا)؟ چونکە لێرە لەو مەقامەدا کە یەکەمجار خوا ﷻ مووسای کردۆتە پێغەمبەر، بانگی کردوە، نەك وەحیی بۆ ناردبێ، وەك پێغەمبەرانی دیکە، لە شێوەی فریشتەیەکدا، یان لە شێوەی دەنگێدا، بەڵکو بەشێوەیەك بانگی کردوە، کە بەس خوا خۆی دەزانێ و مووسای ﷺ دواندوە، وەك لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ ﴾النساء،

بۆیەش فەرموویەتی: (نادی) (لأنّهُ سَمِعَ كَلَامَ اللهِ مِن غَيرِ واسِطَةِ مَلَكٍ)، مووسا عليه السلام فەرمایشتی خوای جل جلاله بیست، بەبێ ئەوەی فریشتەیەك ببێتە نێوەندگیر لە نێواندا.

ئنجا خوا کە بانگی مووسای عليه السلام کرد، چی پێ فەرموو؟

٢)- ﴿ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴾، بچۆ بۆ لای کۆمەڵی ستەمکاران، گەلی فیرعەون (پێیان بڵێ) ئایا پارێز ناکەن؟

کەواتــە: ڕســتەی: ﴿ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ نێوەڕۆکــی دواندنەکــەی خــوای پــەروەردگارە بــۆ مووســا عليه السلام: بچــۆ بــۆ لای کۆمەڵــی ســتەمکاران، ســتەمی گەلــی فیرعەونیــش، هــەم لــە شــیرکدا بــووە، هــەم لــە کوفــردا بــووە، هــەم لــە پێشــێل کردنــی مافەکانــی گــەلی بەنــی ئیســڕائیلدا بــووە، هــەم لــە بــە کۆیلــە کردنیانــدا بــووە، هەروەهــا لــە ســەربڕینی نێرینەکانیــان و لــە هێشــتنەوەی ئافرەتەکانیــان و، لــە ســۆغرەو بێگار پێکرانیــان و ... هتــددا، ئــەو ســتەمە لــە زۆرشــت دا بەرجەســتە بــووە.

ئنجــا ئەمــە کــە مووســا عليه السلام دەفەرمــوێ: ﴿ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ﴿ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ﴾، ﴿ أَلَا يَتَّقُونَ ﴾، ئــەوە دەگەیەنــێ کــە مووســا بــە پلــەی یەکــەم نێرراوە کــە بەنــوو ئیســڕائیل دەربــاز بــکات لــە چنگــی فیرعــەون، بــەڵام هــاوکات لەگــەڵ ئــەوەدا، نێردراویشــە تاکــو فیرعــەون و گەلەکەشــی بڕوابێنــن، نەگەرنــا خــوا جل جلاله دوایــی لەســەر ئــەوە کــە بڕوایان پــێ نەهێنــاوە، ســزای نــەدەدان، کەواتــە: مووسا بــۆ لای قیبتییەکانیــش نێــردراوە.

ڕستەی: ﴿ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ﴾، جێگرەوە (بَدَل)ی (القوم الظالمين)ە.

﴿ أَلَا يَتَّقُونَ ﴾، پێیــان بڵــێ: ئایــا پارێــز ناکــەن؟ ئــەم هەمــزەی ئیســتیفهامە، بــۆ نکووڵییلێکردنــە، ئنجــا (ألا) دەگونجــێ هەمــزە (أ)کــە بــۆ پرســیار کردنــی نکووڵییلێکەرانــە بــێ و، (لا)یەکــە، (لا)ی لابــردن بــێ، (ألا يتقون) ئایــا پارێــز ناکــەن؟ دەشــگونجێ (ألا) لــە (ألا يتقون)دا، هەمــووی یــەك وشــە بــێ، بــۆ ئــاگادار کردنــەوە بــێ، واتــە: ئایــا خۆتــان ناپارێــزن لــە تووڕەبوونــی خــواو جەزرەبــەی خــوا جل جلاله؟

٣)- ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴾، مووسا عليه السلام فەرمووی: پەروەردگارم! من دەترسێم بە درۆم دابنێن، ئەسڵی ئەم تەعبیرە ئاوایە: (إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبونِي) من دەترسێم ئەوان بەدرۆم دابنێن، بەڵام (ي)کە دەفرتێنرێ لەبەر ئەوەی ژێر (كسرة)ەکە دەلالەتی لەسەر دەکات.

٤)- ﴿ وَيَضِيقُ صَدْرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي ﴾، مەترسیی ئەوەشم هەیە سینەم تەنگ بێ و، زمانیشم دەرنەچێ، واتە: زمانیشم بگیرێ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە بە درۆم دادەنێن، دڵم توندو سەغڵەت بێ و سینەم تەنگ بێ، زمانیشم گۆ نەکات، بە سروشت وایە ئینسان ئەگەر ناڕەحەت بوو و سینەی تەنگ بوو، زمانیشی باش قسەی بۆ نایەت.

٥)- ﴿ فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴾ ئنجا بۆیە بنێرە بۆ لای هاڕوون، واتە: با هاڕوونیشم لەگەڵدا بێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَأَخِى هَٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّى لِسَانًا ﴿٣٤﴾ ﴾القصص، هاڕوونی براشم ئەو زمانی لە من پاراوترە، ئەگەر من زمانم گیرا، با ئەو هاوکارم بێ.

٦)- ﴿ وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ ﴾: بۆ ئەوان گوناهێك لەسەر من هەیە، واتە: سزای گوناهێك، یاخود مافی گوناهێکیان لەسەر من هەیە، گوناهێکم دەرهەق کردوون، ﴿ ذَنۢبٌ ﴾ بریتیە لە تاوانێك، بریتیە لە سەرپێچیی کردنی یاساکانی ئەوان، لە سووڕەتی (القصص) دا لە ئایەتەکانی: (١٥ - ٢١) خوا باسی ئەوە دەکات، کە مووسا چۆن ئەو کابرا قیبتییەی کوشتوە کە لەگەڵ یەکێ بەنوو ئیسرائیلیی دا تێك گیراوەو، ستەمی لە کابرا بەنوو ئیسرائیلییەکە کردوە، مووساش عليه السلام ڕقی لە ستەم بووە و، ویستوویەتی ئەو کەسەی ستەم دەکات لەو ستەملێکراوە، دووری بخاتەوە، ڕەنگە ئەویش دوور نەکەوتبێتەوە، ﴿ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ﴾القصص، ﴿ فَوَكَزَهُۥ ﴾ (أي: ضَرَبَهُ بِقَبْضَةِ يده) دەستی کۆ کردۆتەوەو، بۆکسێکی لێداوەو کوشتوویەتی، مووسا پیاوێکی زۆر بەهێز بووە، کابراش ئەجەلی هاتوەو بەو بۆکسەی مووسا ڕۆیشتوە.

٧)- ﴿ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴾، بۆیە دەترسێم کە بمکوژن، وەك لە مانای گشتییەکەشدا گوتمان، لە ڕاستییدا مووسا عليه السلام لە خودی کوشتنەکە نەترساوە، بەڵام لەوە ترساوە کە

کوشتنەکەی ببێتە کۆسپ لەبەردەم گەیاندنی پەیامی خوادا، ئەوەی کە جێی سەرنجی مووسا بووەو، ئەوەی کە خولیای بووەو بیری لێکردۆتەوە، ئەوە بووە: چۆن پەیانی خوا بگەیەنێ؟

ئنجا فەرموویەتی: کاتێك دەچمە لایان ئەگەر بەدرۆم دابنێن و، سینەم تەنگ ببێ و، زمانم گۆ نەکاو بگیرێ و، دوایی هەقی ئەو گوناهەشیان لەسەرم هەیە، دەترسم بمکوژن، مانای وایە پەیامەکەی تۆم بۆ ناگەیەنرێ!

٨)- ﴿ قَالَ كَلَّا ﴾، (خوا) فەرمووی: نەخێر، (كَلاَّ: حَرْفُ إِبْطَالٍ) (كَلاَّ) وشەیەکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی قسەیەك بەکاردێ، بەڵام لێرەدا کە توندییەکی تێدایە، توندییەکە بۆ ئەوەیە، کە نەخێر ئەوان، ناتوانن بتکوژن، (كَلاَّ)یەکە بۆ ئەوانە، واتە: نەخێر ئەوان توانای ئەوەیان نیە، حەددی ئەوەیان نیە تۆ بکوژن.

٩)- ﴿ فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾، بە نیشانەکانمانەوە برۆن، تۆو هاروون.

مانای وایە داوایەکەی جێبەجێ بوو.

١٠)- ﴿ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴾، ئێمەش لەگەڵتانین، باش گوێگرین، واتە: گوێ لە قسەکانی تۆش و، هاروونی براشت و، فیرعەونیش و دەستەو دایەرەکەشی، دەگرین گوێمان لە قسەی هەمووانە.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴾ (الإِسْتِمَاعُ تَكَلُّفُ السَّمَاعِ، وَالمَقْصُودُ بِهِ الإِعْتِنَاءُ والإِهْتِمَام) (إِسْتِماع) بریتیە لەوە کە ئینسان زۆر لە خۆی بکات و، گوێ بگرێ، بە کوردیی دەگوترێ: گوێ هەڵخستن، کە ئەمە گرنگیی پێدان و مشوور لێخواردن دەگەیەنێ.

١١)- ﴿ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ ﴾، هەردووکتان بچن بۆ لای فیرعەون.

١٢)- ﴿ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، پێی بڵێن: ئێمە ڕەوانە کراوو، نوێنەری پەروەردگاری جیهانییانین، واتە: ئێمە لەلایەن پەروەردگارەوە نێردراوین، لێرەدا (رسول:

فَعُولٌ بِمعنَي: مُفْعَل، أي مُرسل) ئێمە ڕەوانە کراوین لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە، کەواتە: ئەو ئیددیعایەی تۆ دەیکەی و دەڵێی: ﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾النازعات، یان دەڵێی: ﴿ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾الشعراء.

ئەو قسانە، قسەی بۆشن، تۆش مرۆڤی، پەروەردگاری جیهانییان، زاتێکە ئەم گەردوونە هەڵدەسووڕێنێ و تۆشی دروستکردوە.

١٣)- ﴿ أَنۡ أَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾، بە فیرعەون بڵێن: بەنوو ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرە، واتە: ئەگەر گەلەکەشت ئیمان ناهێنن، بەلای کەمەوە گەلەکەی خۆمان، ئەو گەلە چەوساوەو کەساسەمان لەگەڵ بنێرە، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡۖ ﴿٤٧﴾ ﴾طه، واتە: بەنوو ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرەو چیدیکە مەیانچەوسێنەوە، ئازارو ئەشکەنجەیان مەدە، ﴿ أَنۡ أَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾ (هَذِهِ جُمْلَة تَفسِيرِيَّة لِرَسول رَبِّ العالمين)، ئەم ڕستەیە هەمووی ڕوونکردنەوەیە بۆ ڕستەی (رَسولُ رَبِّ العالمين) یانی: ئێمە نێردەی پەروەردگاری جیهانییانین، هاتووین کە گەلی بەنوو ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێری، (أَرْسِل: أَطْلِق، لا تَحْبِسهُم) چیدیکە لەلای خۆت گیریان مەدەوە، چیدیکە کۆنترۆڵیان مەکە، ژێردەست و بندەستیان مەکە، وەك کۆیلە مامەڵەیان لەگەڵ مەکە.

**مەسەلەی دووەم:**

**چاکە بە چاو دادانەوەی فیرعەون بۆ مووسا ﷺ کە کاتی خۆی لە ماڵی واندا بەخێو کراوە، کەچی سپڵە بووەو کەتنێکیشی کردوە، پیاوێکی کوشتوە، وەڵام دانەوەی مووساش بۆ هەردوو قسەکەی فیرعەون، بەڵام چ وەڵامێك، وەڵامێکی ددان شکێن:**

﴿ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلْتُهَا إِذًا وَأَنَا مِنَ الضَّالِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْمًا وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٢٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

وەك پێشتر گوتمان لە مانای گشتییدا: خوای پەروەردگار ئەوەی هەموو پێچاوەتەوە کە مووساو هارون چوون و داوایان کرد فیرعەون ببینن و، دەرگاوان لە دەرگایان داو، دەروازە کرایەوەو، ئەو هەموو وردەکارییانە تاکو لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بوونەوە، قسەو مشت و مڕیان بووەو ... هتد ئەوە هەموو پێچراوەتەوە، یەکسەر هاتۆتە سەر وەڵامی فیرعەون:

١)- ﴿ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا ﴾، فیرعەون گوتی: ئایا بە منداڵیی لەنێو خۆماندا بەخێومان نەکردی، لەماڵی ئێمەدا؟ ئەم پرسیار کردنە، پرسیار کردنی دانپێیدا هێنانە، واتە: تۆ دەزانی و دانی پێدادێنی کە لە نێو ئێمەدا بەخێو کرای، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی لازیمەکەی و دەرهاویشتەکەیەتی، واتە: تۆ دەبێ لەگەڵ ئێمەدا چاکەکار بی و گوێڕایەڵ و فەرمانبەر بی، چونکە تۆ بەخێو کراوی خۆمانی.

٢)- ﴿ وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴾، [نەك هەر بەخێومان کردی] چەندان ساڵ لە تەمەنت لەگەڵ ئێمەدا گوزەراندت، لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: چل (٤٠) ساڵ، واتە: مووسا

ﷺ تاکو تەمەنی بۆتە چل ساڵ، هەر لە ماڵی فیرعەون و لە کۆشکی فیرعەوندا بووە، دەشگونجێ بیست ساڵ یان سی ساڵ بووبێ، چونکە ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ﴿١٤﴾ ﴾القصص، کاتێك کە گەیشتە ئەوپەڕی تین و تاقەتی خۆی و تەواو پێگەیشت، هەندێ لەزانایان وایان لێك داوەتەوە کە دەبێ بووبێتە چل ساڵ، چونکە دوایی دەفەرموێ:

﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ۖ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ﴿١٥﴾ ﴾القصص.

کەواتە: ئەو کاتە کابرای قیبتیی کوشتوە دەبێ تەمەنی چل ساڵ بووبێ، چونکە دوای ئەوە بووە کە گەیشتۆتە حاڵەتی (أشُدّ) واتە: تەواو پێگەیشتوە لەڕووی جەستەو عەقڵ و دەروون و ... هتدەوە، (وَٱسْتَوَىٰٓ ) گەیشتۆتە حاڵەتی تێرو تەواویی، بەڵام بەڵگەیەکی دڵنیاکەرمان بە دەستەوە نیە، کە ئەوکاتە تەمەنی چل ساڵ بووبێ.

٣)- ﴿ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ ﴾، ئەو کەتنەت کرد کە کردت، واتە: کردەوەیەکی زۆر دزێوو ناقۆڵات کرد، کە بریتی بوو لە کوشتنی بابای قیبتیی، لێرەدا کە دەڵێ: ﴿ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ ﴾ سێ جاران وشەی کردار (فعل) دووبارە بۆتەوە، ئەوە بۆ ناشیرین کردن و ناقۆڵا پێشاندانی کردەوەکەی مووسایە ﷺ، هەڵبەتە لە تەورات لە (سفر الخروج، الإصحاح: ٧)دا هاتوە دەڵێ:

مووسا لە تەمەنی چل (٤٠) ساڵیدا قیبتییەکەی کوشتوەو لە تەمەنی هەشتا (٨٠) ساڵیدا خوا ﷻ وەحیی بۆ ناردوە، بەڵام ئەوە قسەی تەوراتەو پشتی پێ نابەسترێ.

ئنجا فیرعەون لەسەر قسەکەی خۆی بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

٤)- ﴿ وَأَنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، واتە: تۆ لە سپڵان و ناسپاسان بووی، ئەو کاتەی کە لە ماڵی ئێمەدا بەخێو کرای کەچی کەسێکت لە گەلەکەی من کوشت، یاخود تۆ ئێستا سپڵەو ناسوپاسی کە یەخەمان دەگری و داوا دەکەی گەلی بەنوو ئیسرائیلت لەگەڵ دا بنێرین.

دەشـگونجێ وشـەی (کافر) مەبەسـت پێـی کوفرانـی نیعمـەت نەبـێ و، مەبەسـت پێـی بێبڕوایـی بـێ، واتـە: تـۆ بـێ بـڕوای بـە دینەکەمـان، ئـەو دیـن و بیروبەرنامەیـەی ئێمـە هەمانـە، یـان هـەر ئـەو کاتـەش بێبـڕوا بـووی.

مووساش ﷺ، وەڵام دەداتەوە دەفەرموێ:

٥)- ﴿ قَالَ فَعَلۡتُهَآ إِذٗا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾، گوتی: ئەو کاتەی ئەو کەتنەم کرد، ئەو کردەوەیەی تۆ زۆر پێت ناشیرین و ناقۆڵایە، لە بەڕێ نەزانان بووم، لە گومڕایان بووم، چونکە (ضَلال) بە چەند واتایەك دێ:

أ- نەزانینی حەقیقەتی شتێك، وەك دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ۝٥٢ ﴾طه، واتە: پەروەردگارم شتی لێ زایە نابێ و، لە بیری ناچێ.

ب- ڕۆیشتن بەرەو هەڵەت و هەڵدێر و بە هەڵە داچوون.

ج- بە مانای لەبەین چوون و ون بوونیش دێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭ ۝١٠ ﴾السجدة، گوتیان: ئایا ئەگەر ئێمە لە زەویدا ون بووین، واتە: نێژراین و بووینەوە خاك، ئایا لە نوێ دروست دەکرێینەوە؟

لێرە: ﴿ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئەوەبـێ کـە مـن ئـەو کاتـە زانیارییـم نەبـوو، دەشـگونجێ مەبەسـت ئەوەبـێ بـە ڕێیـم نەدەزانـی و زایـە بووبـووم.

بـەڵام بـە دڵنیاییـەوە مەبەسـت پێـی کوفـر نیـە، چونکـە کوفـر لـە (كُفْـر)ەوە هاتـوە، واتـە: داپۆشـین، مووسـاش هەقێکـی بـۆ نەهاتـوە داپۆشـێ و ڕەفـزی بـکات.

کەواتــە: مەبەســت ئەوەیــە مــن ئــەو کاتــە هەقیقەتــم نەدەزانــی، بەڕێیــەم نەدەزانی، ون بووبـووم، نەمدەزانی چـۆن بەندایەتیی بـۆ خـوا بکـەم، نەمدەزانی چـۆن ژیانـی خـۆم و کۆمەڵگایەکـەم ڕێـك بخـەم بـە پێـی شـەریعەت و هیدایەتـی خـوا.

لـە مانـا گشـتییەکەیدا نـاوام لێکدایـەوە، کـە لـە تەفسـیرەکاندا نەمبینیـوەو ئـەو مانایـەم زۆر پـێ گونجـاوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾، واتـە: مـن بـە هـۆی ئـەوەوە کـە لـە ماڵـی ئێـوەدا گـەورە بـووم و بـە کلتـوورو فەرهەنگـی ئێـوە ڕاهاتبـووم، بـە عـادەت و نەرێتەکانـی ئێـوە، ئێـوەش عادەتتـان وابـوو، بـە تایبـەت فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی، کەسـێك لارییەکـی لـێ بینرابایـە، سـتەمێکی لـێ بینرابایـە، سـزا دەدرا، منیـش بەبـێ گەڕانـەوە بـۆ دادگاو لێپێچانـەوە، چونکـە بەپێـی کلتـوورو فەرهەنگـی ئێـوە ڕەفتـارم کـرد، ئـەو کابرایـەم بینـی، لـە بابـای ئیسـڕائیلیی دەدا، ویسـتم لێـی دووربخەمـەوە، کـە لێـی دوورنەکەوتـەوەو ویسـتی لەسـەر سـتەمەکەی بـەردەوام بـێ، بۆکسـێکم لێـدا تاکـو لێـی دوور بخەمـەوەو بـە بۆکسـەکە کوشـتم.

واتـە: مـن ئـەو کاتـە لەسـەر ڕەویـەو کلتـوورو فەرهەنگـی ئێـوە بـووم، کەواتـە: هـەر ڕۆنـی خۆتانـە لەسـەری خۆتـان دەدرێتـەوە، وەك ئێـوەم کـرد، کـە ئـەو کابرایـەم کوشـت.

٦)- ﴿ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ ﴾: کاتێك ترسم لێتان پەیدا بوو، لە دەست ئێوە ڕام کرد، هەڵاتم.

٧)- ﴿ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾: پەروەردگاریشم حیکمەتی پێدام، زانیاریی بە سوودی پێدام، حیکمەت یانێ: زانیاریی و کردەوەی ڕاست، **(الإِصَابَةُ عِلْمَاً، وَعَمَلاً، أو فـي القَوْلِ والفِعْل)** ئینسان لە نیشانە بدات، نیشانە بپێکێ بە قسەو بە کردەوە، یان بە زانیاریی و بە کردەوە، خوا ئەوەی پێدام، ﴿ وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ منیشی گێرا

لە ڕەوانە کراوان، واتە: خوا زانیارییەکی پێدام کە لە ڕێگای وەحییەوە نەبێ نازانرێ و، منیشی گێڕا لە نێرراوانی خۆی، ئەمە وەڵامی کوشتنی کابرای قیبتیی، ئنجا دێتە سەر وەڵامی قسەکەی دیکە، کە لە ماڵی ئەواندا بە خێو کراوە:

٨)- ﴿ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ ﴾، ئەو چاکەیەش کە منەتی پێ لەسەر من دەکەی و بەچاوی منی دادەدەیەوە:

٩)- ﴿ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، لە سونگەی ئەوەوە بوو کە بەنی ئیسرائیلت ژێر دەست و بندەستکردبوو، کردبووتن بە کۆیلە، ئنجا ئەگەر ژێر دەست و بندەستی تۆ نەبوونایەو، تۆ داتنەنابایە کە نێرینەکانیان سەرببڕی، بەوەدەردە نەدەچووم کە: دایکم لە ترسی سەربڕینی تۆ، منی خستە صندووق و تابووتێکەوە، کە خوا خوڕپەی بۆ کردو بەڕووباری نیلی دادام و لەماڵی ئێوە گیرامەوە، واتە: ئەوەش هەر ڕۆنێکە لەسەری خۆت دەدرێتەوە، تۆ گەلەکەی منت ژێر دەست و بندەست کردبوو، بۆیە منیش هاتمە ماڵی تۆ، ئەگەرنا منیش ماڵی باب و دایکی خۆم هەبوو، لە ماڵی خۆم بە خێو دەکرام، بەڵام بۆیە هاتمە ماڵی تۆ، لە ترسی سەربڕینی تۆ، لەبەر ئەوەی تۆ گەلەکەی منت هەموو کردبووە کۆیلەو سەرت دەبڕین و دەتچەوساندنەوە، ئنجا کە من هاتوومە ماڵی تۆ، دەرهاویشتەی ئەو خراپەو جینۆسایدەیە، کە تۆ بە گەلەکەی منت کردوە!

مووسا وەڵامێکی داوەتەوە، قوڕی بنی دەرهێناوە، مووسا ﷺ، وەك هەموو پێغەمبەرانی خوا، خاوەنی گەورەترین عەقڵ بووە، بە باشترین شێواز و ئەوپەڕی دانایی و حیکمەت، وەڵامی داوەتەوە، هەم بۆ کوشتنی کابرای قیبتیی وەڵامێکی چاکی دەداتەوە، کە ئەوە دەرهاویشتەی فەرهەنگ و کلتووری ئێوەیە، کە من ئەو کاتە وەك ئێوە گومڕا بووم، نەك وەك ئێستا هیدایەتدراو بم، بەپێی کلتووری ئێوە ڕەفتارم کرد، کە کابرام کوشت، ئەوەی دیکەش ئەو چاکەیەی کە بەچاوی منی دادەدەیەوە، ئەوە دەرهاویشتەی ئەوەیە کە تۆ گەلەکەی منت هەموو دەچەوساندەوەو، من لە ترسی ئەوە کە لەلایەن دەستەو دایەرەکەی تۆوە، سەرنەبڕدرێم، بە ڕووبار دادرام و، دوایی هاتمە ماڵی ئێوەو لە ماڵی ئێوەدا بەخێو کرام.

**مەسەلەی سێیەم:**

**پرسیار کردنی فیرعەون لە بارەی پەروەردگاری جیهانییانەوەو، سێ جۆرە وەڵامی زۆر بەهێزی مووسا عليه السلام و پەنا بردنی فیرعەون بە لۆژیکی هێز لە جیاتی هێزی لۆژیک:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ وَمَا رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنۡ حَوۡلَهُۥٓ أَلَا تَسۡتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمۡ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِيٓ أُرۡسِلَ إِلَيۡكُمۡ لَمَجۡنُونٞ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ أَوَلَوۡ جِئۡتُكَ بِشَيۡءٖ مُّبِينٖ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأۡتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:**

١)- ﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ وَمَا رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، فیرعەون گوتی: پەروەردگاری جیهانییان چییە؟ دوای ئەوەی مووسا و هارِوونی برای (**عليهما الصلاة والسلام**) گوتیان: ﴿ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ ﴾، ئێمە نێردراوی پەروەردگاری جیهانییانین، خاوەنی جیهانییان، فیرعەون پرسی: پەروەردگاری جیهانییان چییە؟ ﴿ وَمَا رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، [(و) **عاطفة و (ما) إستفهامية، والواو عاطفة هَذَا الإستِفهامُ عَلَى الإستفهام الأول**)، (و) بۆ گێڕانەوەو بادانەوەیە، (ما) لە: ﴿ وَمَا رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾دا، بۆ پرسیار کردنە، ئنجا (و) ئەو پرسیار کردنە دەگێڕێتەوە بۆ سەر پرسیار کردنی پێشتر، لێرەدا فیرعەون لەبارەی چییەت (**ماهية**) ی پەرورەدگاری جیهانییانەوە دەپرسێ، چونکە نالێ: (**وَمَن رَبُّ العالَمين**)؟ پەروەردگاری جیهانییان کێیە؟ بەڵکو دەڵێ: چییە؟ با بزانین مووسا عليه السلام، چۆن وەڵام دەداتەوە؟

٢)- ﴿ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴾، (مووسا عليه السلام) فەرمووی: پەروەردگاری جیهانییان، خاوەن و مشوورخۆرو، پەروەردگاری ئاسمانەکان

و زەوی و، ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوەیە، [هی هەموویەتی]، ئەگەر ئێوە خاوەنی زانیارییەکی دڵنیاکەر بن، (اليَقِينُ: العِلْمُ الجَازِمِ الّذي لا تَشُوبُه شَائِبَةُ البَاطِل) (يقين) بریتیە لەو زانیارییە جێی دڵنیاییە، کە بە هیچ ڕەنگێك خڵتەی ناهەقی تێکەڵ نابێ، واتە: ئەگەر ئێوە زانیارییەکی چاکتان هەبێ، نەك هەروا بە دوای خەیاڵ و وەهم و گومان کەوتبن، ئەگەر زانیارییەکی باشتان هەبێ و، ئەهلی زانست بن، دەزانن کە ئەم گەردوونە، بەسەرو خواریەوە، بە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانەوە، خاوەنێکی هەیە، پەروەردگارێکی هەیە، مشوورخۆرێکی هەیە، واتە: فیرعەون لە بارەی چییەتی خواوە دەپرسێ، بەڵام مووسا ﷺ لە ڕێی شوێنەوارەکانیەوە، خوا ﷻ و پەروەردگاری جیهانییان دەناسێنێ، بۆچی؟ چونکە ئێمە هیچ ئامرازێکمان نیە بتوانین چۆنیەتی ماهییەتی خوا ﷻ دەرك بکەین، کەواتە: دەبێ لە ڕێی شوێنەوارەکانیەوە بیناسین، ئایا هەر خوا ﷻ وایە؟ نەخێر بەڵکو زۆرێك لە دروستکراوەکانی خواش بەو شێوەیەن، هەر دەبێ لە ڕێی شوێنەوارەکانیانەوە پەییان پێ ببەین، بەڵام چییەت و خودی خۆیان بۆ ئێمە ناسراو نین، بۆ وێنە هێزی ڕاکێشان (قوة الجاذبية) ئەم گەردوونەی، بەم هەموو کەهکەشانەوە ڕاگرتوە، گەردوونناسیی نوێ، ژمارەی کەهکەشانەکان لە نوێترین بیردۆزەیدا بە یەك تریلیۆن واتە: هەزار ملیار (١٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کەهکەشان مەزەندە دەکات، کە هەر کام لەو کەهکەشانانە بە تێکڕایی، ملیاران ئەستێرەن، بۆ وێنە: کەهکەشانی ئێمە کەهکەشانی ڕێی کاکێشان، یان ڕێی شیری، ژمارەی ئەستێرەکانی بە یەك تریلیۆن (هەزار ملیار) مەزەندە دەکرێ، ئەوە هەمووی بە هۆی هێزی ڕاکێشانەوە، ئەم گەردوونە وەستاوە، کە خوا ﷻ لە چەند شوێنێك ئاماژەی پێ دەکات: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴿٢﴾ ﴾ الرعد، واتە: خوا ئاسمانەکانی بە چەند کۆڵەکەیەك بەرز کردۆتەوە، کە نایانبینن، کە مەبەست پێی هێزی کێشکردنە،

بەڵام ئایا فیرعەون هەر بەڕاستیی لە هەقێ گەڕاوە، وەك گوتراوە: لە هەقێ ناو ڕادەوەستێ! بە تەئکید نەخێر، بۆیە لە وەڵامی ئەو وەڵامەی مووسادا ﷺ قسەیەکی زۆر نەفامانە دەکات:

٣)- ﴿ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴾، (فیرعەون) بەوانەی دەوروبەری خۆی گوت: گوێتان لێ نیە! ئەمە سەر سوڕماندنە، فیرعەون ویستوویەتی: کۆڕو مەجلیسەکەی والێبکات سەریان سوڕبمێنێ، لە قسەی مووسا ﷺ یانی: ئێوە ڕەنگە گوێتان لەو قسەیە نەبووبێ، ئەگەرنا زۆرتان سەرسوڕدەما، زۆرتان عاجباتی دەهات، ئەوە گوێتان لێنەبوو؟ پرسیار کردنەکەی، ڕوو پێ کردۆتە بیستنەکەیان، یانی: ئەوە دیارە نەتانبیستوە، ئەگەرنا قسەیەکی زۆر سەیرو عەجایبی کرد! بەڵام مووسا ﷺ خۆی شلوێ ناکات و وەڵامێکی دیکە دەداتەوە:

٤)- ﴿ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، {مووسا ﷺ} فەرمووی: {پەروەردگاری جیهانییان} خاوەن و پەروەردگارو مشوورخۆری خۆتان و باب و باپیرانی پێشووتانە، واتە: ئەمجارە مووسا ﷺ بۆیان دادەبەزێ و بەخۆیان بەڵگە دێنێتەوە، لەسەر پەروەردگارێتیی خوا ﷻ، نەك بە کەون و کائینات، چونکە خۆیان نیزیکترن لە ئاسمانەکان و زەوی و، بۆ خۆیان چاکتر خۆیان دەبینن، دەزانن کە مرۆڤایەتیی جیل لە دوای جیل بەدوای یەکدا دێ و دەڕوات، لەبەر چاویانە.

بەڵام فیرعەون چی دەڵێ؟

٥)- ﴿ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴾، (فیرعەون) گوتی: بە دڵنیایی ئەو ڕەوانەکراوەتان کە بۆلاتان ڕەوانکراوە، شێتە، دیارە فیرعەون پێی لێ هەڵێناوە لە بەرانبەر وەڵامەکەی مووسادا، کاتێك دەفەرموێ: پەوورەردگاری خۆتان و باب و باپیرانتان، یانی: خۆتان پەروەردگارتان هەیە و ئەی فیرعەون! تۆ کە دەڵێی: ﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾النازعات، درۆ دەکەی، بەڵام لە پەنارا وای پێ دەڵێ، هەڵبەتە فیرعەون خۆشیی و، باب و باپیرانی دیکەشی کە فیرعەون بوون، فیرعەون یانی: حوکمڕان و پادشا، کەواتە: مووسا بەو قسەیەی سیفەتی پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی خەڵکیان لێ دادەڕنێ، کە حوکمڕانێتیی خۆسەپێنیی و دیکتاتۆریی بووە، بۆیە فیرعەون زۆر هەڵدەچێ و دەڵێ: بە دڵنیایی ئەو ڕەوانەکراوەتان کە بۆلاتان ڕەوانە کراوە، شێتە، هەڵبەتە فیرعەون دان بەوەدا

نانێ کە مووسا لەلایەن پەروەردگارەوە ڕەوانە کراوە، بەڵکو بە توانج و تەوسەوە وا دەڵێ، بەڵام مووساش ﷺ لە بەرانبەردا، وەڵامەکەی توندتر دەکات، مووسا ﷺ لەو جۆرە مەعدەنانە نیە لە ژێر فشاردا نەرم بێ، لە بەرانبەر هەڕەشەو گوڕەشەدا بترسێ:

٦)- ﴿ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، (مووسا ﷺ) فەرمووی: [پەروەردگاری جیهانییان] پەروەردگارو خاوەنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو ئەوەیە کە دەکەوێتە نێوانیانەوە، ئەگەر بفامن، ئەگەر عەقڵتان هەبێ، واتە: من شێت نیم، بەڵام ئەگەر ئێوە عەقڵتان هەبێ، دەبێ پەروەردگاری خۆتان کە خاوەنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایەو، ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، دەبێ بیناسن، ئەگەر عەقڵتان هەبێ.

لێرەدا مووسا ﷺ بەڵگە بە شتێك دێنێتەوە کە ڕۆژانە دەیبینن، ڕۆژانەو شەوانە خۆر دەبینن کە هەڵدێ، ئێواران کە ئاوا دەبێ.

هەردوو وشەی (المَشرِق) و (المَغرِب) دەگونجێ ناوی شوێن بن، واتە: ئەو دوو شوێنەی خۆریان لێ هەڵدێ و، خۆریان لێ ئاوا دەبێ، دەشگونجێ هەردووکیان چاوگ بن: (مَشرِق) خۆر هەڵاتن، چاوگی (مِغرِب) واتە: خۆر ئاوا بوون، مووسا ﷺ یش قسەکانی وردە وردە توند دەبن، لە بەرانبەر قسەکانی فیرعەون دا، کە ئەو مووسا تۆمەتبار دەکات بەوەی شێتە، مووساش ﷺ دەڵێ: ئەگەر عەقڵتان هەبێ دەبێ پەروەردگاری خۆتان، کە هەموو ڕۆژێ لە خۆرهەڵاتەوە خۆرتان بۆ هەڵدێنێ و، لە خۆرئاواوە ئاوا دەبێ، دەبێ بیناسن، دوای ئەو سێ بەڵگانەی مووسا ﷺ، فیرعەون چیدیکە لەسەری ناچێ، چونکە تەماشا دەکات: تاکو ئەو پرسیار دەکات، یان هەڵوێستی نەرێنیی دەنوێنێ، مووسا ﷺ بەڵگەیەکی بەهێزترو گورجکبڕترو بێقسەکەرتر دێنێتەوە، بۆیە لە مەیدانی هێزی لۆژیکەوە، دەگوازێتەوە بۆ لۆژیکی هێز:

٧)- ﴿ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴾، فیرعەون گوتی: بە دڵنیایی ئەگەر جگە لە من پەرستراوێکی دیکە بگری، دەتخەمە گەڵ گیراوان.

﴿ لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴾، دەتخەمـە گـەڵ زیندانییـان، واتـە: زۆری دیکـەی وەك تۆشـم زیندانیـی کـردوون، لەسـەر ئـەو شـتانەی بـە دڵـم نەبـوون، وشـەی: ﴿ لَئِنِ ﴾ زانایانـی شـارەزای زمانـی عەرەبیـی دەڵێـن: (ل)ی (لـئن) بـۆ سـوێندە، یانـی: (وَاللهِ لَـئِن)، سـوێند بـە خـوا ئەگـەر ... یاخـود (لامٌ مُوطِّئَة لِلقَسـم)، (ل)ی ڕێخۆشـکەرە بـۆ سـوێندو، بـۆ تەئکیـد کردنـەوەو جەختکردنەوەیـە، ئنجـا مووسـا ﷺ لـە وەڵامـی ئـەو هەڕەشـەیەی فیرعـەون دا، قسـەیەکی دیکـەی تـازە دەکات:

٨)- ﴿ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴾، گوتی: ئەدی ئەگەر شتێکی ڕوونت بۆ بێنم؟ (مُبِين) دەگونجێ: لە (أبان)ی (لازِم)ەوە بێ، واتە: شتێکی ڕوون و ڕۆشن، دەشگونجێ لە (أبان)ی (متعدّي)ەوە بێ، واتە: شتێکی ڕۆشنکەرەوە، بەڵگەیەك بیسەلمێنێ و ڕوونی بکاتەوە کە من پێغەمبەری خوام و ڕاست دەکەم، ئەدی ئەگەر بەڵگەیەکی ئاوات بۆ بێنم؟ (الإستِفهام الإنكاري إستِغرابي وَالواو لِعطف الإستفهام) هەڵبەتە لێرەدا پرسیار کردنەکە، پرسیار کردنی نکووڵییلێکردن و پێ سەیر بوونە، [ئایا ئەگەر بەڵگەیەکی ڕوون و ڕوونکەرەوەشت بۆ بێنم، هەر ئەوە قسەت دەبێ] (و)کەش هەر بۆ بادانەوەو گێڕانەوەیە بۆ سەر قسەکانی پێشێ.

٩)- ﴿ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾، (فیرعەون) گوتی: ئەو (شتە ڕوون)ە بێنە، ئەگەر لە ڕاستانی، دیارە ناچار بووە، وابڵێ، خەڵك و کۆڕو مەجلیس بووە، فیرعەون بڵێ: نەخێر نابێ بەڵگەی ڕوون و ڕوونکەرەوە بێنی! مانا وایە تێدەشکێ و ئەوە دان پێداهێنانە بەوەدا کە مووسا ﷺ لەسەر هەقە، لەبەرئەوە بە ناچاریی دەڵێ: بەڵێ: بیهێنە ئەگەر لە ڕاستانی، کە ئەوەش جۆرێکە لە تانەدان لە مووسا واتە: تۆ ڕاست ناکەی.

**مەسەلەی چوارەم:**

**پێشاندانی مووسا ﷺ بۆ دوو بەڵگەکەی: گۆچانەکەی و دەستی و، ڕاوێژ کردنی فیرعەون بە کۆڕو مەجلیسەکەی و، بڕیار دان بە کۆکردنەوەی هەرچی جادووگەری شارەزایەو، کۆکردنەوەی خەڵکیش:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:**

**١)- ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ ﴾، گۆچانەکەی فڕێدا، کە فیرعەون پێیگوت: ئەگەر ڕاست دەکەی ئەو شتە ڕوون و ڕوونکەرەوە بێنە، گۆچانەکەی فڕێدا.**

**٢)- ﴿ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴾، [ئەو (إذا)یە، (فُجائية)یە]، یانی: کت و پڕ بوو بە مارێکی ئاشکرا، لێرەدا (مُبِين) لە (أبان)ی (لازم)ەوە هاتوە، واتە: مارێکی ڕوون و ئاشکرا، هیچ کەس گومانی لەوەدا نەبووە کە مارە، ئنجا وشەی (ثُعْبَانٌ ) زانایان دەڵێن: بە ماری نێر دەگوترێ، مارێك زۆر قەبەو زۆر درێژ و زل بێ، پێی دەگوترێ: (ثُعْبَانٌ )، ئەوە بەڵگەی یەکەمی، مووسا کە من پێغەمبەری خوام ﷺ ئەوەتا کێ دەتوانێ گۆچان بکاتە حەزیاو ئەژدیهایەك؟**

**٣)- ﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴾، دەستیشی دەرهێنا یەکسەر سپیی و درەوشاوەبوو بۆ بینەران، (النَّزْعُ: السَّلُّ، أي: أَخْرَجَ يَدَهُ مِنْ القَمِيص مِن جَيْبه) دەستی دەرهێنا، لەبن هەنگڵی دەریهێنا، کە لەبن هەنگڵی نابوو، یاخود لە یەخەی کراسەکەیەوە**

بردیە بن قۆڵی و دوایی دەستی دەرهێنا، وەك لەشوێنی دیكەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ ﴿١٢﴾ ﴾النمل، واتە: دەستت لە یەخەی كراسەكەتەوە بخە بن قۆڵت، دوایی دێتە دەرێ بەبێ خراپەو نەخۆشیی.

لە شوێنی دیكە لە سوورەتی (القصص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ ﴿٣٢﴾ ﴾، قۆڵت بەرەوە لای خۆت، بینووشێنەوە، بەلای خۆتیەوە بنووسێنە، بە كەلەكەت، لە كاتێكدا ترسێكت هەبێ، ﴿ فَذَانِكَ بُرْهَانَانِ مِن رَّبِّكَ ﴿٣٢﴾ ﴾، لەوێش وا دەفەرموێ، واتە: ئەو دووانە: گۆچانەكەت و دەستت، دوو بەڵگەی ئاشكران لەلایەن پەروەردگارتەوە.

﴿ وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاءُ لِلنَّاظِرِينَ ﴾، دەستیشی دەرهێنا یەكسەر كت و پڕ بوو بە شتێكی سپیی بۆ بینەران.

لێرەدا دەفەرموێ: سپیی، بەڵام بە تەئكید بەس ئەوە نەبووە ڕەنگەكەی سپیی بووبێ، بەڵكو یانی: شتێكی درەوشاوەو تیشكدەر، كە لە هەندێك لە تەفسیرەكاندا دەڵێ: ئەوەندە سپیی و تیشك دەرو درەوشاوە بووە، چاوی لەبەر هەڵنەهاتوە، بە زاراوەی ئێستا: وەك بلاجكتۆرێك، وەك گڵۆپێكی چەند هەزاریی كە زۆر زۆر بە شەوق بێ، چونكە دەفەرموێ: ﴿ لِلنَّاظِرِينَ ﴾ واتە: بۆ بینەران كە لە ملاولاڕا بێن تەماشای بكەن، لەبەر زۆر بە شەوقیی.

٤)- ﴿ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُ ﴾، (لە بەرانبەر ئەو دوو موعجیزەیەی مووسادا عليه السلام فیرعەون) بە قسە ڕۆیشتووانی دەورو بەری خۆی گوت:

٥)- ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ ﴾، بێگومان ئەمە جادووگەرێكی زانایە.

لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ الْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ ﴾، قسە ڕۆیشتووانی گەلەكەی فیرعەون گوتیان: ئەمە جادوو گەرێكی ئاشكرایە، بەڵام لێرە قسەكە پاڵ دەداتە لای فیرعەون، وادیارە

فیرعـەون قسـەکەی کـردوەو ئـەو قسـە ڕۆیشـتووانەش، یەکسـەر وەك تووتیـی قسـەکەی ئەویـان دووبـارە کردۆتـەوە، چونکـە ئەوانـەی کـە بـە دەوری حوکمڕانـە خۆ سـەپێنەکانەوەن، وەك ئەشـکەوتیان لـێ دێ، ئـەو چـی بڵـێ، وا دەنـگ دەدەنـەوە، یان وەك تەپڵیـان لێـدێ چۆنـی دەسـت لێبـدەن، وا دەنگـی دێ، خاوەنـی بیـر کردنـەوەو عەقـڵ و ئیـرادەی خۆیـان نیـن، چییـان پـێ بگوتـرێ، وا دەڵێـن، فیرعـەون پێشـێ قسـەیەکی کـردوە، وەك لێـرەدا هاتـوە، ئەوانیـش وەك لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا هاتـوە، دووبارەیـان کردۆتـەوە، ئەمـەش تێکگیـران (تناقض) نیـە، بەڵکـو قسـەکە لـە بنەڕەتـەوە لەلایـەن فیرعەونـەوە کـراوە: ﴿ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴾، لێـرەدا ئەسـڵی بەسـەرهاتەکە دەگێڕێتـەوە، قسـەکە لەکێـوە سـەرچاوەی گرتـوە؟ قسـەکە هـی فیرعـەون بـووە.

بـەڵام لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ ﴾، یـانی: دوای ئـەوەی فیرعـەون وایگوتـوە، قسـە ڕۆیشـتووانی گەلـی فیرعەونیـش هـەر هەمـان قسـەی فیرعـەون دووبـارە دەکەنـەوە، وەك تووتیـی (بَبْغـاء).

٦)- ﴿ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ ﴾، دەیەوێ لەسەر زەمینی خۆتان، بە هۆی جادووەکەیەوە، دەرتان بکات، هەڵبەتە ئەوە درۆیەکی گەورە بووە، چونکە مووسا ﷺ نەهاتوە بڵێ: وەدەرتان دەنێم، یاخود شەڕیان پێ بفرۆشێ، هێزێکی وای نەبووە!! بەڵکو فەرموویەتی: هیدایەت و بەرنامەی خوام هێناوەو لێم وەربگرن، ئنجا کە وەری ناگرن، لانی کەم ئەو گەلە ستەمدیدەیەی من با لەگەڵم بێن و، چیدیکە لە ژێر چەنگاڵ و پۆستاڵی و ئێوەدا نەچەوسێنرێنەوە.

٧)- ﴿ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴾، فیرعەون بە کۆڕو مەجلیسەکەی دەڵێ: فەرمانتان بەچییە؟ دیکتاتۆرو حوکمڕانە خۆسەپێنەکان هەروان، کاتێك لێیان دەقەومێ، زۆر خاکیی دەبن، زۆر خۆ بەکەمگر دەبن، ئەگەرنا ئەو فیرعەونەی کە لێرەدا، لە بەرانبەر هەردوو

بەڵگەکەی مووسادا عليه السلام بە دەورو بەرەکەی خۆی دەڵێ: فەرمانتان بەچییە؟ هەر ئەو فیرعەونەیە کە لە سوورەتی (النازعات)دا خوای پەروەردگار لێی دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: ﴿ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾، ئنجا ئایا پەروەردگاری هەرە بەرز، چۆن بەدەورو بەرەکەی خۆی دەڵێ: فەرمانتان بەچییە؟

بەڵام ئەو دیکتاتۆرو حوکمڕانە خۆسەپێنانە هەر وان، کاتێك لێیان دەقەومێ، زۆر خاکیی دەبن، بەڵام کاتێك هاتیانە، زۆر لە کەوڵی خۆیان دەردەچن و کە نەهاتیان بوو، زۆر تێ دەشکێن و خراپ دەڕووخێن!

بەڵام ئینسانی ئیماندار وانیە، نە لە هاتدا لەخۆی بایی دەبێ، نە لە نەهاتدا نائومێد دەبێ، حاڵەتێکی هاوسەنگ و ئاسایی هەیە.

ئنجا با بزانین قسە ڕۆیشتووانی دەورو بەری فیرعەون، بڕیار بەدەستان، ئەوانەی کە پێیان دەگوترێ: (مـلأ)[1] کە قسەیان لێ وەردەگیرێ و، گوێیان بۆ دەگیرێ، چی دەڵێن؟

٨)- ﴿ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ ﴾، گوتیان: خۆی و برایەکەی دوابخە.

(الإرْجـاء: التَّأخـير، في الأَصـل: أرْجِـأْهُ) (أَرْجِهْ ) ئەصڵی خۆی (أرْجِـأْهُ)ە، (الإرْجـاء) یانی: دواخستن، (أرْجَـأ، يُرْجِـئ، إرْجائـاً، فهـو مُرْجِـئ) مورجیئە بۆیە وایان بێ گوتراوە، چونکە کردەوەیان لە ئیمان دواخستوە.

بۆی پێشنیار دەکەن دەڵێن: خۆی و برایەکەی سزا مەدەو دوایان بخە، یانی: جارێ لێپرسینەوەیان لەگەڵدا مەکەو سزایان مەدە، بە حیساب زۆر لەخۆڕادیتوون و دەتوانن سزایان بدەن!

٩)- ﴿ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَـٰشِرِينَ ﴾، کۆکەرەوانیش بە شاراندا بنێرە، (المَدَائِن: جَمْعُ مَدِيْنَة، وكذلك المُدُن)، (المَدائِن) کۆی (مدينة)یە (حاشرين )یش کۆی (حاشِر)ە، واتە: کۆکەرەوە، واتە: کۆکەران بە شاراندا بنێرە.

---

(١) ملأ: دڵ و چاوپڕکەران: سال و هەیبەت

١٠)- ﴿ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴾: هەموو جادوو گەرێکی زۆر زاناو شارەزات بۆ بێنن، لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَـٰحِرٍ عَلِيمٍ (١١٢) ﴾، جادووگەری زانا، لێرە دەفەرموێ: (سَحَّارٍ ) دیارە وێڕای ئەوەی پێشێ، ئەمەشیان گوتوە: (سَحَّارٍ ) کە ڕێژگەی زێدەڕۆیی (ساحر)ە، یانی: زۆر جادووزان و شارەزا.

١١)- ﴿ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَـٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴾ ئنجا جادووگەرەکان بۆ ژوانگەی ڕۆژێکی زانراو، کۆکرانەوە، (میقات) بەکوردیی ژوانگە، (الميقاتُ: الموْعِد، الزَّمان المحَدّد، المكانُ المحدَد) دەگوترێ (مواقيت الحَج) ئەو شوێنانەی یاخود، ئەو کاتانەی کە حەجیان تێدا دەکرێ، زانایان دەڵێن: میقاتی کاتیی هەیەو، میقاتی شوێنیی هەیە، بە کوردیی: ژوانگە، واتە: ئەو کات و شوێنەی کە دیاریکراون.

کە دەفەرموێ: بە شاراندا، جاڕدەران، کۆکەرەوان بنێرە، هەموو جادووگەرێکی زۆر جادووگەرو زەبر دەست و شارەزا بێنن، ئەوە هەمووی قرتێنراوە کە: کۆکەرەوەکانی ناردن و، بە شاراندا جاڕیان داو، حاڵییان کردن، ئەوە هەمووی دەپێچێتەوەو یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَـٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴾، تەنیا شوێنی مەبەست باس دەکات و، پێویست ناکات وردەکارییەکان هەموویان باس بکات، چونکە جێی مەبەست و گرنگ ئەوەیە کە: هەموو جادووگەرەکان کۆکرانەوە لە ژوانگەی ڕۆژێکی زانراودا.

١٢)- ﴿ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴾ هەروەها بە خەڵکیش گوترا: ئایا ئێوە کۆبوونەتەوە؟

١٣)- ﴿ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ ﴾: بەڵکو بەدوای جادووگەرەکان بکەوین.

١٤)- ﴿ إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَـٰلِبِينَ ﴾: ئەگەر ئەوان زاڵ بن.

واتە: خەڵک لەگەڵ زاڵ بوواندان، با جادووگەریش بن! بەو مەرجە لەگەڵیاندان، کە زاڵ بن، ئەوە بەزۆریی لۆژیکی خەڵک و جەماوەرە، کە حاڵیی

نەبووبێ و خاوەن مەبدەء نەبێ، ئەگەر لەسەر مەزهەبی دیکتاتۆرو حوکمڕانە خۆسەپێنەکان بێ، بەو شێوەیە، کێ لەسەرەوە بێ، لەگەڵ وییە، کێ زاڵ بێ، لەگەڵ وییە، کێ پارەی لە لابێ، لەگەڵ وییە، کێ دەستەڵاتی هەبێ، لەگەڵ وییە، بەداخەوە! خەڵك و جەماوەر، مەگەر عەقڵ و دڵیان بە هیدایەتی خوا ڕۆشن بووبێتەوە، ئەگەرنا زۆربەیان بەو شێوەیەن.

بۆیە من پەندێکم هەیە دەڵێم: [خەڵك و جەماوەر وەك سەماوەرە، کێ ئاگری بداتە بەر، بۆی دەکوڵێ]، هەڵبەتە خەڵك و جەماوەرێك کە هیدایەتی خوایان پێ نەگەیشتبێ، بەڵام خەڵك و جەماوەرێکی عەقڵ هۆشیاری، دڵ بێدار، نەخێر، تەماشا ناکات: کێ لەسەرییەو، کێ دەوڵەمەندەو، کێ پارەی هەیەو، کێ دەسەڵاتی هەیە، کێ دەتوانێ بکوژێ و ببڕێ؟ تەماشا دەکات، هەق لە کوێیە؟ بەڵام تاکو خەڵك دەگاتە ئەو ئاستەو ئاوا هۆشیار دەبێتەوە، کاری دەوێ!

**مەسەلەی پێنجەم:**

**هاتنی جادوو گەرەكان بۆ لای فیرعەون و، داوای خەڵات و بەرات كردنیان لە فیرعەون و، گفت پێدرانیان لەلایەن فیرعەونەوە، فڕێدانی گۆچان و پەتەكانیان و، سوێند خواردنیان بە عیززەتی فیرعەون، یاخود گوتنیان: كە بە عیززەتی فیرعەون ئێمە زاڵ دەبین، هاویشتنی مووساش ﷺ بۆ گۆچانەكەی و، قووت دانی گۆچانەكەی مووسا ﷺ كە بۆتە حەزیاو ئەژدیهایەك، بۆ هەرچی گۆچان و پەتی جادووگەرەكانەو، بڕواهێنانی جادووگەرەكان و، هەڕەشە كردنی فیرعەون لێیان، كە بە خراپترین شێوە بیانكوژێ و، بێباكیی دەربڕینی جادووگەرەكان، دوای ئەوەی بڕوایان هێناوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْا۟ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُوا۟ لَا ضَيْرَ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست، بڕگەدا:**

١)- ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ ﴾، كاتێك كە جادووگەرەكان هاتن(ەلای فیرعەون).

٢)- ﴿ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴾، بەفیرعەونیان گوت: ئایا ئێمە پاداشت و كرێمان دەبێ ئەگەر زاڵ بووین؟ لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا ﴿١١٣﴾ ﴾، لێرەدا بە شێوەی پرسیار: ئایا ئێمە پاداشتمان هەیە، هەڵبەتە لەوێش

دەگونجێ بەشێوەی پرسیار بخوێنرێتەوە: ﴿ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا ﴿١١٣﴾ ﴾؟ ئایا ئێمە کرێ و پاداشتمان هەیە؟ ﴿ إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴾ ئەگەر ئێمە زاڵ بووین.

٣)- ﴿ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴾، (فیرعەون) گوتی: بەڵێ: ئێوە ئەگەر وا بکەن لە حاڵێکی وادا، لە زۆر وەنیزیکخراوانیش دەبن، لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾، واتاکەیان هەریەکە.

بـەڵام خـوا ﷻ بەپێـی سـیاق و کـەش و هـەوای گێڕانـەوەی بەسـەرهاتەکەو، ئـەو بارودۆخـە کـە بـۆ پێغەمبـەرو ﷺ هاوەڵانـی لـە ئـارادا بـووە، لـە کاتـی دابەزینـی قورئانـدا، بەپێـی ئـەوە وشـەیەك کـەم دەکات، زیـاد دەکات، تەعبیرێـك دەگـۆڕێ، بـەڵام هەمـان ئێوەڕۆکـە.

٤)- ﴿ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴾، مووسا پێی فەرموون: ئەوەی فڕێی دەدەن، فڕێی بدەن، ئەوەی ئامادەتان کردوە بۆ جادوو کردن، بە حیساب لەسەر ئەو بناغەیە کە ئەوەی مووساش ﷺ جادوویە، بۆیە فیرعەون جادووگەری هێناون، ئنجا مووسا ﷺ کە تەماشای کردوە گۆچانیان بەدەستەوەن و، پەت و گوریسیان بەدەستەوەن، بۆ ئەوەی جادوویان پێ بکەن، فەرموویەتی: ئەوەی بە دەستتانەوەیەو دەتانەوێ فڕێی بدەن، فڕێی بدەن، ئەوەی دەتانەوێ فڕێدەری بن، فڕێی بدەن.

٥)- ﴿ فَأَلْقَوْا۟ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ ﴾، پەتەکانیان و گۆچانەکانیان فڕێدان، (حِبال) کۆی (حَبْل)ەو (عِصِيّ) کۆی (عَصَى)یە، واتە: هەرچی پەت و گوریس و، هەرچی گۆچانەکانیان بوون، فڕێیاندان.

٦)- ﴿ وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾، گوتیان: بە هۆی عیززەتی فیرعەونەوە، بە دڵنیایی هەر ئێمە زاڵ بووانین.

لێرەدا (ب)ی ﴿ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ ﴾:

أ- دەگونجێ: (باء السَّببيَّة) بێ، یانی: بە هۆی عیززەتی فیرعەونەوە، ئێمە زاڵ دەبین.

ب- دەشگونجێ: (باء القسم) بێ، واتە: سوێند بە عیززەتی فیرعەون، ئێمە زاڵ دەبین.

ج- دەشگونجێ ئەم (ب) بۆ (تَيَمّن) بێ، واتە: بە هۆی موبارەکیی عیززەتی فیرعەونەوە، پیت و پێزی عیززەتی فیرعەونەوە، ئێمە زاڵ دەبین، چونکە ئەوانە پێیان وا بووە حوکمڕانان پەرستراون، پەروەردگارن، موبارەکن، جیان لە مرۆڤ، حوکمڕانەکان خۆیان وا وێنا کردوە، خەڵکێکی زۆریش پێیان چەواشە بوون و وایان زانیوە: ئەوان شتێکی دیکەن و موبارەکن، پیرۆزن!

زۆرجـاران کۆلکـە عەلمانییەکانـی وڵاتـی خۆمـان، کـە ئیسـلام قیـاس دەکەنـە سـەر ثیوکراسـیی ڕۆژئـاوا، دەڵێـن: لـە ئیسـلامدا بەرپـرس و حوکمـڕان، موقەددەسـە، بـەڵام عەلمانییـەت دەڵـێ: دەبـێ پیرۆزیـی لـێ دابڕنـرێ! بـەڵام لەڕاسـتییدا ئـەوە لـە ثیوکراسـیی ڕۆژئـاوادا وابـووە، کـە عەلمانییەتیـش لەکاردانـەوەی ئـەو ثیوکراسـییەدا سـەری هەڵـدا، لـە ثیوکراسـیی ڕۆژئاوایـی دا، کـە عەلمانییەکانـی ئێمـە بـەوێ سەرسام (مُعجَـبْ)ن، لەوێـوە بـە پیـرۆز گرتنـی دەسـتەڵاتداران سـەری هەڵـدا، بـەڵام لـە ئیسـلامدا هەرگیـز نـەك هـەر حوکمڕانانێـك کـە لەجێـی پێغەمبەرانـن (علیهـم الصلاة والسـلام)، بەڵکـو پێغەمبەرانیـش خۆیـان بەپیـرۆز نەگرتـوە، ئەوەتـا پێغەمبـەر ﷺ خـوا پێـی دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ﴿١١٠﴾ ﴾الكهف، واتـە: بڵـێ: مـن تەنیـا مرۆڤێکـم وەك ئێـوە، بـەس وەحییـم بـۆ دێ، واتـە: جیاییـم لەئێـوە تەنیـا ئەوەیـە کـە خـوا پەیامـم بـۆ دەنێـرێ، ئەگەرنـا منیـش وەك ئێـوە بەشـەرم، مرۆڤـم، پێغەمبـەر خـۆی بـە پیـرۆزو پـاك و موقـەددەس نەزانیـوە.

لـە ڕاسـتییدا لـە ئیسـلامدا حوکمڕانـان مرۆڤـن، وەکیلـی خـواش نیـن، وەکیلـی خەڵکـن، نوێنـەری خەڵکـن، خەڵـك دایاندەنـێ و خەڵـك لێیـان دەپرسـێتەوەو، خەڵـك چاودێرییـان دەکات، خەڵـك بـۆی هەیـە لاشیـان بـەرێ، لـە ئیسـلامدا ئاوایـە و، هەرکـەس دەسـتەڵاتداران و حوکمڕانـان بـە پیـرۆز و پـاك و بەبـێ گوناهـو هەڵـە دەگـرێ، بەهەڵەداچوویـە و، ڕەفتارەکـەی بـە ئیسـلام نامۆیـە، بەپیرۆزگرتنـی حوکمڕانـان هیـچ پەیوەندیـی بـە ئیسـلامەوە نیـە.

ئێستاش بەداخەوە عەلمانییەکان بە قسە وا دەڵێن -کەحوکمڕانان پیرۆزنین-، کەچی ئێمە دەبینین: حیزبە عەلمانییەکان و ڕژێمە عەلمانییەکان، ئەو کەسانەی دەبن بە سەرۆك و حوکمڕانیان، ئەگەر بەقسەش نەیڵێن، بە کردەوە بەپیرۆزو بەبێ هەڵە لە قەڵەم دەدرێن و، قبووڵ ناکەن کەس ڕەخنەیان لێ بگرێ، ڕژێمە عەلمانییەکان لەو بوارەدا زۆر زەقن و حیزبە عەلمانییەکانیش زۆر دیارن.

ئنجا بەداخەوە ئێستا لە هەندێك لە وڵاتانی مسوڵماننشیندا، هاتوە: مەلیك زاتێکی موقەددەسە (لا تُمَسُّ) لەسەرووی ڕەخنەوەیە!! کە لە ڕاستییدا ئەمە هەمان ثیوکراسیی ڕۆژئاوایە، هەروەها لەلای زۆرێك لە شیعانیش مەسەلەی (ولي فقيه) کە لە سەرووی دەسەڵاتەکانی دیکەیە، ئەویش دیسان هەر شێوەیەکە لە دووبارە کردنەوەی حوکمی پاپایی، پاپا کاتێ خۆی نوێنەرو وەکیل و سێبەری خوا بووە، بەڵام لە ئیسلامدا، حوکمڕانان نە نوێنەری خوان، بەو واتایە کەس نەتوانێ ڕەخنەیان لێ بگرێ، نەسێبەری خوان، بەڵکو بەندەی خوان و، دەبێ پابەندبن بەبەرنامەو شەریعەتی خواوە، ئنجا ڕەوایەتییان پێ دەدرێ.

ئنجا با بزانین مووسا ﷺ کاتێ کە ئەوان گۆچان و پەتەکانی خۆیان هەڵدا، چی کرد؟

٧)- ﴿ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ ﴾، مووساش گۆچانەکەی خۆی فڕێدا.

٨)- ﴿ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴾، [(ف)ی (فَإِذَا) بۆ بەدواداهاتن (تعقيب)ە]، واتە: یەکسەر دوای ئەوەی فڕێیدا، هەرچی هەڵیانبەستبوو، هەمووی قووتدان و هەڵیلووشین.

(إذا) لێرەدا (فُجائية)یە یانی: یەکسەرو کت و پڕ، هەرچی کە هەڵیانبەستبوو، هەمووی قووتدان، (تَلْقَفُ) یانی: (تَبْتَلِع) (لَقْف) بریتییە لە وەرگرتنی شتێك بەدەست، یان بەزار بەخێرایی و بە کارامەیی، ﴿ مَا يَأْفِكُونَ ﴾ (مَا) لێرەدا (موصولة)یە یانی: (الَّذي يَأْفِكونَهُ) ئەوەی کە هەڵیاندەبەست، ئەو درۆیەی کە هەڵیاندەبەست، بۆیەش خوا ناوی لێناوە: (إِفْك) چونکە جادوو زیاتر بریتییە لە

هەڵخەڵەتاندنی چاوی خەڵك و هەستەوەرەکانی خەڵك، ئەو گۆچانەی مووسا بۆتە ئەژدیهایەك، بۆتە حەزیاو مارێکی گەورەو، هەرچی پەت و گۆچانی ئەوانە، کە بەحیساب وەك مار دەجووڵێن لەبەر چاوی خەڵك، هەموویانی قووتداون، لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ ﴾طە، واتە: بە هۆی جادووی جادووگەرەکانەوە، وا دەهاتە بەرچاوی و، وای دەزانی دەڕۆن، هەندێك لە زانایان دەڵێن: جیوەیان تێکردوون، بەهەرحاڵ وا هاتۆتە بەرچاوی، کە ئەو گوریس و گۆچانانە، دەڕۆن و مووساش ﷺ ترسی لێ نیشتوە، کە خەڵك پێیان هەڵخەڵەتێ: ﴿ فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ ﴾طە، بەڵام دوایی خوا دڵنیای کردەوە لە سەرکەوتن: ﴿ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ ﴾طە، گوتمان: نەترسێی بەدڵنیایی تۆ لەسەرێی، ئەوەی بە دەستی ڕاستتەوەیە فڕێی بدە، هەرچی ئەوان بەکارامەیی دروستیان کردوە، هەمووی قووت دەدا، چونکە ئەوەی کردوویانە فێڵی جادووگەرەو، جادووگەریش لە هەر جێیەکەوە بێ، سەرفراز نابێ.

ئنجا جادووگەرەکان کە ئەوەیان بینی:

٩)- ﴿ فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ ﴾، جادووگەرەکان بەسەجدەدا خران.

وەك بێ ئەوەی ویستی خۆیانی تێدابێ، بە سەجدەدا خران، ( فَأُلْقِيَ ) کەوێنران، ئەمە لەبەر ئەوەی زۆر سەرسام بوون و کەوتوونە ژێر کاریگەریی، وەك ویست و بژاردەی خۆیانیان لەدەست دابێ.

١٠)- ﴿ قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، گوتیان: بڕوامان بە پەروەردگاری جیهانییان هێنا، پەروەردگاری جیهانییان، کێیە؟

١١)- ﴿ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَارُونَ ﴾: پەروەردگاری مووساو هاروون، بێگومان خوا پەروەردگاری هەمووانە، بەڵام پەروەردگار یانی: خاوەن و مشوورخۆرو سەرپەرشتیار، ئنجا پەروەردگاریی

و مشوورخۆریی و سەرپەرشتیاریی خوا، بۆ ئەو دوو بەندەیەی خۆی کە ناردوونی بۆ لای ئەو فیرعەون و دارو دەستە ستەمکارە، بە باشترین شێوەی دەرکەوتوە.

ئنجا لێرەدا فیرعەون دەستەو ئەژنۆ دادانیشێ و، دەبێ شتێکی دیکە بڵێ، پێشێ کە لەڕووی بەڵگەوە تێشکا، هاتە سەر بەکارهێنانی زمانی زبرو هەڕەشە، دوایی جادووی بەکارهێنا، جادووگەرەکانیش بڕوایان هێناو، لەوێشدا تێشکا، ئنجا چی بڵێ؟

١٢)- ﴿ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ﴾: گوتی: ئایا بڕواتان پێهێنا، بەر لەوەی مۆڵەتتان بدەم؟ دەڵێ: ﴿ ءَامَنتُمْ لَهُۥ ﴾ ناڵێ: (آمَنتُم بِهِ) لە شوێنێکی دیکە دەڵێ: (آمَنتُم بِهِ)، بەڵام لێرە دەڵێ: ﴿ ءَامَنتُمْ لَهُۥ ﴾، ئایا بۆوی بڕواتان هێنا، بەر لەوەی من مۆڵەتتان بدەم؟ فیرعەون و حوکمڕانە خۆ سەپێنەکان، نەك هەر ڕێگا بە ئازادیی بیروڕا دەربڕین نادەن، بگرە ڕێگا بە ئازادیی بیر کردنەوەش نادەن، واتە: چۆن قەناعەتتان بەوە هات کە مووسا پێغەمبەری خوایە، بەر لەوەی من مۆڵەتتان بدەم؟ دەبێ عەقڵتان دەبێ قفڵی منی لەسەر بێ و بە کلیلی من بکرێتەوە، ئنجا بۆتان هەیە قەناعەتتان بگۆڕن!! بەڵێ فیرعەونەکان وا بیر دەکەنەوە، کە خەڵك نەك بۆی نیە شتێك بڵێ، ئەوان بە دڵیان نیە، بەڵکو بۆی نیە بیریش لە شتێك بکاتەوە، کە بەدڵیان نیە!

بیستوومانە کاتی خۆی لەسەردەمی ڕژێمی گۆڕبەگۆڕی سەددامدا، هی وا هەبووە خەونێکی بینیوە، دوایی بیستوویانەتەوەو خەونەکەیان بەدڵ نەبووە، لێیدان داوە!

هەروەها بیستوومە ئەو حیزبانەی خۆشمان جاری وا هەبووە، کەسێك خەونێکی بینیوە، بەدڵیان نەبووە، پێیان گوتوە: چۆن خەونی وا دەبینی و قسەی وا دەکەی؟

١٣)- ﴿ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ﴾ [فیرعەون جادووگەرەکان تۆمەتبار دەکات و مووساش ﷺ تۆمەتبار دەکات، دەڵێ]: بەدڵنیایی مووسا ئەو گەورەیەتانە کە جادووی فێر کردوون! بەتەئکید فیرعەون بۆخۆی زۆر باشی زانیوە، ئەو جادووگەرانە

هی خۆینی، لەوانەیە مامۆستای تایبەتییان هەبووبێ و خولی تایبەتییان هەبووبێ، هەر لەخۆڕا خەڵك نابێتە ساحیر، ئەوەش زانستێکەو پێویستیی بە کۆمەڵێك فێرکردن و مەشق و ڕاهێنان هەیە، کەچی ئەوە دەڵێ، تاکو خەڵکەکە هەڵخەڵەتێنێ، ئەگەرنا ئەو جادووگەرانە هی تۆن و، هێناوتن لەگەڵ مووسادا ﷺ ڕووبەڕوویان بکەیەوەو بەرەنگاری یەکدی ببنەوە، کەچی دەڵێی: ئەوە ئەو گەورەیەتانە جادووی فێر کردوون؟

١٤)- ﴿فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾، لەمەودوا دەزانن، ئەمە هەڕەشەیەکی شێردراوەیە، کە دوایی تەفسیری دەکات:

١٥)- ﴿لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ﴾، بەدڵنیایی دەستەکانتان و لاقەکانتان، بەپێچەوانەوە، دەبڕم.

﴿مِّنْ خِلَافٍ﴾ یانی: بە پێچەوانەوە: دەستی ڕاستتان و لاقی چەپتان دەبڕم، ڕاست و چەپ.

١٦)- ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ﴾: هەمووشتان تێکڕا هەڵدەواسم، لەسێدارەتان دەدەم، لە سووڕەتی (طه)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ ﴿٧١﴾﴾، بەقەدەکانی دارخورمایانەوە، هەڵتان دەواسم، دەستی ڕاست و پێی چەپیان دەبڕێ، هەڵیشیان دەواسێ، تاکو خوێنیان لێ دەبڕێ، کە ئەوە خراپترین جۆری کوشتنە.

١٧)- ﴿قَالُوا لَا ضَيْرَ﴾: گوتیان: زیانی نیە، (الضَّيرُ: والضُّرُّ بِمَعنى) هەردووکیان یانی: زیان، (ضَارَهُ يَضِيرُهُ، وَضَرَّهُ يَضُرُّهُ) واتایان وەك یەکە، واتە: (لا يَضُرُّنَا وَعِيدُكَ) هەڕەشەی تۆ زیانمان لێ نادات، (لا) لێرەدا بۆ لابردنی تێکڕایە (لنفي الجنس) یانی: هیچ جۆرە زیانێکمان لێ نادات، بۆچی؟

١٨)- ﴿إِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾: ئێمە گەڕاوەین بۆ لای پەروەردگارمان و، دەچینەوە بۆ لای پەروەرگارمان و پاداشتیشمان دەداتەوە، بۆیە ئەو هەڕەشەو کوشتنەی تۆ بۆمان، زیانمان لێ نادات، (مُنقَلِبُونَ ) یانی: (رَاجِعُون)، (الإنقِلَابُ: الرُّجُوع)، یانی: مادام ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ لای پەروەردگارمان، کوژرانمان، زیانی نیە.

١٩)- ﴿ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ ﴾: ئێمە ئومێدمان وایە کە پەروەردگارمان لە گوناهەکانمان بمانبوورێ، ئەمە ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی گەڕانەوەکەیانە بۆ لای پەروەردگاریان.

٢٠)- ﴿ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾: بە هۆی ئەوەوە کە ئێمە یەکەمینی بڕوادارانین، واتە: یەکەمینی بڕوادارانین بە پێغەمبەرایەتیی مووساو هاڕوون (علیهما الصلاة والسلام) لە خەڵکی میسرو لە قیبتییەکان، ئومێدمان وایە خوای پەروەردگار لە بەرانبەر ئەوەدا، لە گوناهەکانمان بمانبوورێ، کە تاکو ئێستا بەس جادووگەریی و چەواشەکارییمان کردوە.

**مەسەلەی شەشەم:**

**سروشکردنی خوا ﷻ بۆ مووسا عليه السلام کە بە شەو گەلەکەی دەرباز بکات، شەوڕۆیان پێ بکات، چونکە فیرعەون و سوپایەکەی ڕاوەدوویان دەنێن، فیرعەونیش جاڕچیی بەشاراندا ناردن، کە لە دژی گەلی مووسا خڕبنەوە، بۆ ڕێگرتن لە هەڵاتنیان و، سەرەنجام دەرچوونی فیرعەون و کۆمەڵەکەی، لەو نازو نیعمەتەی تێیدا بوون و، بوونی بە میرات بۆ گەلی ئیسرائیل:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ ﴾، (و) لێرەدا بۆ بادانەوە (عطف)یە: سروشمان بۆ لای مووسا کرد کە شەووڕۆ بەبەندەکانم بکە، بەندەکان یانی: گەلی بەنوو ئیسرائیل،

ئنجا بۆچی شەوڕۆیان پێ بکات؟

٢)- ﴿ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴾، بەدڵنیایی ئێوە ڕاوەدوونراو دەبن، واتە: بەدواتان دەکەون،

دیارە دوای ماوەیەکی زۆر کە مووسا عليه السلام لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەیدا خەریک بووە، بەڵام هەر نەهاتوونە ژێربار، خوا ﷻ سەرەنجام وەحیی بۆ مووسا ناردوە، کە: بەندەکانم، بەنوو ئیسرائیل دەرباز بکە لەدەستی فیرعەون و بڕۆن، وریاش بن ئەوان بەدواتان دەکەون و ڕاوەدووتان دەنێن، ئەوەش بۆ ئەوەی دوایی کە مووسا عليه السلام تووشی هەڵوێستێك نەبێ، چاوەڕوان نەکراو بێ، پێشێ خوا ئاگاداری دەکاتەوە، کە فیرعەونییەکان بە دواتان دەکەون.

٣)- ﴿ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴾ ئنجا فیرعەون بەشاراندا کۆکەرەوەکانی ناردن، (مَدائِن) کۆی (مَدینة)یە، (حاشِرین) کۆی (حاشِر)ە، فیرعەون جارچیی کۆکەرەوەی ناردن بە شاراندا، چونکە ئەو کاتە وەك خاوەنی (التحریر والتنویر) دەڵێ: میصر چواردە شاری قەرەباڵەغی لێبوون.

ئنجا ئایا جارچییەکان چی بە خەڵك بڵێن؟

٤)- ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرۡذِمَةٞ قَلِيلُونَ ﴾، ئا ئەمانە کۆمەڵێکی دابڕ دابڕی کەمن، یانی: ئەو خەڵکەی لەبەردەستی ئێمە ڕایانکردوەو دەیانەوێ ڕابکەن، خەڵکەکە کۆ بکەنەوەو جاڕیان بەنێودا بدەن: کە ئەوانە کۆمەڵێکی پچڕپچڕی کەمن، (شِرذِمة) دەڵێ: (الطَّائِفَةُ: القَلِيْلَةُ مِنَ النَّاس) خەڵکێکی کەم، هەندێ گوتوویانە: (شِرذِمة) کە کۆیەکەی (شَرَاذِم) یانی: خەڵکێکی دابڕ دابڕی پەڕاگەندە، یانی: کەمیشن و پەڕاگەندەو دابڕ دابڕیشن.

٥)- ﴿ وَإِنَّهُمۡ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴾، بەڕاستیی ئەوانە بۆ ئێمە زۆر تووڕەکەرو پەستکەرن، ئێمەیان زۆر پەستکردوە، (غائظ: إسم فاعِل، مِن (غاظَهُ)، الَّذي هُوَ بِمَعْنی أغاظَهُ أي: جَعَلَه ذا غَیْظ)، واتە: وایکرد زۆر (غَیْظ)ی بچێتە دڵ، (غَیْظ)یش (أَشَد الغَضَب) زۆر تووڕە بوون، یانی: ئەوانە ئێمەیان زۆر ناڕەحەتکردوە.

٦)- ﴿ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴾، ئێمەش تۆکمەین و پێکەوەین و زۆریش وریایین و زۆریش ئامادەین، خاوەنی هەموو پێداویستییەکی جەنگین، بۆیە با بەدوایان بکەوین و نەهێڵین بڕۆن.

٧)- ﴿ فَأَخۡرَجۡنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴾، [خوا دەفەرموێ:] ئێمە ئەوانمان، [فیرعەون و دارو دەستەکەی و سوپایەکەیمان] لە نێو ئەو باخ و بێستان و کانیی و سەرچاوانە کە تێیان دا بوون، دەرمان کردن، دیارە لەوێ باخی دار خورماو سەرچاوەو بیرو کارێزیان، سازکردوون.

٨)- ﴿ وَكُنُوزٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ ﴾، [(الكُنوز: الأموال المُدَّخَرَة)] هەروەها فیرعەونییەکان زۆر خەزنەو سەروەت و سامانی لە سەرێك کەڵەکە بوو و، جێگاو ڕێگایەکی زۆر چاکیان

هەبوو، (الكريمُ: النَّفيسُ مِن نَوعِهِ)، (كريم) هەر شتێك كە لە جۆری خۆیدا زۆر باش بێ، شوێنی نیشتەجێ بوونی زۆر باش و، پڕ نازو نیعمەتیان هەبوو، ئێمە لەوە لەهەمووی، وەدەرمان نان.

٩)- ﴿ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، ئاوا هەر بەو شێوەیە [كە دەبێ هەر تەشبیە بكرێ بەخۆیەوە، ئەوەندە بە عەجایبی دەرمان كردن]و كردمانە میراتی بەنوو ئیسرائیل، هەڵبەتە بەنوو ئیسرائیل دوایی نەچوونەوە بۆ میسر، هەر چەندە هەندێك لە زانایان وایانگوتوە، بەڵام یانی: ئەوەی فیرعەونییەكان بەجێیان هێشت، شێوەی ئەوەمان كرد بە میرات و دامان بە بەنوو ئیسرائیل، وەك موڵكی خۆیان لە فەڵەستین و شام.

**مەسەلەی حەوتەم:**

**لێک وەدەرکەوتنی گەلی مووساو ﷺ سوپای فیرعەون و، ترس ڕێنشتنی گەلی مووساو، دڵنیا بوونی مووسا ﷺ لە ڕێنمایی خوا بۆیان و، دواتر گۆچان لێدانی مووسا ﷺ لەدەریاکەو، شەق بوونی دەریاو، دەرباز بوونی گەلی مووساو، نغرۆ بوونی فیرعەون و سوپاکەی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآ ۖ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴾ ئنجا دەمەو خۆرهەڵات بەدوایان کەوتن، واتە: بەدوایان کەوتن و پێشیان گەیشتن، چونکە زۆر لێیان نیزیك بوون، (تبع) یانی: بەدوای کەوت، بەڵام (أتبع) یانی: دوای کەوت و پێشیگەیشت، لەبەر ئەوەی زۆر لێیان نیزیك بوون، وەك پێیان گەیشتبن، وابووە، (مُّشْرِقِينَ) یانی: دەمەو خۆرهەڵات، هەندێکیش گوتوویانە: (مُّشْرِقِينَ) یانی: لەلای ڕۆژهەڵات، چونکە مووساو ئەوان ڕووەو دەشتی سیناو بەرەو دەریای سوور ڕۆیشتوون، یانی: بەرەو لای ڕۆژهەڵات ڕۆیشتوون.

٢)- ﴿ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ ﴾، کاتێ دوو کۆمەڵەکە لێك وەدەر کەوتن: ئەوە سوپای فیرعەون، ئەوەش مووساو گەلەکەی بەدەست بەتاڵیی دەڕۆن، بە پیاوو نافرەت و منداڵ و هەموو شتێکەوە، لێك وەدەر کەوتن، (**التَّرائي: تَفاعل لأنَّه حاصِلٌ مِنَ الجانِبَين**) (تراءي) (تفاعل)ە لە (رؤية)ەوە، یانی: لێك وەدەرکەوتن و، هەر کامێکیان ئەوەی دیکەیانی بینی،

٣)- ﴿ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ﴾، هاوەڵانی مووسا (گەلەکەی) گوتیان: ئێمە گیراین، ئێمە دەمانگەنێ، (إِنَّا لَمُلحَقون) یانی: ئێمە پێگەیشتووانین.

٤)- ﴿ قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴾، (مووسا) فەرمووی: نەخێر، من پەروەردگارم لەگەڵم دایەو ڕێنماییم دەکات، (كَلَّآ: الكَلِمةُ رَدْعٍ، رَدَعَ بِهِ موسى ظَنَّهُم) (كلاّ) بەرچەرچدانەوەی گومانەکەی ئەوانە، نەخێر، هەرگیز وانیە، چونکە پەروەردگارم لەگەڵمدایە، ڕێگام پێشان دەدات، چی بکەم؟

٥)- ﴿ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ ﴾، ئنجا سروشمان کرد بۆ لای مووسا، کە بە گۆچانەکەت لە دەریاکە بدە، واتە: دەریای سوور، کە ئەو کاتە (بَحر القلزم)ی پێگوتراوە.

٦)- ﴿ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾، یەکسەر دەریاکە شەق بوو، ئنجا هەر پارچەیەك لە دەریاکە، وەك چیایەکی مەزن دەرکەوت.

(فِرْقٍ) یانی: (الجُزء المَفروق مِنهُ) ئەو پارچەیەی کە لێی جیا بۆتەوە، (الطَّود) یش یانی: (الجَبَل)، وەك چیای مەزن، زانایان دەڵێن: دەریایەکە بۆتە دوازدە (١٢) داڵان، نەك هەر یەك داڵان بێ، بەڵکو لە دوازدە شوێنەوە قڵیشاوەو بووەتە دوازدە داڵان، بۆ ئەوەی دوازدە هۆزەکەی بەنوو ئیسرائیل پێیان دا بڕۆن.

٧)- ﴿ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ﴾، دوایی ئەوانی دیکەشمان وەنیزیك خستن، واتە: فیرعەون و سوپایەکەی.

٨)- ﴿ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ﴾، دوایی مووساو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، تێکڕایانمان دەرباز کردن.

٩)- ﴿ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴾، دوایی ئەوانی دیکەمان خنکاندو نغرۆمان کردن، دوای ئەوەی دواکەسی کۆمەڵی مووسا عليه السلام لە دەریایەکە دەرچوون و، دواکەسی سوپایەکەی فیرعەونیش هاتنە نێو ئەو داڵانانەوە، دەریا وێك کەوتەوە.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ:

١٠)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، بەڕاستیی لەوەدا بەڵگەیەکی مەزن هەیە، بەڵام زۆربەیان بڕوادار نین، زۆربەی ئەو خەڵکەی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا، یان مرۆڤایەتیی بەگشتیی.

١١)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیاییەوەش بەس پەوەردگارت زۆر زاڵی باڵادەستی بەبەزەییە.

واتە: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی خوا بەیەکگرتن و، ڕاستیی پێغەمبەرایەتیی، خواش زاڵی باڵادەستە لە بەرامبەر دوژمنان و ناحەزانی داو، میهرەبان و بەبەزەییشە بەرانبەر بە دۆستەکانی.

با کۆتایی ئەم دەرسەمان بەبەسەرهاتێك بێنین کە **(القرطبي)** لە تەفسیرەکەی خۆی **(الجامع لأحكام القرآن)**[1]دا، هێناویەتی:

قەیسی کوڕی حەججاج گوتوویەتی: کاتێك میسر ئازاد دەکرێ، خەڵکەکەی دێنە لای عەمری کوڕی عاص، ئەو دەبێتە والیی میسر، کاتێك مانگی (بەئونە) دێ، لە مانگەکانی قیبتییەکان کە ساڵیان پێ ئەژمارکردوون، پێی دەڵێن: ئەی سەرۆك! ئەم ڕووباری نیلەی ئێمە، عادەتێکی هەیە کە هەتا ئێمە ئەوە ڕەچاو نەکەین، ئاوی نیل هەڵناستێ و بەرز نابێتەوە، ئەویش دەڵێ: چییە؟

دەڵێن: کاتێك کە دوازدە شەو تێدەپەڕن لەم مانگی (بەئونە) دەبێ ئێمە بێنین کچێکی گەنج لە ماڵی بابی بێ، باب و دایکی ڕازی بکەین، پارەیان بدەینێ و ڕازییان بکەین، ئنجا بێنین ئەو کچە برازێنینەوە بە جوانترین خشڵ و باشترین پۆشاکی لەبەر بکەین، دوایی بە زیندوویی فرێی بدەینەوە نێو ڕووباری نیلەوە، بۆ ئەوەی ئەو ڕووبارە قەناعەتی بێت و بۆمان هەڵسێ!

---

(١) ج١٣، ص٨٧.

عەمری کوڕی عاص دەڵێ: ئەوە لە ئیسلامدا ناگونجێ، ئیسلام ئەو شتانەی پێش خۆی دەسڕێتەوە، دوایی عەمری کوڕی عاص نامەیەك دەنووسێ بۆ عومەری کوڕی خوتتاب خوا لێی ڕازی بێ و ئاگاداری دەکاتەوە.

عومەر کە خەلیفەی مسوڵمانانە دەڵێ: شتێکی چاکت کردوە، ئەوەت نەکردوە، ئەمە عادەتێکی نەفامییە، دوایی عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، نامەیەك دەنووسێ بەم شێوەیە:

{مِنْ عَبْدِ اللَّهِ عُمَرَ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ إِلَى نِيلِ أَهْلِ مِصْرَ، أَمَّا بَعْدُ ... فَإِنَّكَ إِنْ كُنْتَ إِنَّمَا تَجْرِي مِنْ قِبَلِكَ، فَلَا تَجْرِ، وَإِنْ كَانَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ هُوَ الَّذِي يُجْرِيكَ، فَنَسْأَلُ اللَّهَ أَنْ يُجْرِيَكَ}.

واتە: لە بەندەی خوا فەرماندەی بڕوادارانەوە عومەر بۆ ڕووباری نیل! دوای ستایشی خوا، ئەگەر بۆ خۆت تاکو ئێستا ڕۆیشتووی، ئەوە مەڕۆ، بەڵام ئەگەر خوای تاکی ملپێکەچکەر تۆی ڕواندوە، ئەوە داوا لە خوای تاکی مل پێکەچکەر دەکەین، بتڕۆێنێ.

پێی دەڵێ: کاغەزەکە فڕێ بدەنە نێو ڕووباری نیلەوە، ئنجا کە نامەکەیان فڕێدایە نێو ڕووباری نیل، ڕووباری نیل هەڵسا، ئەو عادەتەش کە لە میسر باو بوو، ئەو عادەتە نەفامییەش خەڵکەکە لێی دەرباز بوون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتەکانـی: (٦٩ - ١٠٤) دەگرێتـە خـۆی، لـەو سـی و شـەش (٣٦) ئایەتـەدا، بیسـت و یـەك (٢١) ئایەتیـان تایبەتـن بـە گۆشـەیەك لـە بەسـەرهاتی ئیبراهیـم ﷺو پـازدە (١٥) ئایەتیشـیان باسـی سـەرەنجامی پـڕ خێـرو خۆشـیی پارێـزکاران بـە کورتیـی و، بـە درێژیـش باسـی سـەرەنجامی شـوومی بێبڕوایـان و هاوبـەش بۆخـوا دانەرانـن، کـە لـە ڕۆژی دواییـدا زۆر ژیـوان دەبنـەوە، بـەڵام بـێ سـوود دەبـێ.

﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَءَيۡتُم مَّا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلۡأَقۡدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾ وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ يُبۡعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ﴿٨٩﴾ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلۡ يَنصُرُونَكُمۡ أَوۡ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ

إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَا أَضَلَّنَا إِلَّا الْمُجْرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَافِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

[هەروەها هەواڵی (بەسەرهاتی) ئیبراهیمیان بەسەردا بخوێنەوە ﴿٦٩﴾ کاتێک بە بابی و گەلەکەی گوت: ئەوە چییە (لە جیاتی خوا) دەیپەرستن؟ ﴿٧٠﴾ گوتیان: بتانێک دەپەرستین، ڕۆژێ بەدەم پەرستنەوە لەگەڵیانین ﴿٧١﴾ (ئیبراهیم) گوتی: ئایا کاتێک (لێیان) دەپاڕێنەوە، دەبیستن؟ ﴿٧٢﴾ یان ئایا سوودتان پێ دەگەیەنن؟ یان زیانتان لێدەدەن؟ ﴿٧٣﴾ گوتیان: بەڵکو (بەڵگەمان هەر ئەوەیە کە) باب و باپیرانمان دیوە، هەر وایان کردوە ﴿٧٤﴾ (ئیبراهیم) گوتی: ئەو (شت)انەتان دیوە کە دەیانپەرستن ﴿٧٥﴾ خۆتان و باب و باپیرانی پێشووتان ﴿٧٦﴾ بێگومان ئەوانە (هەموویان) دوژمنن، جگە لە پەروەردگاری جیهانییان ﴿٧٧﴾ ئەو کەسەی وەدیهێناوم، هەر ئەویش ڕێنماییم دەکات ﴿٧٨﴾ هەروەها بەس ئەو خواردن و خواردنەوەم پێدەدات ﴿٧٩﴾ کاتێکیش نەخۆش بم، بەس ئەو چاکم دەکاتەوە ﴿٨٠﴾ هەروەها ئەو کەسەی دەممرێنێ، دوایی زیندووم دەکاتەوە ﴿٨١﴾ هەروەها ئەو کەسەی بەتەمام ڕۆژی سزاو پاداشت لە گوناهەکەم ببووریّ ﴿٨٢﴾ پەروەردگارم! حیکمەتم پێ ببەخشەو، بە چاکانەوە پەیوەستم بکە ﴿٨٣﴾ ناوبانگی باشیشم بە نێو ئەوانی دیکەدا بڵاوبکەوەو ﴿٨٤﴾ لە میراتگرانی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتم بگێڕەو ﴿٨٥﴾ لە بابیشم ببوورە، بێگومان ئەو لە گومڕایان بوو ﴿٨٦﴾ ڕۆژێ کە (مرۆڤەکانیش) زیندوو دەکرێنەوە، شەرمەزارم مەکە ﴿٨٧﴾ ئەو ڕۆژە کە

نەسامان و نە كوڕان سوود ناگەیەنن (بە خاوەنەكانیان) ﴿٨٨﴾ مەگەر كەسێك بە دڵێكی ساغەوە هاتبێتە خزمەت خوا ﴿٨٩﴾ (ئەو ڕۆژە كە جگە لە دڵی ساغ دادی كەس نادات) بەهەشتیش بۆ پارێزكاران نیزیك خرایەوەو ﴿٩٠﴾ دۆزەخیش پێشانی بێمرادان دراو ﴿٩١﴾ پێیان گوترا: كوان ئەو (شت)انەی ﴿٩٢﴾ جگە لە خوا دەتانپەرستن؟ ئایا سەرتان دەخەن، یان (لانی كەم) خۆیان سەردەخەن؟ ﴿٩٣﴾ ئیدی ئەوان (پەرستراوەكان و پەرستەرە) بێ مرادەكان، هەموویان لەوێدا بەسەرێكدا كەوتن ﴿٩٤﴾ هەروەها تێكڕای سەربازەكانی ئیبلیسیش ﴿٩٥﴾ ئنجا لە كاتێكدا كە پێكەوە دەمەقاڵێیان بوو ﴿٩٦﴾ گوتیان: بە خوا ئێمە لە گومراییەكی ئاشكراو ڕوون دا بووین ﴿٩٧﴾ كاتێك ئێوەمان لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا یەكسان دەكرد ﴿٩٨﴾ تەنیا تاوانبارانیش ئێمەیان سەرگەردان كرد ﴿٩٩﴾ (ئێستاش) هیچ كەسمان نیە لە تكاكاران (تكامان بۆ بكات) ﴿١٠٠﴾ هەروەها هیچ برادەرێكی دڵسۆزو بەپەرۆشییشمان نیە ﴿١٠١﴾ خۆزگە جارێك (دەرفەت)مان هەبووایە، تاكو لە بڕواداران بین ﴿١٠٢﴾ بێگومان لەوەدا نیشانەیەكی مەزن هەیە، بەڵام زۆربەیان بڕوادار نین ﴿١٠٣﴾ بە دڵنیایی تەنیا پەروەردگاریشت زاڵی میهرەبانە ﴿١٠٤﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَنَظَلُّ ): دەگوترێ: (ظَلْتُ وظِلْتُ: بِحَذْفِ إحْدَى اللاَمَيْنِ، يُعَبَّرُ بِهِ عَمَّا يُفْعَلُ بِالنَّهَار) (ظَلَّ يَظَلُّ) دەگونجێ بلێی: (ظَلَلْتُ)و (ظَلْتُ) یەکێ لە (لام)ەکانی لابرێ، (ظَلَّ) تەعبیری پێ دەکرێ لەو کردەوەیەی کە بە ڕۆژێ دەکرێ، هەروەك (بَاتَ) تەعبیری پێ دەکرێ، لەو کردەوانەی کە بەشەو دەکرێن.

(عَاكِفِينَ ): (العُكُوفُ: الإقْبَالُ عَلَى الشَّيءِ، وَمُلاَزَمَتُهُ عَلَى سَبِيلِ التَّعْظِيمِ لَهُ، وَالإعْتِكافُ فِي الشَّرعِ: الإحْتِبَاسُ فِي المَسْجِد عَلَى سَبِيلِ القُرْبَةِ)، (عکوف) بریتیە لەوە کە ئینسان ڕوو بکاتە شتێك و لەگەڵیبێ بەشێوەی بەمەزنگرتن، (إعتکاف) لە زاراوەی شەرعدا بریتیە لە مانەوە لە: مزگەوت بە مەبەستی لەخوا نزیك بوونەوە.

(حُكْمًا ): (الحُكْمُ والحِكْمَةُ: إصَابَةُ الحَقِّ بِالعِلْمِ وَالعَمَل)، (حُكم) لێرەدا مەبەست پێی حیکمەتە، مەبەست ئەوەیە کە ئینسان حەق بپێکێ لە ڕووی زانیاریی و، لە ڕووی کردەوەییەوە، یان: بە قسەو بە کردەوە هەق بپێکێ.

(لِسَانَ صِدْقٍ ): یانی: زمانی ڕاستیی (وَيُعَبَّرُ عَنْ كُلِّ فِعْلٍ فَاضِلٍ ظَاهِراً وَباطِنَاً، بِالصِّدْق)، بەڵام لێرەدا (صدق) تەعبیری پێ دەکرێ لە هەر کردەوەیەکی چاك، کە بە ڕواڵەت و بە پەنهان چاك بێ.

(سَلِيمٍ ): (أي: مُتَعَرٍّ مِنَ الآفَاتِ الظَّاهِرَةِ وَالبَاطِنَة) (سلیم) ئەوەیە ڕووت بێ و دووربێ لە هەموو دەردە ڕواڵەتیی و پەنهانەکان، دڵێك کە نەخۆشیی ڕواڵەتیی و پەنهانیی تێدا نەبێ، بە کوردییش دەڵێن: ساغ و سەلیم.

(لِلْغَاوِينَ): (الغاوین) کۆی (غَاوي)یە کە لە (غَيّ)ەوە هاتوە، (الغَيُّ: جَهْلٌ مِنْ اعْتِقَادٍ فَاسِد)، (غي) نەزانییەکە لە بڕوا پێ بوونێکی خراپەوە بێ، (راغب

**الأصفهاني)** وای لێکداوەتەوە، بەڵام هەر **(راغب)** مانایەکی دیکەشی لێکرتوە، دەڵێ: **(غَوَى: فَسَدَ عَيْشُهُ)** ژیانی تێکچوو، **(غَوى، أي: خَابَ)** واتە: بەدبەخت بوو، بێمراد بوو، کە من پێم وایە زیاتر ئەمە مەبەستی **(غَيّ)**یە، چونکە **(ضَلَال)** بریتیە لە گومڕایی، بەڵام **(غَيّ)** بریتیە لە دەرەنجامی گومڕایی، هەروەك **(هِدایة)** بریتیە لە ڕێنمایی و بەڕێزانین، بەڵام **(رُشد)** برتیە لە دەرەنجامی هیدایەت، کەسێك کە هیدایەت دەدرێ، سەرڕاست دەبێ و، کەسێك کە گومڕا بێ، بەدبەخت و پەشێمان دەبێ.

**( فَكُبْكِبُوا )**: یانی: بەسەرێکدا کەوتن، **(الكَبُّ: إِسْقَاطُ الشَّيءِ عَلَى وَجْهِهِ، وَالكَبْكَبَةُ: تَدَهْوُرُ الشَّيءِ فِي هُوَةٍ، كُبَّ وَكُبْكِبَ، نَحو: كَفَّ وَكَفْكَفَ)**، **(كَبّ)** بەردانەوەی شتێکە لەسەر ڕووی، **(كَبْكَبَة)** وەك ئەوەیە شتێك بکەوێتە چاڵێکەوە بەسەر یەك دا برمێ، ئنجا **(كُبَّ عَلَى وَجهِهِ)** یانی بەسەر ڕووی دا خرا، وەك **(كَفَّ)** یانی: وازی هێنا، لە **(كَفْكَفَ)** دێ، یانی: وازهێنان، **(كَبّ)**یش یانی: لەپەو ڕوو کەوتن.

**(حَمِيمٍ )**: **(المَاءُ الشَّدِيدُ الحَرَارَة، وهو القَرِيبُ المُشفِقُ)**، (حميم) هەم بە ئاوی زۆر گەرمی داغکراو دەگوترێ، هەم بە خزم و نزیکی دڵسۆزو بەپەرۆش دەگوترێ، بۆیە گوتراوە: **(الخَاصَّةُ وَالعَامَّة)** یانی: کەسانی زۆر نیزیك و دڵسۆز، **(عامّة)**ش یانی: خەڵك بەگشتیی.

**(كَرَّةً)**: **(الكَرُّ: العَطْفُ عَلَى الشَّيءِ)** واتە: بادانەوە بۆ شتێك، گەڕانەوە بۆ شتێك، **(والكَرَّةُ: المَرَّةُ)** یانی: جارێك گەڕانەوە بۆ شتێك لە **(كَرّ)**ەوە هاتوە، واتە: بادانەوە.

## مانای گشتیی ئەم ئایەتانە

ئێمە بە تێرو تەسەلیی توێژینەوەمان لەبارەی ئیبراهیمەوە عليه السلام کردوە، لە کاتی تەفسیر کردنی ئایەتەکانی: (٣٥-٤١) لە سوورەتی (إبراهیم)دا.

وەك زۆر جار گوتوومانە: لە سوورەتێکدا بەسەرهاتی پێغەمبەرێك دێنین، کە ئەو سوورەتە بەناوی ئەوەوە ناونرا بێ، وەك: سوورەتی (یونس)، سوورەتی (إبراهیم) سوورەتی (الحجر) بەسەرهاتی صاڵح، سوورەتی (یوسف)، سوورەتی (هود) بەسەرهاتی هوودمان تێدا هێناوە، جاری واش هەیە کە زیاتر لە بەسەرهاتی پێغەمبەرێك لە سوورەتێکدا دەهێنین، ئەگەر لەوێدا زیاتر بە گونجاومان زانیبێ، ئنجا بەسەرهاتی (ئیبراهیم)مان عليه السلام بە تەفصیل لە سوورەتی (إبراهیم)دا هێناوە، بۆیە لێرە بە خێرایی بەسەریدا دەڕۆین.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾، هەواڵی ئیبراهیمیان بەسەردا بخوێنەوە، واتە: هەواڵی بەسەرهاتی ئیبراهیم بەسەر گەلەکەتدا، بەسەر خەڵکەکەتدا بخوێنەوە ئەی موحەممەد ﷺ! هەروەها دوای ئەویش، ئەی هەر کەسێك کە لەڕێی موحەممەدەوە ﷺ دەڕوا، بە ڕێبازی ئەودا دەڕوا، لەگەڵ کۆمەڵگای خۆی و دەوروبەری خۆیدا خەریك دەبێ، کە بەرەو هیدایەتی خواو، بەرەو ڕاستە شەقامی خوایان بێنێ! بەسەرهاتی ئیبراهیمیان بەسەردا بخوێنە:

﴿ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴾، کاتێك کە بە بابی و بە گەلەکەی خۆی گوت: چی دەپەرستن؟ یانی: ئەوەی ئێوە دەیپەرستن چییە؟ ﴿ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴾ ئیبراهیم عليه السلام بینیویەتی بتان دەپەرستن، بەلام ویستوویەتی لە زمانی خۆیانەوە بیانگرێ، وەك عەرەب دەڵێن: (أُدينُك مِن فَمِك) بەزاری خۆت دەتگرم! با بۆ خۆیان دانی پێدا بێنن کە بتان دەپەرستن، ﴿ قَالُواْ

﴿نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ﴾ گوتیان: ئێمە چەند بتانێك دەپەرستین كە بە درێژایی ڕۆژێ لەلایان دەمێنینەوە (بەمەزنیان دەگرین و لێیان دەپاڕێینەوە!)

﴿قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ﴾، ئیبراهیم ﷺ فەرمووی: ئایا كاتێك لێیان دەپاڕێنەوە، گوێیان لێتانە؟ یانی: (تدعونَهُم) یان (تدعُونَها)، ئایا كاتێك لێیان دەپاڕێنەوە، گوێبیستتان دەبن؟ ﴿أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ﴾ یان ئایا سوودتان پێ دەگەیەنن، یان زیانتان لێدەدەن، ئەگەر لێتان ڕازی بن، سوودتان پێ دەگەیەنن، یان ئەگەر لێتان تووڕە بن، بەخەیاڵی خۆتان، زیانتان لێدەدەن؟

﴿قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ ناكرێ بڵێن: پاڕانەوەمان دەبیستن، یان سوودمان پێدەگەیەنن و زیانمان لێدەدەن، بۆیە گوتوویانە: بەڵكو بەڵگەمان ئەوەیە كە ئێمە باب و باپیرانمان وا بینیوە، وایان كردوە، ئێمەش وەك ئەوان دەكەین، وەك چۆن مەڕ سەر لەدوای یەك دەنێ، ئەگەر مەڕێكیان لە شاخ هەڵدێرێ، مەڕەكانی دیكەش هەموویان بەدوایدا هەڵدەدێرێن، ئەوانی دیكە بیر ناكەنەوە: ئەو مەڕە هەڵدێرا، با ئێمە هەڵنەدێرین و ڕاوەستین!!

جاری وایە مەڕ لە شاخی دەچێ، سێ سەد، چوارسەد سەر مەڕ، پێكەوە هەڵدەدێرێ لە چیا، خەڵك و جەماوەری واهەیە لەسەر مەزهەبی مەڕە، لەسەر مەزهەبی بزنە، لەسەر مەزهەبی ئاژەڵە، مرۆڤ ئەگەر هیدایەتی خوا لەفریای نەیەت، خراپ بەسەر خۆی دێنێ، دەچێتە سەر مەزهەبی ئاژەڵ و مەڕو بزن و گاگەل، ئنجا ئەو كاتە شوانێك هەر دەبێ بەپێش خۆیانبدات، گاوانێك هەر دەبێ لێیان خوڕێ، بەڵام ئەگەر بەندەی خوابن، مرۆڤ دەبن، ڕێزو حورمەتی خۆیان دەزانن، بۆیە ئێستا گەلی ئیبراهیم، دوای ئەوەی ئیبراهیم ﷺ ناچاریان دەكات بێنە گۆو دان بە حەقیقەتدا بێنن، كە ئایا ئەوانە گوێیان لە پاڕانەوەی ئێوە دەبێ؟ ئایا سوودتان پێ دەگەیەنن؟ ئایا زیانتان لێدەدەن؟ ناتوانن بڵێن: بەڵێ، دەڵێن: بەڵكو بەڵگەمان ئەوەیە كە باب و باپیرانمان هەر وایان كردوە.

﴿ قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴾، ئیبراهیم ﷺ فەرمووی: ئەوانەتان بینیون کە ئێوە دەیانپەرستن، ﴿ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴾، خۆتان و باب و باپیرانی پێشووتان، ﴿ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بەدڵنیایی ئەوانە هەموویان دوژمنن بۆمن، جگە لە پەروەردگاری جیهانییان، واتە: ڕقم لێیانە، چونکە ئێوە بە هۆی ئەوانەوە هەڵخەڵەتاون، ئەگەرنا ئەوانە بەس پەیکەرن، من ڕقم لێیانە، کە بوونە هۆی گومڕایی ئێوە، من تەنیان پەروەردگاری جیهانییان دۆستمە، ئەوانی دیکە هەموویان دوژمنمن.

ئنجا دوایی پەروەردگاری جیهانییان پێناسە دەکات، چەند سیفەتێکی خوا هەڵدەدات، دەفەرمویّ:

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴾، ئەو زاتەی منی هێناوەتە دی و، هەر ئەویش ڕێنماییم دەکات و، ڕێم پیشان دەدات، ﴿ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴾، ئەو کەسەش کە تەنیا ئەو خواردنم پێ دەداو خواردنەوەشم پێ دەدات، ﴿ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴾، کاتێکیش نەخۆش بم، بەس ئەو چاکم دەکات، نەخۆشییەکەی پاڵ داوەتە لای خۆی و، چارەسەرەکەی پاڵ داوەتە لای خوا، چونکە بەزۆریی وایە مرۆڤ بە هۆی کەمتەرخەمیی خۆیەوە، لەڕووی تەندروستییەوە نەخۆش دەبێ، ئەگەر نەخۆش کەوتم خوا چاکم دەکاتەوە، بەڵێ ڕەنگە بە هۆی دەرمان و چارەسەرکردنەوە چاك ببێتەوەو پزیشك چاکی بکاتەوە، کە ئەوە دەبێتە هۆکار، بەڵام ئەوەی شیفایەکە دەهێنێ خوایە، جاری وایە سەد پزیشك لە نەخۆشێك کۆدەبنەوە، بۆشیان چاك نابێتەوە، چونکە خوا مۆڵەتی لەسەر نیە، جاری واش هەیە بەبێ پزیشکیش مرۆڤ دەگونجێ چاك ببێتەوە، کەواتە: چاککەرەوەکە خوایە ﷻ، بەڵام ئەوانی دیکە هۆکارن، جاری وایە کاریگەرییان دەبێ و، جاری واش هەیە پەرچێك دێتە ڕێی بەردەم هۆکارەکان، کاریگەرییەکەیان بەتاڵ دەکاتەوە.

﴿ وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ﴾، هەروەها پەروەردگارم ئەو کەسەیە کە دەممرێنێ و، زیندووم دەکاتەوە. ﴿ وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴾، دیسان پەوەردگارم ئەو زاتەیە، ئومێدم وایە کە لەڕۆژی سزاو پاداشتتدا لە هەڵەو کەم و کوڕییەکەم ببووری.

ئایا کەم و کوڕییەکەی ئیبراهیم ﷺ چی بووە؟ پێغەمبەران هەمیشە لە بەرانبەر خوای پەروەردگاردا، خۆیان پێ کەمتەرخەم و گوناهبارو، پێویست بەوە بووە، خوا لێیان ببووری و چاوپۆشییان لێ بکات، نەك وەك خەڵکی دیکە بە مستە ئاوێك بکەونە مەلە، بەدوو ڕکات نوێژ، هەوایەك بچێتە کەللەیان! پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) زانیویانە خوا ﷻ چ پایەو مەقامێکی بەرزی بێ وێنەی هەیە، بۆیە هەرچی کردوویانە لە خواپەرستیی و دینداریی و چاکە، هەر پێیان کەم بووەو، خۆیان پێ گوناهبارو کەمتەرخەم بووە لە بەرانبەر خوادا ﷻ.

﴿ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، پەروەردگارم! حیکمەتم پێ بدەو بە چاکانەوە پەیوەستم بکە، بخە ڕیزی چاکانەوە. ﴿ وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾، هەروەها زمانی چاکم، ناوبانگی چاکم لەنێو ئەوانی دیکەدا بۆ بڵاوبکەوە.

ئەو دوعایەی ئیبراهیم ﷺ تەماشا بکەن، چۆن قبووڵ بووە! هەموو خاوەن ئایین و کتێبە ئاسمانییەکان، لەسەر ئیبراهیم یەك دەنگن، هەر لە صابیئەوە بگرە، تاکو جوولەکەکان، نەصرانییەکان، مسوڵمانانان، ئەوانەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، مەجووسییەکان، گرنگ ئەوەیە هەموو ئەوانەی خۆیان پاڵداوەتە لای خوا ﷻ و لای کتێبە ئاسمانییەکان، هەموویان ڕێزیان بۆ ئیبراهیم ﷺ هەیەو، ئەو دوعایەی ئیبراهیم زۆر چاك لە واقیعدا بەرجەستە بووە.

چونکە ﴿ لِسَانَ صِدۡقٖ ﴾، یانی: مەدح و سەناو پێهەڵگوتن، ئنجا ئایا ئیبراهیم بۆچی ئەو دوعایەی کردوە؟ بۆ ئەوەی خەڵك قسەی لێ وەربگرێ، چونکە

خەڵك ئەگەر خۆشی نەوێی و متمانەی پێت نەبێ، قسەشت لێ وەرناگرێ، بۆ ئەوەی پەیامی خوا چاك بگەیەنێ، بۆیە گوتوویەتی: باس و خواس و ناوبانگی چاكم بە نێو خەڵك دا بڵاو بكەوە، ﴿ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، هەروەها لە میراتگرانی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتم بگێڕە، ﴿ وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾، لە بابیشم ببوورە، چونكە ئەو لە گومڕایان بوو، چاوپۆشیی لێ بكە، بەڵام خوا ئەم دوعایەی ئیبراهیمی عليه السلام قبووڵ نەكردوە، وەك لە سوورەتی (التوبة) و (الممتحنة)دا هاتوە، ﴿ وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ يُبۡعَثُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾، هەروەها لە ڕۆژێكدا كە زیندوو دەكرێنەوە، شەرمەزارم مەكە، ڕوو زەردم مەكە، با زەبوون و سەرشۆڕ نەبم، ﴿ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ﴾، ئەو ڕۆژەی كە نە سامان و نە كوڕان دادی كەس نادەن، سوود بەكەس ناگەیەنن، مەگەر كەسێك بەدڵێكی ساغ و سەلیمەوە بێتەوە خزمەت خوا ﷻ، ئەگەرنا هیچ شتێكی دیكە بەفریای كەس ناكەوێ.

لێرە كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ يُبۡعَثُونَ ﴾، ئەمە لەبەرڕا هاویشتنەو كنارەیە بۆ هاوبەش بۆخوادانەرەكان، یانی: ئەوانە سەرشۆڕ دەبن لە ڕۆژێك كە زیندوو دەكرێنەوە، بەڵام من سەرشۆڕ مەكە، وەك ئەوان.

هەروەها كە دەفەرموێ: ئەو ڕۆژە كە سامان و كوڕان سوود بە كەس ناگەیەنن، یانی: ئەو هاوبەش بۆخوا دانەرو كافرانە بە تەمای سەروەت و سامانەكەیان و، كوڕو خزمیان تێكەوتوون، كە ئەوانە سوود ناگەیەنن، مەگەر كەسێك بە دڵێكی ساغەوە بێتەوە خزمەت خوا، دڵی ساغیش ئەوەیە كە خڵتەی شیرك و كوفرو نیفاقی تێدا نەبێ، هەروەها خڵتەی ڕیاو بیدعەتی تێدا نەبێ، دڵێكی ساغ و صاف و سەلیم بێ.

لێرە بەسەرهاتی ئیبراهیم عليه السلام كۆتایی دێ، كە پێشتریش گوتمان: بیست و یەك (٢١) ئایەتی بۆ تەرخان كرابوو.

ئنجا ئەو پازدە (١٥) ئایەتەکەی کە دێن، بێگومان هەر پەیوەستن بە بەسەرهاتی ئیبراهیمەوە ﷺ، بەڵام پەیوەستیشن بە بەسەرهاتی هەموو پێغەمبەرانەوە، لە ئێویشیاندا سەروەرو گەورەی پێغەمبەران موحەممەد ﷺ چونکە باسی ڕۆژی دوایی دەکات، کە لەوێ پارێزکاران حاڵ و باڵیان چۆن دەبێ؟

دوایی بە درێژیی باسی ئەوە کراوە: چی ڕوودەدا بۆ هاوبەش بۆخوادانەران، بۆ لارێیان لە ڕاستە شەقامی خوا؟! دەفەرموێ:

﴿ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾، بەهەشت وەنزیکخرا بۆ پارێزکاران، ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ ﴾، هەروەها کڵپەی سەوزی ئاگری دۆزەخیش ڕانوێنرا، ئاشکرا کرا بۆ بێمرادان، بۆ ئەوانەی لە ئەنجامی گومڕاییدا بێمرادو بەدبەخت و چارە ڕەش بوون، ﴿ وَقِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، پێیان گوترا: کوان ئەوانەی لە جیاتی خوا دەتانپەرستن، لە کوێن؟ ﴿ هَلۡ يَنصُرُونَكُمۡ أَوۡ يَنتَصِرُونَ ﴾، ئایا ئێوە سەردەخەن، یاخود (ئەگەر ئێوەش سەرنەخەن بەلای کەمەوە) خۆیان سەردەخەن؟ یانی: ئەوان خۆشیان پێ دەرباز ناکرێ، چ جای ئێوە! ﴿ فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ﴾، واتە: بت و صەنەمەکان، پەرستراوە ساختەکان لەگەڵ سەرگەردان و بێمرادەکان دا، هەموویان لەپەوڕوو کەوتنە نێو ئاگری دۆزەخەوە، ﴿ وَجُنُودُ إِبۡلِيسَ أَجۡمَعُونَ ﴾، هەروەها سەربازەکانی ئیبلیسیش هەموویان تێکڕا و وێکڕا کەوتنە نێو دۆزەخەوە، ﴿ قَالُواْ وَهُمۡ فِيهَا يَخۡتَصِمُونَ ﴾، ئنجا لە کاتێکدا لەوێدا دەمەقاڵێ و، مشت و مڕیان بوو، گوتیان: ﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴾، سوێند بە خوا، ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بووین، ﴿ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، کاتێک ئێوەمان یەکسان دەکرد بە پەروەردگاری جیهانییان.

ئێمە دەربارەی شیرك و هاوبەش بۆخوا دانەران، لە کۆتایی سوورەتی (یوسف) دا باسێکی تێرو تەسەلمان کردوەو گوتوومانە: ئەصڵ و ڕیشەی شیرك، ئەم ئایەتە موبارەکە پێناسەی دەکات، شیرك بریتیە لە یەکسان کردنی غەیری خوا لەگەڵ

خـوادا، چ لـە بەدیهێنەرایەتییـدا، چ لـە پەروەردگارێتییـدا، چ لـە خاوەندارێتییـدا، چ لـە نـاوو سـیفەتەکاندا، چ لـە پەرسـتراوێتییدا، چ لـە هـەر تایبەتمەندییەکـی دیکـەی خـوای پـەروەردگاردا، غەیـری خـوا یەکسـان بکـەی لەگـەڵ خـوادا، ئـەوە ڕیشـەی شـیرکە، بناغـەی شـیرك ئەوەیـە، کـە وەك خـوای پـەروەردگار، تەماشـای هەندێـك لـە پـەروەردە کراوەکانـی بکـەی، وەك خـوای بەدیهێنـەر، تەماشـای هەنـدێ لـە بەدیهێـنراو و دروسـتکراوەکانی بکـەی، چ لـە زاتیانـدا، چ لـە سـیفەتیاندا، چ لـە ناویانـدا، چ لـە هـەر شـتێکدا کـە تایبەتمەندیـی خـوای پـەوەردگارە.

﴿ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾، تەنیـا تازانبارانیـش ئێمەیـان گومـڕا کـرد، ﴿ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴾، ئێسـتاش هیـچ تکاکارمـان نینـە، ﴿ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴾، هەروەهـا دۆسـت و هاوەڵێکـی دڵسـۆزو بەبەزەیـی و نزیـك و دڵ سووتاویشـمان نیـە، بـێ کـەس وکار کەوتووینـە گـۆڕێ، دەسـتخەڕۆو ڕەنجەڕۆیـن، بـێ کـەس و کەساسـین! ﴿ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ خۆزگـە جارێکـمان بـۆ هەبووایـە تاکـو لـە بـڕواداران بیـن، یـانی: خۆزگـە جارێـك بگەڕێینـەوە بـۆ دنیـا، تاکـو لـەوێ تووشـی ئـەو سـەرەنجام و دەرەنجامـە شـووم و بێخێـرە نەبیـن، بـەڵام وەك پێشـینان دەڵێـن: (داری خۆزگـەو بریـا بەرناگـرێ)، ئـەوە هـەر ئاواتێکـەو دەیخـوازن، بـەڵام بایـی فلسـێکە، ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ لەمـەدا نیشـانەیەکی مـەزن هەیـە، بـەڵام زۆربەیـان بـڕوادار نیـن، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، تەنیـا پەروەردگاریشـت باڵادەسـتی بەبەزەییـە، بەسـەر ناحـەزانی خـۆی و ئاییـن و پەیـام و پێغەمبـەرانی دا زاڵ و باڵادەسـتەو، لـە بەرانبـەر پێغەمبـەران و شـوێنکەوتووانیان دا، میهرەبـان و بـە بەزەییـە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**بەسەرهاتی ئیبراهیم لەگەڵ بابی و گەلەکەیدا، کە لەبارەی بتە پەرستراوەکانیانەوە لێیان دەپرسێ و، دوای ئەوەی لێیان دەپرسێ: ئایا پاڕانەوەکەتان دەبیستن؟ یان سوودو زیانیان هەیە؟ ئەوان هەڵوێستەکەیان بە لاساییکردنەوەی پێشینانیان پاساو دەدەنەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

۱)- ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾، هەروەها هەواڵی بەسەرهاتی ئیبراهیمیان بەسەردا بخوێنەوەو، بۆیان بگێڕەوە، واتە: ئەوەی کە خوا ﷻ لە قورئاندا لەبارەی ئیبراهیمەوە بۆی گێڕاویەوە، بۆیان باس بکە.

۲)- ﴿ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴾، یاد بکەوە! کاتێ ئیبراهیم بە بابی و بەگەلەکەی خۆی گوت: چی دەپەرستن؟ (ما: اسم اسْتِفهامٍ، يُسألُ بِهِ عَن تَعيين الجِنْس) (ما) بۆ پرسیار کردنە، پرسیاری پێ دەکرێ لەبارەی ڕوونکردنەوەی جینس و ماهیەتی شتێك، کە بە تەئکید لێرەدا پرسیار کردنەکە مەبەست پێی: کردنەوەی دەرگای وتووێژو دیالۆگە، نەك مەبەستی بێ: چییەت و چۆنیەتی شتەکانی پێ بناسێنن، چونکە خۆی زانیویەتی کە دارو بەردن و، یان ئەو کەرەستەو ماددانەن کە لێیان دروستکراون.

٣)- ﴿ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴾، گەلەكەی و باببیشی گوتیان: ئێمە ئەو پەیكەرانە دەپەرستین، ئەو بتانە دەپەرستین، بەدرێژایی ڕۆژێ ئێمە لەلایان دەمێنینەوەو بەگەورەیان دەگرین، لێرەدا (عاكِفين: ضُمِّنَ مَعْنى «عابِدين» فَعُدِّيَ إلَيْهِ الفِعْل باللاّم) یانی: (فَنَظَلُّ لَها عاكِفينَ وَعابِدين) وشەی (عاكفین) مانای (عابدین)یشی خراوەتە نێو، بۆیە بە (ل) بەركاری خواستوە، ئەگەرنا دەگوترێ: (ظَلَّ عَلَيْهِ عَاكِفاً) نەك (ظَلَّ لَهُ عاكِفاً)، بەڵام لەبەر ئەوەی (عاكفین) مانای (عابدین)ی خراوەتە نێو، یانی: لەسەریان دەمێنینەوەو دەیانپەرستین، بۆیە بە (ل) تێپەڕی پێكراوە بۆ بەركار (مفعول بە).

٤)- ﴿ قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ﴾، ئیبراهیم عليه السلام فەرمووی: ئایا كاتێك دەپاڕێنەوە (واتە: لێیان دەپاڕێنەوە) گوێبیستتان دەبن؟

٥)- ﴿ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ﴾، یان ئایا سوودتان پێ دەگەیەنن، یان زیانتان لێ دەدەن؟

٦)- ﴿ قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴾، گوتیان: بەڵكو ئێمە باب و باپیرانمان، پێشینانمان، وابینیوە هەروایان كردوە، (بَلْ: إضْرَابُ انْتِقَالٍ مِنْ مَقَامِ إثْبَاتِ صِفَاتِهِم إلى مَقَامٍ قَاطِعٍ لِلْمجَادَلَة في نَظَرِهِم، وَهوَ أنهم وَرِثوا عِبَادَةَ هَذِهِ الأَصْنَامِ عَنْ آباءِهِم) كە دەڵێن: ﴿ قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴾، واتە: پێویست ناكات ئێمە وەڵامی ئەو پرسیارەت بدەینەوە، ئایا سوودمان پێ دەگەیەنن یان زیان و، ئایا گوێیان لە پاڕانەوەمان دەبێ یان نا؟! وشەی (بل) بۆ لێدان و گواستنەوەیە (گواستنەوە لە حاڵێكی نزمەوە بۆ حاڵێكی بەرزتر) لە پێگەی ئیسپاتكردنی سیفەتەكانی پەرستراوەكانیان، بۆ پێگەی كۆتایی پێهێنانی مشت و مڕەكە، كە ئێمە ئەوەمان لە باب و باپیرانمانەوە بەمیرات گرتوە، كەواتە: جێی مشت و مڕو قسە لێكردنێ نیە، ئەوانە لاساییكردنەوەی باب و باپیرانیان، وا داناوە كە هێندە هەقە، پێیان وابووە جێی قسە لێ كردنێ هەر نیە.

**مەسەلەی دووەم:**

**ڕەخنــە گرتنــی ئیبراهیــم ﷺ لــە بــت پەرســتەکان و، خســتنە ڕووی چەنــد خەسـڵەتێکی بنەڕەتیـی خـوای بـەرزی مـەزن، کـە بەڵگـەو پاسـاوی پەرستنیشـینی و سـەرجەم هەشـتن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:**

**١)- ﴿ قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴾، واتە: ئیبراهیم ﷺ فەرمووی: ئایا ئەوانەتان بینیوە کە دەیانپەرستن!**

**٢)- ﴿ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴾، خۆتان و باب و باپیرانی لەمێژینەو پێشینتان، کە دەفەرموێ: (أَفَرَءَيْتُم) دەگونجێ مەبەست پێ بینینی چاو (الرؤية البصرية) بێ، چونکە بەچاو بت و صەنەمەکان بینراون، دەشگونجێ مەبەست بینینی عەقڵ و دڵ (الرؤية القَلبية) بێ، واتە: ئایا بە چاوی عەقڵ و دڵ، ئەو بت و صەنەمانەی خۆتان و باب و باپیرانی پێشینتان دەیانپەرستن، دەبینن و دەزانن! (ٱلْأَقْدَمُونَ)، (أَقْدَم) کە بە (أَقْدَمون) کۆدەکرێتەوە یانی: (أكثرُ قِدَماً) واتە: ئەوانەی زۆر زۆر لەمەوپێشن، ئەوانە دەبینن کە دەیانپەرستن خۆتان و باب و باپیرانی پێشووتان.**

**٣)- ﴿ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بە دڵنیایی هەموویان بۆمن، دوژمنن جگە لە پەروەردگاری جیهانییان، کە دەفەرموێ: دوژمنن بۆمن، ئەمە وەك زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: (هَذا مِنَ التَّشبيهِ البَليغ) ئەمە لە وێچواندنی ئەو پەڕە، کە جۆرێکە**

لە وێچواندن، واتە: وەك دوژمن وان، ئەگەرنا خۆیان دوژمن نین، بەڵام یانی: هێندەم ڕق لێ هەڵدەستێ، وەك دوژمن وان.

(عَدُوٌّ)ش وەرگیراوە لە (عُدوان)ەوە، واتە: دەستدرێژیی و سنوورشکێنیی، هەروەها (العَدوّ: المُبغِضُ وَهُوَ فَعولٌ، بِمَعْنى «فَاعِل» مِنَ العُدوانِ يُلاَزِم الإِفْرَادَ وَالتَّذكِيرَ، فَلاَ تَلْحَقُهُ عَلاَمَات التَّأْنيث إِلاَّ نَادِراً) (عدو) كەسێكە ڕقی لە كەسێك یان شتێك بێ، لەسەر كێشی (فعول)ە، بەڵام بە مانای (فاعل)ە، وەك (مُبغِض) كەسێك كە ڕقی لە كەسێك دەبێتەوە، كە هەمیشە بەتاك و بەنێر دێ و، مەگەر بەدەگمەن ئەگەرنا نیشانەكانی مێینەی ناچنەسەر.

ئنجا پەروەردگاری جیهانییان، بەچەند وەسفێك پێناسە دەكات، كە سەرجەم هەشت وەسفن:

٤)- ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَنِى ﴾، ئەو پەروەردگارەی منی هێناوەتە دی، منی دروست كردوە.

ئەمە سیفەتی یەكەم.

٥)- ﴿ فَهُوَ يَهْدِينِ ﴾، ئنجا هەر ئەویش ڕێنماییم دەكات، ئەمەش سیفەتی دووەم. (خلق)ی بە كاری ڕابردوو گوتوە، چونكە دروست بووە، (خَلَقَنِى) منی هێناوەتە دی، ﴿ فَهُوَ يَهْدِينِ ﴾، ئەو ڕێنمایی من دەكات، بەڵام هیدایەتی بە ڕانەبردوو هێناوە، چونكە مرۆڤ هەمیشە پێویستیی بە ڕێنمایی و خستنە سەر ڕێی بەردەوامی خوای پەروەردگار هەیە.

٦)- ﴿ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴾، هەروەها پەروەردگاری جیهانییان ئەو كەسەیە كە خۆراكم پێ دەدا و خواردنەوەم پێدەدا.

ئەمانەش سیفەتەكانی سێیەم و چوارەم.

٧)- ﴿ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴾، سیفەتی پێنجەم: كاتێك نەخۆش كەوتم، بە هۆی كەمتەرخەمیی خۆمەوە لە ڕووی تەندروستییەوە، یان بە هۆی ئەو ژینگەیەوە

کەتێیدا دەژیم، یان بە هۆی ئەوەوە کە مرۆڤ لە جەستەیەک خوڵقاوە، کارتێکەرەکانی دەوروبەری کاری تێدەکەن، کاتێک کە نەخۆش کەوتم، ﴿ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴾، ئەو (خوا) چاکم دەکاتەوەو شیفام دەدا، بۆیەش دەفەرموێ: ئەگەر نەخۆش کەوتم، یانی: لە داهاتوودا هەر کاتێک نەخۆش کەوتم، ئەو چاکم دەکاتەوەو چارەسەرم دەکات، بێگومان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئیبراهیم ﷺ دەرمان و چارەسەری پزیشک بەکار نەهێنێ، بەڵام ئەمە یانی: ئەوانە هەموویان هۆکارن و لە پشت هۆکارەکانەوە، ئیرادەی ڕەهای خوا هەیە، کە کاریگەریی ڕەهای هەیەو، کاریگەریی دەداتە هۆکارەکانیش.

٨)- ﴿ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴾، سیفەتی شەشەم و حەوتەم، کە خوای پەروەردگاریان پێ وەسف دەکات: هەروەها خوا ئەو کەسەیە کە دەممرێنێ و دواییش زیندووم دەکاتەوە، واتە: خوا ئەگەر بیەوێ، لە هەر کاتێک و هەر شوێنێک دا، بە هەر شێوەیەک، دەمرم و، هەر ئەویش زیندووم دەکاتەوە.

٩)- ﴿ وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴾، سیفەتی هەشتەم و کۆتایی کە لێرەدا ئیبراهیم ﷺ پەروەردگاری پێ دەناسێنێ: هەروەها پەروەردگاری جیهانییان ئەو کەسەیە، کە ئومێدم وایە لەڕۆژی سزاو پاداشتدا لە گوناهەکەم ببوورێ.

دەگوترێ: (خَطِيءَ خَطِيئَةً: أَيْ أَذْنَبَ وَخَالَفَ مَا أَمَرَ بِهِ الشَّرْعِ) (خطيء) یانی: گوناهی کرد، شتێکی کرد پێچەوانەی ئەوەبوو کە شەریعەت فەرمانی پێکردوە، بەڵام (أَخْطَأَ، خَطَأً) واتە: هەڵەی کرد، (خَطِيئَة) شتێکە بزانی گوناحەو بیکەی، بەڵام (أَخْطَأَ) ئەوەیە ئینسان بەهەڵە شتێک بکات، ئیبراهیم ﷺ هەڵەکانی خۆی بەرانبەر مەقامی بەرزی خوای پەروەردگار، بە (خَطِيئَة) ناو ناوە، (خَطِيئَة) ش ئەوەیە بە ئەنقەست گوناهێک بکەی، ئەمەش تەفسیرەکەی ئەوەیە کە وەک گوتراوە: (حَسَنَاتُ الأَبْرارِ سَيِّئَاتُ المُقَرَّبِين) ئەوەی بۆ چاکەکاران چاکە، بۆ زۆر لەخوا نزیکان بە گوناح لە قەڵەم دەدرێ، لەبەر ئەوەی ئەوانە زانیویانە خوا چ پایەو مەقامێکی بەرزی هەیە، ئەوەی خۆیان ئەگەر بەهەڵەدا چوونێک بووبێ،

ئەگەر لە ئیجتیهادێکدا نەیانپێکابێ، شتێکی بچووکیش بووبێ، لەلایان گەورە بووە، هەر بۆیە خوا ﷻ هەم لە نووحی گێڕاوەتەوەو، هەم لە ئیبراهیمی گێڕاوەتەوە، بە نسبەت پێغەمبەری خۆشمانەوە ﷺ فەرموویەتی:

﴿ لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴾ الفتح - ٢ -، کە بەنسبەت پایەو مەقامی بەرزی ئەوانەوەو، بە هۆی زۆر نیزیکیی ئەوانەوە لە خوا، ئەو وردە هەڵانە بە گوناح لە قەڵەم دراون، ئەگەرنا لەڕاستییدا پێغەمبەران ﷺ پارێزراو بوون لەوەی شتێك بکەن، بزانن خوا پێی ناخۆشەو گوناحە، دیارە دوای ئەوەی وەحییان بۆ هاتوە، پێش پێغەمبەرایەتییش خوا ﷻ مەعدەنەکەی هێندە پاك و، زگماکی هێندە چاك دروستکردوون، کە بە خوارسك لەشتی خراپ و ناشیرین دوور بوون، بەڵام تەنیا لەدوای پێغەمبەرایەتییەوە خوای پەروەردگار پاراستوونی لەو شتانەی بە گوناح و تاوان لە قەڵەم دەدرێن، بەڵام کە هەندێ لە هەڵس و کەوت و هەڵەکانی خۆیان، بە گوناح لە قەڵەم داوە، لەبەر ئەوەیە کە پایەو مەقامی خوا هێندە بەرزە، نابێ وردە هەڵەو کەم و کوڕییش لە بەرانبەریدا بکرێ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**چەند داواکارییەکی گەورەو گرنگی ئیبراهیم ﷺ لە خوای پەروەردگار کە سەرجەم شەش داواکارییـن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ (٨٣) وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ (٨٤) وَاجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ (٨٥) وَاغْفِرْ لِأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ (٨٦) وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ (٨٧) يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ (٨٨) إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ (٨٩) ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا ﴾، یەکەم داواکاریی ئیبراهیم ﷺ ئەوەیە دەفەرموێ: پەروەردگارم! حیکمەتم پێ ببەخشە، حیکمەتیش: (الحِكْمَة: الإِصَابَة فِي العِلْمِ وَالعَمَل) حیکمەت بریتیە لەوە کە ئینسان لەڕووی زانیاریی و کردەوەوە نیشانە بپێکێ، واتە: هەم زانیارییەکی ڕاست و دروستی هەبێ، هەم کردەوەیەکی پاك و چاکی هەبێ، پەروەردگارم! حیکمەتم پێ ببەخشە.

٢)- ﴿ وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴾، داواکاریی دووەمی ئەوەیە: بە چاکانەوە پەیوەستم بکە، واتە: بمخە ڕیزی ئەوانەوە، (أَسْلِكْنِي فِي سِلْكِهِم) لە ڕیزی واندا دامبنێ، واتە: با هێندە چاك بم، بچمە نێو قووڵایی چاکەکارانەوە.

٣)- ﴿ وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ﴾، داواکاریی سێیەمی ئەوەیە دەفەرموێ: ناوبانگی چاکم بەڵکو ئەوانی دیکەدا بڵاوبکەوە، (لِسَان) یانی: زمان (لغة) زمانی قسە پێکردن، هەروەك بە زمانی گۆشتینیش دەگوترێ، ئنجا لەبەر ئەوەی زمانی گۆشتین، ئامڕازی قسە کردنە، (صدق)یش هەر شتێکی خۆشویستراوی ئارەزوو بۆ کراوە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ لِسَانَ صِدْقٍ ﴾، واتە: ناوبانگی چاك، خەڵك باسی خێرم بکەن و ستایشم

بکەن، ئایا ئەوەی بۆچی بووە؟ بۆ ئەوەی بووە تاکو خەڵك پەیامی خوای لێوەربگرێ، مەبەستی ئەوەبووە: ئەگەر خەڵك منیان خۆش بوێ و، ڕێزم لێ بگرن و، ناوبانگی چاکم بڵاوبێتەوە و متمانەم پێ بکەن، قسەشم لێ وەردەگرن، پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، هەموو شتێکیان بەستۆتەوە بە خوای پەروەردگارەوە، بەپەیامی خواوە، بەو ئەرکەوە کە خوا پێی سپاردوون.

٤)- ﴿ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، داواکاریی چوارەمی: هەروەها بمگێڕە لە میراتگرانی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت، واتە: لەو کەسانەی لە لای خوا شایستەی خاوەن ماف دەبن، شایستەی ئەوە دەبن ئەو بەهەشتە پڕ لە نازو نیعمەتەیان بدرێتێ.

٥)- ﴿ وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾، داواکاریی پێنجەمی: لە بابیشم ببوورە، چونکە بێگومان ئەو لە گومڕایان بووە. بەڵام ئەم داواکارییەی وەڵام نەدراوەتەوە، چونکە بابی شایستەی لێبوردران نەبووە.

٦)- ﴿ وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ يُبۡعَثُونَ ﴾، داواکاریی شەشەمی: لەڕۆژێکدا کە مرۆڤەکان زیندوو دەکرێنەوە، سەرشۆڕم مەکە، شەرمەزارم مەکە، بە هۆی ئەوەوە کە بابم سزا بدەی، یاخود شەرمەزارم مەکە، بەهەر هۆیەکەوە بێ.

ئنجا دوایی باسی ئەو ڕۆژە دەکات کە بریتیە لە:

٧)- ﴿ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ﴾، ئەو ڕۆژەی کە نەسامان و نە کوڕان سوود ناگەیەنن بەکەس.

٨)- ﴿ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ﴾، مەگەر کەسێك بە دڵێکی ساغ و سەلیمەوە، بێتەوە خزمەت خوا.

لە فەرمایشتدا هاتوە: [يُؤْتَى بِأَبِي إِبْرَاهِيمَ يَوْمَ القِيَامَةِ فِي صُورَةِ ذِيخٍ، فَيُلْقَى فِي النَّارِ فَلا يَشْعُرُ بِهِ أَهْلَ المَوْقِفِ][1].

---

(١) السيوطي، الدر المنثور (٣٧/٦).

واتـە: بابـی ئیبراهیـم لـە ڕۆژی دواییـدا دەهێنـن لـە شـێوەی کەمتیارێکـی نێـردا، فـڕێ دەدرێتـە نێـو ئاگـر، ئـەو خەڵکـەی لەوێـوە وەسـتاوە کـەس هەسـتی پێنـاکات.

بۆ ئەوەی ئیبراهیم هەست بە شەرمەزاریی و سەغڵەتیی نەکات.

واتـە: خـوای پـەروەردگار ئەو دوعایەشـی قبووڵ کـردوەو، لـەو ڕۆژەدا واناکات ئیبراهیم هەسـت بـە شـەرمەزاریی بـکات، بـە هۆی بابیـەوە، بەڵام بابـی هەر سـزا دەدرێ.

## وشەی (صِدق) لـە قورئاندا نۆ (٩) جاران هاتوە:

١)- ﴿لِسَانَ صِدْقٍ ۝٥٠﴾مريم، واتە: زمانی ڕاست کە مەبەستی پێ ناوبانگە.

٢)- ﴿مُدْخَلَ صِدْقٍ ۝٨٠﴾الإسراء، واتە: بچمە نێو هەر کارێکەوە، بەچاکیی بچم.

٣)- ﴿مُخْرَجَ صِدْقٍ ۝٨٠﴾الإسراء، واتە: بە چاکیی لە کارێك بێمە دەرێ.

٤)- ﴿وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ۝١٦﴾الأحقاف، واتە: بەڵێنی چاك.

٥)- ﴿مَقْعَدِ صِدْقٍ ۝٥٥﴾القمر، واتە: نشینگەی چاك.

٦)- ﴿قَدَمَ صِدْقٍ ۝٢﴾يونس، واتە: پاداشتی باش.

٧)- ﴿مُبَوَّأَ صِدْقٍ ۝٩٣﴾ يونس، واتە: نیشتەجێکردنی چاك.

٨)- ﴿وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ ۝٣٢﴾الزمر، واتە: ڕاستی بە درۆ دانا.

٩)- ﴿جَآءَ بِٱلصِّدْقِ ۝٣٣﴾الزمر[1]، واتە: ڕاستیی هێنا.

لـە فەرموودەیەکـی دیکـەدا هاتـوە: [عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﷺ عَـنِ النَّبِـيِّ ﷺ قَـالَ: «إِنَّ إِبْرَاهِيـمَ عَلَيْـهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ يَـرَى أَبَـاهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ، عَلَيْـهِ الْغَـبَرَةُ وَالْقَـتَرَةُ» الْغَـبَرَةُ هِـيَ الْقَـتَرَةُ] (أخرجـه البخـاري: ٣٣٥٠).

---

(١) تفسير الشعراوي، ج١٧، ص١٠٥٩٩.

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ﷺ، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ئیبراهیـم ﷺ بابـی لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا دەبینـێ، کـە تـۆزو خـۆڵ و ڕەشـایی لـێ نیشـتوە.

هەروەهـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە فەرمایشـتێکی دیکـەدا دەفەرمـوێ: {يَلْقَـى إِبْرَاهِيـمُ أَبَاهُ، فَيَقُولُ: يَـا رَبِّ! إِنَّـكَ وَعَدْتَنِي أَنْ لاَ تُخْزِيَنِـي يَـوْمَ يُبْعَثُونَ، فَيَقُـولُ اللـهُ: إِنِّي حَرَّمْـتُ الجَنَّـةَ عَـلَى الكَافِرِيـنَ} (أخرجـه البخـاري: ٤٧٦٩. عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﷺ).

واتــە: ئیبراهیــم دەگاتــە بابــی لــە ڕۆژی دوایــی دا و دەپاڕێتــەوە، دەڵــێ: پـەروەردگارم! بەڵێنـت پێدابـووم کـە لـە ڕۆژێـك دا زینـدوو دەکرێینـەوە، شـەرمەزارم نەکـەی، نارەحـەت و سـەغڵەت نەبـم، خـوای بـەرز دەفەرمـوێ: بەهەشـتم لـە کافـران قەدەغـە کـردوە.

دوایـی لەسـەر شـێوەی کەمتیارێـك بابـی ئیبراهیـم دەخرێتـە ئاگـرەوە بـۆ ئـەوەی ئیبراهیـم هەسـت بـە سـەغڵەتیی و شـەرمەزاریی نـەکات لـەو ڕۆژەدا، کـە هەمـوو جینـن و مـرۆڤ و فریشـتەکان کۆبوونەتـەوە.

**مەسەلەی چوارەم:**

**نیزیك خرانەوەی بەهەشت بۆ پارێزكاران و، وەدەرخرانی دۆزەخ بۆ بێمرادان و، بەسەریەكدا كەوتنی بێبڕوایان لە دۆزەخدا، وێڕای سەربازەكانی ئیبلیس و، دان پێداهێنانی كافران بە تاوانی شیركداو، چەند خۆزگە خواستنێكی بێ جێیان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ (٩٠) وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ (٩١) وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ (٩٢) مِن دُونِ اللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ (٩٣) فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ (٩٤) وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ (٩٥) قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ (٩٦) تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ (٩٧) إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ (٩٨) وَمَا أَضَلَّنَا إِلَّا الْمُجْرِمُونَ (٩٩) فَمَا لَنَا مِن شَافِعِينَ (١٠٠) وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ (١٠١) فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (١٠٢) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ (١٠٣) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ (١٠٤) ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەژدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾، بەهەشت نیزیكخرایەوە بۆ پارێزكاران، (و)ی سەر ( وَأُزْلِفَتِ ) (الواو لِلحال، وَالعامِل فِيها: لا يَنْفَعُ مالٌ) واتە: (و) بۆ حاڵەو (منصوب)ە، یان لە شوێنی (منصوب) دایە، ئنجا ئەوەی وای كردوە (و) (منصوب) بێ، ئەم كرداری ( وَأُزْلِفَتِ ) ە، كە لە دوایەوە دێ، ﴿ وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ ﴾ واتە: لە حاڵێكدا ئەوە دەبێ، بەهەشت نیزیكخراوەتەوە بۆ پارێزكاران، دیارە لە ڕۆژی دواییدا وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، هەم بەهەشت و هەم دۆزەخ، بەدەست فریشتانەوەن و دەهێنرێن، ئێمە نازانین حاڵ و بارودۆخی قیامەت چۆنە، گرنگ ئەوەیە بەهەشت هەروەها دۆزەخیش هەردووكیان دەهێنرێن، باسی دۆزەخ كراوە كە چەندان هەزار فریشتە دەیهێنن[1]، لێرە خوا هەر هێندە دێنێ، دەفەرمووێ: بەهەشت نیزیك خرایەوە بۆ پارێزكاران.

---

(١) لە تەفسیری ئایەتی ( وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ) -٢٣- لە سوورەتی (الفجر)دا زیاتر لەو بارەوە دەدوێین.

هەڵبەتە زانایان ( وَأُزۡلِفَتِ )یان بە (قُرِّبَت)، (أُدۡنِيَت) لێکداوەتەوە، واتە: نیزیکخرایەوە، بەڵام بە بۆچوونی من، لەبەر ئەوەی (زُلۡفی) بەمانای (قُرۡبی) دێ، واتە: نیزیکییەکی تایبەت، بۆچی خوا ﷻ نەیفەرمووە: (قُرِّبَت)؟ یان (أُدۡنِيَتِ الجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ)و وشەی (أُزۡلِفَت) بەکارهێنراوە؟ واتە: ئەو پارێزکارانە پلەی نیزیکییان لە خزمەت خوای پەروەردگاردا هەیە، بۆیە خوا ﷻ بەهەشتیان بۆ نیزیک دەخاتەوە، واتە: بەهەشت ئەو شوێن و جێگاو ڕێگایەیە، کە مایەی نیزیکیی پارێزکارانە لە خوای پەروەردگار.

وەك لە سووڕەتی (القمر)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴿٥٤﴾ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴿٥٥﴾ ﴾، واتە: بێگومان پارێزکاران لە باخان و ڕووباران دان، لە نشینگەیەکی پاك لە لای حوکمڕانی توانادار. بە تەئکید ئەهلی بەهەشت لە خوا نزیك دەبن، بەو شێوە نزیکییەی کە بۆ خوا شایستەیە، هەروەك ئەهلی دۆزەخیش لە خوا دوور دەبن، ﴿ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾هود، کەواتە: وشەی (أُزۡلِفَت) تەنیا مانای نیزیکییەکی ڕووت، ناگەیەنێ، بەڵکو یانی: نیزیکییەك کە نیشانەی خۆشەویستیی خوای پەروەردگارە بۆ پارێزکاران و نیزیکیی مەعنەویی لێیان، یانی: دەیانخاتە شوێنێکەوە، کە لە خوای پەروەردگارەوە نیزیکە.

وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {... فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ، فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ، وَأَعْلَى الْجَنَّةِ، وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تُفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ}[1].

واتە: ئەگەر داواتان لە خوا کرد، فیردەوسی لێ داوا بکەن، چونکە نێوەڕاستی بەهەشتەو بەرزترین شوێنی بەهەشتەو لە سەرووی فیردەوسەوە، عەرشی خوای خاوەن بەزەییە، لە فیردەوسەوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن و دێنە خوار.

---

(١ ) حديث أبي هريرة: أخرجه أحمد: ٨٤٠٠، والبخاري: ٦٩٨٧، مطولًا، ومن حديث معاذ: أخرجه ابن ماجه ٤٣٣١، ومن حديث عبادة بن الصامت: أخرجه الحاكم: ٢٦٩، وأخرجه أيضًا: الترمذي: ٢٥٣١.

٢)- ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ ﴾، دۆزەخیش وەدەرخرا، پێشاندرا بۆ بێمرادان، له ئەنجامی گومڕابووندا مرۆڤ بێمراد دەبێ، هەرکەسێك (ضال) بوو دەبێتە (غاو)یش، وەك هەر کەسێك (مُهْتَدِي) بوو، (رَشید)یش دەبێ، بەرەنجام و بەرهەمی (هدی)، (رُشْد) ەو، بێمرادیی (غَواية)یش بەرهەمی (ضلال) گومڕاییە، چونکە هەندێك لە زانایان (غاوين) یان هەر بە (ضالّين) لێکداوەتەوە، بەڵام وشەی (ضالّين) لە قورئاندا هەیەو (غاوين)یش هەیە، کەواتە: ماناکانیان بە تەئکید لێك جیان، کە وەك گوتم: (غَواية) بەرەنجام و بەرهەم و دەرهاویشتەی گومڕاییە، لەئەنجامی گومڕا بووندا، ئینسان بێمرادو بێ بەش دەبێ، چارەڕەش دەبێ، خوا بمانپارێزێ.

وشـەی: (بُـرِّزَت) لـە جیاتـی (أُبـرِزَت) هاتـوە، (أُزْلِفَـت)، (أُبْـرِزَت)، کـە (أُبـرزت) لـە ڕووی بێژەییـەوە زیاتـر لەگەڵـی دەگونجـا، بـەڵام (بُـرِّزَت) زێدەڕۆیـی زیاتـری تێدایـە لـە (أُبْـرزت)، چونکـە بنچینەیـە لـە زمانـی عەرەبییـدا کـە (تضعيـف)، {(فعل)ێـك کـە یەکێـك لـە پیتەکانـی دووقـات دەکرێنـەوە} زێدەڕۆیـی زیاتـر لـە واتاکەیـدا هەیـە، واتـە: زۆر چـاك وە دەرخـراو پێشـاندراو هێنرایـە گـۆڕێ.

٣)- ﴿ وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، پێیان گوترا، {بەو بێمرادو چارەڕەشانە، بەو بێ ئاکام و بێ ئەنجامانە} کوا لەکوێیە، ئەوەی جگە لە خوا دەتانپەرست؟

پەرسـتراوەکان چ بـت و صەنـەم بن، چ دروسـتکراوەکانی دیکەی خـوای پەروەردگار بـن، بەشـەربن، بەردبـن، داربـن، لـە هـەر قاڵبێك دابـن هەمـووی دەگرێتـەوە، بۆیەش لـە شـوێنەکەیان پرسـیار کـراوە، یاخـود لـە کردەوەکەیـان لـە کوێـن، بۆچـی شـتێك ناکـەن؟ ئەمـە هیـچ لـە دەسـت نەهاتوویـی بـت و صەنەمەکانیـان دەگەیەنـێ و وەك نەبوونیـان تەماشـا کـراوە، چونکـە بـەو شـێوەیە نیـن کـە ئـەوان لێیـان چـاوەڕێ کـردوون، بتوانـن زیانیـان لـێ دووربخەنـەوە، یاخـود قازانجیـان بـۆ دەسـتەبەر بکـەن.

٤)- ﴿ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ ﴾، ئایا ئێوە سەردەخەن؟

٥)- ﴿ أَوۡ يَنتَصِرُونَ ﴾، یاخود {بەلای کەمەوە} خۆیان سەردەخەن؟ (إنتِصَار) لەسەر کێشی (إفتِعال)ە، ئەوەیە کە ئینسان خۆی سەربخات، (إنْتَصَر) وەك (إنْتَقَم) لە خۆیدا هەڵسا بەخۆسەرخستن، ئایا ئەوانە لەتوانایان داهەیە، ئێوە سەربخەن، یان بە لای کەمەوە ئەگەر ئێوەش سەرناخەن، دەتوانن خۆشیان سەربخەن؟ خۆیان دەرباز بکەن؟

هەڵبەتە وەڵامی ئەو پرسیارانە هەموویان قرتێنراوە، چونکە هیچ وەڵامیان نیە، بەڵام لە جیاتی وەڵامدانەوە، خوا دەفەرموێ:

٦)- ﴿ فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ﴾، واتە: لەپەوڕوو خرانە نێوی، ئەوانیش و سەرگەردانەکانیش، واتە: بت و صەنەم پەرستراوە ساختەکان، لەگەڵ ئەو بێمرادو، بێ ئاکامانەی کە پەرستوویانن، هەموویان خرانە نێو دۆزەخەوە.

(كُبْكِبوا، أي: كُبُّوا فِيهَا كَبّاً بَعْدَ كَبّ) (كَبٌّ) یانی: لەپەوڕوو خرا، لەپەوڕوو کەوێنرا، (كُبْكِبوا) یانی: جار لە دوای جار، کەوێنرا وەك (كَفْكَفَ) یانی: جار لە دوای جار وازی هێنا، لە (كَفٌّ)ەوە هاتوە.

بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا ﴾ بت و صەنەمەکان ڕاناوی کۆی بۆ بەکارهێناون، وەك ڕاناوی عاقڵان، نەیفەرموە: (كُبَّتْ فِيهَا هُمْ الغَاوِن)، ئەوە بەپێی تێگەیشتن و عەقڵی پەرستەرەکانیانە، چونکە ئەوان پێیان وابووە: پەرستراوەکان نیرادەو عەقڵ و شعووریان هەیە، بۆیە خوای پەروەردگار بەپێی ئەوان فەرمایشتی کردوە، (نُزِّلوا مَنْزِلَةَ العُقَلاءِ حَسَبَ عقولِهِم)! ڕاناوی عاقڵانیان بۆ بەکارهاتوە، بە پێی تێگەیشتنی ئەوانەی پەرستوویانن.

٧)- ﴿ وَجُنُودُ إِبۡلِيسَ أَجۡمَعُونَ ﴾، هەروەها سەربازەکانی ئیبلیسیش پێکڕا هەموویان لەپەوڕوو خرانە دۆزەخەوە، بەسەر یەکدا خرانە دۆزەخەوە.

٨)- ﴿ قَالُواْ وَهُمۡ فِيهَا يَخۡتَصِمُونَ ﴾، لە حاڵێکدا کە مشت و مڕو دەمەقاڵێیان بوو، گوتیان، کێ مشت و مڕو دەمەقاڵێی بوو؟ بێگومان ئەوانەی بت و صەنەمەکانیان

پەرستوون، لە نێو خۆیاندا دەمەقاڵێیان بووە، ئەگەرنا ئەهلی بەهەشت هەر سەلام لەیەکدی دەکەن، بەڕێزو حورمەتەوە، بە ئارامیی و ویقارەوە، بەڵام ئەهلی دۆزەخ، هەمیشە سەرگەرمی گاڵەو قاڵەن، ئەگەر تەماشای ئایەتەکان بکەین هەم لێرە، هەم لەشوێنەکانی دیکە، بۆ وێنە: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا ۝٣٨﴾ الأعراف، واتە: هەر کاتێك کۆمەڵێك دەهاتن، نەفرینی دەکرد لەدەستە خوشکەکەی، واتە نەفرینی دەکرد لە کۆمەڵەکەی دیکە، چ شوێنکەوتووان لە پەیڕەویی لێکراوان، چ پەیڕەویی لێکراوان لەوانەی شوێنیان کەوتوون، نەفرینیان لێك دەکرد، هەرکامیان بەوی دیکەی گوتوە: بە هۆی ئێوەوە ئێمە تووشی ئەو سزایە بووین و، بەم داوەوە بووین، ئنجا لە حاڵێکدا کە مشت و مڕو دەمەقاڵێیان بوو گوتیان:

٩)- ﴿تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾، سوێند بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بووین، وشەی: (إن) لێرەدا، (مُخَفَّفَة لِلتَأكِيد بِدلِيل وُجودِ اللاَّم)، ﴿تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾، ئەمە بۆ تەئکید کردنەوەیە چۆن دەزانین و جیاوازیی ئەو (إن)ە، لەگەڵ (إن)ی لابردن (نافية) بەچی دەکرێ؟ جیاوازییەکەیان ئەو (ل)یە کە دەلکێنرێ بەو ناوەوە کە لەدوای دێ: ﴿إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾، ئەگەر فەرمووبای: (إن كُنّا فـي ضلالٍ مُبين) یانی: (ما كُنّا) بەڵام (إن كُنّا لَفـي ضَلالٍ مُبين)، ئەمە بۆ جەختکردنەوەیە، واتە: بە دڵنیایی ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بووین، لە چیدا؟

١٠)- ﴿إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، واتە: لە کاتێکدا ئێمە ئێوەمان لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا یەکسان دەکرد، ئەی بت و صەنەمەکان! ئەی پەرستراوە ساختەو بێ نێوەڕۆکەکان! ئێمە لە گومڕاییەکەی ئاشکرادا بووین، (نُسَوِّيكُم) یانی: (نُمَثِّلُكُم)، (التَّسْوِيَة): (المُعادَلة والمُماثَلة) (تسوية) یانی: وەك یەك لێکردن و هاوشێوە کردن، یانی: وەك ئەوانمان یەکسان دەکردن، وەك ئەوان مامەڵەمان لەگەڵدا دەکردن، ئنجا ئا ئەمە بناغەی شیرك و هاوبەش بۆخوا دانانە، شایانی باسە: ئێمە باسێکی تێرو تەسەلمان لەبارەی شیرك و هاوبەش بۆخوادانانەوە کردوە، لە کۆتایی سوورەتی (یوسف)داو گوتوومانە: ڕیشەی شیرك و هاوبەش بۆخوا دانان، ئەوەیە کە: جگە لەخوا، کەسێك، یان دروستکراوێك،

وەك خوا مامەڵەی لەگەڵدا بكەی، لە هەر ڕوویەكەوە، چ بەشێك لە پەروەردگارێتیی و بەدیهێنەرایەتیی و خاوەندارێتیی بخرێتە پاڵ، یان یەكێك لە سیفەتەكانی خوا وەك: شیفا هێنان، سەرخستن، یان یەكێك لە كردەوەكانی خوا، یان یەكێك لە ناوەكانی خوای بۆ بەكار بهێنرێ، یاخود لەڕووی پەرستنەوە، كە ئەمە جەوهەرو نێوەڕۆكی شیركە، یان هەندێ لە دروشمەكانی خوا پەرستیی، بۆ بكرێن چ دروشمە ڕواڵەتییەكان، وەك: پاڕانەوەو پشت پێ بەستن و، هاوار تێ بەستن و، نوێژو، ڕۆژوو، خوا پەرستییەكانی حەج و نەزرو قوربانیی، چ شتە دەروونییەكان بن، وەك: ئەوپەڕی خۆشویستن، ئەوپەڕی لێ ترسان، ئەوپەڕی سام لێكردن، ئەوپەڕی بەگەورەگرتن، ئەوپەڕی مل بۆكەچ كردن، هەرشتێك لەو شتانەی كە دەبێ تەنیا بۆ خوا بن ﷻ، چ لە دروشمە ڕواڵەتییەكان، چ لە سیفەت و خەسڵەتە دەروونییەكان، بۆ جگە لە خوا بكرێن، مانای وایە ئەو شتەی یاخود ئەو كەسەی بە هاوبەشی خوا داناوە، ئنجا ئەوانە دەڵێن: ئێمە لە گومڕاییەكی ئاشكرادا بووین، كە ئێوەمان لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا یەكسان دەكرد.

٩٩)- ﴿ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾، تەنیا تاوانبارانیش ئێمەیان گومڕاكرد، لێرەدا مەبەستی پێ كافرەكان و هاوبەش بۆخوا دانەرەكانی دیكەیە، كە گومڕایان كردووین بەڵام سیفەتی تاوانبارییان دەداتە پاڵ و بەوە دەیانناسێنێ.

١٠٠)- ﴿ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴾، ئنجا باسی حاڵی خۆیان دەكەن كە ئایا دەبێ چ دەرەتانێكیان هەبێ، دەڵێن: ئێمە هیچ تكاكارانێكمان نین، (الشَّافِع: الَّذِي يَكونُ واسِطَةً جَلب نَفعٍ لِغَيْرِهِ أَو دَفعُ ضُرٍّ عَنْهُ)، (شافع) ئەو كەسەیە كە دەبێتە هۆكار بۆ ئەوەی قازانێك بۆ ئەو مرۆڤە بێنێ، یاخود زیانێكی لێ دوور بخاتەوە، واتە: دەبێتە هۆكار لە نێوان: تكا لەلاكراو و تكا بۆ كراودا، خوای پەروەردگارو ئەو كەسەی تكای بۆ دەكرێ.

١٠١)- ﴿ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴾، هەروەها هیچ دۆست و برادەرێكی دڵسۆزو بەپەرۆش و نزیكیشمان نیە، (حَمِيمٍ: أَي قَرِيبٌ مُشفِق) لە (حَمٌّ)وە هاتوە، بە مانای (سَخُنَ) واتە: گەرم بوو، واتە: هیچ دۆستێكی گیانی بەگیانی گەرم و گوڕمان نیە.

١٤)- ﴿ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً ﴾، خۆزگە، گەڕانەوەیەکمان بۆ هەبووایە، (لَوْ) واتە: ئەگەر، بەڵام لێرەدا بۆ خۆزگە بەکارهاتوە، چونکە لەنێوان ئەو شتەدا کە ناگونجێ و، لەنێوان خۆزگە خواستندا، ئەو بۆنەو موناسەبەتە هەیە، نە خۆزگە پێ خوازراوەکە دێتە دی، نە ئەو شتەش کە پەیدا نەبوو (مُمْتَنِع)ە، ئەویش نایەتە دی، ئنجا بەو موناسەبەتەوە لێرەدا (لَوْ) مانای خۆزگە پێخواستن دەگەیەنێ، یانی: ئەگەر ئێمە جارێکی دیکەمان هەبووایە، (كَرَّة: أي مَرَّةٌ من الكَرّ وهو الرُّجُوع) ئەگەر ئێمە جارێکی دیکە گەڕابووواینەوە، یەك دەرفەتی دیکەمان درابووایەو، گەڕابواینەوە بۆ ژیانی دنیا.

١٥)- ﴿ فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئنجا بووباینە بڕوادار، (فَنَكونَ، مَنصوب لأنّهُ جَوَابُ التَّمَنّي) (فَنَكونَ) (منصوب)ە چونکە، وەڵامی خۆزگە پێخواستنەکەیە، ئەگەر یەکجارمان هەبووایەو، ببووینایە بڕوادار، خۆزگە بەوە دەخوازن، بەڵام داری خۆزگەو بریا بۆ هیچ کەس بەری نەگرتوە، تاکو بۆ ئەوان بەر بگرێ، ئنجا ئەمە وەك خۆزگە خواستنی ئەو شاعیرە وایە کە گوتویەتی:

أَلاَ لَيْتَ الشَّبابُ يَعُود يَوماً .... فَأُخْبِرَهُ بِما فَعَلَ المَشيبُ

خۆزگە گەنجێتی گەڕابایەوە ڕۆژێك .... تاکو هەواڵی پێبدەم پیری چی بەسەر هێناوم

بەڵام دوای پیر بوون و بەساڵداچوون، گەنجێتیی ناگەڕێتەوە، ئەوانیش دوای چوونە قیامەت و ڕۆژی دوایی، ناگەڕێنەوە بۆ ژیانی دنیا، ئەوە بەس قسەیەکە، دەیکەن، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّآ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾، واتە: هەتا کاتێك یەکیان مردنی بۆ هات گوتی: خوایە! بمگێڕنەوە (بۆ ژیانی دنیا) بەڵکو کردەوەی باش بکەم لەوەدا کە بەجێم هێشتوە! [بەڵام وەڵامی دەدرێتەوە بە (كَلَّآ )] نەخێر، ئەوە قسەیەکە هەر خۆی دەیڵێ، هەر خۆی بێژەریەتی و لە پشتیانەوە نێوانێك هەیە تاکو ئەو ڕۆژەی تێیدا هەڵدەستێنرێنەوەو زیندوو دەکرێنەوە، یانی: تازە

پشت پەردە دەبن و دەکەونە قۆناغێکی دیکەو ژیانێکی دیکە، بەپێی ئەو سیستمە کە خوا ﷻ بۆ گەردوون و ژیانی دنیای داناوە، قۆناغ قۆناغە، ژیانی دنیا هەیە، ژیانی بەرزەخ هەیە، ژیانی ئاخیر زەمان هەیە، قۆناغی هەڵسانەوە هەیە، لەهەر قۆناغەدا شتێك دەبێ، لە قۆناغەکەی دیکەدا نابێ، قۆناغی قیامەت بەرەنجام و بەرهەمی قۆناغی ژیانی دنیایە، هەروەها بەرزەخیش، وەك قۆناغێکی کاتیی و ڕاگوزەر.

١٦)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا کە باس کرا نیشانەیەك هەیە، بەڵگەیەکی گەورەو گرنگ هەیە، لەسەر ئەوە کە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، لەسەر ئەوە کە پێغەمبەران هەقن، لەسەر ئەوە کە ڕۆژی دوایی و دیداری خوا هەقە، لەسەر ئەوە کە بەرنامەو ڕێبازی ڕاست، بەس ئەوەیە کە خوا بە پێغەمبەراندا ناردوویەتی بۆ ژیانی ئینسان و، بۆ ئەوە کە مرۆڤ بە شێوەیەك بژی کە لە لای خوا پەسند بێ، ئەویش ئەوەیە کە ژیانێکی ئیماندارانە، ژیانێکی ڕاست و ساغ لە هەڵس و کەوت و ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییدا، بگوزەرێنن، لەوەدا کە باسکرا بەڵگەو نیشانەیەکی گەورەو گرنگ هەیە، بۆ هەموو ئەوشتانەی باسکران.

١٧)- ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، بەڵام زۆربەشیان بڕوادار نین، واتە: کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ یاخود: مرۆڤایەتیی بەرەهایی، ئەم قورئانە بەس بۆ ئەو کاتە دانەبەزیوە، مەگەر بە بەڵگەیەك شتێك دیار بێ، تایبەت بێ بە خەڵکی ئەو کاتەوە، ئەگەرنا قورئان بۆ هەموو قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتییە، ئەوەش کە خوا فەرموویەتی، هەروایە، زۆربەی مرۆڤەکان بڕوادار نابن، وەك لە شوێنی دیکە دەفەرموێ:

﴿ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾المؤمنون.

﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾سبأ.

﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾يوسف.

تەنانــەت ئەوانــەش کــە بــڕواش بەخــوا دێنــن، زۆربەیــان هاوبەشــدانەر دەبــن، هاوبــەش پەیــدا کــردن بــۆ خــوا، ئاوێتــەی ئیمانەکەیــان دەکــەن، ئاوێتــەی خواناســـیەکەیان دەکــەن.

١٨)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیاییەوەش تەنیا پەروەردگارت زاڵی بەبەزەییە، باڵادەستی میهرەبانە.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هـەژدە (١٨) ئایـەت پێکهاتـوە: (١٠٥ - ١٢٢)، هەمـوو ئایەتەکانیـش بـۆ بەسـەرهاتی نـووح تەرخـان کـراون، هەر لە سـەرەتای دەسـتپێکردنی بانگکردنـی گەلەکەیـەوە بـۆ خواپەرسـتیی و پارێزکاریـی و، بەڕێوەچـوون بـە پێـی بەرنامـەی خـوا... تاکـو ئـەو هەمـوو چەرمەسـەرییانەی بەسـەری هاتـن، ئـەو هەمـوو کەللەڕەقیـی و عینادیـی و بوغڕاییـەی گەلەکـەی و، تاکـو نغـرۆ بوونـی گەلەکـەی جگـە لـە بـڕواداران لـەو لافـاوە مەزنـەدا، کـە هیـچ کەسـی لـێ قوتـار نەدەبـوو..

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٠٥﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ ﴿١١١﴾ قَالَ وَمَا عِلْمِى بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّى ۖ لَوْ تَشْعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٥﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِى كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفْتَحْ بَيْنِى وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِى وَمَن مَّعِىَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ٱلْبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{گەلی نووح پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا (بڕوایان پێیان نەهێنا) ﴿١٠٥﴾ یاد بکەوە! کاتێ نووحی برایان پێی گوتن: ئایا پارێز لە خوا ناکەن؟ ﴿١٠٦﴾ بە دڵنیایی من ڕەوانە کراوێکی ئەمیندار (و ڕاست و ساغ)م بۆتان ﴿١٠٧﴾ بۆیە پارێز لەخوا بکەن و بەقسەم بکەن ﴿١٠٨﴾ هیچ کرێیەکیشتان لەبەرامبەریدا لێ داوا ناکەم، پاداشتم تەنیا لەسەر (خوای) پەروەردگاری جیهانییانە ﴿١٠٩﴾ بۆیە پارێز لە خوا بکەن و، بەقسەم بکەن (فەرمانبەرییم بکەن) ﴿١١٠﴾ (گەلەکەی) گوتیان: چۆن بڕوات بۆ بێنین لە حاڵێکدا کە (تەنیا مرۆڤە) هیچ و پووچەکان شوێنت کەوتوون! ﴿١١١﴾ (نووح) گوتی: ئنجا من چووزانم ئەوان کاتی خۆی چییان کردوە، (تاکو بزانم ئایا تۆمەتەکەتان گوایە: خەڵکێکی نزم و پەستن، ڕاستە یان نا؟) ئەگەر هەست و هۆشتان هەبێ ﴿١١٢﴾ لێپرسینەوەیان تەنیا لەسەر پەروەردگارمەوە ﴿١١٣﴾ من (هەرگیز) دەرکەرو دوورخەرەوەی بڕواداران نابم (لەدەوری خۆم بۆ ڕازی کردنی ئێوە) ﴿١١٤﴾ من تەنیا ترسێنەرو هۆشیار کەرەوەیەکی ڕوون و ئاشکرام ﴿١١٥﴾ (گەلەکەی) گوتیان: ئەی نووح! ئەگەر وازنەهێنی، بێگومان لەبەرد باران کراوان دەبی ﴿١١٦﴾ (نووح) گوتی: پەروەردگارم! بێگومان گەلەکەم بە درۆیان دانام ﴿١١٧﴾ دەجا دادوەرییەکی بەکلاییکەرەوە لە نێوان من و ئەواندا بکەو، خۆم و بڕوادارانێک کە لەگەڵمن ڕزگارمان بکە ﴿١١٨﴾ سەرەنجام ئێمەش خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، لەکەشتییە پڕەکەدا دەربازمان کردن ﴿١١٩﴾ دوایی ئەوانی دیکە کە مابوونەوە (لەسەر کوفر) (لە تۆفانەکەدا) خنکاندمانن ﴿١٢٠﴾ بە دڵنیایی لەوەدا نیشانەیەکی مەزن هەیە، بەڵام زۆربەیان بڕوادارنین ﴿١٢١﴾ بێگومانیش بەس پەروەردگارت باڵادەستی بەبەزەییە ﴿١٢٢﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلۡأَرۡذَلُونَ ): بە کوردیی بە (هیچ و پووچەکان) لێکم داوەتەوە، ئەم وشەو تەعبیرەم لەگەڵ ڕێزو ئەدەبی قورئاندا بە گونجاو زانی، ئەگەرنا بۆ وشەی (ٱلۡأَرۡذَلُونَ ) جگە لەو وشەیەی بەکارم هێناوە، ڕەنگە وشەی دیکەش هەبن، بەڵام ئینسان دەبێ ورد بێ، کە تەعبیرێك بەکاردێنێ بەپێی ئەو زمانەی قسەی پێ دەکات، تەعبیرێکی سووك نەبێ، هەڵبەتە دەزانم هیچ و پووچ تا ڕاددەیەك تەعبیرێکی سووکە، بەڵام لەوەش سووکتر هەیە، (ٱلۡأَرۡذَلُونَ ) (الرَّذْلُ وَالرُّذالُ: المَرْغوبُ عَنهُ لِرداءَتِهِ) (رَذْلٌ ورُذالٌ) شتێك کە ناویستریّ لەبەر خراپییانی، ئنجا (أَراذِل وَأَرْذَلون: جَمع أَرْذَل) (أَراذِل وَأَرْذَلون) هەردووکیان کۆی (أَرْذَل)ن، واتە: زۆر خراپ، وەك گوتم: بەکوردیی مەگەر بگوترێ: هیچ و پووچ، دەگونجێ بگوترێ: بێ نرخ، پەست و زەبوون، مەبەستیان پێ ئەوەبووە ئەوانەی شوێنت کەوتوون، بەوجۆرەن، هەڵبەتە ئەوانەی شوێن نووح ﷺ کەوتوون و شوێن هەموو پێغەمبەران کەوتوون، بەزۆریی وەك خوا ﷻ لە قورئاندا باسی کردوە، خەڵکە بێهێزو بێ دەستەڵات و، داماوو چەوسێنراوەکە بووە، بەڵام لەچاوی خۆبەزلگرو حوکمڕانە ملهووڕەکاندا، ئەوانە هیچ و پووچ و بێ نرخ و بێ مایە بوون.

(لَوۡ تَشۡعُرُونَ ): (الشُّعورُ: الإِدْرَاكُ بِالحَوَاسِّ) (شعور) یانی: ئینسان بە هەستەوەرەکان شت بزانێ، بەڵام جاری واش هەیە (شعور) بۆ عەقڵ و دەرککردنی عەقڵ و هۆشیش بەکارهێنراوە، چونکە عەقڵیش لەڕێی هەستەوەرەکانەوە کەرەستەی بۆ دەستەبەر دەکرێ، ئەو وێنانەی بە تۆڕی شەداوی چاو دەگیرێن، وەك ئەو دەنگانەی هێزی بیستن، هەروەها تامکراوەکان، بۆنکراوەکان، دەستلێدراوەکان، کە بە هۆی پێنج هەستەکانەوە کۆ دەکرێتەوە، عەقڵ دەتوانێ دوایی چەمك و واتایەکان بەهۆیانەوە دروست بکات.

(ٱلْمَرْجُومِينَ ): (الرِّجَامُ: الحِجَارَة، وَالرَّجْمُ: الرَّمِيُ بِالرِّجَامِ، يُقَالُ: رُجِمَ فَهُوَ مَرْجُومٌ) (الرِّجَامُ) یانی: بەرد، (رجْم) بریتیە لە بەرد پێدادان، بەردباران کران، (المَرجومِين، المَقْتولِينَ شَرَّ قِتْلَة) ئەوانەی دەکوژرێن بە خراپترین شێوە، (وَيُسْتَعَارُ الرَّجْم لِلرَّمي بِالظَّن، وَالتَّوَهُّم وَالشَّتم، والطَّرد) وشەی (رجم) دەشخوازرێتەوە بۆ ئەوە گومانی خراپ بە کەسێك ببردرێ، یان کەسێ بە وەهم تاوانبار بکرێ، یاخود قسەی پێ بگوترێ و دووربخرێتەوە، هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان وەك دوایی باسی دەکەین گوتوویانە: لێرەدا هەڕەشەیان لێکردوە کە قسەی پێ بڵێن، یانی: ئێمە قسەت پێ دەڵێین!

بەڵام لە ڕاستیدا ئەو مانایە بێهێزەو کێشەو دوژمنایەتیی گەلە کافرەکان لەگەڵ پێغەمبەران و، شوێنکەوتووانی پێغەمبەراندا، لەوە گەورەتر بووە، کە بە قسە پێ گوتنیان واز بێنن!

(فَتۡحٗا ): واتە: دادوەریمان لە نێواندا بکە، لە نێوان خۆم و گەلەکەمدا، (الفَتْحُ: إِزَالَةُ الإِغْلَاقِ والإِشكالِ، وَفَتَحَ القَضِيَّةَ فِتاحاً: فَصَلَ الأَمْرَ فِيْهَا، وَأَزَالَ الإِغلاقَ فِيها)، (فتح) واتە: کردنەوە، بەڵام لێرەدا بە مانای لابردنی شتێکە کە داخرابێ و لابردنی نیشکالێکە، واتە: لە کێشەکەدا دادوەریی کردو ئەو داخراویی و نامۆییەی تێیدا بوو: کێ لەسەر هەقەو، کێ لەسەر هەق نیە؟ بۆی لابراو نوختەی بۆ خرایە سەر پیت.

(ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ): کەشتیی پڕ، (أي: المَمْلوءِ، وَالشَّحْنَاءُ: عَدَاوَةٌ امْتَلأَتْ مِنْهَا النَّفْسُ، يُقَالُ: عَدوٌّ مُشَاحِن)، (شحناء) بە دوژمنایەتییەك دەگوترێ: کە دڵ و دەروونی ئینسانی پڕ کردبێ، دەگوترێ: (عَدوٌّ مُشاحِن) فلانکەش دوژمنێکە کە دڵی مرۆڤ پڕ دەکات لە بوغزو تووڕەیی و ڕق، کەواتە: (ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ) یانی: کەشتیی پڕ، ئێستاش وشەی شەحن بەکاردەهێنرێ، بۆ پڕ کردن بە هەموو جۆرەکانیەوە.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

بەسەرهاتی نووح و عليه السلام گەلەكەیمان - وەك پێشتریش ئاماژەم پێیدا - لە تەفسیری سوورەتی (هود) لەکاتی تەفسیر کردنی ئایەتەکانی: (٢٥ - ٤٩)دا هێناوە، باسێکی تێرو تەسەلمان کردوە، هەم لە ڕووی ئایەتەکانی قورئان، کە هەموویانمان کۆکردۆتەوە، هەم لەڕووی گەڕانەوە بۆ سەرچاوە مێژووییەکان، ئەوەی کە دەستمان پێیان گەیشتوە، لەو بارەوە باسێکی تێرو تەسەلمان کردوە، بەڵام لێرەدا هەروا پوختەیەك لە بەسەرهاتی نووح عليه السلام دێنین، هەروەك هی پێغەمبەرانی دیکەش (عليهم الصلاة والسلام)، ئێمە بەپێی ئەوە کە لێرەدا ئەو پوختەیە هاتوە، ئێمەش هەروا پوختەیەکی بەسەرهاتەکەی دێنین.

خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، گەلی نووح پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانان، بڕوایان پێ نەکردن، پێیان بێبڕوا بوون، ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، یادبکەوە! کاتێ نووحی برایان پێی فەرموون: ئایا پارێز ناکەن؟ واتە: پارێز لە خوا ناکەن، یان پارێز لە لێپرسینەوەو سزاو جەزرەبەی خوا ناکەن، کە بە هۆی کوفرو شیرکەوە بە ملتان دادێ؟ ﴿ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، من (لەلایەن خواوە) بۆ ئێوە ڕەوانەکراوێکی ئەمیندارم، واتە: ڕاست و ساغم لەگەڵتان، چیتان پێ دەڵێم، لێم وەربگرن، چونکە خوا منی بۆ لای ئێوە ناردوەو نوێنەری خوام، ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، کەواتە: پارێز لەخوا بکەن و بە قسەم بکەن، فەرمانبەرییم بکەن.

﴿ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، لە حاڵێکدا من هیچ کرێتان لێ داوا ناکەم لەسەری، لەسەر گەیاندنی ئەو پەیامە، چونکە کرێ و پاداشتی من تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانیانە، هیچ چاوەڕوانییەکم لەئێوە

نیە، هیچ بارگرانییەکم بۆتان نیە، نیشی خۆتانم بەخۆتانە، مەداری خۆم بەئێوە ساز ناکەم، دەمەوێ مەداری ئێوە ساز بکەم، ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾ دووبارەی دەکاتەوە، کەواتە: پارێز لە خوا بکەن و بە قسەم بکەن، فەرمانبەرییم بکەن.

ئنجا با بزانین گەلە ملهوڕو کەللە ڕەقەکەی، چی وەڵام دەدەنەوە؟

﴿ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ ﴾، ئایا بڕوات بۆ بێنین لە حاڵێکدا هەرچی و پەرچییەکانت شوێن کەوتوون؟ لە سوورەتی (هود)دا پێی دەڵێن: ﴿ وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: نابینین شوێنت کەوتبێ، جگە لەوانەمان کە هیچ و پووچن، بێ نرخن، کەمن، ئەوانەی کە ڕایان زۆر ڕواڵەتییە، واتە: تێناگەن و زۆر سەرکێڵن، لێرەش دەڵێن: ئایا شوێنت بکەوین، لەحاڵێکدا کە تەنیا کەم و هیچەکان شوێنت کەوتوون، ئەوانەی کەم بایەخن؟ ﴿ قَالَ وَمَا عِلْمِى بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، نووح گوتی: من چووزانم پێشتر چییان کردوە، کە لە ئەنجامی کردوەکانی پێشوویاندا، دەبێ ئێوە ئەو ئەنجامگیرییەتان کردبێ، کە ئەوان هیچ و پووچ و بێ نرخ و کەم بایەخن، لێرەدا نووح ﷺ سەرنجیان بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە مرۆڤ لە کردەوەو هەڵوێستەکانیدا خولاصە دەبێتەوە، من نازانم چییان کردوە، ئێوە ئەوەتان لێ هەڵێنجاون، کە هیچن؟! دیارە ئەوان خۆیان بە وەجاخ و ڕەچەڵەك و سەروەت و سامانەوە هەڵکێشاوە: لەبەر ئەوەی پارەم زۆرە، دەسەڵاتم زۆرە، دەوڵەمەندم و خەڵك و خزمم زۆرە، بۆیە شتێکی گرنگم! ئەوانەش لەبەر ئەوەی ڕەش و ڕووتن بێ توانان، چەوسێنراوەن، بێ دەستەڵاتن، کەواتە: هیچن، تەماشا بکەن! ئەو تەرازووە لاسەنگ و لاتەڵ و بێ ویژدانەیە!! سەروەت و سامان و دەستەڵاتی حەڕام و قۆرخکراویش، بۆیە کەوتۆتە دەستی ئەوانە، لەئەنجامی ئەوەدا کە ستەمیان کردوە، چەوسێنراوەکانیش بۆیە چەوسێنراونەوەو ڕووت و ڕەجاڵ بوون، لە ئەنجامی ئەو حوکمڕانییە سەقەتەدا کە ئەوانە کردوویانە، کە هەموو شتێکیان بۆ خۆیان قۆرخ کردوە، بۆ خزم و حیزبیان، بۆ دەورو بەریان، ئەوانی دیکەش بێ دەسەڵات

و بێ چارە کەوتوونەتە گۆڕێ! نـووح ﷺ دەیـەوێ سـەرنجیان ڕابکێشێ بۆ ئـەوە کـە ئەگـەر کـردەوەی خراپیـان بووبـێ، مـن ئـاگادار نیـم، چونکـە بـە هـۆی کـردەوەی خراپـەوە مـرۆڤ خـراپ دەبـێ، بـە هـۆی هـی چاکیشـەوە، چـاك دەبـێ، نـەك بـە هـۆی سـەروەت و سـامانەوە، ئەگـەر هەیبـێ چـاك بـێ و، ئەگـەر نەیبـێ خـراپ بـێ!

﴿ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ ﴾، لێپرسـینەوەیان تەنیـا لەسـەر پەروەردگارمـە، ئەگـەر ئێـوە هەسـت بکـەن، ئەگـەر شـعوورتان هەبـێ، مـن ناچـم لێپرسـینەوەیان لەگەڵـدا بکـەم، ئێسـتا بانگیـان دەکـەم بـۆلای خـوا، ئـەوە ئەرکـی منـە، ئەمـما مـن بێـم هەڵیانسـەنگێنم، بـەو تـەرازوو و پێـوەرە لاتـەڵ و لاسـەنگەی ئێـوە، ئـەوە کاری مـن نیـەو ئـەوە شـتێکی نالۆژیکییـە.

ئنجا ئـەوان داوایـان لـێ کـردوە، ئـەو بڕوادارانـە دەربـکات و دووریـان بخاتـەوە، بۆیـە دەڵـێ: ﴿ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، مـن دەرکـەری بـڕوادارەکان نیـم، بـۆ ڕازیبکردنـی ئێـوە، ﴿ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، مـن تەنیا ترسـێنەرو هۆشـیار کەرەوەیەکی ڕوون و ئاشـکرام، یاخـود ڕوونکـەرەوەو ئاشـکراکەرم بـۆ ڕاسـتییەکان.

دووبـارە گەلـە سـەرکەش و یاخییەکـەی، زمـانی زبـر بەکاردێنـن، هەڵبەتـە وەك لـە سـووڕەتی (هـود)دا، هاتـوەو لـە سـووڕەتی (الأعراف)یـش دا، ئەوانـە کـە ئـەو قسـانەیان کـردوون، دەسترۆیشـتوو و بڕیـار بەدەسـت و خۆسـەپێنەکان بـوون، ﴿ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴾، گوتیـان: ئـەی نـووح! ئەگـەر واز نەهێنـی، تـۆ لەبـەرد بـاران کـراوان دەبـی، واتـە: هـی دیکەشـمان بـەرد بـاران کـردوون، تـۆش دەبەینـە ڕیـزی ئـەوان.

ئنجـا دەگونجـا تەعبیرەکـە ئـاوا بووایـە: (لَنَرْجُمَنَّكَ) وەك لـە شـوێنی دیکـە بـەو تەعبیـرەش هاتـوە، بـەڵام ئـەم تەعبیـرە: ﴿ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴾ مانایەکـەی بەهێزتـرە، واتـە: هـی دیکەشـمان بەردبـاران کـردوون، تـۆش وەك ئـەوان لێدەکەیـن و بـە مـەرەدی ئەوانـت دەبەیـن.

ئنجا کە ئەوان هەر لەسەر کەللە ڕەقیی و نەسەلماندنی خۆیان و، لەسەر هەڕەشەو گوڕەشەی خۆیان بەردەوام بوون، نووح ﷺ هیچ چاری نەما، مەگەر پەنا بەرێتە بەر خوا، فەرمووی: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ ﴾، پەروەردگارم! گەلەکەم، خەڵکەکەم منیان بەدرۆ دانا، ﴿ فَٱفْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئنجا لە نێوان من و گەلەکەمدا دادوەریی بکەو، خۆم و ئەوانەی لەگەڵمن لە بڕواداران، دەربازمان بکە، ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴾، بە (ف)ی بەدواداهاتن، خوا وەڵامی دایەوە: (تعقیب) یەکسەر خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون لەبڕواداران، لە کەشتییە پڕەکەدا دەربازمان کردن، ﴿ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ٱلْبَاقِينَ ﴾، دوایش ئەوانەی کە مابوونەوە، واتە: ئەوانەی لەسەر کوفر مابوونەوە، یاخود مابوونەوەو سواری کەشتییەکە نەبووبوون، ئەوانەمان هەموو خنکاندن و لە تۆفانە گەورەکەدا نغرۆمان کردن، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، لەوەدا نیشانەیەکی گەورە هەیە [لەسەر ڕاستیی نیمان و، ڕاستیی ڕێبازی بەندایەتیی بۆخواو، شوێنکەوتنی پێغەمبەرانی خوا] بەڵام زۆربەیان بڕوادار نین، کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ هەروەها کافرەکانی هەموو ڕۆژگارەکان.

بۆچی دەفەرموێ: (أَكْثَرُهُم)؟

چونکە هەندێکیان بڕوادێنن، هەیانە بڕوا دێنێ و واز لە کوفرو شیرك دێنێ، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیایی تەنیا پەروەردگاریشت زاڵی بەبەزەییە، کەواتە: پشت بە پەروەردگارت ببەستە، لە بەرانبەر دوژمن و ناحەزەکانتدا، کە ئەو لە بەرانبەریان دا زاڵ و دەستڕۆیشتوو و باڵادەستە، بۆ تۆو شوێنکەوتووانیشت، میهرەبان و بەبەزەیی و بەپەرۆشە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**بـە درۆ دانانـی گەلـی نـووح ﷺ بـۆ پێغەمبەرەکەیـان و، ئامۆژگاریـی کرانیـان لەلایـەن نووحـەوە ﷺ کـە پارێـز لەخـوا بکـەن و، گوێڕایەڵیـی و فەرمانبەریـی وی بکـەن، چونکـە نوێنەرێکـی ئەمینـداری خوایـە بـۆ لایـان و، هیـچ چاوەڕوانییەکیشـی لێیـان نیـە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٠٥﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ ﴾، خەڵکی نووح پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، بۆچی (تاءُ التأنيث) خراوەتە سەر (كَذَّبَت)؟ بە هۆی ئەوەوە کە وشەی (قَوْم) بە مانای ئۆممەت (أمة) یان بە مانای کۆمەڵ (جماعة) لێکدراوەتەوە، ئەگەرنا (قَوم) بۆ خۆی لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، نێرینەی مەجازیی (الْمُذَكَّر المجازي)یە، بەڵام مانای ئۆممەت و کۆمەڵی لێ وەرگیراوە، بۆیە (تاءُ التَّأنيث)ی خراوەتە سەرێ.

فەرموویەتـی: (كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ ) لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە نـووح ﷺ یەکـەم پێغەمبـەری خاوەن ئۆممـەت بـووەو، ئـەوان تەنیـا یـەك پێغەمبەریـان بـەدرۆ داناوە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ئـەوان بۆیـە بڕوایـان بـە نـووح نەهێنـاوە، نـەك لەبـەر خـودی نـووح ﷺ، بەڵکـو لەبـەر پەیـام و بەرنامەکـەی، پەیـام و بەرنامەکەشـی لەگـەڵ

هـی هەمـوو پێغەمبەرانـدا یەکـە، بۆیـە بڕوانەهێنـان بەیەکێـك لـە پێغەمبـەران، وەك بـڕوا نەهێنانـە بـە هەموویـان، چونکـە لـە سـۆنگە ئـەوەوە بڕوایـان پـێ ناهێنـن، کـە دان بـەوەدا ناهێنـن: نوێنـەری خوابـن، ئنجـا هەمـوو پێغەمبـەران نوێنـەری خـوان و، ئەگـەر بـڕوات بـە یەکێکیـان نەبـوو، کـە نوێنـەری خوایـە، واتـە: بـڕوات بەهیچیـان نیـەو، ئەگـەر بـڕوات بـە پەیـام و وەحییـەك نەبـوو، کـە بـۆ یەکیـان هاتـوە، واتـە بـڕوات بـە هـی ئەوانـی دیکـەش نیـە.

٢)- ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، کاتێك کە نووحی برایان پێی فەرموون: ئایا پارێز لە خوا ناکەن؟! ﴿ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، (أَلَا) ئامرازی ئاگادار کردنەوەیە، یاخود هاندانە، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوْمًا ﴿١٣﴾ ﴾التوبة، ئایا لە دژی کۆمەڵێك جەنگ ناکەن کە ئێوەیان لە وڵاتی خۆتان وەدەرنا؟ هەندێکیش گوتوویانە: (أَلَا) هەمزە (أ)ی پرسیار کردنە، لەگەڵ (لا)ی لابردن، (أ) (لا) (تَتَّقُونَ) ئایا پارێز ناکەن؟

٣)- ﴿ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، من ڕەوانە کراوێکی ئەمیندارم، واتە: ڕاست و ساغم لەلایەن خواوە بۆ ئێوە.

٤)- ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، ئنجا پارێز لە خوا بکەن و فەرمانبەریی من بکەن، پارێز لە خوا بکەن، وەك تاکە پەرستراوی شایستەی پەرستران، بە قسەی منیش بکەن، تاکو ڕێی خوا پەرستییتان پێشان بدەم.

٥)- ﴿ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾: هیچ جۆرە کرێیەکتان لێ داوا ناکەم، واتە: لەسەر گەیاندنی ئەو پەیامە، هیچ کرێیەکتان لێ داوا ناکەم و هیچ بارگرانییەکم بۆ سەرتان نیە، باری شانتان قورس ناکەم.

٦)- ﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾: کرێ و پاداشتی من، تەنیا لەسەر پەروەرگاری جیهانییانە.

٧)- ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾: کەواتە: پارێز لە خوا بکەن و فەرمانبەرییم بۆ بکەن.

لە (صحیح البخاري)دا هاتوە، کە هیرەقل چەند پرسیارێك لە ئەبوو سوفیان دەکات لەبارەی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ، ئەبوو سوفیان پرسیاری لێ دەکرێ: ئایا موحەممەد تاکو ئێستا لەگەڵ ئێوەدا قسەی درۆی کردوە، خیلافی کردوە؟ ئەویش دەڵێ: تاکو ئێستا درۆمان لێی نەبینیوە، بەڵام پەیمانێکمان لەگەڵی بەستوە، {ئەو قسەو باسە دوای صولحی حودەیبییە بووە} ئنجا نازانین چی دەکات؟ هیرەقل پێی دەڵێ: [فَقَد عَلِمْتَ أَنَّهُ مَا كانَ لِيَدَعَ الْكَذِبَ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ يَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ][1] بۆ خۆت دەزانی کە ناگونجێ درۆ لەگەڵ خەڵکی نەکا، کەچی بچێ درۆ بەناوی خواوە بکات!

**مەسەلەی دووەم:**

**نکووڵییکردنـی گەلـی نـووح ﷺ لـە بـڕوا پێهێنانـی و، تانەدانیـان لـە شـوێن کەوتووانـی، بـەوە کـە خەڵکـی نـزم و کەمـن و، وەڵامدانـەوەی نـووح ﷺ کـە ئـەو وەك حـاڵ و واقیعـی ئێسـتایان مامەڵەیـان لەگەڵـدا دەکات و، لێپرسـینەوەیان لەسـەر خوایـەو، ئـەو تەنیـا ترسـێنەرو وشـیارکەرەوەیە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ﴿١١١﴾ قَالَ وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنۡ حِسَابُهُمۡ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّيۖ لَوۡ تَشۡعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿١١٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەو پێنج، ئایەتە لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ﴾: ئایا بڕوات بۆ بێنین، لە حاڵێك دا هیچ و پووچەکانت شوێن کەوتوون؟ بۆچی دەڵێن: (نُؤۡمِنُ لَكَ)؟ هەندێك گوتوویانە: (ل) لێرەدا لەشوێنی (ب) بەکار هێنراوە، واتە: (أَنُؤۡمِنُ بِكَ)؟ بەڵام نا، یانی: ئایا بڕوابێنین لەبەر تۆ، وایانزانیوە کە بڕواهێنانەکە بە قازانجی نووحە ﷺ، نەیانزانیوە بە قازانجی خۆیانە، هەڵبەتە ئەوانەی ئەو دیالۆگ و وتووێژانەیان لەگەڵ نووح ﷺ دا کردوون، بڕیار بە دەست و دەستڕۆیشتووەکان بوون، ئنجا ئەمە لێرەدا پرسیار کردنێکە بۆ نکووڵیلێکردن، واتە: چۆن بڕوا بۆ تۆ دێنین؟

﴿ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ﴾: ئـەم (و)ە، (واو الحالية)یـە، یـانی: لـە حاڵێکـدا کـە هیـچ و پووچـەکان، کـەم مایـەکان، بـێ نرخـەکان، شـوێنی تـۆ کەوتـوون، حاشـای ئـەو ئیماندارانـەی کـە شـوێنی نـووح ﷺ کەوتـوون، (ٱلۡأَرۡذَلُونَ : **سَقَطُ القَوْمِ الموصوفُونَ بِالرَّذالَـةِ، وَهِـيَ الخِسَّـةُ، وَالحَقـارةُ، أَرادُوا بِهِـم: الضُّعَفَـاءَ وَالفُقَـراءَ**) (أرذلـون) واتـە: ئەوانـەی لـە خەڵکەکـە، خەڵکـی کەمـن و، وەسـف کـراون بـە سـیفەتی کەمیـی و

بێ نرخیی و، هیچ و پووچیی، (حاشای ئەوان)، مەبەستیان پێی بێ دەسەڵات و چەوسێنراوەکان و هەژارەکان بوون.

٢)- ﴿ قَالَ وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾: واتە: گوتی: چووزانم پێشتر چییان کردوە! [(أي شيءٍ عِلمِي، وَضُمِّنَ (عِلمي) مَعنى اهتِمامي، فَعُدِّيَ بِالبَاء، ﴿ وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾] لێرەدا وشەی (عِلمِي) مانای بایەخ پێدانی خراوەتە نێو، بۆیە بە (ب) تەعەددای کردوە، یانی: زانیاریی من و گرنگیی پێدانی من، کەی لەوەدایە داخۆ کاتی خۆی چییان کردوە؟

٣)- ﴿ إِنۡ حِسَابُهُمۡ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّيۖ لَوۡ تَشۡعُرُونَ ﴾، لێپرسینەوەیان تەنیا لەسەر پەروەردگارمە، ئەگەر ئێوە هەست پێبکەن، ئەمە بە نەفام دانانی ئەوانە، تاکو لەخۆبایی بوونیان و بەخۆ سەرسام بوونیان بشکێنێ، ﴿ لَوۡ تَشۡعُرُونَ ﴾ ئەم ئەگەر (لَو)ە وەڵامەکەی قرتێنراوە، چونکە ڕستەکانی پێشێ، دەیگەیەنن، واتە: ئەگەر هەستتان پێکردبایە، نەدەبوو ئەو ڕەخنەیان لێ بگرن، لەبەر ئەوەی بێ دەستەڵاتن و کەم توانان، چونکە ئەصڵی مرۆڤ کردەوەکەیەتی، من چووزانم پێشتر چ کردەوەیەکیان کردوە! من وەك ئێستا مامەڵەیان لەگەڵ دەکەم.

٤)- ﴿ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، بە دڵنیاییەوە من دەرکەری بڕواداران نیم، دوورخەرەوەیان نیم.

٥)- ﴿ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴾، من تەنیا ترسێنەرێکی ڕوون و ئاشکرام، یاخود، ترسێنەرێکم ڕوونکەرەوەم بۆ ڕاستییەکان.

پوختەی وەڵامی نووح ﷺ ئەوەیە:

ئەو تانەیەی ئێوە لێیان دەدەن، لەلای منەوە نرخی نیە، پێوەری من بۆ هەڵسەنگاندن، کردەوەکانیانە، نەك ماڵ و سامانیان، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ من چووزانم داخۆ چییان کردوە؟ چونکە جەوهەری مرۆڤ و نرخ و پایەی لە نێو کردەوەکانیدا شێردراوەتەوە، ئەگەر چاکی کرد، ئەو مرۆڤە چاك دەبێ و، ئەگەر کردەوەکانیشی خراپ بن، خراپ دەبێ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هەڕەشــە کردنــی گەلــی نــووح ﷺ بەبــەرد بارانکردنــی، ئەگــەر واز نەهێنــێ و، پەنـا بردنـی نـووح ﷺ بـە پـەروەردگاری، کـە دادوەرییـان لـە بەینـدا بـکات، خـۆی و بـرواداران دەربـاز بـکات و، ڕزگار بوونیـان لە کەشـتییە پڕەکـەداو نغرۆ بوونـی کافرەکان:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قَالُواْ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ٱلْبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەو حەوت ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا

١)- ﴿ قَالُواْ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴾، پێیانگوت: ئەی نووح ﷺ! ئەگەر واز نەهێنی، دەستبەرداری پەیامەکەت نەبی، [بێگومان زلەزلەو دەسترۆیشتووانی گەلەکەی وایانگوتوە] بەدڵنیایی لە بەردبارانکراوان دەبی.

هیچ کەسێك توانای ئەوەی نەبووە، نە لە ڕابردوو داو نە ئێستاش هەڕەشە لەخەڵك بکات: بەرد بارانت دەکەم و، لە سێدارەت دەدەم، ئەوە دیارە حوکمڕانە خۆ سەپێنەکان بوون، بەڵێ لێرەدا خوای پەروەردگار هەر بە ناوی گەلەکەیەوە، دەدوێ، چونکە ئەو خۆ سەپێنانە کە خەڵکەکە لەگەڵیان بووە، مانای وایە وەك خەڵکەکە شتەکەی کردبێ وایە، ئەو خەڵك و جەماوەرەش کە لەگەڵ ئەو حیزبە عەلمانییانەیە و، دەنگیان پێ دەداو، تەزویریان بۆ دەکات و، سەریان دەخات و کارەکانیان بۆ ڕادەپەڕێنێ و، پشتیان دەگرن لەسەر ناهەق، هەموویان یەك حیسابیان هەیە لە قیامەتدا، ئەوە نیە کابرا بڵێ: خوایە! من بەس بۆ مووچەکە لەگەڵیان بووم!! ئەگەر تۆ نەبووای و ئەو نەبووایەو ئەم نەبووایە، بە تەنێ نەیاندەتوانی، ئەو ستەمە بکەن، کاتێك خەڵك دەکەوێتە پێش ستەمکارو ئەویش لێی دەخوڕێ وەك

مەڕو بزن، خۆیان لێ دەکات بە گاوان و شوان، خەڵکیش دەچێتە سەر سروشتی ڕەشە وڵاخ و ئاژەڵ، هەر کەسێك خۆی لێ بکات بە گاوان و شوان، پێشی دەکەوێ، مانای وایە هەمان حوکمی ئەویان هەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾﴾الصافات، واتە: کۆیان بکەنەوە (ڕەپێچەکیان بدەن خڕیان بکەنەوە) ستەمکاران و ئەوانەی هاووێنەشیان بوون، (لەگەڵیان دابوون و پەیڕەوییان لێ کردوون)، وێڕای ئەو شتانەی دەیانپەرستن، بەرەو دۆزەخ ڕەپێچەکیان بدەن، هەموویان پێکەوە.

کەواتــە: ﴿قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ﴾، واتــە: دەسترۆیشــتووە خــۆ بەزلگــرەکان، گوتیــان، بــەڵام بــە نــاوی خەڵــك و کۆمەڵــگاوە قســەیان کــردوە، چونکــە خەڵکەکــە لەگەڵیــان بــووەو لــە بەرانبەریانــدا بێدەنــگ بــووە، ئەوانیــش شــوێنکەوتنی کوێرانــەی خەڵــك بۆیــان و، لەخزمــەت دابوونــی خەڵکیــان قۆزتۆتــەوەو گوتوویانــە: ئــەو خەڵکــە هەمــووی لەگــەڵ ئێمەیــە! لــە حاڵێکــدا کــە هــەرکام لــەو خەڵکــە، ئەگــەر دڵــی خــۆی کردبایــەوە، ســەد نەفرینیــان لــێ دەکــردن، بــەڵام ئــەوە بابــی فلســێکە، چونکــە تــۆ مــادام بــە کــردەوە لەگەڵــی بــووی و لــە خزمەتــی دا بــووی، ئــەو مــەداری خــۆی بــە تــۆ ســاز کــردوەو، ئامانجــە ناشــەرعییەکانی خــۆی بــە تــۆ جێبەجــێ کــردوون و دژایەتیــی هەقــی بــە تــۆ کــردوەو، تــۆی بەگــژ هەقــدا کــردوە! ئنجا ئــەوە لەســەردەمی نووحیشــدا ﷺ وابــووەو، ئێســتاش و دوای ئێســتاش هەروایــە.

هەربۆیــەش لــە تەفســیری ســوورەتی (الأعــراف)دا باســێکی ســەربەخۆمان لــەو بــارەوە کــردوە[1]، کــە خــوا ﷻ باســی ئەوانــە دەکات، پەیڕەوییــان لێکــراوەو، ئەوانــەش کــە پەیڕەوییــان کــردوە، ئەوانەی شــوێنکەوتووی ســتەمکاران بــوون و ســتەمکارانیش، کە خــوای پــەروەردگار پێیــان دەفەرمــوێ: ﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾﴾، واتــە:

---

(١) هەروەهــا لــە تەفســیری ســوورەتی (ســبأ) یــش دا کورتــە باســێکمان لەوبــارەوە کــردوە لــە کاتی تەفســیرکردنی ئایــەتی: (وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ ...)دا.

بۆ هەرکامێکتان سزای دووچەند هەیە، بەڵام ئێوە نازانن، ستەمکارەکان و حوکمڕانە خۆسەپێنەکان، بۆیە دووقات سزا دەدرێن، لەبەر گوناهی خۆشیان و، کە ئەو خەڵکەشیان بەدوای خۆیان داوە، شوێنکەوتووە چەوسێنراوەکانیش، لەبەر خۆشیان سزا دەدرێن و، لەبەر ئەوەش کە ئەو فیرعەون و طاغووت و خۆسەپێنانەیان بەسەر خۆیانەوە کردوونە مڵۆزم، ئەگەر ئەو خەڵکە نەبووایە ئەوانە نەدەبوونە مڵۆزم.

﴿ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴾، ئەگەر وازنەهێنی بێگومان لە بەردباران کراوان، دەبی، (الرَّجمُ: الرَّمي بِالحِجارة: أي الرِّجام) (رجم) ئەوەیە بەرد بە شتێکدا بدەی، (رجام) یانی: بەرد، هەندێك گوتوویانە: واتە: لە جنێو پێدراوان و قسە پێگوتراوان، دەبی! بەڵام نەخێر، کێشەکەی نێوان ئەو حوکمڕانە خۆسەپێنانەو نووح ﷺ، هەروەها پێغەمبەرانی دیکەش، زۆر لەوە گەورەتر بووە، بە قسە پێگوتن و جنێو پێدان وازیان لێ بێنن!

٢)- ﴿ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِى كَذَّبُونِ ﴾، نووح ﷺ پاڕایەوە و گوتی: پەروەردگارم! بە دڵنیایی گەلەکەم، (خەڵکەکەم کە من بۆ لایان نێردراوم) منیان بە درۆ دانا، ئەمە ڕێخۆشکردنە کە دوایی نزایان لێ بکات، وەك لە سوورەتی (نوح)دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: پەروەردگارم! تاقەوار لە کافرەکان مەهێڵە، کەسیان لێ مەهێڵە، چونکە وەك لەوێ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴾ ، ئەوانە وا گومڕا بوون، هەرچی لێشیان دەبێ هەر گومڕایە.

٣)- ﴿ فَٱفْتَحْ بَيْنِى وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا ﴾، دادوەریی لە نێوان من و ئەواندا بکە، دادوەرییەك کە شایستەی خۆتە، واتە: حوکممان لە نێواندا بکە.

٤)- ﴿ وَنَجِّنِى وَمَن مَّعِىَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، خۆشم و ئەوانەی لەگەڵمدان، لە بڕواداران ڕزگارمان بکە، واتە: ڕزگارمان بکە لەو تۆفانەی کە دێ، یان ڕزگارمان بکە لەو ستەم و هەڕەشەو گوڕەشەی کافرەکان.

٥)- ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴾، یەکسەر دوای ئەوە خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون، لە کەشتییە پڕەکەدا، دەربازمان کردن، ڕزگارمان کردن، بە (ف)ی بەدواداهاتن (تعقیب) هێناویەتی، (المَشحون) یانی: (المَملوء) پڕکراو، لەبەر ئەوەی کەشتییەکە پڕ کرابوو، هەم لەو بڕوادارانەی کە لە خزمەت نووحدا بوون، هەم لە هەر کام لە ئاژەڵەکان و پەڕەوەرەکان، لەوانەی تۆیان نەبڕێتەوەو نەفەوتێن، ئەوانەی کە لە ئاودا دەخنکێن، لە هەرکامێکیان جووتێکی سوار کردوە.

٦)- ﴿ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ٱلْبَاقِينَ ﴾، دواییش ئەوانەی کە لە کوفردا مابوونەوە، لەسەر کوفر بەردەوام بوون، ئەوانەمان خنکاند و نغرۆمان کردن.

٧)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانەیەکی گەورە هەیە، بەڵام زۆربەیان بڕوادار نەبوون، واتە: لەوەدا نیشانە هەیە، کە خوا دۆستەکانی خۆی دەرباز دەکات و، دوژمنەکانی دەفەوتێنێ، بەڵام لەکاتی خۆیدا.

٨)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیایی تەنیا پەروەردگاری تۆ زۆر زاڵ و باڵادەستەو، زۆریش میهرەبان و بەبەزەییە.

کەواتە: پشتی پێ ببەستەو بێ منەت بە لە دوژمنەکانت، دڵنیاشبە کە خوا ﷻ دۆستانی خۆی وێڵ ناکاو، پشتگوێ ناخات، بەڵێ تووشی ئازارو ناڕەحەتیی دەبن، بەڵام هەرکات حیکمەتی خوا خواستی، دوژمنەکانی دەفەوتێنێ و، ئیماندارە دۆستەکانی خۆشی دەرباز دەکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەژدە ئایەت پێکهاتووە: (١٢٣ - ١٤٠) کە هەموویان تەرخانکراون بۆ پوختەیەك لە بەسەرهاتی هوود ﷺ و گەلەکەی عاد، هەر لە دەستپێکی بانگەوازیەوە لەگەڵیان بەرەو خواپەرستیی و پارێزکاریی، هەتا فەوتانیان بە هۆی ملهووڕیی و خۆ بەزلگرییانەوە، بەبایەکی زۆر بەهێز، کە حەوت ڕۆژو هەشت شەوان بێ پسانەوە لە دژیان هەڵیکرد، وەك لە شوێنەکانی دیکەی قورئاندا هاتووە:

﴿ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ ﴾ الحاقة.

واتە: بەڵام هەرچی گەلی عادە، بە بایەکی زۆر ساردی لەسنوور دەرچوو، فەوتێنران، کە حەوت شەوو هەشت ڕۆژان خوا لە دژیان هەڵیکرد، بنبڕی کردن، خەڵکەکەت دەبینی لە شارو وڵاتەکەی خۆیان دا کەوتبوون بە مردوویی، وەك بنکی دار خورما کەوتووەکان.

دارخورما کە دەکەوێ و بنکەکەی دەمێنێتەوە، بەو شێوەیە دەهاتنە بەرچاو.

﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُمْ بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُمْ

بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَٰمٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾ قَالُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ ﴿١٣٦﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(گەلی) عاد پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان (بڕوایان پێ نەهێنان) ﴿١٢٣﴾ یاد بکەوە! کاتێك هوودی برایان پێیگوتن: ئایا پارێز (لە خوا) ناکەن! ﴿١٢٤﴾ بێگومان من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی ئەمیندار (ڕاست و ساغ)م ﴿١٢٥﴾ دەجا پارێز لە خوا بکەن و، بە قسەم بکەن ﴿١٢٦﴾ هیچ کرێشتان لە بەرانبەریدا لێ داوا ناکەم، پاداشتم تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە ﴿١٢٧﴾ ئایا هەروا بەهەوەنتە (بێ ئامانجێکی پێویست)، لە هەموو بەرزاییان (بینایەکی) نیشانە (ئاسا) دروست دەکەن! ﴿١٢٨﴾ هەروەها کۆشك و تەلاران (لەسەر حیسابی خەڵکی ڕەش و ڕووت) دروست دەکەن (بە خەیاڵی خۆتان) بەهیوای ئەوەی هەر ماوبن (لەژیانی دنیادا بە هۆی کۆشك و باڵەخانەو شوێنی مەحکەمەوە)؟! ﴿١٢٩﴾ هەر کاتێکیش بۆ سزادان پەلامار (ی کەسانێك)تاندا، ملهوڕانەو تێکشکێنەرانە سزاو پەلامار دەدەن ﴿١٣٠﴾ دەجا پارێز لەخوا بکەن و، بەقسەم بکەن (فەرمانبەرییم بکەن) ﴿١٣١﴾ هەروەها پارێز لەو کەسە بکەن، ئەوەی خۆتان دەزانن پێیداون ﴿١٣٢﴾ ئاژەڵەکان و کوڕانی پێداون ﴿١٣٣﴾ هەروەها باخ و کانیی و سەرچاوەکان ﴿١٣٤﴾ بەڕاستیی من مەترسیی ئازاری ڕۆژێکی مەزنم لێتان هەیە ﴿١٣٥﴾ (گەلەکەی) گوتیان: یەکسانە لەلامان ئامۆژگاریی بکەی، یان لە ئامۆژگارییکاران نەبی ﴿١٣٦﴾ ئەمە (کە تۆ ڕەخنەی لێدەگری و، هەوڵی گۆڕینی دەدەی) هەمان نەریت و خووی پێشووانە

(ڕێ نادەیـن دەسـتکاریی بکـەی) ﴿١٣٧﴾ ئێمـەش لـە سـزاداران نابیـن (ڕاسـت نیـە خـوا سـزامان بـدات) ﴿١٣٨﴾ سـەرەنجام بـە درۆیـان دانـاو، ئێمـەش فەوتاندمانـن، بێگومـان! لـەوەدا نیشـانەیەك (ی گـەورە) هەیـە، بـەڵام زۆربەیـان بـڕوادار نیـن ﴿١٣٩﴾ تەنیـا پەروەردگاریشـت باڵادەسـتی میهرەبانـە ﴿١٤٠﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(رِيعٍ): (الرِّيـعُ: المَـكَانُ المُرْتفِـع الَّـذِي يَبْـدو مِـن بَعيـدٍ، الواحِـدَةُ: رِيعَـة) (ريـع) بەشـوێنێکی بـەرز دەگوتـرێ، کـە لـەدوورەوە دیـارە، ئەمـە نـاوی (جنـس)ە، تاکەکـەی بریتیـە لـە (رِيعَـة) یـەك شـوێنی بـەرز.

(ءَايَةً ): (عَلامَـةٌ ظاهِـرَة) نیشـانەیەکی ئاشـکرا، واتـە: ئـەو شـتانەی دروسـتی دەکـەن لـە دووری، وەك نیشـانەیەك و دروشـمێك دیـارن.

(مَصَانِعَ ): هـەم بەمانـای کۆشـکەکان لێکدراوەتـەوە، کـۆی (مَصْنَـع)ە، کـە (مَصْنَع) هـەم بەمانـای (صِهريـج المـاء) لێکدراوەتـەوە، ئـەوەی نـاوی تێـدا کۆکراوەتـەوە، کارێز، حـەوز، هـەم بـە مانـای شـوێنی جـوان و ڕێـك هاتـوە.

(بَطَشْتُم ): (البَطْش: تَنَاوُلُ الشَّيءِ بِصَوْلَةٍ) (بَطْش) بریتیە لەوە بەزەبر پڕ بدەیە شتێك.

(جَبَّارِينَ ): (الجَبَّـارُ: المُتَعـال عَـن قُبـولِ الحَـقِّ، وَيُقَـالُ لِلقاهِـرِ غَـيرَهُ: جَبَّـار) (جباريـن) کـۆی (جَبَّـار)ە کەسـێکە لەبارمبـەر هەقێـدا خـۆی بەبـەرز بگـرێ و، کەسـێك مـل بـە جگـە لـە خـۆی کـەچ بـکات پێـی دەگوتـرێ: (جَبَّـار)، کـە سـتەم بـکات جگـە لـە خـۆی.

(خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ): (أَي خُلُـقُ أَسْـلَافِهِم وَأُسْـوَتُهُم، فَـلاَ يَقْبَلُـونَ مِنـهُ عَـذْلاً وَلا مُلاَمَـاً) کـە دەڵێـن: ئـەی هـوود! ئـەوە هـەر نەریتـی پێشـوواڤانە، واتە: ئـەوان سـەرمەشـقی ئێمەن، بۆیـە قبـووڵ ناکەیـن، سـەرکۆنە ناڕاسـتەی ئـەوان بکـرێ و ڕەخنەیـان لـێ بگیـرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەسەرهاتی هوود ﷺو گەلەکەی (عاد)مان بەتێرو تەسەلیی لە تەفسیری سووڕەتی (هود)دا خستۆتە ڕوو، لەکاتی تەفسیر کردنی ئایەتەکانی: (٥٠ - ٦٠)دا، بۆیە لێرە بەخێرایی بەسەریدا دەڕۆین.

خوا ﷻ لە دوای بەسەرهاتەکانی مووساو هاروونی برای (**علیهما الصلاة والسلام**)و، گەلەکەیان لەگەڵ فیرعەون و گەلەکەیدا، پاشان بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ بابی و گەلەکەیدا، دوایی بەسەرهاتی نووح ﷺ لەگەڵ گەلەکەیدا، ئنجا بەسەرهاتی هوود ﷺ و گەلی (عاد)مان، بۆ دەگێڕێتەوە، کە یەکەمجار بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، هاوەڵانی بەڕێزی خوا لێیان ڕازی بێ، بووە، کە ئێوەش وەك ئەو پێغەمبەرانە خۆڕاگر بن، ئەوانە سەرمەشقی ئێوەن، هەروەها ئەو بڕوادارانەی کە لە خزمەتیان دا بوون.

هەروەها هۆشداریی و ترساندنیش بووە بۆ نەیارەکانیان، کە ئێوەش ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتان بەردەوام بن، بەمەرەدی ئەو گەلە کافرانەی ئەو پێغەمبەرانە (**علیهم الصلاة والسلام**) دەچن.

دەفەرمووێ: ﴿كَذَّبَتۡ عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾، گەلی عاد پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانان، دیارە لەو کاتیدا هەر هوودیان پێغەمبەر بووە، بەڵام بێگومان لەبەر ئەوە هوودیان بەدرۆ داناوە، کە پەیامێکی هێناوە، ئەوان بڕوایان بەو پەیامە نەبووە، بڕوایان بەو ڕاستییانە نەبووە کە ئەو پەیامە گرتوونیە خۆی، ئنجا پەیامی هەموو پێغەمبەرانیش (**علیهم الصلاة والسلام**) لە نێوەڕۆکدا وەك یەك بوون، واتە: کەسێ بڕوا بەیەکێ لە پێغەمبەران نەکات، لەبەر پەیامەکەیان، مانای وایە هەر لەبەر ئەوە بڕوا بە هیچیان ناکات.

﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک هوودی برایان پێی گوتن: ئایا پارێز ناکەن، واتە، پارێز لەخوا ناکەن، یاخود: پارێز لەو بەڵاو موصیبەتانە ناکەن، کە بە هۆی کوفرەوە بەسەرتان دێن، یاخود: پارێز ناکەن لە سزای خوا لە ڕۆژی دواییدا، ﴿ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، من بەدڵنیایی بۆ ئێوە ڕەوانە کراوێکی ئەمیندارم، ڕاست و ساغم، بۆتان دڵسۆزم، ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، دەجا پارێز لە خوا بکەن و بە قسەم بکەن، فەرمانبەرییم بکەن، چونکە من ڕێی خواتان پێشان دەدەم ﴿ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، هیچ جۆرە کرێیەکیشتان لە بەرانبەریدا، لە بەرانبەر ئەو پەیامەدا کە پێتان دەگەیەنم، لێ داوا ناکەم، کرێ و پاداشتی من تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە، دڵتان نەترسێ بڵێن، ڕەنگە کاری خۆی بەتێمە بێ! کاری خۆتانم بەخۆتانە، نەک کاری خۆم، دەمەوێ مەداری ئێوە ساز بکەم، نەک مەداری خۆم، ئەوە زۆر زۆر گرنگە بۆ شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پێغەمبەران کە بە قسە وایانفەرمووەو، خوا فەرموویەتی وا بڵێن، بەکردەوەش هەروا بوون، گرنگە شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانیش، بە قسەش و بە کردەوەش وابن، هیچ چاوەڕوانییەکیان لە خەڵک نەبێ.

ئنجا هوود سەرزەنشتیان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ ﴾، ئایا لەهەر بەرزاییەک قەڵاو باڵەخانەیەک دروست دەکەن وەک نیشانە لەدوورەوە دیار بێت، ﴿ تَعْبَثُونَ ﴾ واتە: هەروا بە هەوەنتە بێ ئامانجێکی پێویست، بەس بۆ خۆهەڵێشان و خۆڕانان بەسەر خەڵکی ڕەش و ڕووت دا، ئەو قەڵاو باڵەخانە بەرزانە دروست دەکەن؟ ﴿ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴾، هەروەها کۆشکان دروست دەکەن، یاخود ئەو شتانەی دیکە دروست دەکەن، (مَصَانِعَ ) کۆی (مَصْنع)ە، هەر بینایەک کە دروست دەکرێ، کۆشک بێت، قەڵابێ، کارێزی ئاو بێ، حەوزی ئاو بێ، هەرچی بێ دروست بکرێ، بە وردەکاریی و بە کارامەیی (مَصَانِعَ )ی پێ دەگوترێ، (مَصَانِعَ ) دروست دەکەن بۆ ئەوەی

بەڵکو بمێننەوە، هەر ماوبن لە ژیاندا، ﴿ وَإِذَا بَطَشۡتُم بَطَشۡتُمۡ جَبَّارِينَ ﴾ کاتێ پەلاماریش دەدەن و سزای خەڵك دەدەن، زۆر دڵڕەقانەو ملهوڕانە سزا دەدەن، تێدەپەڕێنن لە سزا داندا، ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، جارێکی دیکە پێتان دەڵێم: بەقسەم بکەن و، پارێز لەخوا بکەن، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِيٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعۡلَمُونَ ﴾، خۆشتان لەسزاو لێپێچینەوەی ئەو کەسە بپارێزن کە ئەوەی دەیزانن، بە ئێوەی بەخشیوە (أَمَدَّكُم ) یانی: (أَعطاكُم) پێیداون، (إمداد) ئەوەیە جار لە دوای جار شتێك بەکەسێك بدەی، (أَمَدَّهُ، يُمِدُّهُ إِمْداداً) یانی: بەردەوام خوا ﷻ ئەوەی کە دەیزانن، پێتان دەداو پێی داون.

دوایی ڕوونی دەکاتەوە ئەوەی کە پێیداون چییە؟ ﴿ أَمَدَّكُم بِأَنۡعَٰمٖ وَبَنِينَ ﴾، خوا ﷻ ئاژەڵان و کوڕانی بە ئێوە داون.

هەندێکیش گوتوویانە: (بَنين) واتە: منداڵ بە گشتیی، کوڕو کچ، بەڵام ئەگەر وابایە دەیفەرموو: (أَوْلاد)، (بَنين) واتە: کوڕان، ئەوان زیاتر کوڕیان بە پشت و هێزی خۆیان دەزانی، لێرەدا بەپێی عەقڵی ئەوان، پێغەمبەرەکەیان ﷺ ئەوانی دواندوە، ئەوان ئافرەتیان پێ هیچ نەبووە، پێغەمبەرەکەشیان بەپێی عەقڵی ئەوان دواندوونی، ئەگەر فەرمووبای کچی پێداون، دەیانگوت: کچ چییە؟ بەڵام دەفەرموێ: هەم ئاژەڵی پێداون و هەم کوڕانیشی پێداون، ئەوانەش نیعمەتی خوان ﴿ وَجَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴾، هەروەها باخ و بێستانەکانی پێداون و کانیی و سەرچاوەکانیشی بۆ ڕەخساندوون، پارێز لەو کەسە بکەن کە هەموو ئەو نیعمەتانەی پێداون، ﴿ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴾، بەدڵنیاییی من مەترسیی ئازارو سزای ڕۆژێکی مەزنم لێتان هەیە، ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەی تێیدان بەردەوام بن، ﴿ قَالُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَوَعَظۡتَ أَمۡ لَمۡ تَكُن مِّنَ ٱلۡوَٰعِظِينَ ﴾، پێیان گوت: بە نسبەت ئێمەوە یەکسانە، یەکسانە لەسەر ئێمە، ئامۆژگاریی بکەی، یاخود لە ئامۆژگارییکاران نەبی، قسەکانی هوودیان بە ئامۆژگاریی (وَعْظ) لێکداوەتەوە، واتە: تۆ بەس ئامۆژگارییکارێکی، ئامۆژگاریی بکەی، یان نەیکەی، هەروەك خۆمانین، هیچ لەحاڵی ئێمە ناگۆڕێ، ﴿ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾،

أ- ئەوەی کە ئێمە لەسەرینی، هەمان داب و نەریتی پێشووەکانمانەو، ئێمە لەسەر ئەوە بەردەوام دەبین.

ب- یاخود: ئەوە کە خەڵك دێن و دەڕۆن، جیل دوای جیل دێن، ئەم سەر زەوییە بەجێ دێڵن، عادەت و نەریتی پێشووەکان هەر وابووە، خوانەبووە کە پێشووەکانی ئێمەی فەوتاندوون، بەڵکو هەروابووە.

ج- واتایەکی دیکەی ئەوەیە لەپێش ئێمەشدا کەسانی دیکەی وەك تۆ بوون، هاتوون بە ناوی خواوە وەك پێغەمبەر قسەیان کردوە، بەڵام بە قسەیان نەکردوون، ئێمەش هەر وەك وان بەردەوام دەبین.

﴿ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾، ئێمە لە سزادراوان نین لەلایەن خواوە: ﴿ فَكَذَّبُوهُ ﴾، بەدرۆیان دانا، لە هەموو ڕووێکەوە بە درۆیان دانا:

أ- گوتیان: نە تۆ نوێنەری خوای و، نە خوایەك پەیام و بەرنامەی ناردوە.

ب- ئەوەك تۆ دەڵێی وایە، کە پێشووەکان ئەوانەی بە قسەی پێغەمبەرانیان نەکردبێ خوا سزای دابن، ئەوانە هیچیان ڕاست نین.

﴿ فَأَهْلَكْنَاهُمْ ﴾، بە (ف)ی (تعقیب)، یاخود بە (ف)ی (جزائیة) یانی: لە سزای ئەوەدا فەوتاندمانن، یاخود دوای ئەوە کە تەواو دەرکەوت بە درۆیان داناو، پەیامەکەیان قبووڵ نەکرد، فەوتاندمانن و لەبەینمان بردن، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، بەڕاستیی لەوەدا نیشانەیەکی گەورەو بەرچاو هەیە، بەڵام زۆربەیان بڕوادارنین، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیایی بەس پەروەردگاریشت باڵادەستی میهرەبانە، کەواتە: پشتت بەو قایم بێ، لە بەرانبەر دوژمن و ناحەزەکانی تۆدا باڵادەست و زاڵەو، بۆ خۆت و کەسانێك کە شوێنت کەوتوون، میهرەبان و بەبەزەیی و پەرۆشە.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**باسی ڕەوانە كرانی هوود بۆ لای گەلەكەی (عاد)و، بەدرۆ دانانیان بۆی و، ئامۆژگاریی كردنی دڵسۆزانەی بۆیان كە پارێز لە خوا بكەن و، بە قسەی بكەن، چونكە هیچ تەماعێكی پێیان نیە و، هیچ چاوەڕوانییشی لێیان نیەو، ڕەخنە گرتنی لە زێدەڕۆیی كردنیان، لە خەرج كردنی ماڵ و سامان لە دروستكردنی خانوو بەرەو شتی ناپێویست و، سنوور شكێنییان لە زەبر وەشاندن و سزاداندا، دووبارە ئامۆژگاریی كردنیان بەپارێز كردن و گوێڕایەڵیی و، یاد كردنی چاكەكانی خوا بەسەر خۆیانەوە، ترسان لە سزای مەزنی خوا، كە بە ملیاندا بێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِىٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَٰمٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، گەلی عاد ڕەوانەكراوانیان بەدرۆدانا.

وەك پێشتریش گوتمان: لێرەدا عاد یانی: گەلی عاد، ئنجا لەبەر ئەوەی كۆ (جمع)ن، (كُلُّ جَمْعٍ مُؤَنَّث) لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿ كَذَّبَتْ ﴾، یان ئوممەتی عاد (أُمة عاد)،

کۆمەڵەکەی عاد (جماعة عاد) ئەوانە پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، یەك پێغەمبەریان بە درۆ داناوە، بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) پەیامەکەیان لە نێوەڕۆکدا یەك بووە، باسی ئەوە دەکەن کە تەنیا خوا بپەرستن و، تەنیا خوا ﷻ بە هەمەکارەی ژیانی مرۆڤ دابنرێ، پاشان باسی ئەوە کە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) نوێنەری خوان و باسی ئەوە کە ڕۆژی دوایی هەیە، سزاو پاداشت هەیە، پەیامی هەموو پێغەمبەران ئەو نێوەڕۆکەی هەبووە، بۆیە کەسێ یەکێکیانی بەدرۆ دانابێ، مانای وایە هەموویانی بە درۆ داناوە.

٢)- ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، کاتێك هوودی برایان پێیگوتن: ئایا پارێز ناکەن، دیارە هوود عليه السلام لە ڕەچەڵەکیشدا برایان بووەو، لە مرۆڤایەتییشدا برایان بووە، برای ئینسانییان و برای نەتەوەییشیان بووە، ئەگەرنا لە دیندا برایان نەبووە.

﴿ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، پێیگوتن: ئایا پارێز ناکەن؟ (ألاَ، همزة استفهام مع «لا» النّافية) (ألا) یان هەمزەی ئیستیفهام (أ)ە لەگەڵ (لا)ی لابردن، یاخود (ألا) هەمووی یەك وشەیە، بۆ هاندان، یاخود بۆ وریا کردنەوە، وەك: ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾یونس، کە بە تەئکید لێرە (ألا) بۆ ئاگادار کردنەوەیە، یانی: ئەها وریا بن! دۆستانی خوا نەترسیان لەسەرەو نە پەژارە دادەگرن.

٣)- ﴿ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، بەدڵنیایی من بۆ ئێوە ڕوانە کراوێکی ئەمیندارم، واتە: ڕاست و ساغم.

٤)- ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، دەجا پارێز لە خوا بکەن و، فەرمانبەریی من بکەن.

٥)- ﴿ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾، لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامەش هیچ کرێتان لێ داوا ناکەم.

٦)- ﴿ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، کرێ و پاداشتم تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە.

دووبارە کردنەوەی ئەم ڕستانە، ئاگادار کردنەوەیە کە ئەمانە چەند پرەنسیپێکی بنەڕەتیین و، زۆر زۆر گرنگن لە هەمووچاخ و سەردەمەکاندا، کە پێغەمبەرانیان و شوێنکەوتووانیان دەبێ ئاوابن بۆ خەڵك، دەبێ لەگەڵیاندا ئەمیندار بن و، داوایان لێ بکەن کە پارێز لە خوا بکەن و، بە قسەیان بکەن بۆ لای خوا، نەك بۆ لای خۆیان، پاشان هیچ چاوەڕوانییەکیان لەخەڵك نەبێ، تەنیا چاوەڕوانییان لە خوای پەروەردگار هەبێ.

ئنجا هـوود ﷺ ژمارەیـەك لـە هەڵـەو کـەم و کوڕییەکانـی خۆیانیـان دەخاتـەوە بەرچـاو، لـە ڕووی ئابووریـی و کۆمەڵایەتیـی و، سیاسـیی و ئەمنیـی و هەمـوو ڕەهەندەکانـی دیکـەی ژیانــەوە.

٧)- ﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً ﴾، ئایا لەسەر هەر بەرزاییەك نیشانەیەك دروست دەکەن (رِيعٍ) واتە: (المَكَان المُرْتَفِع) شوێنی بەرز، (ءَايَةً)ش بە مانای نیشانە (علامة) دێ، واتە: ڕێی پێ بزاننەوەو قووچکە (معلم)ی ڕێگا بێ، یاخود دروستکراوێکی سەرسوڕهێنەر، کە بەڵگەی ئەوەبێ: ئەو کەسەی دروستیکردوە، زۆر کارامەو شارەزایە، یانی: نیشانەیە بۆ ئەوەی ڕێی پێ بزانرێ، یاخود: بۆیە پێیگوتراوە نیشانە: لەبەر ئەوەی بەڵگەیەو نیشانەیە لەسەر کارامەیی و شارەزایی ئەو کەسەی دروستیکردوەو بنیاتی ناوە.

ئنجا ئایا بۆچی لەسەر هەر بەرزاییەك باڵەخانەیەك دروست دەکەن، وەك نیشانە؟

٨)- ﴿ تَعْبَثُونَ ﴾: گاڵتە دەکەن و بەهەوەنتە و بێ ئامانجێکی ڕاست وا دەکەن. (العَبَثُ، اللَّهو، وما لا فائِدَةَ مِنْهُ) (عبث) یانی: خافڵان و شتێك کە سوودی نەبێ، هەروا بە گاڵتە، بە هەوەنتە.

٩)- ﴿ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴾: هەروەها بینایان دروست دەکەن، بەڵکو هەرماوبن، (مَصانِع جَمْعُ مَصْنَع، مَصْدَر مِيمي، وَصِف بِهِ لِلمُبالَغَة) (مصانع) کۆی (مَصْنَع) ە، چاوگی میمییە، کراوەتە وەسف بۆ زێدەڕۆیی تێدا کردن، هەندێك دەڵێن: (مَصْنَع) بە مانای حەوزێك دێ، کە لەزەوی هەڵقەنراوەو هەندێك گوتوویانە: بەمانای کۆشك دێ، بەڵام (الطبري) زۆر جوان دەڵێ: (مَصَانِع جَمْعُ مَصْنَع، وَهوَ كُلّ بِنايَةٍ قَصْراً أَوْ حَوْضاً أو غَيْرِهِما)

واتە: (مَصَانِع) کۆی (مَصْنَع)ە، ئەویش بریتیە لەهەر باڵەخانەیەك، ئنجا کۆشك بێ، حەوز بێ، هەر شتێکی دیکەبێ کە دروست بکرێ بە کارامەیی و لێزانیی، پێی دەگوترێ: (مَصْنَع).

﴿ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴾، بـۆ ئـەوەی بمێننـەوە، بەڵکـو هـەر ماوبـن لـە ژیانـدا، بەپێـی گومانـی خۆتـان، ئـەوە لـەڕووی ئابوورییـەوە ڕەخنەیـان لـێ دەگـرێ، دوایـی لـە ڕووی ئەمنیـی و لـە ڕووی سەربازییشـەوە:

١٠)- ﴿ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴾، کاتێك کە سزاش دەدەن، زۆر ستەمکارانەو ملهوڕانە سزا دەدەن، دەڵێ: (البَطش: الضَّرْبُ عِندَ الغَضَب) (بطش) لێدانە لە کاتی توڕەییدا.

١١)- ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، جارێکی دیکەش لێیان دووبارە دەکاتەوە: پارێز لەخوا بکەن و بەقسەم بکەن.

١٢)- ﴿ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴾، ئنجا جارێکی دیکە دێتەوە سەر باسی ئەو نیعمەتانەی خوا پێیداون: هەروەها پارێز لەو زاتە بکەن، ئەوەی بەئێوە داوە، کە دەیزانن، واتە: ئەوەی دەیزانن بۆ ئێوەی ڕەخساندوە بەبەردەوامیی (أَمَدَّكُم: اسْتَمرَّ في إعطائِها لَكم) بەردەوام بووە لە پێدانیداپێتان.

١٣)- ﴿ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴾: ئاژەڵانی بە ئێوە داون (بەهەر چوار جۆرەکەیانەوە) هەروەها کوڕانیشی پێداون، یاخود هەموو ئەو ژیاندارانەی کە مرۆڤ لێیان بەهرەمەند دەبێ، چ چوار جۆرەکە: (ڕەشە وڵاخ و، وشترو، مەڕو، بزن) چ وڵاخە بەرزەو، هێسترو، کەرو هەموو ئەو ئاژەڵانەی دیکە، وەك فیل و ژیاندارانێك کە لەسەر گۆی زەوی، مرۆڤ لێیان بەهرەمەند دەبێ.

١٤)- ﴿ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴾، هەروەها چەندان باخ و بێستان و، کانیی و سەرچاوەی پێداون، پارێز لەو زاتە بکەن.

١٥)- ﴿ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾: بەڕاستیی من مەترسیی ڕۆژێکی مەزنم لێتان هەیە، بەڵام ئایا ئەوان چ وەڵام دەدەنەوە؟ ئەوە لەمەسەلەی دووەمدا دێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**وەڵامدانەوەی ملهوڕانەو لاسایکەرەوانەو، بێباکانەی گەلی عادو سەرەنجام فەوتێنرانیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ ﴿١٣٦﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەو پێنج ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:**

١)- ﴿ قَالُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ ﴾، گەلەکەی [یان دەستڕۆیشتووانی گەلەکەی کە بە ناوی گەلە هەڵخەڵەتاوو چەواشەکراوەکەوە قسەیان کردووە، خۆیان لێ کردوونە مامۆتک و دەمڕاست و، ئەوانیش بێدەنگ بوون] پێیان گوت: ڕێنمایی تۆ بۆ ئێمەو، ڕێنمایی نەکردنت، ئامۆژگاریی کردنت و، ئامۆژگاریی نەکردنت بۆ ئێمە، یەکسانە، ئامۆژگاریی بکەی، یاخود لە ئامۆژگارییکەران نەبی، بۆ ئێمە یەکسانە، واتە: خۆماندوودردنت لەگەڵمان دا هیچ سوودێکی نیە، ویستوویانە نائومێدی بکەن.

٢)- ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾: ئەمە جگە لە ڕەوشت و نەرێتی پێشووان، هیچی دیکە نیە. خوێنراوتەوەش: (إن هَذا إلاّ خَلْقُ الأوّلين)، هەڵبەتە (إن) هی لابەرە (نافية)یە، یانێ: ئەمە هەر دروستکراوی پێشووانە.

**ئنجا بە هەردووك جۆرە خوێندنەوەکە، چەند واتایەك دەگەیەنن:**

أ- ئەوانی پێشینیانیش، وەك ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرەکانی خۆیاندا ناکۆك بوون، بە قسەیان نەکردوون، کەواتە: دروستکراوانی پێشووش هەروابوون.

ب- عادەت و نەریتی گەلە پێشووەکانیش هەروا بووە، لەوەدا کە بت و صەنەمیان پەرستوون و پێشینانیان بەمەزن گرتوون.

ج- یاخود عادەت و نەریتی گەلە پێشووەکانیش هەروەك هی ئێمە بووە، کە بەقسەی پێغەمبەرانیان نەکردوە.

د- یاخود ئەوە کە خەڵك کۆمەڵگایەك دەفەوتێ و، کۆمەڵگایەکی دیکە دێتە جێی، نەریتی پێشووەکانیش هەروا بووە، واتە: ئەوە نیە وەك تۆ بانگەشەی بۆ دەکەی، کە خوا خاوەنی ئەو کۆمەڵگایانەو ئەو مرۆڤانە بێ، کە لەسەر زەویین و، ئەگەر لایاندا سزایان بدات، نەخێر، عادەت هەروا بووە، خەڵك هەر مردووەو، ژیاوەو، بە دوای یەکدا هاتوون.

٣)- ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾، ئێمەش لە سزادراوان نابین، لەلایەن خواوە، لە دنیادا، یان لە دواڕۆژدا، یان لە هەردووکیان دا.

٤)- ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَاهُمْ ﴾، بەدرۆیان داناو، ئێمەش فەوتاندمانن، (ف)ی ﴿ فَكَذَّبُوهُ ﴾ (الفاءُ الفَصيحَة)یە، نەك (ف)ی (تعقيب) بێ، یانی: یەکسەر بە درۆیان دانا، چونکە پێی چووە، واتە: ڕوون بۆوە کە ئەوان گوتیان: یەکسانە ئامۆژگارییمان بکەی و ئامۆژگارییمان نەکەی، بۆی دەرکەوت کە ئەوانە بێ سوودە، خۆ لەگەڵ ماندووکردنیان، (ف)ی (فَأَهْلَكْنَاهُمْ) (فاءُ الجَزائية)یە، یاخود (فاءُ التعقيب)ە، واتە: لەسزای ئەوەدا فەوتاندمانن، یاخود یەکسەر دوابەدوای ئەوە فەوتاندمانن.

٥)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ﴾، لەوەدا نیشانەیەکی گەورەو گرنگ هەیە، یانی: لەوەدا کە باسکرا، کە خوا ﷻ لە مرۆڤەکان نەگەڕاوەو، ژیانی دنیای بۆ نەکردوونە شاری بێ خاوەن، بەڵکو سەرپەرشتییان دەکات و کەسێك لایدا، لە کاتی خۆیدا سزای دەدا، هەروەها لەوەدا کە باسکرا نیشانە هەیە لەسەر ئەوە، کە خوا لەسەر دۆستانی خۆی، لەسەر پێغەمبەرانی خۆی وەدەنگ دێ و وێڵیان ناکات.

٦)- ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾: بەڵام زۆربەیان بڕوادار نین.

٧)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾: بە دڵنیایی هەر پەروەردگاریشت زۆر زاڵی میهرەبانە، کەواتە: دڵنیابە دوژمن و ناحەزانت دەفەوتێنێ و، تۆو شوێنکەوتووانیشت سەردەخات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە نـۆزدە (١٩) ئايـەت پێـك دێ: (١٤١ - ١٥٩) هەمووشـيان بـۆ باسـكردنی پوختـەی بەسـەرهاتی صالـح عليه السلام و گەلەكـەی (ثمـود)، تەرخانكـراون، هـەر لـە سـەرەتای بانگـەوازەوە هەتـا سـەرەنجامی شـوومی گەلـە ملهوڕەكـەی، كـە بـە هـاڕژن و چریكەیەكـی گـەورەو بێـڕەزا فەوتێـنراون، وەك لـە سـووڕەتی (الحجـر) دا هاتـوە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴿٨٣﴾ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾، واتـە: دەمـەو بەيـان هـاڕژن و چریكەیەكـی بێـڕەزا گرتنـی، ئايـا ئـەوەی وەدەسـتيان دەهێنـا و دەيانكـرد، چ سـوودێكی پـێ گەيانـدن؟ بـە تەئكيـد هيچ، ئـەوە ئەگـەر (مـا) لێرەدا بـۆ پرسـيار كـردن (إستفهام) بـێ، ئەگـەر بـۆ لابـردن (نَفي)يش بـێ، يانـی: سـوودی پـێ نەگەيانـدن، ئـەوەی كـە بەدەسـتيان هێنـا.

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُواْ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾ ﴾.

## مانای وشە بەوشەی ئایەتەکان

{(گەلی) ثەموود پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانان (پێیان بێبڕوا بوون) ﴿١٤١﴾ یاد بکەوە! کاتێک صاڵحی برایان پێیگوتن: ئەرێ پارێز (لە خوا) ناکەن؟ ﴿١٤٢﴾ بێگومان من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی ئەمیندار (ڕاست و ساغ)م ﴿١٤٣﴾ بۆیە پارێز لە خوا بکەن و، بە قسەم بکەن ﴿١٤٤﴾ هیچ کرێشتان لەبەرانبەریدا لێ داواناکەم، پاداشتم تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە ﴿١٤٥﴾ ئایا (پێتان وایە) لێرە (لەم نازو نیعمەتەدا) وازتان لێ بهێنرێ و، هەروا هێمن و بێ ترس بیگوزەرێنن؟ ﴿١٤٦﴾ لە نێو باخ و کانیی و سەرچاواندا ﴿١٤٧﴾ لە نێو کشتوکاڵ و دارو خورمایانێکی بەرومیوە گەیوو نەرمدا ﴿١٤٨﴾ هەروەها کارامانەو شادمانانە خانووان لە چیایان دادەتاشن ﴿١٤٩﴾ دەجا پارێز لە خوا بکەن و، بە قسەم بکەن و ﴿١٥٠﴾ بە قسەی زێدەڕۆییکاران مەکەن ﴿١٥١﴾ ئەوانەی تێکدان و خراپەکاریی لە زەویدا دەکەن و چاکسازیی ناکەن ﴿١٥٢﴾ (گەلەکەی) گوتیان: بێگومان تۆ تەنیا لە زۆر جادوولێکراوانی ﴿١٥٣﴾ تۆ تەنیا مرۆڤێکی وەک ئێمەی و، ئەگەر لە ڕاستانی، نیشانەیەکمان بۆ بێنە ﴿١٥٤﴾ (صاڵح) گوتی: ئەمە حوشترێکە (وەک بەڵگەو نیشانە) ئەو بەش و نۆرە ئاوی خۆی هەیە (لەسەرچاوەکەو) ئێوەش بەش و نۆرە ئاوی ڕۆژێکی زانراوتان هەیە (نۆرە بڕیی لێ مەکەن) ﴿١٥٥﴾ نەچن بەخراپە دەستی بگەیەنێ (زیانی لێبدەن) ئەگەرنا سزای ڕۆژێکی مەزن دەتانگرێ ﴿١٥٦﴾ (کەچی) سەریان بڕی و پەییان کردو، هەر زووش پاش هاتنی سزا، پەشێمان بوونەوە ﴿١٥٧﴾ ئیدی ئازارو سزا گرتنی، بێگومان لەوەدا نیشانەیەکی گەورە هەیە، بەڵام زۆربەیان بڕوادار نەبوون ﴿١٥٨﴾ تەنیا پەروەردگاریشت زاڵی میهرەبانە ﴿١٥٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(طَلۡعُهَا ): (طَلْع) بەو کیفە دەگوترێ کە هێشووە خورمای تێدایە.

(هَضِيمٞ ): (الهَضِيمُ: شَدْخٌ مَا فِيهِ رَخَاوَةٌ أي: دَاخَلَ بَعْضُهُ فِي بَعْضٍ كَأَنَّمَا شُدِخَ)، (هَضِيم) شتێك كە نەرمییەكی تێدا بێ و بكوترێ، واتە: ئەوە كە خورمایەكە چووبێتەوە نێو یەك، وەك كوترابێ، ئاوا نەرم و خۆش بێ.

(فَٰرِهِينَ ): (الفَرِهُ: الأَشِرُ، أي: حَاذِقِينَ، وَجَمْعُهُ فُرَّه)، (فَرِهُ) یانی: زۆر بە كارامەیی، (فَرِهِين) بە مانای (أَشِرِين)یش هاتوە، واتە: زۆر لە خۆبایی بووانە.

(ٱلۡمُسَحَّرِينَ ): (المَسْحورينَ بِقُوَّة) ئەوانەی كە زۆر بەهێز جادوویان لێكراوە، هەندێكیش گوتوویانە: (مَنْ جُعِلَ لَهُ سَحَرٌ تَنْبِيهاً أَنَّهُ مُحْتاجٌ إلى الغِذاء) (سَحَر) بە مانای گەدە دێ، (مُسَحُّرين) واتە: تۆش یەكێكی لەوانەی پێویستت بەخواردنە، تۆش یەكێكی لەوانەی گەدەت هەیە.

بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو مانایە بێهێزە، (مُسَحَّرين) یانی تۆش یەكێكی لەوانەی كە بەشێوەیەكی بەهێز جادوویان لێكراوە.

(شِرۡبٞ ): (الشُّرْبُ: النَّصِيبُ مِنَ الشَّراب)، (شرب) واتە: پشك و بەش لە خواردنەوە، یاخود بە مانای نۆرە خواردنەوە دێ.

( فَعَقَرُوهَا): واتە: سەریان بڕی، دەگوترێ: (عَقَرْتُ النَّخْلَ: قَطَعْتُهُ مِنْ أَصْلِهِ) واتە: لە ڕیشەوە بڕیم، (وَعَقَرْت البَعيرَ: نَحَرْتُه، أو قَطَعْتُ قَوائِمَهُ، أَسْقَطْتُهُ عَلَى الأَرْض) حوشترەكەم عەقر كرد، یانی: سەرم بڕی، یاخود چوار پەلەكەیم بڕی و، كەوتە سەر زەوی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئێمە بەسەرهاتی صاڵح و گەلەکەی (ثمود)مان لە تەفسیری سوورەتی (الحجر) دا بە درێژیی باس کردوە، ئایەتەکانی: (٨٠ - ٨٤)، بۆیەش ئەوێمان هەڵبژارد بۆ خستنە ڕووی بەسەرهاتی صاڵح ﷺ و گەلەکەی (ثمود)، چونکە لە هەموو قورئان دا تەنیا لەوێ بە ناوی شوێنەکەیانەوە ناونراوە، بۆیە لێرەدا بە خێرایی بەسەریدا دەڕۆین:

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ الْمُرْسَلِينَ ﴾، گەلی (ثمود) پێغەمبەرانیان بەردۆ دانا، پێیان بڕوا بوون ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك صاڵحی برایان، [لەڕووی ڕەچەڵەکی نەتەوەیی و نەژادییەوە] پێیگوتن: ئایا پارێز ناکەن؟ واتە: پارێز ناکەن لە سزای خوا، یان: پارێز ناکەن لەوەی بەڵاتان بەسەر بێ پارێز ناکەن لە خوا، یان: لەڕۆژی دوایی ﴿ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، بە دڵنیایی من بۆ ئێوە ڕەوانە کراوێکی ئەمینمدارم، ڕاست و دڵسۆزم بۆتان، ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، ئنجا پارێز لە خوا بکەن و، بە قسەم بکەن، فەرمانبەریی و گوێڕایەڵییم بکەن، ﴿ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، لەسەر گەیاندنی پەیامی خواش پێتان، هیچ کرێیەکتان لێ داوا لێ ناکەم، پاداشت و کرێی من، تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە.

ئنجا هەندێ لە نیعمەتەکانی خوایان دەخاتە بەرچاو: ﴿ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ ﴾، ئایا لێرەدا وازتان لێ دەهێنرێ، وا بە هێمنیی و ئارامیی، بەبێ ئەوەی حیساب بۆ خواو بۆ خەڵك بکەن، ﴿ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴾، لە چەند باخ و بێستانێك و، لەچەند کانیی و سەرچاوەیەکی زۆر بەرچاوو ڕەونەقدارا، ﴿ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴾، هەروەها لەنێو کشت و کاڵ و دارخورمایان دا، کە

بەرەکـەی زۆر نـەرم و خۆشـە، بـە لێـوان دەخـورێ. ﴿ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴾، عادەتیشـتان وایـە لـە چیایـەکان، خانـووان دادەتاشـن زۆر بـە خۆشـحاڵیی و بـە شـادمانیی، یاخـود: زۆر بـە کارامەیـی و لێزانیـی، ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، ئنجا پارێـز لـە خـوا بکـەن و فەرمانبەریـم بکـەن، بـە قسـەم بکـەن.

﴿ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴾، گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی ستەمکارانێك مەکـەن، کـە تێکـدان لـە زەوییـدا دەکـەن و، هەرگیـز عادەتیـان نیـە چاکسـازیی بکـەن.

مەبەسـت پێـی ئـەو حوکمڕانـە خۆسـەپێن و گەنـدەڵ و مشـەخۆرانەن، کـە لەسـەر حیسـابی خەڵکـی ڕەش و ڕووت دەژیـن و، دەسـتیان گرتـوە بەسـەر موقـەددەرات و سـامانی وڵاتـدا.

کەواتـە: ئـەوە تەنیـا ئێسـتا نەبـووە، بەڵکـو عادەتـی سـەرجەم حوکمڕانـە خۆسـەپێن و ملهـوڕو حیسـاب بۆ خـوا نەکەرەکان هـەروا بـووە. ﴿ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴾، گوتیـان: بـە دڵنیایـی تـۆ لەوانـەی، کـە زۆر جـادووت لێکـراوەو تێکچـووی، ﴿ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾، وێـڕای ئـەوەی تـۆ جـادووت لێکـراوەو عەقـڵ و هۆشـت لـە جێـی خـۆی نەمـاوە، بۆیـە ئـەو قسـانە دەکـەی کـە زۆر سـەیرو عەجایـبن و، پێچەوانـەی کلتـوورو فەرهەنگـی ئێمـەن، وێـڕای ئـەوەش، تـۆ بـەس مرۆڤێکـی وەك ئێمـەی، ﴿ فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، ئنجـا نیشـانەیەکمان بـۆ بێنـە لەسـەر ڕاسـتیی خـۆت، ئەگـەر لـە ڕاسـتانی.

﴿ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴾، (صالـح عليه السلام) فەرمـووی: ئەمـە حوشـترێکە ئـەو بەشـە ئـاوی خـۆی هەیـە، ئێـوەش نـۆرە ئـاوی خۆتـان و بەشـی خۆتـان هەیـە، لـە ڕۆژێکـی زانـراودا، نـۆرە بڕیـی لـێ مەکـەن.

حوشـترەکە زۆر گـەورە بـووەو، خەڵکـی شـارەکە هەمـووی شـیریان لـێ دۆشـیوە، بـەڵام یـەك ڕۆژیـش بـە تەنـێ، ئـاوی کانییەکـەی هەمـوو خواردۆتـەوە، دوایـی

ڕۆژێکی دیکەش، خەڵکەکە ئاویان لە کانیەکە هەڵێنجاوە، تەنیا یەك کانییان هەبووە، واتە: نۆرە بڕیی لێ مەکەن، ئاوەکەش کە دەخواتەوە هەر بۆخۆتانە، دوایی دەیکات بە شیرو لێی دەدۆشن.

﴿ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴾، بە خراپەش دەستی مەگەیەننێ، ئەگەرنا سزای ڕۆژێکی مەزن دەتانگرێ و تووشتان دەبێ.

﴿ فَعَقَرُوهَا فَأَصۡبَحُواْ نَٰدِمِينَ ﴾، کەچی سەریان بڕی، یاخود چوار پەلیان بڕی ﴿ فَأَصۡبَحُواْ نَٰدِمِينَ ﴾، هەر یەکسەریش پەشێمان بوونەوە، لە ئەنجامی ئەوکارەیان پەشێمان بوونەوە ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُ ﴾، یەکسەر سزاو ئازار گرتنی ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا، نیشانە هەیە، بەڵگە هەیە لەسەر ڕاستیی پەیامی خوا، لەسەر ڕاستیی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، لەسەر ئەوە کە خوا ئەم دنیایەی نەکردوە بەشاری بێ خاوەن و، لە مرۆڤەکان دەپێچێتەوە، ﴿ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ بەڵام زۆربەیان بڕوادار نەبوون، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیایی تەنیا پەروەردگارت زۆر باڵادەستی میهرەبانە، باڵادەستە بەرانبەر بە ناحەزانی و، لەسەر کەسانێك کە ئازاری دۆستەکانی دەدەن، هەروەها بە بەزەیی و بەپەرۆشە لەگەڵ دۆستەکانی دا.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**بەدرۆ دانانی گەلی ثەموود بۆ سەرجەم پێغەمبەران، دوای ڕەوانە كرانی صاڵح بۆلایان و، گەیاندنی پەیامی خوا پێیان و، ئامۆژگاریی كردنیان كە پارێز لەخوا بكەن و، بەقسەی بكەن و، هیچ تەماعێكی تێیاندا نیەو، كاری خۆیانی پێیانە نەك كاری خۆی! هەروەها هۆشداریی پێدانیان كە ناگونجێ هەروا لەو نێو نازو نیعمەتەدا، كە لێی بەهرەمەندن، وازیان لێ بهێنرێ: باخ و كانیی و كشتوكاڵ و خورمای گەیوو خانووبەرەی لە چیا داتاشراو ... هتد، بۆیە دەبێ بە هۆی بەقسە كردنی زێدەڕۆییكارانەوە، تێكدان لە زەویدا نەكەن و خراپەكاریی نەكەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾.

### توێژینەوەی ئەو ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، ثەموود پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانا، ثەموود گەلی صاڵحن، ئەوانەش عەشیرەتێك بوون، كۆمەڵێك بوون، بۆیە وشەی: ﴿ كَذَّبَتْ ﴾ یان بۆ بەكارهێنراوە لەبەر ئەوەی كۆمەڵ بوون و، (كُلُّ جَمْعٍ مُؤَنَّث)، یاخود لەبەر ئەوەی

بێژەی (جَماعَة) یان (أمة) یان تێدا ڕەچاو کراوە، بۆیە ڕاناوی مێینەیان بۆ بەکارهێنراوە.

پێشتریش گوتمان:

**یەك:** هەر کام لە گەلە کافرەکان کە پێغەمبەرانیان بەدرۆ داناوەو، بڕوایان پێ نەهێناون، لەبەر شەخسی پێغەمبەرەکە نەبووە، بەڵکو لەبەر پەیامەکەی بووەو، پەیامی هەموو پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام)، لە هێڵە گشتییەکانیدا و، لە نێوەڕۆکیدا، یەکە، کە بریتیە لەوەی تەنیا خوا بەدیهێنەرو خاوەنی مشوورخۆری گەردون و ژیان و مرۆڤەو، دەبێ بەس ئەو بەندایەتیی بۆ بکرێ و بپەرسترێ.

**دوو:** پاشان پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نوێنەری خوان و، پەیامی خوایان هێناوە، بۆیە دەبێ گوێڕایەڵییان بکرێ و فەرمانبەرییان بکرێ و، پەیڕەویی لەو پەیام و بەرنامەیە بکرێ، کە هێناویانە.

**سێ:** ڕۆژێك دێ، قۆناغێکی دیکە دێ، کە مرۆڤ لەسەر ئەم ژیانی دنیایەی لێ دەپرسرێتەوەو لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێ، سزاو پاداشتێك کە لە ڕۆژی دوایی دا هەیە، وەریدەگرنەوە.

ئەم سێ بنچینەیە جەوهەرو نێوەڕۆکی پەیامی هەموو پێغەمبەرانیان (علیهم الصلاة والسلام) پێك هێناوە، ئنجا هەر کۆمەڵگایەك و گەل و نەتەوەیەك، بڕوای بە هەرکام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نەهێنابێ، لەبەر ئەو سێ ئەصڵە بووە:

١- خوا بەیەکگرتن،

٢- پێغەمبەرایەتیی و وەحیی،

٣- ئیمان هێنان بەڕۆژی دوایی، بەرنامەی هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر وابووە، بۆیە هەر یەکێك لەو گەل و نەتەوانە بڕوای بە یەکێك لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نەهێنابێ، مانای وایە بڕوای بە هەموویان نەهێناوە، بڕوای بەهیچ کامیان نەهێناوە.

دوایی خوا ﷻ بۆمان باس دەكات و دەفەرمویّ:

٢)- ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، یاد بكەوە! كاتێك صاڵحی برایان پێی گوتن: ئایا پارێز ناكەن؟ هەڵبەتە صاڵح هەر لە گەلی ثەموود بووەو، لە ڕووی ڕەچەڵەك و نەتەوەوە، برایان بووە، یاخود: ئەو پێغەمبەرانە، ئەگەر لەڕووی ڕەچەڵەكیشەوە، برای نەتەوەكانی خۆیان نەبووبن، برای ئینسانیيانن، بۆیە وشەی: برایان ﴿ أَخُوهُمْ ﴾یان بۆ بەكاردێنێ، ﴿ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾ ئایا پارێز ناكەن، واتە: ئایا پارێز لە خوا ناكەن؟ یاخود: ئایا پارێز لەوە ناكەن كە تووشی سزای خوا بن؟ یاخود: ئایا خۆتان لەوە ناپارێزن كە لادان نەكەن و، لانەدەن لە ڕاستە شەقامی خوا، كە بە پێی زگماك و خۆڕسكی خۆتان و، بە پێی عەقڵی سەلیمی خۆشتانە، بۆ ئەوە تووشی ئەو باج و دەرهاویشتە خراپانە نەبن، كە بە هۆی لادان لە شەریعەتی خواوە، بەسەرتان دێن، ڕستەی: ﴿ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾ لەبەر ئەوەی بەركار (مَفْعول بِه)ەكەی قرتێنراوە، دەگونجێ هەموو ئەو شتانەو زۆر شتی دیكەشی بۆ مەزەندە بكرێن.

٣)- ﴿ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، بە دڵنیایی من بۆ ئێوە ڕەوانەكراوێكی ئەمیندارم، واتە: ڕاست و ساغم و بۆتان دڵسۆزم.

٤)- ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، كەواتە: پارێز لە خوا بكەن و بە قسەم بكەن، فەرمانبەریيم بكەن، كە بێگومان پارێز لە خوا كردن، لەمیانی بەقسە كردنی پێغەمبەرەوەو ﷺ پەیڕەویی لێ كردنیەوەو، شوێنكەوتنیەوە، دێتە دی، چونكە پێغەمبەرانن ﷺ كە مرۆڤەكان فێردەكەن: چۆن پارێز لە خوا بكەن و، خوای پەروەردگار دەبێ چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ؟ پارێز لە خوا كردنیش وەك زۆرجار گوتوومانە: لە دوو شتدا خولاصە دەبێتەوە:

أ/ فەرمانەكانی خوا جێبەجێ بكرێن.

ب/ قەدەغە كراوەكانی خوا دووریيان لێ بكرێ.

ئنجا دوایی بۆ ئەوەی ئەوە نەکەنە بیانوو، کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ بارگرانیی خستۆتە سەریان، ئەرکێکی خستۆتە سەر شانیان، دەفەرموێ:

٥)- ﴿ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍ ﴾، هیچ جۆرە کرێیەکتان لێ داواناکەم، هیچ چاوەڕوانییەکم لێتان نیە.

٦)- ﴿ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، پاداشتی من، کرێی من تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە، واتە: ئەگەر بۆیە بڕوا ناهێنن، پێتان وایە من کارێکی خۆمم بە ئێوەیە، مەدارێکی خۆم بەئێوە ساز دەکەم، نەخێر وانیە، بەڵکو من کاری خۆتانم بە خۆتانەو، پاداشتی من، چاوەڕوانیی من، تەنیا لە خوایە ﷻ، کە وەك پێشتر باسمان کرد: ئەمە خاڵێکی یەکجار گرنگە بۆ هەموو ئەوانەی خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکەن، ئەو ترس و وەهمەیان لە پێش چاو بڕەوێننەوە، کە ئەوانیش وەك ئەو تاغووت و حوکمڕانە خۆسەپێن و دیکتاتۆرو قۆرخکارو گەندەڵانە نین، کە هەموو شتێکیان دەخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوەو، خۆشیان دەکەنە کۆیلەو دەست بەسەر موقەددەرات و خێرو بێری وڵاتیشیان دا دەگرن، نەخێر، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەپێچەوانەوە: نەك خەڵك ناکەنە کۆیلە، بەڵکو ئازادیان دەکەن و، زنجیرو کۆت و پێوەندی دەست و پێ و گەردنیان دەپچڕێنن، ﴿ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ ﴿١٥٧﴾ ﴾الأعراف.

پێغەمبەران هاتوون خەڵك ئازاد بکەن، نەك هەر نەیانکەنە کۆیلە، بەڵکو کۆت و زنجیری دەست و پێ و گەردنیان بپچڕێنن و ئازاد بن بەمانای وشەو تەنیا بەندەی خوابن، پاشان ئازو نیعمەتەکانیش کە خوا دایناون لە زەویدا، هەموویان بەیەکسانیی لێیان بەهرەمەند بن و کەس قۆرخیان نەکات و، هیچ کەس دەست بەسەر هیچ شتێکدا نەگرێ، چونکە خوا هەموو نیعمەتەکانی بۆ هەموو مرۆڤەکان ڕەخساندوون و، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەس بە قەدەر ئەوانیان بەش پێ دەبڕێ.

دوایی صاڵح ڕەخنە دەگرێ لەگەڵی ثەموود، چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نەهاتوون موجامەلەی خەڵك بکەن، نەهاتوون تەنیا هەست و نەستی

خەڵـك بجووڵێنـن، یاخـود خەڵـك چییـان پـێ خۆشـە، ئەوەیـان پـێ بڵێـن، بەڵكـو خەڵـك چییـان بـۆ چاكـە، وایـان بـە خەڵـك گوتـوە، ڕاسـتیی و سـاغیی لەگـەڵ خەڵكـدا، ئەوەیـە خەڵـك چـی بـۆ چاكـە بـۆ دنیـاو دوارۆژی، ئـەوەی پـێ بڵێـی، نـەك چـی پێخۆشـە، نابـێ بـەدوای ئارەزووەكانـی خەڵـك بكـەوی، وەك حوكمڕانـە خۆسـەپێن و دیكتاتـۆرو خـۆ بەپـەروەردگارو خـۆ بەپەرسـتراو زانـەكان، بـە درێژایـی مێژوو وایانكـردوە، هەوڵیـان داوە لـە ڕێـی جووڵاندنـی غەریـزەكان و تێركردنـی غەریزەكانـەوە، بەشـێوەی ناشـەرعیی، خەڵـك بـە دوای خۆیـان بخـەن، پێغەمبـەران (علیهـم الصلاة والسلام) هاتـوون خەڵـك فێـر بكـەن، غەریزەكانـی خۆیـان حـەزو ئـارەزووە ناشـەرعییەكانی خۆیـان كـپ بكـەن و، خۆیـان كۆنتـرۆڵ بكـەن، كارێـك بكـەن كـە بەقازانجـی دنیـاو دوارۆژیـان تـەواو بـێ، بەقازانجـی ڕووح و جەسـتەیان تـەواو بـێ، نـەك ڕووحیـان بكەنـە كۆیلـەی ئـارەزووە جەسـتەییەكانیان، بۆیـە صاڵـح دەفەرمـوێ:

٧)- ﴿ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَا آمِنِينَ ﴾، ئایا ئا لێرەدا وا بە ئارامیی و هێمنیی وازتان لێ دەهێنرێ، ﴿ هَٰهُنَا ﴾، یانی: لێرە لەم وڵاتەدا، ﴿ آمِنِينَ ﴾ واتە: بە هێمنیی و ئارامیی، كە بەهرەمەند بن لە هێمنیی و ئاساییش، چونكە گەورەترین نیعمەت و یەكەمین نیعمەت، بریتیە لە نیعمەتی هێمنیی و ئاساییش، هەر گەل و وڵاتێك هێمنیی و ئاساییشی تێدا سەقامگیر نەبێ، نە لە ڕووی سیاسییەوە، نە لە ڕووی ئابوورییەوە، نە لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە، نە لە ڕووی فیكرییەوە، ناتوانێ گەشە بكات و بەردەوام بێ.

٨)- ﴿ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴾، ئایا لێرە وازتان لێ دەهێنرێ بەهێمنیی و ئاساییشی بێگوزەرێنن، لە نێو باخ و بێستانەكانداو لە نێو كانیی و سەرچاوەكاندا، (جَنَّات) كۆی (جَنَّة)یە، یانی: باخ، (عُیون) كۆی (عَیْن) واتە: كانیی و سەرچاوە.

٩)- ﴿ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴾، هەروەها لە نێو كشت و كاڵ و دارخورمایانی میوە گەیودا، (زُرُوع) كۆی (زَرْع)، یانی: كشتوكاڵ، (نَخْل) ناوی جینسە بۆ (نَخْلة) و مانای كۆ دەگەیەنێ، واتە: لە نێو دارخورمایەكاندا، ﴿ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴾ واتە: بەرەكەی زۆر نەرم و گەییوە، وەك كوردەواریی دەڵێن: بە لێوان دەخورێ.

١٠)- ﴿ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴾، لە چیایەکانیشدا خانووان دادەتاشن زۆر بە دڵخۆشیی و، شادمانیی، یاخود زۆر بە کارامەیی و لێزانیی، ﴿ فَٰرِهِينَ ﴾ وەك پێشتر گوتمان:

ئەگەر (فَرِهِين) بێ و لە (فَرَه)ەوە هاتبێ، یانی: (الأَشَر) واتە: شانازیی بەخۆوە کردن و لەخۆبایی بوون، دەشگونجێ (فارِهِين) بێ و کۆی (فارِهٌ) بێ، یانی: (حاذِق) واتە: زۆر بەلێزانیی و کارامەیی، کە (فارِه) ئەو کاتە (إسم الفاعل)ەو کۆیەکەی دەبێتە (فُرَّه).

دەربارەی وشەی (طَلْع) کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴾، (طَلْع) لێرەدا مەبەستی پێ میوەکەیە، بەڵام (طَلْع) لە ئەصڵی زمانی عەرەبییدا: (**الطَّلْعُ: وِعَاءٌ يَطْلَعُ مِنَ النَّخْلِ، فِيهِ ثَمَرُ النَّخْلَةِ فِي أَوَّلِ أَطْوَارِهِ، يَخْرُجُ كَنَصْلِ السَّيفِ فِي باطِنِه شَمَارِيخُ القِنْوِ، وَيُسَمَّى الطَّلْعُ «رَكْم»، ثُمَّ يَنفلِق ذلِك الوِعَاءُ عَنِ الشَّمَارِيخِ، وَهِي الأَغْصانُ الَّتي فيها الثَّمر كَحَبٍّ صَغيرٍ، ثُمَّ يَغلُظ وَيَصير بُسْراً ثُمَّ تَمراً**)[1].

واتە: (طَلْع) بریتیە لەو کیفەی کە یەکەمجار لە دارخورما دەردەچێ، کە پێی دەگات، پێشێ وەك نووکی شمشێر وایە، کە هێشووەکانی (یاخود ئەو لقانەی دوایی دەبنە هێشووی دارخورما تێیدان)و (رَكم)یشی پێ دەگوترێ، دوایی ئەو کیفە دەپشکوێ، شەمراخەکانی لێ دێنەدەر، کە بریتین لە لقەکانی و میوەکەیان تێدایە، پێشێ وەك دەنکی بچووك بچووکن، دوایی وردە وردە گەورە دەبێ و، دەبێتە فەریکە خورما، دواییش دەبێتە خورمای تەواو.

کەواتە: (طَلْع) یانی: ئەو کیفەی، هێشووە خورمای تێدایە، بەڵام مەبەست پێی ئەوەیە لە نێو کیفەکەدایە، کە خورمایەکەیەو نەرم و خۆشە.

﴿ بُيُوتًا ﴾ وەك زۆر جاری دیکە گوتوومانە: بە: (بُيُوت) خوێنراوەتەوە، بە بۆر (ضَم)ی (ب)یەکە، هەروەها بە (بِيوت) بە ژێر (کسرة)ی (ب)یەکەش

---

(١) التحرير والتنوير، ج١٩، ص١٧٥.

خوێنراوەتــەوە.

١١)- ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، جارێکی دیکە صالح عليه السلام دووبارەی دەکاتەوە، دەڵێ: پارێز لە خوا بکەن و، بە قسەی من بکەن.

١٢)- ﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾، بە قسەی زێدەڕۆییکاران مەکەن فەرمانی زێدەڕۆییکاران جێبەجێ مەکەن، کێ بوون ئەو زێدەڕۆییکارانە؟ دیارە گەورەکانیان و بڕیار بە دەستەکانیان بوون.

١٣)- ﴿ ٱلَّذِينَ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾: ئەوانەی خراپەکاریی دەکەن لە زەویدا، واتە: لە وڵاتدا، ئەو وڵاتە کە گەلی ثەموودی تێدا بووەو چاکسازیی ناکەن، یانی: هێندە خراپەکارن خراپەکارییەکەیان هیچ چاکەی تێدانیە.

بــە تەئکیــد لێــرەدا کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾، یانــی: (ولا تُطيعوُا أَمْرَ كُبَرائِكُم المُسْرِفين) فەرمانبەریــی گەورەکانتــان کــە زێدەڕۆیــکارن، مەکەن، هەمیشــە هــەر ئــەو حوکمڕانــە خۆســەپێنانەی خەڵــك و وڵات (عباد وبلاد ) دەخەنــە ژێــر ڕکێفــی خۆیانــەوەو، نــازو نیعمەتــەکان دەخەنــە ژێــر دەســتی خۆیــان، ئەوانــەن کــە زێدەڕۆیــی دەکــەن و، زۆر بــە کەیــف و کــووف و بــە خۆشــگوزەرانانە دەژیــن، لەســەر حیســابی خەڵکــی ڕەش و ڕووت و، هــەژار خســتنی خەڵــك و جەمــاوەر.

بــەو شــێوەیە صاڵــح عليه السلام پەیامــی خــوای پەروەردگاریــان پێدەگەیەنــێ و، زیاتــر لــە ڕووی ئابووریــی و سیاســیەوەو لــەڕووی کۆمەڵایەتییــەوە، ڕەخنەیــان لــێ دەگــرێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**تۆمەتبار کردنی گەلی ثەموود بۆ صالح، کە جادوویەکی قورسی لێکراوەو، بۆیە حاڵی عەقڵی تێکچووەو، تەنیا مرۆڤێکی وەك خۆشیانەو، ئەگەر ڕاست دەکات، با نیشانەیەك بێنێ بۆ ئیسپاتی دەعوایەکەی، خواش حوشترێکی سەرسوڕهێنەری پێدا، کە گەلی ثەموود و حوشترەکە، بە نۆرە ئاو لەسەرچاوەکەیان بخۆنەوەو، هۆشداریی پێدانی صالح کە زیانی پێ نەگەیەنن، ئەگەرنا تووشی سزا دەبن، کەچی سەربڕینی و پاشان سزادرانیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ۝١٥٣ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا فَأۡتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝١٥٤ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٞ لَّهَا شِرۡبٞ وَلَكُمۡ شِرۡبُ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ۝١٥٥ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ۝١٥٦ فَعَقَرُوهَا فَأَصۡبَحُواْ نَٰدِمِينَ ۝١٥٧ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ۝١٥٨ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ۝١٥٩ ﴾.

**توێژینەوەی ئەم حەوت ئایەتە، لە سێزدە بڕگەدا:**

دوای ئەوەی صالح بەو شێوەیە پەیامی خوای پێ ڕاگەیاندن و زۆر بەڕوون و ڕاشکاویی، دەستی خستە سەر عەیب و کەم و کوڕییەکانیان بەبێ موجامەلە کردن، بەبێ خاتر گرتن، بەڵکو دڵسۆزانەو ڕوون و ڕاشکاوانە، ئاوا وەڵامیان دایەوە:

١)- ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ﴾، گەلی ثەموود گوتیان: بەدڵنیایی تۆ تەنیا لە جادوو لێکراوانی، (مُسَحَّر) یانی: زۆر جادوو لێ کراو، لەشوێنی دیکەدا هاتوە: (المَسْحورين) واتە: جادوولێکراوان، بەڵام ﴿ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ﴾: (زِيَادَةُ المَبْنى تَدُلُّ عَلى زِيادَةِ المَعْنى) واتە: زۆر جادووت لێکراوە، جادووێکی زۆر بێڕەزاو سەختت لێکراوە،

ئامۆژگاریی و دڵسۆزییەکەی صاڵحیان، بەبوختان پێکردن و تۆمەت بۆ هەڵبەستن وەڵام دایەوە، کە عەقڵی تێکچووەو جادووی لێکراوە!

٢)- ﴿ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾: ئەمەش ڕەخنەی دووەمە کە لێی دەگرن، دەڵێن: تۆ تەنیا مرۆڤێکی وەك ئێمەی، وەك مرۆڤبوون عەیب و ڕەخنەیەك بێ کە لە صاڵحدا هەیە، ئەوانە چونکە لە ڕوانگەی بووناسیی مادديی و بە ئاژەڵ تەماشا کردنی مرۆڤەوە، تەماشای مرۆڤیان کردوە، مرۆڤیان پێ شایستەی ئەوە نەبووە، نوێنەری خواو پێغەمبەری خوا بێ، یان مەبەستیان ئەوە بووە تۆش هەر مرۆڤێکی وەك ئێمەی، بۆیە وەك چۆن جادوو لێکردن کاریگەریی نەرێنیی لەسەر ئێمە دادەنێ، لەسەر تۆشی دادەنێ.

٣)- ﴿ فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾، ئنجا ئەگەر لە ڕاستانی نیشانەیەك بێنە، موعجیزەیەك بێنە، بیسەلمێنێ تۆ پێغەمبەری خوای، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- ئەگەر تۆ لەو پێغەمبەرانەی کە بەڕاستیی پێغەمبەر بوون، کە هەموویان موعجیزەیان بووە، تۆش موعجیزەیەك بێنە.

ب- مەبەست ئەوە نیە کە ویستبێتیان دان بە پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرانی پێشوودا بێنن، بەڵکو یانی: ئەگەر تۆ ڕاست دەکەی پێغەمبەرو ڕەوانە کراوی خوای، بەڵگەیەکمان بۆ بێنە، نیشانەیەکمان بۆ بێنە.

٤)- ﴿ قَالَ هَـٰذِهِۦ نَاقَةٌ ﴾، (صاڵح) فەرمووی: ئەمە حوشترێکە، ئێمە پێشتر ئاماژەمان پێدا لە کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (الحجر)دا، هەروەها لە کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (الأعراف)یشدا، بەسەرهاتی گەلی ثەموودو صاڵحی برایانمان بە درێژیی باس کردوە، کە ئەو حوشترە چۆن پەیدا بووە؟ لەچیایەك هاتۆتە دەرێ، چیایەکە ژانی گرتووەو حوشترەکەی لێ هاتۆتە دەرێ و، بەچکەیەکیشی لەگەڵیدا بووە، ئنجا لەبەر ئەوەی لەوێ وردەکارییەکەیمان باس کردوەو، لێرەش خوای پەروەردگار بەکورتیی باسیکردوە، ئێمەش خوا ﷻ لێرەدا چۆنی باسکردوە، هەر ئەوەندەی باسدەکەین.

یانی: ئەمە حوشترێکی تایبەتە، لە حوشتری دیکە پەیدا نەبووە، لە پارچە چیایەك هاتۆتە دەرێ، بەچکەیەکیشی لەگەڵدایە، دەبێ حوشترێکی زۆر گەورە بووبێ، چونکە بەشی هەموو گەلی ثەموود شیری تێدا بووە.

٥)- ﴿ لَّهَا شِرۡبٌ وَلَكُمۡ شِرۡبُ يَوۡمٍ مَّعۡلُومٍ ﴾، حوشترەکە ئەندازەیەك لەناو خواردنەوەی خۆی هەیە، یاخود نۆرە ئاوی هەیە، (شِرْب: نَوبَةُ الماءِ، النَّصيب من الماء)، (شِرْب) دەگونجێ بە مانای نۆرە ئاو بێ، یاخود: یانی: پشك و بەشە ئاوی خۆی هەیە، ئێوەش پشك و بەشی ئاوی خۆتان هەیە، ئەو نۆرە ئاوی خۆی هەیە، ئێوەش نۆرە ئاوی خۆتان هەیە، وەك لە کات و شوێنی خۆی دا باسمان کردوە، گەلی ثەموود کانیی و سەرچاوەیەکی گەورەیان هەبووە، ئەو حوشترەش زۆر گەورە بووە، ڕۆژێك تایبەت بووە بە حوشترەکە، کە ئاوی لێ بخواتەوە، ڕۆژی دووەمیش خەڵکەکە ئاویان لە کانیی و سەرچاوەکە هەڵێنجاوە، ئنجا ئەو ڕۆژە کە حوشترەکە ئاوی لەکانیی و سەرچاوەکە خواردۆتەوە، لە بەرانبەر ئەوەدا بووە کە خەڵکەکەش هەمووی شیری ئەو حوشترە بدۆشن، بەشی هەموویان شیری تێدا بووە، واتە: ئاوی لێ خواردوونەوە، بەڵام شیری پێداون و زۆر قازانجیان بووە.

٦)- ﴿ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ ﴾، بەخراپەش دەستی مەگەیەنن، تەنانەت بەدەست گەیاندنیش بە نیازی زیان پێگەیاندن، دەستی مەگەیەنن، چ جای بیکوژن و لاقەکانی پەی بکەن!

٧)- ﴿ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴾، ئەگەرنا ئازاری ڕۆژێکی مەزن دەتانگرێ و تووشتان دێ.

کەچی ئەوان:

٨)- ﴿ فَعَقَرُوهَا ﴾ یەکسەر پەییان کردو سەریان بڕی. بە (ف)ی (تعقیب) هێناویەتی، ئەوەندە سەرپێچییکار بوون، هەر دوای ئامۆژگاریی و ڕێنماییەکەی صالح، یەکسەر سەریان بڕی، (عَقْر) بە مانای سەربڕین دێ بۆ حوشتر، بەڵام بۆ ڕەشە وڵاخ و مەڕو بزن دەگوترێ: (ذبْح)، یاخود (عَقْر) بە مانای چوار پەل بڕینە.

بەڵام دەگونجێ چوار پەلیشیان بڕیبێ و سەریشیان بڕیبێ.

٩)- ﴿ فَأَصْبَحُوا۟ نَـٰدِمِينَ ﴾، کەچی هەر زوو پەشێمان بوونەوە، زۆر بەخێرایی، ئەویشی بە (ف)ی بە دواداهاتن (التعقیب) هێناوە، واتە: زۆ ربەخێرایی پەشێمان بوونەوەو هێندەی پێنەچوو، سزایان بەملدا هات.

١٠)- ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ﴾، ئیدی سزاگرتنی، لە سوورەتی (الحجر)دا باسمان کردوە، کە ئەو سزایە بریتی بووە لە هاڕژن و چریکەیەکی زۆر گەورە، کە لە شوێنی دیکەدا بە (صاعِقة) هاتوە، واتە: بڵێسە ئاگرێك لە ئاسمانەوە، وەك لە سوورەتی (فصلت) دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَـٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَـٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ ﴾فصلت.

واتە: بەڵام گەلی ثەموود ڕێنماییمان کردن، کەچی ئەوان کوێرییان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد، بۆیە بڵێسەی ئازارێکی ڕیسواکەر گرتنی، بە هۆی ئەوەوە کە دەیانکردو، ئەوانەی بڕوایان هێنابوو و پارێزیان دەکرد، ئەوانەمان دەرباز کردن، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ﴾، یەکسەر ئازارگرتنی، لە شوێنەکانی دیکە باسی کردوە، کە ئەو ئازار و سزایە چی بووە، هاڕژن و چریکەیەك بووە، دوایی بۆتە بڵێسەیەك، لە سوورەتی (الشمس)دا دەفەرموێ: ﴿ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَـٰهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَـٰهَا ﴿١٥﴾ ﴾.

واتە: پێغەمبەری خوا (کە ساڵحە) پێی گوتن: ئەوە حوشتری خوایە! وریابن لە حوشتری خواو، نۆرە ئاوەکەی (ئاو خواردنەوەکەی) کەچی بە درۆیان داناو حوشترەکەیان پەی کرد، یاخود سەریان بڕی پەروەردگاریشیان بە هۆی گوناهەکانیانەوە زەوییەکەی لەبندا لەرزاندنەوە، [بە هۆی ئەو هاڕژن و چریکەیەوە کە بۆتە بڵێسەیەك، یان ئاگر پژێنێك، لەسەرێوە بۆیان دابەزیوە]، ئنجا زەوییەکەیانی تەختکردو ئەوانیشی لەگەڵ خاکدا یەکسان کرد، پەروەردگاریش لە سەرەنجامەکەی ناترسێ، [ترسی نیە لەوەی سزایان بداو تۆڵەیان لێ بکاتەوە].

١١)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ﴾، بە ڕاستیی لەوەدا، نیشانەیەكی مەزن و گەورە هەبوو.

١٢)- ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، ئەوانیش زۆربەیان بڕوادار نەبوون، ئەوان كێن؟

أ- گەلی ثەموود، كە بە تەئكید هەندێكیان بڕوایان هێناوە.

ب- یاخود: كافرەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ.

ج- یان بێبڕوایان بە گشتیی، زۆبەیان بڕوادار نین.

١٣)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیایی تەنیا پەروەردگاریشت، زۆر زاڵی میهرەبانی بەبەزەییە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە شازدە ئایەتان پێك دێ: (١٦٠ - ١٧٥) کە هەموویان بۆ باسکردنی بەسەرهاتی لووط و گەلەکەی تەرخانکراون، هەر لە دەستپێکەوە کە لووطیش وەك سەرجەم پێغەمبەرانی برای بە: ﴿ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٤﴾ ﴾، دەستپێکردوە.

پاشان هاتۆتە سەر ڕەخنە لێگرتنیان لەبارەی ئەو کارە قێزەونەی ئەو گەلە ڕەوشت نزمە پێی ناسراون، (نێربازیی) جووتبوونی پیاوانیان لەگەڵ یەکدی، هەتا سزادانی گەلەکەی بە هۆی وەرنەگرتنی پەیام و ئامۆژگاریی لووطو، بگرە هەڕەشەی دەرکردن و شاربەدەر لێکردنیشی.

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا لُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُمْ مِنَ الْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَرًا فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنْذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{گەلی لووط پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانان (بڕوایان پێنەهێنان) ﴿١٦٠﴾ یاد بکەوە! کاتێك لووطی برایان پێیگوتن: ئایا پارێز (لە خوا) ناکەن؟ ﴿١٦١﴾ بێگومان من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی ئەمیندار (ڕاست و ساغ)م ﴿١٦٢﴾ دەجا پارێز لە خوا بکەن و، بە قسەم بکەن ﴿١٦٣﴾ هیچ کرێیەکیشتان لە بەرانبەریدا لێ داوا ناکەم، پاداشتم بەس لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە ﴿١٦٤﴾ ئایا لە نێو جیهانییاندا (ئێوە) لەگەڵ نێرینان جووت دەبن! ﴿١٦٥﴾ ئەوەش کە پەروەردگارتان لە هاوسەرانتان بۆی دروستکردوون، وازی لێ دێنن! بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکی سنوورشکێنن ﴿١٦٦﴾ (گەلەکەی) گوتیان: ئەی لووط! ئەگەر وازنەهێنی، بە دڵنیایی لەدەرکراوان دەبی ﴿١٦٧﴾ گوتی: مسۆگەر من ڕقم لە کردەوە (نزم و دزێوە)کەتانە ﴿١٦٨﴾ پەروەردگارم! خۆم و نیزیکانم لە (سزای) ئەوەی دەیکەن، قوتارمان بکە ﴿١٦٩﴾ ئیدی خۆی و تێکڕای نیزیکانیمان دەرباز کرد ﴿١٧٠﴾ جگە لە پیرەژنێك لە فەوتاوان (بەجێماوان) ﴿١٧١﴾ دوایی ئەوانی دیکەمان فەوتاندن (تەفرو توونامان کردن) ﴿١٧٢﴾ بارانێکیشمان بەسەردا باراندن (لە قوڕی بەبەرد بوو) بارانی ترسێنراوان (ی بێباك) خراپترین باران بوو ﴿١٧٣﴾ بێگومان لەوەدا (کە باسکرا) نیشانەیەك (ی گەورە) هەیەو، زۆربەشیان بڕوادار نەبوون ﴿١٧٤﴾ بە دڵنیایی تەنیا پەروەردگاریشت زاڵی میهرەبانە ﴿١٧٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلذُّكۡرَانَ ): (ذُكُور: جَمْعُ ذَكَر، وَإنَاث جَمْعُ أُنثَى) (ذُكْرَان) و (ذُكُور) هەردووكيان كۆی (ذَكَر)ن، (ذَكَر) یانی: نێرینە، پیاو، یان كوڕ، (إنَاث)یش كۆی (أُنثَى)یە، واتە: مێینە، ئافرەت، ژن یان كچ.

(ٱلۡقَالِينَ ): (القِلَى: شِدَّةُ البُغض، قَلاَهُ، يَقْلِيهِ، ويَقْلُهُ قِلاً ) (قِلَى) بریتیە لە ڕق لێبوونەوەیەكی زۆر، دەگوترێ: (قَلاَهُ، يَقْلِيهِ، ويَقْلُهُ قِلاً) واتە: ڕقی لێبوّوە، ڕقی لێ دەبێتەوە، بە ڕق لێبوونەوەیەكی زۆر، واتە: من ڕقم زۆر لە كردەوەكەتان هەڵدەستێ، نەك لە خودی خۆتان وەك مرۆڤ.

(عَجُوزٗا ): (العَجُوزُ: سُمِّيَتْ لِعَجْزِهَا فِي كَثيرٍ مِنَ الأُمور) (عَجوز) یانی: پیرەژن، بۆچی پیرەژن، یان پیرە پیاو، ئەو وشەیان بۆ بەكاردێ؟ بە نسبەت پیرەژنەوە لەبەر ئەوەی لە زۆر كاراندا بێتوانایە و، دەستپاچەیە، هەروەها پیرە پیاویش بە زۆریی وان.

(ٱلۡغَٰبِرِينَ): (الغابِرُ: الماكِثُ بَعْدَ مُضِيِّ ما هُوَ مَعَهُ) (غابِر) یانی: ماوە، ئەو كەسەی دەمێنێتەوە، دوای ئەوەی كەسێك كە لەگەڵی بووە ڕۆیشتووەو، ئەو ماوەتەوە.

هەروەها بە پێچەوانەشەوە: (غابِر) بە مانای ڕۆیشتوو دێ، یانی: (غابِر) هەم بەمانای ئەوەی ماوەیەك دەمێنێتەوە، هەم بە مانای ئەوەی تێپەڕیوە، دێ، (غابِرین) واتە: ئەوانەی كە مانەوە لە سزادا، ئەویش لەوان بوو، ئەو پیرەژنە لەوان بوو، ژنەكەی لووط، لەوانەبوو كە مانەوە، سزایان بەملداهات، یاخود (غابِر) بە مانای تێپەڕی، ئەوانەی تێپەڕین، واتە: سزا دران و فەوتان و نەمان،

واتـە: وشـەی (غابِـر) لێـرەدا لـە یـەك كاتـدا دوو مانـای پێچەوانـەی یەكـدی هـەن، هـەم بـە مانـای مـاوەوە، هـەم بەمانـای تێپەڕیـو دێ، هـەروەك وشـەی (عَسْـعَس) كـە لـە سـووڕەتی (التَّكویـر)دا هاتـوە: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴿١٧﴾ ﴾، هـەم بەمانـای هـات (أَقْبَـل) دێ، هـەم بـە مانـای ڕۆیـی (أَدْبَـر) دێ، یانـی: شـەوگار كـە دێ، یاخـود شـەوگار كـە تێدەپـەڕێ.

(فَسَآءَ مَطَرُ ٱلۡمُنذَرِينَ ): (بِئْسَ) خراپترین بوو، بارانی ئاگادار كراوان و ترسێنراوان.

(ٱلۡمُنذَرِينَ): (الإِنْـذَارُ: إِخْبَـارٌ فِيـهِ تَخْوِيـفٌ) واتـە: ئەوانـەی ترسـێنران و ئـاگادار كرانـەوە، بـەڵام ئـەوان بێبـاك بـوون، (إِنْـذار): بریتیـە لـە ئـاگادار كردنەوەیـەك كـە ترسـاندنی تێدابـێ، واتـە: ترسـێنراوان، هۆشـداریی پێـدراوان.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

شایانی باسە: ئێمە کاتی خۆی بەسەرهاتی لووط ﷺ لەگەڵ گەلەکەیمان، بە درێژیی لەکاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (هود)دا باسکرد، ئایەتەکانی: (٧٧ - ٨٣) واتە: حەوت ئایەت، بۆیە لێرە بە خێرایی بەسەریدا دەڕۆین.

لەوێ بەوردیی باسی چۆنیەتی سزادرانی گەلی لووطمان کرد، لەلایەن خوای دادگەرەوەو، باسی حوکمی نێربازیی و، هەموو ئەو وردەکارییانەمان کرد کە بەسەرهاتی لووط ﷺ دەیانگرێتە خۆی و، لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە بەسەرهاتی لووطیان تێدا هاتوە، ئایەتەکانمان لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا هێناوەو، ئەوەی فیکرمان پێی شکاوە، لەبارەی ئەو بەسەرهاتەوە خستوومانەتە ڕوو، وەك عادەتمان لە کاتی توێژینەوەی بەسەرهاتی هەرکام لە پێغەمبەران دا، بۆیە لێرە بە خێرایی بەسەر تەفسیر کردنی ئەو ئایەتانەدا دەڕۆین، کە بەسەرهاتی لووطیان ﷺ لەگەڵ گەلە ڕەوشت نزمەکەی، گرتۆتە خۆیان.

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾، گەلی لووط پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانا، پێیان بێبڕوا بوون، وەك پێشتریش باسمان کرد: کاتێك گەلی لووط بڕوایان بە لووط نەکردوە، مانای وایە بڕوایان بە هەموو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) نەکردوە، چونکە هەموو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لە لووتکەی ڕەوشبەرزیی و نەجابەت و پاکیی و چاکیی دابوو، کەواتە: لەبەر شەخسی خۆیان نەبووە، بە درۆ دانراون و، لەبەر پەیامەکەیان بووەو، پەیامی پێغەمبەرانیش (عليهم الصلاة والسلام) هەمووی لەنێوەڕۆکدا وەك یەکە، کەواتە: بڕوا بە یەکێکیان نەهێنرێ، مانای وایە بڕوا بەهیچیان نەهێنراوە، ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾، یاد بکەوە! کاتێ لووطی برایان پێی فەرموون: ئایا پارێز ناکەن؟ دەگونجێ بەرکار (مفعول)ەکەی کە قرتێنراو (مَحذوف)ە، بریتی بێ:

١- لە: (ألا تَتّقونَ الله) ئایا پارێز لە خوا ناکەن؟

٢- یان: ئایا پارێز ناکەن لە گوناهو تاوان و لادان؟

٣- یان: ئایا پارێز ناکەن و، خۆتان ناپارێزن لەسزای ئەو گوناح و تاوانانەی دەیانکەن؟

٤- یان: ئایا پارێز ناکەن لە سزای ڕۆژی دوایی؟

٥- یان: ئایا پارێز ناکەن لە تووڕە بوونی خوا؟ هەموو ئەمانە دەگرێتەوە.

﴿ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، بە دڵنیایی من بۆ ئێوە ڕەوانە کراوێکی ئەمیندارم و چی بۆتان چاکە ئەوەتان پێ دەڵێم، وشەی (أمین) لە کوردییدا بەڕاست و ساغم لێکداوەتەوە، دەزانم: یانی: ئەمیندارو ئەمین کەسێکە ئەمانەتێکی پێ بسپێردرێ و بیپارێزێ، بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: من ڕەوانە کراوێکی ئەمینم واتە: ڕاست و ساغم لەگەڵتان، ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، کەواتە: پارێز لەخوا بکەن و بە قسەم بکەن.

﴿ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەیان دووبارە کردۆتەوە: لەسەر ئەوەش کە ئێوەی بۆ بانگ دەکەم، لەسەر گەیاندنی پەیامی خوا، هیچ کرێیەکتان لێ داواناکەم، ڕاناوی ﴿ عَلَيْهِ ﴾ دەچێتەوە بۆ پەیامێك کە لووط پێیان دەگەیەنێ، کە ئەم ئایەتانە پەیامەکە دەگرنە خۆیان، با بە بێژە (لفظ)یش باسی پەیامەکە نەکرابێ، بەڵام نێوەڕۆکی پەیامەکە دیارە، یانی: لەسەر گەیاندنی ئەو پەیامەو، ئەو ئەرکەی خۆم، هیچ کرێیەکتان لێ داوا ناکەم، هیچ بارگرانییەکم بۆ سەرتان نیە، ﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، کرێ و پاداشتی من تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە.

ئنجا دێتە سەر باسی ڕەخنە لێگرتنیان: ﴿ أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ ﴾، ئایا ئێوە دەچنە لای نێرینان، لە نێو هەموو خەڵکی جیهاندا، ئێوە بەوە ناسراون؟ یان: ئایا ئێوە لە مرۆڤەکان، لەگەڵ نێرینان دا جووت دەبن؟ ﴿ وَتَذَرُونَ مَا

خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ﴾، ئـەوەش کـە پەروەردگارتـان لـە ژنەکانتانـدا بـۆی خولّقانـدوون، وازی لـێ دەهێنـن، کـە جـووت بوونـە لەگـەڵ ئەوانـدا؟ خـوا ئافرەتـی بـۆ ئـەوە دروسـتکردوە، پیـاو لەگەڵـی جـووت بـێ، نـەك پیـاو! هـەروەك خـوا پیاویشـی بـۆ ئافـرەت دروسـتکردوە، لـە ڕووی تێـر کردنـی غەریـزەی جینسـییەوە، ئەوانـە بەکەڵکـی یەکـدی دێـن، نـەك پیـاو لەگـەڵ پیـاوو، ئافـرەت لەگـەڵ ئافـرەت، کـە ئەگـەر وابـێ، بەشـەر تـۆوی لەسـەر زەوی دەبڕێتـەوە! ﴿ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴾، بەڵکـو ئێـوە کۆمەڵێکـی سـنوور شـکێن و تێپەڕێنـەرن، کۆمەڵێکـی سـنوربەزێنن و دەسـتدرێژییکارن.

﴿ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴾، گوتیـان: ئـەی لـووط! ئەگـەر وازنەهێنـی، بەدڵنیایـی تـۆ لـە دەرکـراوان دەبـی، لەوانـەی شـاربەدەر دەکرێـن، واتـە: خەڵـکی دیکەشـمان وەك تـۆ شـاربەدەر کـردوە! ﴿ قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴾، (لـووط) گوتـی: بـە دڵنیایـی مـن بـۆ کردەوەکـەی ئێـوە لـە بوغزێنەرانـم، زۆر ڕقـم لـە کردەوەکەتـان هەڵدەسـتێ، چونکـە (القَلى) یانـی: (أَشَدُّ البُغْض) لەوانـەم کـە زۆر ڕقـم لـە کردەوەکەتـان هەڵدەسـتێ، نـەك لـە خۆتـان، واتـە: هیـچ کێشـەم لەگـەڵ خۆتـان نیـە، وەك مـرۆڤ، هەمـوو مرۆڤـەکان لـەلای خـوا بەڕێـزن، بـەڵام ڕقـم لـە ڕەشـتە نـزم و پەسـتەکەتانە، ﴿ رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴾، پـەروەردگارم! خـۆم و نیزیکانـم لـەوەی ئـەوان دەیکـەن، دەربـاز بکـە، واتـە: لـە سـزای ڕەفتارێـك کـە ئـەوان دەیکـەن، ئەگەرنـا خـۆی و نیزیکانـی توخنـی ئـەو کردەوەیـە نەکەوتـوون، یـانی: (رَبِّ نَجِّني وَأهلِي مِن عِقَابِ ما يَعْمَلون) ئەمـەش بـە سـیاق و سـەلیقە دەزانـرێ، یـانی: کاتێـك کـە ئەوانـت سـزادا، لەسـەر ئـەو کـردەوە ڕەوشـتنزمانەیە، ئـەو کـردەوە قێزەونـە، خـۆم و نیزیکانـم دەربـاز بکـە، ﴿ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴾ یەکسـەر خـۆی و نیزیکانیـان دەربازکـرد.

بـە (ف)ی بەدواداهاتـن (تعقیـب)، وشـەی (أَهْل) بەمانای ژن و ماڵ و منـداڵ دێ، بەڵام لێـرەدا بـە مانـای نیزیـکان، ئـەو کەسـانەی لێـی نیزیـك بـوون دێ، بـە تەئکیـد ئەوانـەش لە

لـووط نیزیـك بـوون، کـە بـە قسـەیان کـردوە، چ لـە ڕووی ڕەچەڵـەك (نسـب)ەوە پێـوەی پەیوەسـت بووبـن، چ پێـوەی پەیوەسـت نەبووبـن، چونکـە ئەوانـە ئەهلـی مرۆڤـن، کـە لێـی نزیکـن، بـە نسـبەت پێغەمبەرانەوە (علیهـم الصـلاة والسـلام)و بەنسـبەت دیندارانەوە، ئەوانـە ئەهلیانـن و لێیـان نزیکـن، کـە لەگەڵیانـدان، لـە شـوێنکەوتنی ئاییـن و بەرنامـەی خـوادا، خـۆی و نیزیکانیـمان تێکـڕا دەربـاز کـردن ﴿ إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴾، جگـە لـە پیرەژنێـك لەوانـەدا کـە مابوونـەوە واتـە: لـە سـزادا مابوونـەوە، یاخـود: ﴿ فِي ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴾ یانـی: (في الماضـين) ئەوانـەی کـە تێپەڕیـن و، بوونـە بەسـەرهات و پەنـدو سـزا دران.

﴿ ثُمَّ دَمَّرۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴾، دوایـی ئەوانـی دیکەمـان تێـك شـکاندن، فەوتاندمانن، وەك چـۆن خانوویـەك کاوڵ دەکـرێ و بەسـەر یەکـدا دەڕمـێ، تـاوا ئەوانەمـان فەوتانـدن، ﴿ وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِم مَّطَرٗاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴾، بارانێکـی سەرسـوڕهێنەرمان بەسـەردا بارانـدن، خراپتریـن بـاران بـارانی ترسـێنراوان بـوو.

﴿ وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِم مَّطَرٗاۖ ﴾، مـادام بـە نەزانـراو (نَکـرة) هاتـوە، واتـە: بارانێـك چ بارانێـك، کـە لـە وەسـف نایـەت، بارانێکـی تایبـەت بـوو، کـە بریتـی بـووە لـەوە خـوا ﷻ قـوڕی وشـك بـووەوەی بەبـەرد بوویـان بەسـەردا ببارێنـێ، وەك لـە شـوێنەکانی دیکـەدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ﴿٨٢﴾ ﴾هـود، بەردێـك کـە لـە قوڕێکـی وشـك بـووەوە دروسـت بووبـوو بەسـەرماندا بارانـدن، پێشـتریش باسـمان کـردوە، ﴿ سِجِّيلٖ ﴾، لـە (سـنگ گڵ)ەوە هاتـوە، واتـە: (الطیـن المتحجر)یـەردی قوڕیـن، بەردێـك کـە لـە ئەصڵـدا قـوڕ بـووەو بۆتـە بـەرد، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، لـەوەدا نیشـانەیەك هەیـە، نیشـانەیەکی گـەورەو گرنـگ هەیـە، لەسـەر پەروەردگارێتیـی خـوا، لەسـەر ئـەوە کـە پێغەمبـەران (علیهـم الصـلاة والسـلام) ڕاسـتیان کـردوە، بـەڵام زۆربەیـان بـڕوادار نەبـوون، واتـە: لـە گەڵـی لـووط، یاخـود ئەوانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ کـە لـەو ئایـەت و نیشـانەی خـوا بەهرەمەنـد نەبـوون، پەنـدی لـێ وەربگـرن، یـان لـە مرۆڤایەتیـی بەگشـتیی، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بـە دڵنیایـی تەنیـا پەروەردگاریشـت دەسترۆیشـتوو و باڵادەسـتی بەبەزەیـی میهرەبانـە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**گەیاندنی پەیامی خوا لەلایەن لووطەوە بە گەلەکەی، کە جگە لە هێنانەدی بەرژەوەندیی خۆیان، هیچ چاوەڕوانییەکی لێیان نیەو، ڕەخنەی توند گرتنی لێیان، لەسەر نێر بازیی و واز لێهێنانی ژنەکانیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ (١٦٠) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ (١٦١) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٦٢) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٦٣) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٤) أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ (١٦٥) وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ (١٦٦)﴾.

### شیکردنەوەی ئەم حەوت ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ﴾، گەلی لووط پێغەمبەرانیان (علیهم الصلاة والسلام) بەدرۆ دانا، تەنیا لووط عليه السلام پێغەمبەری ئەوان بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەبەر جەوهەرو نێوەڕۆکی پەیامە خواییەکە، لووطیان بەدرۆ داناوە، مانای وایە پێغەمبەرانی دیکەش (علیهم الصلاة والسلام) کە هەر هەمان پەیامیان پێ بووە، ئەوانیشیان بەدرۆ داناوە.

٢)- ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾، یاد بکەوە! کاتێك لووطی برایان پێی فەرموون: ئەرێ پارێز ناکەن:

١- (لە خوا)؟

٢- پارێز ناکەن لە سزای خوا، بە هۆی کردەوە خراپەکانتانەوە؟

٣- پارێز ناكەن لەو كردەوە خراپانەی كە پێچەوانەی زگماك و عەقڵی سەلیمن؟

٤- پارێز ناكەن لەو دەرهاویشتانەی كە بە هۆی ئەو كردەوە قێزەونەوە، دواپی تووشتان دێ؟

٥- پارێز ناكەن لە سزای دواڕۆژ؟ هەموویان دەگرێتەوە.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَخُوهُمْ لُوطٌ ﴾ واتـە: برایـان بـووە لـە مرۆڤایەتییـدا، چونكـە گەلـی لـووط (عليه السلام) لـە كەنعانییـەكان بـوون، خەڵكـی فەڵەسـتینی ئـەو كاتـە، بـەڵام لـووط (عليه السلام) لەگەڵێكـی دیكـە بـووە و بـرازای ئیبراهیـم (علیهما الصلاة والسلام) بـووە.

٣)- ﴿ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، بە دڵنیاییەوە من بۆ ئێوە پێغەمبەرێكی ئەمیندارم، ڕاست و ساغم، چی بۆتان چاكە ئەوەم بۆتان دەوێ و، ئەوەتان پێ ڕادەگەیەنم.

٤)- ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، مادام وایە پارێز لە خوا بكەن و بە قسەم بكەن.

٥)- ﴿ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾، لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامەش، هیچ كرێیەكتان لێ داوا ناكەم، هیچ پاداشتێكم لێتان ناوێ.

٦)- ﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، پاداشتم تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە، ئەم پەیامە سێ بڕگەییە، زۆر گەورەو گرنگە، بۆیە خوا (جل جلاله) لێرەدا لە بەسەرهاتی ئەم پێغەمبەرانەدا، هەموویان بە یەك بێژە، هەموو جارێ دووبارەی دەكاتەوە.

٧)- ﴿ أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ ﴾، ئایا ئێوە دەچنە لای نێرینان، لەنێو هەموو جیهانییاندا، (أَيْ الذَّكَرَ: وَطِئَهُ) لەگەڵ نێرینەدا جووت بوو، (الذُّكْرَان: الرِّجَال، وَالشَّبَاب، وَالصِّبيان)، (ذُكْرَان) بە مانای نێرینە دێ، ئنجا پیاو بن، گەنج بن، گچكە بن، هەموویان دەگرێتەوە، بۆیە خوا (جل جلاله) بەو بێژەیەی هێناوە، تاكو هەموویان بگرێتەوە.

واتـە: لەنێـو هەمـوو گـەل و نەتەوەكانـدا، ئێـوە ئـەو كـردەوە خراپـە دەكـەن، وەك لـە شـوێنی دیكـەدا دەفەرمـوێ: ﴿ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُمْ بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِنَ الْعَالَمِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾الأعراف، واتـە: ئایـا ئێـوە ئـەو كـردەوە دزێـو و ناقۆڵایـە دەكـەن، كـە لـە پێـش ئێـوەدا هیـچ كـەس لـە جیهانییـان پێشـتان نەكەوتۆتـەوە لـەوەدا،

واتـە: یەکەمیـن گەلـن کـە بـەو دیـاردەو، نەخۆشـییە قێزەونـە نـاسراون، نەگەرنـا ئـەو گوناهـە، ڕەنگـە هـەر بووبـێ، بـەڵام بـە شـێوەیەکی تـاك تـاك و بـە شـێوەیەکی دەگمـەن بـووە، بـەڵام ئـەوان کردوویانـە بـە دیـاردە.

یاخـود: ئایـا ئێـوە لـە نێـو مرۆڤانـدا غەریـزەی جینسـیی خۆتـان لـە نێـران تێـر دەکـەن، لـە جیاتـی ئافرەتـان؟!

٨)- ﴿ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ﴾، ئەوەی پەروەردگارتان لە ژنەکانتان بۆی خوڵقاندوون، وازی لێ دەهێنن؟ واتە: ئەوەی خوا لە ژنەکانتاندا بۆی خەڵقاندوون، کە شوێنی تێر بوونی غەریزەی جینسییە، ئەوە واز لێ دەهێنن؟ یاخود: ئەو ئافرەتانەتان خوا بۆ ئەو مەبەستە دروستیکردوون، کە غەریزەی جینسیی خۆتانیان لەگەڵ تێر بکەن، بۆ ئەوانیش و بۆ ئێوەش بەهەمان شێوە، ئەو غەریزەیە بە شێوەیەکی خوا ڕسك و زگماك تێر دەبێت، ئەوە واز لێ دەهێنن؟

٩)- ﴿ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴾، بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئێوە کۆمەڵێکی سنوور شکێنن، سنوور بەزێنن، تێپەڕێنن، ﴿ عَادُونَ ﴾: (جَمْع عَادي، أَي المُتجاوِز حَدَّ الحَقِّ إلى الباطِلِ، عَدا عَلَيْهِ: ظَلَمَهُ)، (عادون) کۆی (عادي)ە، بریتیە لە بابای تێپەڕێن لە سنووری هەق، بەرەو ناهەق، (عَدا عَلَيْهِ) واتە: ستەمی لێ کرد.

بەم شێوەیە لووط ﷺ پەیامی خوا بە گەلەکەی خۆی دەگەیەنێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**وەڵامدانەوەی گەلی لووط، بە هەڕەشە لێکردنی و شاربەدەرکردنی و، پەنا بە خوا گرتنی لووط، کە خۆی و نیزیکانی قوتار بکات، لە سزای تاوانی گەلەکەی و، دەرباز بوونیان و فەوتێنرانی گەلەکەی بە سزای بەرد باران کران:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالُواْ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم نۆ ئایەتە لە دوازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ قَالُواْ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ ﴾، گوتیان: ئەی لووط ! ئەگەر واز نەهێنی، دەست هەڵنەگری لەو قسانەت، لە گەیاندنی ئەو پەیامەت.

٢)- ﴿ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴾، زۆر بەدڵنیایی لە دەرکراوان دەبی، چونکە هەم (ل) بۆ سوێند خواردنە، یانی: (وَاللهِ لَتَكُونَنَّ) هەم (ن) بۆ تەئکیدە، یانی بە دڵنیاییەوە تۆ لە دەرکراوان دەبی، نەیانگوتوە: (لَنُخْرِجَنَّكَ) لە شوێنی دیکەدا هاتوە، گەلی شوعەیب ﷺ بە شوعەیبیان گوتوە: ﴿ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ﴿٨٨﴾ ﴾الأعراف، بەڵام لێرەدا دەڵێن: ﴿ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴾، تۆ لە دەرکراوان دەبی، لە شار بەدەر کراوان دەبی، واتە: خەڵکی دیکەش پێش تۆ، کە شتێکی بووبێ، پێچەوانەی ڕێبازو بەرنامەو شێوە ژیانی ئێمە بێ، شار بەدەرمان کردوە، تۆش بەو دەردە دەبەین.

٣)- ﴿ قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴾ (لووط) گوتی: بێگومان من بۆ کردەوەکەتان لە بوغزێنەرانم.

پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هەرگیز عادەتیان نەبووە لەبەرانبەر هەڕەشەو گوڕەشەدا، یان لە بەرانبەر ترس و تەماح و موجامەلەدا، دەست بەرداری پەیامی خۆیان بن، لووط ﷺ فەرمووی: من بە دڵنیاییەوە ڕقم لە کردەوەکەی ئێوەیە، لە زۆر ڕق لێبووەوانی کردەوەکەی ئێوەم، (القَلي) یانی: زۆر ڕق لێبوونەوە، کەسێك کە ڕقی لە شتێك دەبێتەوە، زۆر بە خەستیی، یانی: زۆر بە خەستیی ڕقم لە کردەوەکەتانە، کردەوەکەیان پێچەوانەی عەقڵ و زگماك بووە، وێڕای ئەوەی پێچەوانەی شەریعەتیش بووە، کە بریتی بووە لە جووت بوونی پیاوان لەگەڵ یەکدی.

٤)- ﴿ رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴾: پەروەردگارم! خۆم و نزیکانم لەوەی دەیکەن، دەربازمان بکە، (أي: مِن عُقوبَةِ ما يَعْمَلون) واتە: لە سزای ئەوە کە دەیکەن، دەبێ لێرەدا پاڵدراو (مضاف)ێك تەقدیر بکرێ، چونکە مەبەستی ئەوە نەبووە لە کردەوەکەیان، چونکە لەکردەوەکەیان دیارە کە پارێزراو بووە، بەڵام یانی: لە سزای کردەوەکەیان، ئێمە بپارێزە، خۆم و نیزیکانم.

٥)- ﴿ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴾، خۆی و نیزیکەکانیمان دەرباز کردن، یەکسەر دوای پاڕانەوەکەی بە خێرایی، چونکە (ف)ی ﴿ فَنَجَّيْنَٰهُ ﴾ بۆ بەدواداهاتن (تعقیب)ە، یەکسەر بە دوای ئەوەدا، خۆی و نیزیکانیمان تێکڕا دەرباز کردن.

٦)- ﴿ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴾، جگە لە پیرەژنێك لە سزادراوان، کە لە نێو سزادراوان دا مایەوە، چونکە (غابِرين: ماكِثِين) یانی: ئەوانەی کە مانەوە لە سزادا، یاخود ﴿ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴾ (غابرين: ماضين) جگە لە پیرەژنێك لەوانەی کە تێپەڕین و ڕۆیشتن، فەوتان، کە بریتی بووە لە ژنەکەی، لەشوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾الأعراف.

٧)- ﴿ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴾، دوایی ئەوانی دیکەمان تێکشکاندن (ثُمَّ: لِلتَّرتيب الرُّتبي) واتە: دوای ئەوەی کە نیزیکانیمان دەرباز کردن، ئنجا ئەوانی دیکەمان فەوتاندن، لەبەر ئەوەی فەوتاندنی خوای کارزان بۆ گەلی لووط ﷺ لە ڕووی پلەوە، زۆر گرنگترو

گەورەتر بووە، لە دەرباز کردنەکە، کە بەس ئەوە بووە خوا ﷻ بە لووطی فەرموو: خۆت و ماڵ و منداڵەکەت و ئەوانەی بڕوایان بە تۆ هێناوە، بڕۆن، ئەوانیش ڕۆیشتن، بەڵام دوایی فەوتێنرانەکە، زۆر شتێکی گەورە بووە، بۆیە دوای (ثم) هێناویەتی.

٨)- ﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ﴾، بارانێکی تایبەتمان بەسەردا باراندن، بارانە تایبەتەکەش بریتی بووە لەوە کە خوا قوڕی وشك بووەوە و بە بەرد بووی بەسەردا باراندوون، وەك فەرموویەتی: ﴿ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ ﴾هود، لە قوڕێکی بەبەرد بووی وشککراوە، بەڕیز بەسەریاندا، دەباری لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾ ﴾الذاریات.تاکو بەردێکی قوڕینیان بنێرینە سەرێ.

٩)- ﴿ فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنذَرِينَ ﴾، خراپترین باران، بارانی ئاگادار کراوان، ترسێنراوان بوو، کە ترسێنران و هۆشیار کرانەوە، بەڵام بێباك بوون. (ساء: بئس) خراپترین بوو.

١٠)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانەیەکی گەورەو گرنگ هەبوو.

١١)- ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، بەڵام زۆربەیان بڕوادار نەبوون، واتە: گەلەکەی لووط، یان: کۆمەڵگای موحەممەد ﷺ، یان: ئەهلی کوفر بەگشتیی، کە بە درێژایی مێژوو ئەو سزایانەی خوا ﷻ بەسەر ئەو گەلە لادەرانەدا سەپاندوونی، نیشانەو بەڵگەیەکی گەورە بوون، بەڵام خەڵکەکە پەندیان لێ وەرنەگرتوون.

١٢)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾، بەدڵنیایی تەنیا پەروەردگاری تۆ زاڵی بە بەزەییە، بێگومان ئەو دووبارە کردنەوەیە، بۆ جەخت لەسەر کردنەوەیە، چونکە هەر کامێك لەو حەوت بەسەرهاتە، هەمووی، دەرس و پەندە، هەرکامیان چەندان دەرس و پەندی تێدا هەن، بەڵام بەداخەوە کە مرۆڤەکان کەمتر وایە لە بەسەرهاتەکانی مێژوو عیبرەت و پەند وەربگرن، بەڵکو هەر کامێکیان، هەڵەی ئەوانی دیکە دووبارە دەکاتەوەو، لە جیاتی ئەوەی پەند لە خەڵکی پێش خۆیان وەربگرن، دەبنە دەرس و پەند بۆ خەڵکی دوای خۆیان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لە بیسـت و یـەك (٢١) ئایەت پێکهاتـوە، ئایەتـەکانی: (١٧٦ - ١٩١) کـە هەموویـان بـۆ گێڕانـەوەی پوختـەی بەسـەرهاتی شـوعەیب و گەلەکـەی (أَصْحابُ الأَيْكَـة) تەرخـان کـراون، هـەر لـە دەسـتپێکی بانگەوازەکەیـەوە، هەتـا سـوور بـوونی گەلەکـەی لەسـەر بـەدرۆ دانـان و بێبڕوایـیان و، سـەرەنجام فەوتێنرانیـان، بـە (عَـذَابُ يَـوْمُ الظُّلَـة) ئـازاری ڕۆژی سێبەرەکە، کـە سزایەکی زۆر بـە تێـش و بێـڕەزا بـووە.

شـایانی باسیشـە هـەرکام لـە (أَصْحـابُ الأَيْكَـة) و (مَدْيَـن) نـاوی ئـەو خەڵـك و کۆمەڵگایـەن، کـە (شـعیب)یان عَلَيْهِ السَّلَام بـۆ لا نێـردراوەو، هەندێك لـە زانایـان گوتوویانە: (أَصْحـاب الرَّس)یـش هـەر ناوێکـی دیکـەی ئـەو خەڵـك و کۆمەڵگایەیـە، بـەڵام ئـەوە پشـت ئەسـتوور نیـە بـە بەڵگەیـەکی بەهێـز.

﴿ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هاوەڵانی درەختەکە پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان (بڕوایان پێ نەهێنان) ﴿١٧٦﴾ یاد بکەوە! کاتێك شوعەیب گوتی: ئەرێ پارێز (لە خوا) ناکەن؟ ﴿١٧٧﴾ بێگومان من پێغەمبەرێکی ئەمیندار (ڕاست و ساغ)م بۆ ئێوە ﴿١٧٨﴾ ئنجا پارێز لەخوا بکەن و، بە قسەم بکەن ﴿١٧٩﴾ هیچ جۆرە کرێیەکیشتان لەسەری لێ داوا ناکەم، پاداشتم تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە ﴿١٨٠﴾ بە تەواویی (بۆ خەڵك) بپێون و، لە کەمکەرەوان (ی پێوان) مەبن ﴿١٨١﴾ هەروەها بە تەرازووی ڕاست و ڕێك (شت بۆ خەڵك) بکێشن ﴿١٨٢﴾ دیسان شتەکانی خەڵك بەکەم مەگرن (مافەکانیان لە مامەڵەی ماددیی و مەعنەوییدا پێشێل مەکەن)و تێکدەرانە خراپە لەزەوییدا مەکەن ﴿١٨٣﴾ هەروەها پارێز لەو کەسە بکەن، کە ئێوەو خەڵکانی زۆری پێشووی دروستکردوون ﴿١٨٤﴾ خەڵکەکە گوتیان: بێگومان تۆ تەنیا لە جادوو لێکراوان (و عەقڵ تێکچووان)ی و ﴿١٨٥﴾ تۆ تەنیا مرۆڤێکی وەك ئێمەی و، پێمان وایە لە درۆکارانی ﴿١٨٦﴾ ئەگەر لە ڕاستانی، چەند پارچەیەکمان لە ئاسمانێ بەسەردا بخە خوارێ ﴿١٨٧﴾ گوتی: پەروەردگارم بەوەی دەیکەن زاناترە ﴿١٨٨﴾ سەرەنجام بە درۆیان دانا، لە ئاکامدا ئازارو (سزا)ی ڕۆژی (هەورە) سێبەرەکە گرتنی، کە بە دڵنیایی ئازاری ڕۆژێکی مەزن بوو ﴿١٨٩﴾ بێگومان لەوەدا (کە باسکرا) نیشانەیەك (ی گەورەو گرنگ) هەبوو، بەڵام زۆربەیان بڕوادار نەبوون ﴿١٩٠﴾ تەنیا پەروەردگاریشت زاڵی بەبەزەییە ﴿١٩١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَوۡفُواْ): واتــە: بــە تەواویــی بیکــەن (أَمْــرٌ بِالإِيفَــاءِ: أَي جَعْــلُ الــشَّيءِ تامًــا) واتــە: فەرمانکردنــە بــە تەواوکــردن، یــانی: تەواوکــردنی شــت، یــانی: پێــوان بەتەواویــی ئەنجــام بــدەن، غــەش و فێــڵ و ســاختەی تێــدا مەکــەن.

(ٱلۡمُخۡسِرِينَ): (المُخْسِرُ: فاعِلُ الخَسَارةِ لِغَيْرِهِ، أي المُنقِصُ، أي لا تَكونـوا مِـنَ المُطَفِّفِين، وَهـذِهَ الصِّيغَـةُ، أي لا تكُونـوا مِـنْ أهْـلِ هـذا الصَّنيـع) (مُخْسِر) کەسێکە زیــان لێــدان بــە بەرانبەرەکــەی ئەنجــام دەدا، کەمکــەرەوە، زیانگەیەنــەر، واتــە: تێــوە لەوانــە مەبــن کــە لــە کێشــان و پێوانــدا، هەقــی خەڵــك کــەم بکەنــەوە، ئــەم ســیغەیەش یــانی: لــەو کەســانە مەبــن کــە ئــەو کردەوەیــە ئەنجــام دەدەن.

(بِٱلۡقِسۡطَاسِ): (المِيزان، العَـدْل) (قسـطاس) بــە مانــای تــەرازوو دێ و، بــە دادگەرییش دەگوترێ.

(وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ): شــتەکان خەڵــك بەکــەم مەگــرن، کــەم مەکەنــەوە، (البَخْـس: النَّقْـص والـذَّم) (بخـس) بەمانــای کەمکــردن و بەمانــای زەمکردنیــش دێ، (وَهـوَ غَـبْنُ مَنافِعِهـا وَذَمُّهـا بِغَـيْرِ مـا فِيهـا لِيَضْطَرُّوهُـم إلى بَيْعِهـا بِغُبْنٍ) لــە ســوودەکانی شــتەکانی کــەم مەکەنــەوەو مەیانشــکێنن، ســیفەتێکیان تێــدا بــاس بکــەن، کــە ئــەو ســیفەتە خراپەیــان تێــدا نەبــێ ئــەو شــتانە، ســەرەنجام خەڵــك ناچــار بکــەن بــە نرخێکــی کەمــتر لــە نرخــی شایســتەی خۆیــان بیانفرۆشــین.

(وَلَا تَعۡثَوۡاْ): یانی: (ولا تُفْسِدوا) خراپەکارانە خراپە لە زەوییدا مەکەن.

(وَٱلۡجِبِلَّةَ): (الجِبِلَّـة: الخِلْقَـة وَأُريـدَ بِـهِ المَخْلوقـات، لِأَنَّ الجِبِلَّـةَ اسْـمٌ كَالمَصْـدَرِ أي: الأُمَـم السَّـابِقة) واتــە: (جبلّــة) یــانی: دروســتکردن کــە مەبەســت دروســتکراوەکانن، چونکــە (جِبِلّــة) نــاوە وەك چــاوگ، واتــە: گەلــە پێشــووەکان.

﴿كِسَفًا﴾: (الكِسْـفَةُ: القِطْعَـةُ مِـنَ الـشَّيء، والكِسَـفُ جَمْـعٌ وَقِيـلَ: الكِسَـفُ: القِطْعَـةُ) (الكِسَـف) هەندێکیـان گوتوویانــە: کـۆی (كِسْـفَة)یە، بەمانـای: (قِطْعَـة) کەواتــە: (كِسَـف) یانــی: (قِطَـعٌ) چەنـد پارچەیـەك، هەندێکیشـیان گوتوویانـە: (كِسَـفاً) یانــی: (قِطْعَـةٌ) یانــی: پارچەیـەك، نـەك کۆبـێ، بەڵکـو تاکـە.

﴿يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ﴾: (الظُّلَّـة: السَّـحابَة) (ظُلَّـة) یـانی: سـێبەر، هەورێـك سـێبەرێ بـكات، یاخـود تـەم و مژێـك هێنـدە چـڕو پـڕ بـێ، سـێبەر لـە خەڵـك بـكات.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

پێشتریش باسمان کرد کە ئێمە بەسەرهاتی شوعەیبمان عَلَيْهِ السَّلَامُ لەگەڵ گەلەکەی گەلی مەدیەن و (أَصْحابُ الأَيْكَة)دا، لە کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (هود)دا، باسکردوە، ئایەتەکانی: (٨٤ - ٩٥) بۆیە لێرە بە خێرایی باسی دەکەین.

خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ واتە: هاوەڵانی درەختەکە، یاخود هاوەڵانی باخەکە پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانا، کە مەبەست پێیان گەلی مەدیەنە، ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک شوعەیب پێی فەرموون: ئەری خۆتان ناپارێزن، پارێز ناکەن؟ لێرەدا نەیفەرمووە: (**أَخُوهُم**) لەبەر ئەوەی شوعەیب عَلَيْهِ السَّلَامُ لە خۆیان نەبووە، لە رووی رەچەڵەک (نسب)ەوە، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشک دەخەینە سەر هۆکاری ئەوەی بۆچی خوای پەروەردگار وشەی (**أَخُوهُم**)ی بۆ بەکارنەهێناون، چونکە لووطیش لەگەلی لووط نەبووە، بەڵام خوای ﷻ وشەی (أخ)ی بەکارهێناوە، دیارە شتێکی تێدا هەیە، دوایی لەوبارەوە قسەی لێ دەکەین، ﴿ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، بە دڵنیاییەوە من رەوانەکراوێکی نەمیندارم راست و ساغم بۆتان ﴿ فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، دەجا پارێز لە خوا بکەن و، بە قسەم بکەن.

﴿ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، لەسەر گەیاندنی ئەو پەیامەی خواش، لەسەر ئەو کارەی خۆشم کە گەیاندنی پەیامی خوایە، هیچ پاداشت و کرێیەکتان لێ داوا ناکەم، کرێ و پاداشتی من تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە، چاوەڕوانییم تەنیا لەو هەیەو، هیچ بار گرانییم بۆ ئێوە نیە.

﴿ أَوْفُوا ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴾، پێوانە تەواو بکەن، بە تەواویی بپێون بۆ خەڵک و لە زیانگەیەنەران پێیان مەبن، ﴿ وَزِنُوا بِٱلْقِسْطَاسِ

ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴾، (لەڕووی کێشانیشەوە) بەتەرازووی ڕاست بۆ خەڵك بکێشن، ﴿ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ ﴾، شتەکانی خەڵك بەکەم مەگرن، لەبەرچاویان مەخەن، کە سەرەنجام زیانیان لێ بدەن، ﴿ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ ﴾ (لا تَنْقُصوا النّاسَ أشياءَهُم) شتەکانی خەڵك کەم مەکەنەوە، چ لە ڕووی ماددیی، چ لە ڕووی مەعنەوییەوە، ﴿ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾، خراپەکارانەش لە زەویدا خراپە مەکەن، ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ﴾، پارێزیش لەو زاتە بکەن، لەو کەسە بکەن کە ئێوەی دروستکردوە، ﴿ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، هەروەها ئەو خەڵکانەی پێشووشی هێناونە دی، هەموو ئەو خەڵك و نەتەوانەی ڕابردوون.

﴿ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴾، گوتیان: بە دڵنیایی تۆ تەنیا لەوانەی کە زۆر جادوویان لێکراوە، واتە: جادووێکی زۆر بێڕەزاو خەست و سەختت لێکراوە، بۆیە حاڵت ئاوای لێهاتوە، عەقڵ و هۆشت تێکچوە، قسەی وا دەکەی کە پێچەوانەی عەقڵ و لۆژیکە، لەبەر ئەوەی پێچەوانەی عادەت و نەریتی ئێمەیە ﴿ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾، ئنجا تۆش تەنیا مرۆڤێکی وەك ئێمەی ﴿ وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە پێمان وایە تۆ لە درۆکەرانی، ﴿ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، ئنجا چەند پارچەیەکمان لەسەرێوە بەسەردا بکەوێنە، یان پارچەیەك لە ئاسمانمان لەسەرێرا بەسەردا بخە خوارێ، ﴿ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾، ئەگەر تۆ لە ڕاستانی، ﴿ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾، (شوعەیب) گوتی: پەروەردگارم زاناترە بەوەی ئێوە دەیکەن، خوا هەموو شتێکتان لەبارەوە دەزانێ، واتە: کە سزاتان دەدات، لەسەر ئەوە سزاتان دەدات کە بۆ خۆی لەبارەتانەوە دەزانێ، نەك ئەوەی من دەیزانم ﴿ فَكَذَّبُوهُ ﴾، سەرەنجام بەدرۆیان دانا، ﴿ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ﴾، ئنجا ئازاری ڕۆژی سێبەرەکە گرتنی، ئەو هەورە کە سێبەری لێکردن، دوایی باسی دەکەین، هەورێك بووە هەورێکی زۆر خەست بووە، سێبەری لێکردوون، وایانزانیوە ئەوە پەناگەیەکەو پەنایان پێبردوە، دوایی بە هۆی ئەوەوە فەوتاون، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾، بە ڕاستیی

ئـەو سـزاو ئـازارە، ئـازاری ڕۆژێکـی مـەزن بـوو، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، لـەوەدا کـە باسـکرا، نیشـانەو بەڵگـە هەیـە لەسـەر ڕاسـتیی پەیامـی خـوا، لەسـەر ڕاسـتیی پێغەمبـەران (علیهـم الصـلاة والسـلام)، لەسـەر ئـەوە کـە خـوا ﷻ ئـەم ژیانـی دنیایـەی نەکـردوە بەشـاری بێخـاوەن، لەسـەر ئـەوە کـە خـوا پاداشـتی چاکـەکاران دەداتـەوەو سـزای تاوانبـاران دەدات، ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، بـەڵام زۆربەیـان بـڕوادار نەبـوون، واتـە: زۆربـەی ئـەو جیلانـەی مرۆڤایەتیـی کـە بـە دوایەکـدا هاتـوون، لـەو هەمـوو نیشـانانە بەهرەمەنـد نەبـوون، ئـەو دەرس و پەنـدو عیبرەتانـە، کـە لـە بەسـەرهاتی پێغەمبەرانـدا (علیهـم الصـلاة والسـلام) هەبـوون، سـوودیان لێیـان وەرنەگـرت و نەبوونـە بـڕوادار، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾، بەدڵنیاییـش تەنیـا پـەروەردگارت زاڵـی بەبەزەییـە، باڵادەسـتی میهرەبانـە، باڵادەسـت و زاڵـە، بـۆ دوژمنـان و ناحـەزان، هەروەهـا میهرەبـان و بەبەزەییـە، بـۆ کەسـانێك کـە شایسـتەی میهرەبانیـی و سـۆزو بەزەیـی خـوان.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**بە درۆ دانانی (أصحاب الأیکة) بۆ شوعەیب ﷺ، دوای ئەوەی پەیامی تەنیا پەرستنی خواو، بەقسە کردنی پێغەمبەی خوای پێ ڕاگەیاندن و، ئامۆژگاریی کردن کە لە بواری کێشان و پێواندا ڕاست و دادگەر بن و، ستەم و خراپەکاریی نەکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم نۆ ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:**

١)- ﴿ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، هاوەڵانی، یان خاوەنانی **(الأیکة)** پێغەمبەرانیان بەدرۆ دانان، ئەم ئایەتە خوێنراویشەتەوە: **(كَذَّبَ أَصْحَابُ اللَّيْكَةِ المُرْسَلِين)** هەم بە **(الأَيْكة)** هەم بە **(اللَّيْكة)** خوێنراوەتەوە، **(الأَيْكة)**ش بە مانای درەختێکی چڕو پڕو گەورە دێ، هەروەها بە مانای باخێکی چڕو پڕ دێ، کەواتە: باخێکی گەورە، یان درەختێکی زۆر گەورەیان هەبووە، گەلی شوعەیب ﷺ.

٢)- ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، کاتێ شوعەیب پێی فەرموون: ئەرێ پارێز ناکەن، خۆتان ناپارێزن! لێرەدا وشەی **(أَخُوهُم)** نەهاتوە، بەڵام لەکاتێکدا کە باسی

(مَدْيَن) کراوە، خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ﴾هود، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ﴾الأعراف، کەواتە: (أَصْحابُ الأَيْكَة) دەبێ جیابن لە (مَدْيَن) و شوعەیب ﷺ لەگەلی (مَدْيَن) بووە، لەڕووی ڕەچەڵەکەوە، بۆیە لە هەر شوێنێك کە باسی (مَدْيَن) کراوە خوا فەرموویەتی: شوعەیبی برایان، بەڵام بۆ (أَصْحابُ الأَيْكَة) نەیفەرمووە : (أخاهُم) یان (أَخُوهُم) ئنجا ئەمە لێی وەردەگیرێ، کە دەبێ ئەم (أَصْحابُ الأَيْكَة) جیابن لە (أصحابُ مَدْيَن) چونکە ڕایەك هەیە دەڵێ: شوعەیب ﷺ بۆ لای (أصحابُ مَدْيَن)یش ڕەوانە کراوەو، بۆ لای (أَصْحابُ الأَيْكَة)ش ڕەوانە کراوە، خۆیشی خەڵکی (مَدْيَن) بووە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ﴾، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕووی ڕەچەڵەك (نَسَبْ)ەوە لەگەلی (أَصْحابُ الأَيْكَة) نەبووە، بۆیە وشەی (أَخُوهُم)ی بۆ بەکارنەهێناوە، بەڵام گرفت لێرەدا ئەوەیە کە خوا ﷻ بە نسبەت لووط ﷺەوە فەرموویەتی: ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ ﴾الشعراء، کە بە دڵنیاییەوە (لوط)یش لە عەبرانییەکان بووە، بەڵام گەلی لووط لە کەنعانییەکان بوون، لووط دیارە کە برازای ئیبراهیم بووەو، کەنعانییەکانیش کە گەلی لووط بەشێکیان بوون و لە شام و فەلەستین بوون، ئەمە حیسابەکەمان لێ تێکدەدا.

کە لەوێ مەگەر بەوە تەئویل بکرێ، کە لووط لەبەر ئەوەی زۆر لە نێو ئەو خەڵکەدا ماوەتەوەو، ماوەیەکی زۆریان لە نێودا بووەو بۆتە یەکێك لەوان، بۆیە خوا ﷻ وشەی (أَخُوهُم)ی بۆ بەکارهێناوە، مەگەر بەم شێوەیە تەئویل بکرێ، ئەگەر ئەوەیان نەبووایە، دەمانتوانی بڵێین: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە (أَصْحابُ الأَيْكَة) جیابوون لە (مَدْيَن) کە ڕایەکی واش هەیە، وەك لەکاتی توێژینەوەی بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ لەگەڵ گەلەکەیدا لە تەفسیری سوورەتی (الحجر)دا بە تەفصیل باسمان کردوە، ڕایەکی وا هەیە کە شوعەیب تاکە پێغەمبەرێك بووە، بۆ لای دوو گەلان نێردرابێ، بەڵام هەندێکیش دەڵێن: (أَصْحابُ الأَيْكَة) و (مَدْيَن)، هەردووکیان هەر یەکن و، لەڕووی ڕەچەڵەکیانەوە پێیان گوتراوە: (مَدْيَن)، کە دەچنەوە سەر (میدیان)ی کوڕی ئیبراهیم ﷺ،

لەڕووی ئەوەوەش کە چییان هەبووە؟ باخێکیان هەبووە، یاخود درەختێکی زۆر گەورەیان هەبووە، پێیان گوتراوە: (أَصْحَابُ الأَيْكَة) هەردووك ڕایەکان هەن، کە ئێمە لە تەفسیری (الحجر)دا زیاتر ئەوەمان پەسند کردوە، کە یەك گەل بن، بەڵام لە تەفسیری سووڕەتی (الأعراف)دا، زیاتر ئەوەمان هەڵبژاردوە کە دوو گەل بن، بە هەرحاڵ زانایانیش لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، بواری قسە لێکردنی تێدا هەیە.

ئنجا وەك پێغەمبەرانی پێشوو سەلامی خوایان لێبێ، هەمان پەیامی دووبارە کردەوە:

٣)- ﴿ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی ئەمیندارم، ڕاست و ساغم.

٤)- ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، دەجا پارێز لە خوا بکەن و، بە قسەم بکەن.

٥)- ﴿ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾، لەسەر ئەم (پەیام گەیاندن)ەش هیچ کرێتان لێ داوا ناکەم.

٦)- ﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، پاداشت و کرێی من، تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە.

٧)- ﴿ أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ ﴾، دەجا پێوانە تەواو بکەن و لە زیان گەیەنەران مەبن، لەوانە مەبن کە زیان بە خەڵکی بەرانبەرتان بگەیەنن، کاتێك دانەوێڵەیان بۆ دەپێون، (أَوْفُوا: أَيْ أَتِمُّوا، أَيْ: اجْعَلُوا الْكَيْلَ غَيْرَ نَاقِصٍ) واتە: بە چاکیی بۆیان بپێون و، با پێوانەکە ناتەواویی تێدا نەبێ، ﴿ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ ﴾ پێشتر گوتمان: (الْمُخْسِر: فَاعِلُ الْخَسَارَةِ لِلْغَيْرِ) کەسێك زیان بە بەرانبەرەکەی بگەیەنێ، لە کاتێك دا شتی بۆ دەپێوێ.

٨)- ﴿ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ﴾، بە تەرازووی ڕاستیش بۆیان بکێشن، با کێشانیشتان تەواو بێ، (الْقِسْطَاس) یەکێکە لە ناوەکانی تەرازوو، (الْمُسْتَقِيم)یش یانی: ڕێك و ڕاست.

٩)- ﴿ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ ﴾، شتەکانی خەڵك بەکەم مەگرن، (البَخْس: النَّقْصُ والذَّمُّ) (بخس) بریتیە لە کەمکردنەوەو زەمکردن، مەبەست ئەوەیە شتەکانیان لەبەرچاو مەخەن، لەڕووی مەعنەویەوەو لەڕووی ماددیەوەش، زیانیان پێ مەگەیەنن.

١٠)- ﴿ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴾: خراپەکارانەش لەزەویدا خراپە مەکەن، (عَثَى فِي الأَرْضِ فَسَاداً: أَي: أَفْسَدَ، لا تُفْسِدوا أَشَدَّ الفَساد) زۆر خراپەکاریی لە زەویدا مەکەن، چونکە وشەی (عَثَى) لەگەڵ (أَفْسَدَ) مانایان زۆر لە یەك نیزیکە.

١١)- ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلۡجِبِلَّةَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، پارێزیش بکەن لەو زاتە کە ئێوەش و میللەتان و گەلانی پێشی ئێوەشی دروستکردوون، (جِبِلَّة) هەندێکیان بە مانای (الخِلْقَة والسَّجِيَّة)یان لێکداوەتەوە، کە لە ئەصڵدا وایە، (جِبِلَّة) ئەو حاڵەتەیە کە خوا ﷻ مرۆڤی لەسەر سروشتاندوە، کە (خِلْقَة) و (جِبِلَّة) و (سَجِيَّة)شی پێ دەگوترێ و، مەبەست پێی دروستکراوەکانە، واتە: ئەو دروستکراوانەی خوا کە لەسەر یەك شێوە سروشتاندوونی و، لە بناغەدا هەمووی بە یەك شێوە دروست کردوون، خۆتان لە سزای ئەو زاتە بپارێزن.

**مەسەلەی دووەم:**

**وەڵامدانەوەی گەلەکەی بە تۆمەتبار کردنی بەشێتیی، بە هۆی جادوو لێکرانەوەو، کە ئەویش بەس مرۆڤەو، داوا لێکردنییان بەسەردا بەربوونەوەی پارچەکانی ئاسمان و، سەرەنجام ناردنی سزای هەورە سێبەرو، فەوتێنرانیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسۡقِطۡ عَلَيۡنَا كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾ ﴾.

**توێژینەوەی ئەم حەوت ئایەتە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ﴾: بە (ف)ی بەدواداهاتن (تعقیب) هاتوە، یانی: یەکسەر دوای ئەوەی پەیامی خوای پێگەیاندن، ئەوانیش دوا بە دوای ئەوە گوتیان: بەدڵنیایی تۆ تەنیا لەوانەی کە زۆر جادووت لێکراوە، (مُسَحَّر) ڕێژگەی زێدەڕۆیی (مَسْحُور)ە، یانی: جادوو لێکراو، (مُسَحَّر)یش یانی: زۆر جادوو لێکراو، جادووێکی زۆر سەخت و خەستت لێکراوە، تۆمەتباریان کردوە بەوەی: تۆ عەقڵ و هۆشت تەواو نیە، لەبەر ئەوەی جادووت لێکراوە.

٢)- ﴿ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا ﴾، تۆش تەنیا مرۆڤێکی وەك ئێمەی، هی پێشێ فەرمووی: ﴿ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا ﴿١٥٤﴾ ﴾الشعراء، بەڵام لێرە: ﴿ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا ﴾ ئنجا ئەگەر (و)ی لەگەڵدا بێ واتە: یەکەم: تۆ زۆر جادووت لێکراوە، دووەم: تۆش تەنها مرۆڤێکی وەك ئێمە، کەواتە: ئەمە دەبێتە دوو بەڵگە، ئەگەر (و)ی لەگەڵدا بێ، یەکەمیان: زۆر جادووت لێکراوە، دووەمیان: تۆش مرۆڤی وەك ئێمەی، بەڵام ئەوەی

پێشن: هی (صالح) و (ثمود): ﴿ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴿١٥٤﴾ ﴾ تۆش هەر مرۆڤێکی وەك ئێمە، بۆیە هیچ ئیمتیازێکت بەسەر ئێمەوە نیەو، بۆت نیە هیچ بانگەشەیەك بەسەر ئێمەدا، بکەی کە تۆ نوێنەری خوای ﷻ.

٣)- ﴿ وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، بەدڵنیایی ئێمە تۆ لەدرۆکەران دەبینین، ئەم (إن)ە، (مُخَفَّفَة)یە، بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی (ل) خراوەتە سەر ئەو ناوەی دێ: ﴿ وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە تۆ لە درۆکەران دەبینین، دەشگونجێ (ظَنّ) بەمانای دڵنیایی (یقین) بێ، دەشگونجێ بە مانای گومان بێ، گومانمان وایە تۆ لەدرۆکەرانی، چونکە (ظَنّ) جاری وا هەیە بە مانای دڵنیایی دێ و، جاری واشە بەمانای گومان دێ، زاڵ کردنی بوونی شتێك بەسەر نەبوونی، یاخود نەبوونی بەسەر بوونیدا.

٤)- ﴿ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، ئنجا چەند پارچەیەکمان لە ئاسمانەوە بەسەردا بخەخوارێ، (كِسَف) خوێنراوەتەوەو (كِسْف)یش خوێنراوەتەوە، (كِسَف) دەگونجێ کۆی (كِسْفة) بێ، (كِسْفة) یانی: (قِطْعة) پارچە، ئەگەر (كِسْف) بێ بە مانای (قطعة) پارچە دێ، پارچەیەك لە ئاسمانمان بەسەردا ببارێنە، یاخود: چەند پارچەیەك لە ئاسمانان بەسەردا ببارێنە، چونکە ئەگەر (كِسَف) بێ، کۆی (كِسْفة)یە، هەندێ لە زانایان دەڵێن: (كِسَف)یش هەر بە مانای (قِطْعة)یە، بەڵام ئەگەر (كِسْف) بێ، (كِسْف) هەر یەك مانای هەیە واتە: (قِطْعة)، یانی: چەند پارچەیەك لە ئاسمان بەسەرماندا ببارێنە، یاخود لەسەرێوە پارچەیەکمان بەسەردا ببارێنە، پارچەی خرۆکەو ئەستێرەکان.

٥)- ﴿ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، ئەگەر تۆ لە ڕاستانی.

٦)- ﴿ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾، (شوعەیب) گوتی: پەروەردگارم زاناترە بەوەی ئێوە دەیکەن، لێرەدا (أَعْلَم) مەبەست پێی هەڵبژاردن (تفضیل) نیە، بەڵکو مەبەست پێی زێدەڕۆییە، واتە: مەبەست ئەوەنیە کە پەروەردگارم زاناترە لە من، یان زاناترە لە ئێوە، بەڵکو بە ڕەهایی پەروەردگارم زاناترە، بەبێ ئەوەی بەرانبەرەکەی دابنرێ، کە دەفەرموێ: زاناترە، یانی: من هەندێ گوناهو هەڵەو پەڵەتان لێ دەزانم، بەڵام پەروەردگار هەموو شتێکتان لەبارەوە دەزانێ و، هەرچییەك ئێوە دەیکەن، دەیزانێ.

٧)- ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ﴾، بە درۆیان دانا، ئنجا سزای رۆژی سێبەرەکە گرتنی، رۆژی سێبەرەکە (یوم الظلة) عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، ئاوای تەفسیر دەکات، دەڵێ:

(أَصابَهُم حَرٌّ شَديدٌ، فَأَرْسَلَ اللهُ سُبْحانَهُ سَحابَةً فَهَرَبُوا إِلَيْها لِيَسْتَظِلُّوا بِها، فَلَمّا صارُوا تَحْتَها، صِيحَ بِهِم فَهَلَكُوا، وَقيل: أَقامَها اللهُ فَوْقَ رُؤُوسِهِم، وَأَلْهَبَها حَراً حَتّى ماتُوا مِن الرَّمَدِ)[1].

واتە: گەلی مەدیەن، یان گەلی (أَصْحابُ الأَيْكَة)، گەرمایەکی زۆریان تووش بوو، خوا هەورێکی بۆ نارد، ئەوان ڕایان کرد بۆ ژێر هەورەکە، تاکو ببێتە سێبەر بۆیان، کاتێك هەموویان لەژێر سێبەری هەورەکە کۆبوونەوە، [چونکە دەرەوەی سێبەری هەورەکە زۆر گەرم بوو] چریکەیەك لێیدان و هەموویان فەوتان، هەندێکیش گوتوویانە: خوا ﷻ هەورەکەی بەسەر سەریانەوە ڕاگرت و دوایی بوو بە ئاگرو بڵێسەیەك و، هەموویان بوونە خۆڵەمێش.

٨)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾، بە ڕاستیی ئەو ئازارە، ئازاری ڕۆژێکی مەزن بوو.

٩)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ﴾، لەوەدا نیشانەیەکی گەورەو گرنگ هەبوو بۆ خەڵك، لەسەر پەروەردگارێتیی خوا، لەسەر ڕاستیی پێغەمبەران، لەسەر ڕاستیی پەیامی خوا.

١٠)- ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، بەڵام زۆربەیان بڕوادار نەبوون، بەهرەمەند نەبوون لەو دەرس و پەندو عیبرەتانە، کە لە بەسەرهاتی پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) هەن.

١١)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیایی تەنیا پەروەردگاریشت زۆر زاڵی بەبەزەییە، زۆر دەستڕۆیشتوو و باڵا دەستی میهرەبانە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص١١٢.

کەواتە: ئەی موحەممەد! تۆ دڵنیابە پەروەردگارت بۆ دوژمنان و ناحەزانت باڵادەست و زاڵە، دەتوانێ سزایان بدات و لە ژێر دەستەڵات و هەیمەنەی ئەو دەرناچن، هەروەها بۆ تۆو بۆ بڕوادارانێکیش کە شوێنت کەوتوون، میهرەبان و بەزەیی و خاوەنی پەرۆشە، پشتی پێ ببەستەو دڵت خۆش بێ بە میهرەبانیی و بەزەیی خوا، بەرانبەر بە ئێوەو، زاڵیی و زەبر دەستیشیی بەرانبەر دوژمنان و ناحەزانتان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دەرسی کۆتاییە لە تەفسیری سوورەتی (الشعراء) و، لە سی و شەش (٣٦) ئایەت پێك هاتووە، ئایەتەکانی: (١٩٢ - ٢٢٧) تەوەری سەرەکیی ئەو سی و شەش ئایەتە، باسی قورئان و سەرچاوەی لێوە هاتنی و، بەرپەچدانەوەی ژمارەیەك لەو تۆمەتانەیە کە لەلایەن کافرەکانەوە لەبارەیەوە دەگوتران.

ئنجا هەر پەیوەست بەو بابەتەوە، باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان کراوە لەڕۆژی دواییدا، هەروەها باسی ئەوە کە ناگونجێ شەیتانەکان دەستیان لە دابەزاندنی قورئاندا هەبێ، هەروەها چەند ڕێنماییەکی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ کراون، لەبارەی چۆنیەتی هەڵس و کەوتی لەگەڵ خەڵکدا بە گشتیی و خزمانی نیزیکی بەتایبەت.

لە کۆتاییشدا باسی شاعیران کراوە بە خراپ و چاکیانەوە، چونکە یەکێك لەو تۆمەتانەی کافرەکان بەرانبەر قورئان و پێغەمبەر دەیانگوتن، بریتی بوو لە: شیعر بوونی قورئان و، شاعیر بوونی سەرەوەری پێغەمبەران ﷺ!

﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُوا۟ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ

جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكۡرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٠٩﴾ وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴿٢٢٢﴾ يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّهُمۡ فِي كُلِّ وَادٖ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمۡ يَقُولُونَ مَا لَا يَفۡعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْۗ وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{هەروەها ئەم (قورئان)ە بە دڵنیایی دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانییانە ﴿١٩٢﴾ ڕووحی ئەمیندار دایبەزاندۆتە ﴿١٩٣﴾ سەر دڵت، تاكو لە ترسێنەران و هۆشیار كەرەوان بی ﴿١٩٤﴾ (ئەم قورئانە) بە زمانێكی عەرەبیی ڕوون و ڕۆشنكەرەوەیە ﴿١٩٥﴾ بێگومانیش ئەم (قورئانە) باس و خواسی لە كتێبە پێشووەكاندا هەیە ﴿١٩٦﴾ ئایا ئەوە كە زانایانی بەنوو ئیسرائیل بیزانن، نیشانەو بەڵگە نیە بۆیان (لەسەر ڕاستیی تۆ)؟! ﴿١٩٧﴾ ئەگەر گریمان داشمانبەزاندبایە سەر هەندێك عەجەم (یان زمان نارۆشن)ان و ﴿١٩٨﴾ بەسەریاندا خوێندبانەوە، پێی بڕوادار نەدەبوون ﴿١٩٩﴾

بەو شێوەیە خستوومانەتە دڵی تاوانبارانەوە ﴿٢٠٠﴾ کە بڕوای پێ ناهێنن، هەتا سزاو ئازاری بە ئێش دەبینن ﴿٢٠١﴾ کە کت و پڕ، بێ ئەوەی هەست پێ بکەن، بۆیان دێ، ﴿٢٠٢﴾ ئنجا (لەو کاتەدا) دەڵێن: ئایا مۆڵەتمان نادرێ (تۆبە بکەین و چاکە بکەین)؟ ﴿٢٠٣﴾ ئایا پەلە لە هاتنی سزاو ئازاری ئێمە دەکەن؟ ﴿٢٠٤﴾ هەواڵم پێبدە (ئەی موحەممەد!) ئایا ئەگەر ساڵانێك (ژیاندمانن و) بەهرەمەندمان کردن ﴿٢٠٥﴾ دوایی ئەوەی هەڕەشەیان پێی لێیان دەکرێ، بەملیان داهات ﴿٢٠٦﴾ ئایا ئەوەندە ژیانەی پێی بەهرەمەند کراون، چ سوودێکیان پێ دەگەیەنێ (لە دوورخستنەوەی سزاو جەزرەبەی خوادا)؟ ﴿٢٠٧﴾ هیچ ئاوەدانییەکیشمان نەفەوتاندوە، مەگەر ترسێنەریان هەبوون ﴿٢٠٨﴾ بۆ بیرخستنەوەو ئامۆژگارییان و ئێمە ستەمکار نەبووین (لە لە نێوبردنیاندا) ﴿٢٠٩﴾ ئەم (قورئان)ەش شەیتانەکان دایاننەبەزاندوە (وەك کافرەکان دەڵێن) و، ﴿٢١٠﴾ لێشیان ناوەشێتەوەو ناشتوانن ﴿٢١١﴾ چونکە ئەوان لە گوێگرتن (لە وەحیی خواو قسەی فریشتان) دوور خراوەن ﴿٢١٢﴾ دەجا (ئەی موحەممەد!) وێڕای خوا، لە هیچ پەرستراوێك مەپاڕێوە، ئەگەرنا لە سزادراوان دەبی ﴿٢١٣﴾ خزمە نیزیکەکانیشت بترسێنە (وریایان بکەوە) ﴿٢١٤﴾ باڵیشت شۆڕ بکە بۆ بڕوادارانی شوێنکەوتووت (لەگەڵیان میهرەبان بە) ﴿٢١٥﴾ هەر کاتیش سەرپێچییان لێ کردی، بڵێ: من دوورم لەوەی دەیکەن (لەسەرپێچیی و لادانتان) ﴿٢١٦﴾ پشتیشت هەر بە (خوای) زاڵی میهرەبان ببەستە ﴿٢١٧﴾ ئەو کەسەی کاتێك هەڵدەستی بۆ نوێژ (یان ڕادەوەستی لە نوێژدا) دەتبینێ ﴿٢١٨﴾ هەروەها جم و جوڵت لەنێو کڕنووشبەراندا (دەبینێ) ﴿٢١٩﴾ بەدڵنیایی ئەو (خوا) بیسەری زانایە ﴿٢٢٠﴾ ئایا هەواڵتان پێ بدەم شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ ﴿٢٢١﴾ دادەبەزنە سەر هەر درۆزنێکی زۆر گوناهکار ﴿٢٢٢﴾ گوێ هەڵدەخەن (بۆ فریشتان، تاکو زانیارییان لێ بدزن بۆ کاهینەکان) و زۆربەشیان (کاهینەکان) درۆکەرن ﴿٢٢٣﴾ شاعیرەکانیش (کە بێبڕوان) بێمرادە سەرگەردانەکان شوێنیان دەکەون ﴿٢٢٤﴾ ئایا نابینی کە سەراسیمانە بەهەموو شیواندا دەڕۆن و ﴿٢٢٥﴾ شتی

وا دەڵێن کە نایکەن و نەیانکردوە (٢٢٦) بێجگە لەو کەسانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکان دەکەن و، زۆر یادی خوا دەکەن و، دوای ستەملێکرانیان، تۆڵە دەکەنەوە، (ئەوانە لەو حوکمەی پێشوو هەڵاوێرراون) لەمەودواش ئەوانەی ستەمیان کردوە، دەزانن بەچ گەڕانەوەیەك دەگەڕێنەوە (چۆن لە دنیاو دواڕۆژدا بێمرادو بێ ئاکام دەبن)! (٢٢٧)].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(زُبُرِ): (زُبُر: جَمْعُ زَبُور، مِثْل: كِتَاب وَكُتُبْ، أَوْ: جَمْع زِبْر، وَهُوَ مَصْدَرٌ سُمِّيَ بِهِ كَالكِتَاب)، (زُبُر) کۆی (زَبور)ە، (زَبور)یش بە مانای (کتاب)ە، وەك (كِتاب وَكُتُبْ)، یاخود کۆی (زِبْر)ە، ئەویش چاوگە کراوە بە ناو وەك: (كِتاب) کە لە ئەصڵدا وشەی (كِتاب) چاوگە، (كَتَبَ كِتَاباً أَي: كِتَابَةً) یانی: نووسین، بەڵام دوایی (الكِتاب) کە چاوگە لە ئەصڵدا، کراوە بەناو بۆ کتێب.

(ٱلْأَعْجَمِينَ): کۆی (أَعْجَم)ە، واتە: زمان ناڕۆشن، یاخود غەیری عەرەبیی، (العُجْمَةُ: خِلاَفُ الإبانَةِ، وَالإعْجَامُ: الإبْهَامُ، وَالأَعْجَمُ: مَنْ فِي لِسانِهِ عُجْمَةٌ، عَرَبِيّاً كَانَ، أَوْ غَيْرَ عَرَبِيٍّ، اعْتِباراً بِعدم فَهْمِهِم عَنِ العَجَم)، واتە: (عُجْمَة) پێچەوانەی (إبانَة)یە، (إبانَة)ش ڕۆشنکردنەوەیە، (عُجْمَةُ) واتە: ناڕۆشنیی، یان قسە کردن بە شێوەیەکی ناڕۆشن، (إعْجامُ) یانی: (إبْهام) قسەیەك تەم و مژاوی بێ، (أَعْجَم) یش کەسێکە لە زمانیدا ناڕۆشنیی هەبێ، چ لە خودی خۆیدا عەرەب بێ، یان غەیری عەرەب بێ، بەو ئیعتیبارەی کە عەرەب لە زمانی عەجەمان حاڵیی نەبوون، بۆیە هەر زمانێك غەیری عەرەبییان، ناو ناوە (أَعْجَمي)، یان (عَجَمي) یان گوتوویانە: ئەو زمانە (عُجْمَة)ی تێدایە.

هەڵبەتە زمانی عەرەبییش بۆ غەیری عەرەبان هەر عەجەمییە، هەر زمانێك كە لێی حاڵیی نەبووی، بۆ تۆ زمانێكە عوجمەی تێدایەو نارۆشنە بۆت، بەڵام لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار قورئانی بە زمانی عەرەبیی ناردوە، عەرەب غەیری خۆیان بە عەجەم ناو ناوە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا زەمانی عەرەبییش بۆ غەیری عەرەب، عەجەمییە، یانی: تێیناگەن، هەر زمانێك كەسێك لێی حاڵیی نەبوو، ئەو زمانە بۆ ئەو عوجمەی تێدایەو نارۆشنە.

ئەگەرنا زمانی كوردیی بۆ كوردان ڕۆشنە، ئینگلیزیی بۆ ئینگلیزان ڕۆشنە، چینیی بۆ چینییەكان ڕۆشنە، عەرەبییش بۆ عەرەبان، بەڵام عەرەب پەرپەرتە بوون و لاپەڕ ژیاون و، شوێنەكەیان چەقی شارستانیی نەبووەو لە مێژ بووە، دەوڵەتێكی یەككرتوویان نەبووە، لەبەر ئەوە زیاتر بە زمانی عەرەبیی لە نێو خۆیاندا قسەیان كردوە، كە زمانی عەرەبییش ئەو كاتە بەسەر چەند زارێكی تیرەو هۆزەكاندا دابەش بووە، ئیدی زمانەكانی ڕۆمیی و فارسیی و، ئەو زمانانەی دیكەیان ناونـاوە عەجەمیی، لەبەر ئەوەی لێیان حاڵیی نەبوون.

(سَلَكۡنَٰهُ): (أَي: أَدخَلنـاهُ)، ﴿كَذَٰلِكَ سَلَكۡنَٰهُ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ واتە: ناوا بێ بڕواییمان خستۆتە نێو دڵی بێبڕوایانەوە، بەپێی یاسا گەردوونییەكانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا (السُّلُوكُ: النَّفَاذُ فِي الطَّرِيقِ، يُقَالُ: سَلَكْتُ الطَّرِيقَ)، (سلوك) لە ئەصڵدا بریتییە لە چوونە نێو ڕێگا، دەگوترێ: (سَلَكْتُ الطَّرِيقَ) واتە: ڕێگاكەم گرت و چوومە نێوی، كەواتە: (سَلَكْنَاهُ) یانی: (أَدْخَلْنـاهُ) خستمانە نێوی.

(وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ): واتە: بۆیان نەگونجاوە، بۆیان شایستە نیە.

(يَنْبَغِي مُطَاوِعُ بَغَى: أَي: طَلَبَ، أ-يَكُونُ مُسَخَّراً لِلفِعْلِ نحو: النَّار يَنْبَغِي أَنْ تَحْرِقَ الثِّيَابَ، ب- يَكُونُ عَلَى مَعْنَى الإِسْتِئْهَالِ، نَحو: فُلاَنٌ يَنْبَغِي أَن يُعْطَى لِكَرَمِهِ).

واتە: (يَنْبَغِي) (مُطَاوِع)ی (بَغَى)یە، یانی: (طَلَبَ) داوای كرد.

کەواتە: (يَنْبغي) یانی: بۆ ئەو پێویستە:

أ- ئنجا جاری وایە لە ڕووی پێویست بوونی سروشتییەوەیە، وەك: (النَّارُ يَنْبَغِي أنْ تَحْرِقَ الثِّيَابَ) ئاگر بۆی شایستەیە کە پۆشاك بسووتێنێ، ئەوە لە ڕووی سروشتەکەیەوە وایە.

ب- یاخود جاری وا هەیە بە مانای شایستەیی هەیە، دێ، وەك: (فُلاَنٌ يَنْبَغِي أن يُعْطَى لِكَرَمِهِ) فلانکەس پێویستە پێی ببەخشرێ، لەبەر ئەوەی بۆ خۆی بەخشندەیە، واتە: شایستەیی پەیدا کردوە، نەك بە سروشت وابێ.

(لَمَعۡزُولُونَ ): واتـە: کەنارگیـر کـراون، دوور خـراوەن، (الإعْتِـزَالُ: تَجَنُّـبِ الـشَّيْءِ عُمَالَـةً، كَانَـت أَو بَـراءَةً، أَو غَيْرِهِـما، مَعْزُولُـون: أي: مَمْنوعُـونَ بَعْـدَ أَن كانُـوا يُمَكَّنُـون)، (إعْتِـزَال) بریتیـە لـە دووریـی گرتـن لـە شـتێك وەك کارکـردن، یـان هـەروەك حاشـا لێکـردن، یـان جگـە لەوانیـش کەواتـە: (مَعزولـون) ڕێ لێگیـراون، دوای ئـەوەی پێشـتر دەرفەتیـان هەبـووە، شـەیتانەکان پێـش پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ کـە بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتیـی نێـردراوە، دەرفەتیـان هەبـووە گـوێ لـە قسـەی فریشـتان بگـرن، دەرفەتیـان زیاتـر بـووە، بـەڵام لـە دوای ڕەوانەکـرانی موحەممـەد ﷺ ڕاگیـراوەو زۆر بەرتەسـك کراوەتـەوە، هـەروەك لـە سـووڕەتی (الجـن)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَنَّا كُنَّا نَقۡعُدُ مِنۡهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمۡعِۖ فَمَن يَسۡتَمِعِ ٱلۡأٓنَ يَجِدۡ لَهُۥ شِهَابٗا رَّصَدٗا ٩ ﴾، واتـە: ئێمـە پێشـتر لـە ئاسـمان چەنـد شـوێنێکمان هەبـوون، گوێـمان لـە قسـەی فریشـتان دەگـرت، بـەڵام هـەر کەسـێ ئێسـتا گـوێ بگـرێ، بڵێسـە ئاگرێـك بـۆی لـە بۆسـە دایـە، {ناتوانـێ گـوێ بگـرێ}.

(عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ): واتـە: خزمـە نیزیکەکانـت، (العَشـيرةُ: أَهْـلُ الرَّجُـلِ الَّذِيـنَ يَتَكَثَّرُ بِهِـم، أي: يَصِيرونَ لَـهُ بِمَنْزِلَـةِ العَـدَدِ الكامِـل: عـشرة)، عەشـیرەتی پیـاو، واتـە: ئـەو کەسـانەی کـە خۆیـان پـێ زۆر دەکات و، دەوری خۆیـان بـێ قەڵەباڵـغ دەکات و بـۆی وەك ژمـارەی تەواویـان لێـدێ، کـە ژمـارە دە (١٠)یـە، عەشـیرەتیش ئـەو خـزم و خەڵکـەن، کـە دەوری مـرۆڤ قەڵەباڵـغ دەکـەن.

(جَنَاحَكَ ): (جَنـاح) یانـی: بـاڵ، (الطَّـيرُ يَطِـيرُ بِجَناحَيْـهِ)، باڵنـدە بـەدوو بـاڵان دەفڕێ، (وَاخْفِض جَناحَكَ: إِسْتِعارَةٌ أَي: ذُلّ لَهُـم وَتَحَنَّنَ عَلَيْهِـم) ئەمـە خواستنەوەیە: بۆیـان میهرەبـان بـەو لەگەڵیـان بەسـۆزو پـەرۆش بـە، (غَفْض) یانـی: شـۆڕکردنەوە، نزمکردنـەوە، (وَاخْفِـض جَناحَـكَ) یانـی: باڵـت شـۆڕبکەوە، وەك چـۆن باڵنـدە بەچکەکانـی لێـی نزیـك دەبنـەوەو باڵـی بەسـەریاندا دەهێنـێ، تـۆش ئـاوا میهرەبـان بـە، ئەگەرنـا مـرۆڤ باڵـی نیـەو مەبەسـتیش ئـەوە نیـە، چونکـە لەبـن دەسـتیدا جێیـان نابێتـەوە، یانـی: وەك چـۆن باڵنـدە باڵـە شـۆڕە دەکات بـۆ بەچکەکانـی، تـۆش میهرەبـان بـە، ئنجـا ئـەو حاڵەتـەی باڵنـدە، خوازراوەتـەوە بـۆ مانـای میهرەبانیـی و بەزەیـی و شـەفەقەت و سـۆز، یـانی: ئـەو بڕوادارانـەی شـوێنت کەوتـوون، لەگەڵیـان بـە بەبەزیـی و میهرەبـان بـە.

( وَتَقَلُّبَكَ ): هاتـن وچوونـت، هەڵـس و کەوتـت، (التقلُّـب: التَّـصَرُّف) واتـە: هەڵـس و کەوتکردن.

(أَفَّاكٍ ): (الكَثـيرُ الإِفْـك، وَهُـوَ الكَـذِب) (أفّـاك) زۆر خـاوەن (إفـك) (إفك)یـش بریتیـە لـە هەڵبەسـتنی درۆ.

(ٱلْغَـاوُنَ ): کـۆی (غـاوي)ە، (الخَائِبـون، الجَاهِلـونَ عَـنِ اعْتِقَـادٍ فَاسِـد، غَـوى: فَسَـدَ عَيْشُـهُ) (غـاوي) یـانی: بێمـراد، بەئامانـج نەگەیشـتوو، بـێ ئـاکام، هەندێکیـش گوتوویانـە: (غـاوي) کەسـێکە نـەزان بـێ بـە هـۆی بڕوایەکـی خراپـەوە، هەندێکیـش گوتوویانـە: (غـوى) یـانی: ژیانـی تێکچـوو، بـەڵام مـن لـە بەرانبـەر (غـاوي)دا بێمـرادو بـێ ئـاکام، بـە ئامانـج نەگەیشـتوو، دەسـتخەڕۆ، ڕەنجـەڕۆ، دادەنێـم.

(فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ): واتـە: بـە هەمـوو شـیواندا دەڕۆن، بەهەمـوو دۆڵانـدا دەڕۆن، پێشـینانی خۆمـان دەڵێـن: [لـە هەمـوو دیـزان دەبێتـە نەسـکوێ]، یـان [هـەر تیـرە بـە کەنداڵێکـەوە دەنـێ]، دەڵـێ: (يَهِيمُـونَ: أَي يَغْلُـونَ فـي المَـدْحِ والـذَّم) زێدەڕۆیـی دەکـەن لـە ستایشـکردن و زەمکردنـدا، (الهَائِمُ عَلَى وَجْهِهِ: المُخَالِفُ القَصْدَ

الذَّاهِبَ عَلَى وَجْهِهِ) (هائم) کەسێکە ئامانجێکی هەبێ، بەڵام ئەو پێچەوانەی ئەو ئامانجەی بڕوات، وەك پێشینان دەڵێن: سواری سەری خۆی ببێ و، سەری خۆی هەڵبگرێ و نەزانێ بەرەو کوێ دەچێ! (هامَ أي: ذَهَبَ في الأرْض) بە زەوییدا ڕۆیی، بە شیوو دۆڵاندا ڕۆیی، بێ ئەوەی ئامانجێکی دیاریکراوی هەبێ، یان: بەبێ ئەوەی بەرەو ئامانجەکەی بچێ، ڕەنگە ئامانجێکی هەبێ، بەڵام ڕێیەکی گرتۆتە بەر، نایگەیەنێ بە ئامانجەکەی.

(مُنقَلَبٍ): یانی: (أيَّ مَرْجِعٍ يَرْجِعُون) دوایی بۆیان دەردەکەوێ چ جۆرە گەڕانەوەیەك دەگەڕێنەوە، چونکە (مَرْجِع) دەگونجێ بە مانای چاوگ بێ، واتە: (رجوع) دەزانن بەچ جۆرە گەڕانەوەیەك دەگەڕێنەوە، یاخود (مَرْجِع) ناوی شوێنە، واتە: دەزانن دەچنەوە کوێ و بەرەو چ سەرەنجامێك دەچن!

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

ئـەم سـووڕەتی (الشـعراء) بـە باسـی قورئـان دەسـتی پێکـرد، دەسـتپێك بریتـی بـوو لـە شـەش (٦) ئایەتـی دەرسـی یەکـەم، ئـەم سی و شـەش (٣٦) ئایەتـی دەرسـی کۆتاییـش، بـە هەردووکیـان: پێشـەکیی و پاشـەکیی دەبنـە چل و دوو ئایـەت، ئـەو (٤٢) ئایەتـەی سـەرەتای سـووڕەتەکەو کۆتاییەکـەی باسـی قورئانـە، خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئـەم سـووڕەتەدا، دوای ئـەوەی بەسـەرهاتی حـەوت لـە پێغەمبەرانـی (علیهـم الصلاة والسـلام) گێڕایـەوە لەگـەڵ گەلەکانیـان، کـە هەموویـان گەلەکانیـان فەوتێـنراون، لەبـەر ئـەوەی کەللـەڕق و نەسـەلمێن بـوون، ئنجـا گێڕانـەوەی ئـەو بەسـەرهاتانەش، دوو دیـوی هـەن:

دیوێکیـان بـۆ پێغەمبـەرو ﷺ بڕوادارانـی شـوێنکەوتوویەتی، کـە ئەگـەر ئێـوەش خەڵکـە کافـرو هاوبـەش بۆخـوا دانـەرە کەللەڕەقەکـەی ڕۆژگاری خۆتـان، لەگەڵتـان نەیـارەو ناحـەزەو ئایەتـە ژێـر بـاری شـەرع، بزانـن کـە گەلانـی پێشـووش هـەروا بـوون، ئـەوە گەلـی فیرعـەون، کـە مووسـا ﷺ بۆلایـان ڕەوانـە کـرا، ئـەوە گەلـی نـووح ﷺ ئـەوە گەلـی هـوود ﷺ، کـە عـادن، ئـەوە گەلـی ثەمـوود، ئـەوە گەلـی لـووط ئـەوە گەلـی ئیبراهیـم کـە ئیبراهیمیـان بـۆلا ڕەوانـە کـرا، ئـەوە گەلـی ئەصحـاب و لئەیئکـەو مەدیـەن، کـە شـوعەیبیان بـۆ ڕەوانـە کـرا.

دیوێکـی دیکەیـان هۆشـداریی و ترسـاندنە بـۆ کافـرەکان، کـە ئێـوە پەنـد وەربگرن لـەو گەلـە پێشـووانە، سـەرنج بـدەن! لەبـەر ئـەوەی ئامـادە نەبـوون مـل بـۆ پەیامـی خـوا کـەچ بکـەن، پەیامـی خـوا وەربگـرن و بەقسـەی پێغەمبەرەکانیـان (علیهـم الصلاة والسـلام) بکـەن، بـە چ دەردێـك چـوون! ئێـوەش پەنـد لـەوان وەربگـرن و خۆتـان بـەو دەردە مەبـەن کـە ئەوانـی پێچـوون.

خـوا لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بەدڵنیایـی ئـەم قورئانـە دابەزێـنراوی پـەروەردگاری جیهانییانـە، سـەرچاوەکەی پـەروەردگاری جیهانییانـە، ئـەدی هێنەرەکـەی کێیـە؟ ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴾، رووحـی ئەمینـدار دایبەزانـدوە، ئەمـە یەکێکـە لـە ناوەکانـی جیبریـل ﷺ یـان یەکێکـە لـە نازنـاوو وەسـفەکانی، بـە (روح القدس)یـش هاتـوە، بـە (الروح)یـش هـەر هاتـوە، رووحـی ئەمینـدار دایبەزانـدوە ﴿ عَلَىٰ قَلْبِكَ ﴾، بـۆ سـەر دڵـی تـۆ، ئـەی موحەممـەد ﷺ! ﴿ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴾، تاکـو تـۆ لـە ترسـێنەران و هۆشـیار کـەرەوان بـی بـۆ هەمـوو جیهانییـان، نـەك تەنیـا بـۆ هـۆزی قورەیـش و دەورو بەریـان لـە مەککـەدا، یاخـود بـۆ گەلـی عـەرەب بـە تەنیـا، کـە ئەوکاتـە وایـان زانیـوە پێغەمبەرێکـی ناوچەیـی و پێغەمبەرێکـی عەشیرەتییە! بـەڵام نەخێـر، هـەر ئـەو کاتـە خـوا فەرموویەتـی: ئـەوە پەیامێکـە بـۆ هەمـوو جیهانییانـە، ﴿ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴾، بـە زمانێکـی عەرەبیـی رۆشـن، وشـەی: عەرەبیـی یانـی: رۆشـن، ﴿ مُّبِينٍ ﴾یـش، یـانی: رۆشـنکەرەوە، بـە زمانێکـی زۆر رۆشـنکەرەوە، کـە مەبەسـتەکان چـاك رۆشـن دەکاتـەوە، ﴿ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، بەدڵنیایـی ئـەم قورئانـەش بـاس و خواسـی ئـەم قورئانـە، لـە کتێبـە پێشـووەکاندا هەیـە، هەندێکیـش گوتوویانـە: راناوەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەر موحەممـەد ﷺ یـانی: بـاسی موحەممـەد ﷺ لـە کتێبـە پێشـووەکاندا هەیـە، کـە لەهـەر شـوێنێك باسـی موحەممـەد ﷺ کرابـێ، باسـی قورئانیـش کـراوە، ﴿ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، ئایـا بـۆ ئـەوان نیشـانەو بەڵگـە نیـە، لەسـەر ئـەوە کـە قورئـان دابەزێـنراوی خوایـەو، موحەممـەد ﷺ رەوانـە کـراوی خوایـە، کـە زانایانـی بەنـی ئیسـرائیل، واتـە: نـەوەی ئیسـرائیل، وەچـەی ئیسـرائیل، کـە (إسرائيل) نازنـاوی یەعقووبـە ﷺ ئایـا ئـەو زانایانـە بیزانـن، نیشـانە نیـە بـۆ ئـەوان کـە لـە کتێبەکانـی ئەوانـدا باسـی هەبووبـێ؟!

کەواتـە: ئـەم قورئانـەو ئـەم موحەممەدە ﷺ ئێستاشـی لەگەڵدا بێ، باس و خواسـیان لـە کتێبـە پێشـووەکان دا هەیـە، وەك ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (الأعـراف)دا

باسـمان کـردوە، لـەو شـوێنەی کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ ﴿١٥٧﴾ ﴾الأعراف، لـەوێ باسێکی سـەربەخۆمان کـردوە، لەبـارەی هەبوونـی نـاوی موحەممـەد ﷺ بـاسی قورئـان و ئیسـلام لـە کتێبـە پێشـووەکاندا، هەروەهـا لـەو کتێبـەدا کـە تەرخانمـان کـردوە بـۆ ژیانـی پێغەمبـەر ﷺ کتێبـی حەوتەمـی مەوسـووعەی: (الإسلام كما يتجلى فـي كتاب الله)، (خاتَمُ النَّبيِّين مُحَمَّـد ﷺ موجَـزُ سـيرَتِهِ وَبَراهـين نُبُوَّتِـهِ) لەوێـدا باسـی ئەوەمـان کـردوە، کـە چـۆن بـاس و خواسـی موحەممـەد ﷺ لـە کتێبـە پێشـووەکاندا هاتـوە.

ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: ئایـا بـۆ ئـەوان بەڵگـەو نیشـانە نیـە لەسـەر ڕاسـتیی موحەممـەد ﷺو ڕاسـتیی قورئـان، کـە لەلایـەن خـواوە هاتـوە، کـە زانایانـی پێشـوو، واتـە: زانایانـی بەنـوو ئیسـرائیل و، غەیـری بەنـوو ئیسـرائیلیش نـاوی بزانـن و، لـە کتێبەکانـی ئەوانـدا هەواڵـی پـێ درابـێ، کـە پێغەمبەرێـك دێ لـە کۆتایـی دا، کـە سـەدان سـاڵ لـە پێـش پێغەمبـەر (موحەممـەد)دا ﷺ بوونـە؟!

﴿ وَلَوۡ نَزَّلۡنَٰهُ عَلَىٰ بَعۡضِ ٱلۡأَعۡجَمِينَ ﴾، ئەگـەر ئـەم قورئانەشـمان دابەزاندبایـە سـەر هەنـدێ لـە غەیـری عەڕەبـان ﴿ ٱلۡأَعۡجَمِينَ ﴾، واتـە: ئەوانـەی زمانیـان نارۆشـنە، بەنسـبەت عەڕەبانـەوە، گـەلانی دیکـەی غەیـری عـەڕەب، ﴿ فَقَرَأَهُۥ عَلَيۡهِم ﴾، ئنجـا ئـەو بابـا غەیـری عەڕەبـە قورئانـی بەسـەر خوێندبانـەوە، بەسـەر گەلـی عەڕەبـدا ﴿ مَّا كَانُواْ بِهِۦ مُؤۡمِنِينَ ﴾، پێـی بـڕوادار نەدەبـوون.

ئەمـە لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا زیاتـر دەچینـە نێـو وردەکارییەکەیـەوە، ڕەنگـە هەندێکیـان بەهانەیـان گرتبـێ: قورئـان بۆچـی بـۆ بابایەکـی عـەڕەب هاتـوە؟ گوتوویانـە: ڕۆم و فـارس و هینـدو چیـن چەنـدە پێشـکەوتوون! ئـەدی بۆچـی قورئـان لـە نێـو ئەوانـدا نەهاتـوە؟ خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئەگـەر بـۆ سـەر غەیری عەڕەبیشـمان دابەزاندبایـە، هـەر بڕوایـان پـێ نەدەهێنـا، واتـە: لەبـەر ئـەوە نیـە کـە بـە عەڕەبییـە، ئـەوە بیانوویـان بـێ، ئەگـەر بـە عەجەمیی بووایـە، ئـەو کاتـە بیانووەکەیـان بەهێزتـر

دەبوو، دەیانگوت: ئێمە چۆن بڕوا بە پێغەمبەرێك بێنین، كە لە نێو خۆماندا نەهاتوەو، لە زمانەكەی تێناگەین؟!

﴿ كَذَٰلِكَ سَلَكۡنَٰهُ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، ئاوا خستوومانەتە دڵی تاوانبارانەوە، چی خستۆتە نێو دڵیان؟ ﴿ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ ﴾، بێبڕواییمان خستۆتە نێو دڵی تاوانبارانەوە، بە هۆی تاوانەكەیانەوە، دڵ و دەروونێكی پیس و نەگریس و خراپیان هەیە، شایستەی ئەوە نیە ئیمانی بچێتە نێو، بەڵكو كوفری چۆتە نێو، یاخود: ڕستەی پێشێ تەواو بووە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ ﴾، بڕوای پێناهێنن، ﴿ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾، تاكو ئازاری بەئێش نەبینن، بڕوا بە قورئان ناهێنن، تاكو ئازاری بە ئێش نەچێژن، ﴿ فَيَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾، كت و پڕ بەملیان دادێ، ئەو ئازارە بە ئێشە، بێ ئەوەی هەست پێ بكەن، چاوەڕوانیی ناكەن، كە ئازارەكەیان بەملی دادێ.

﴿ فَيَقُولُواْ هَلۡ نَحۡنُ مُنظَرُونَ ﴾، (وا پێدەچێ ئەمە مەبەست پێی ئازاری سەرەمەرگ بێ) ئنجا دەڵێن: ئایا ئێمە مۆڵەت پێدراوین، مۆڵەتمان نادرێ، چاوەڕێمان ناكرێ؟ ﴿ أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ ﴾، خوا دەفەرموێ: ئایا پەلە دەكەن لە سزاو ئازاری ئێمە! ﴿ أَفَرَءَيۡتَ إِن مَّتَّعۡنَٰهُمۡ سِنِينَ ﴾، ئایا دەزانی، دەبینی ئەگەر ئێمە ساڵانێك ئەوانمان بەهرەمەند كردو، لە ژیانی دنیادا هێشتماننەوە، ﴿ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴾، دوایی ئەوەی كە هەڕەشەی پێی لێیان دەكرێ، بۆیان هات ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴾، ئایا ئەوەندە ساڵانەی كە بەهرەمەند كراون لە ژیاندا، چ سوودێكیان پێ دەگەیەنێ و چ دادێكیان دەدا؟ ئایا ئازاریان لێ دوور دەخاتەوە؟ نەمساڵ نا، دە ساڵی دیكە، دە ساڵی دیكە نا، پەنجا ساڵی دیكە، هەر دەمرن، یانی: هەرچەندە ژیان بكەن لە زەویداو، ساڵانێكی زۆر بژین، بەڵام سەرەنجامەكەیان هەر مەرگەو، هەر دەچنەوە بەردەستی خوا ﷻ، كەواتە: ئەوەندە ژیانەی كە دەژیەن و بەهرەمەند دەكرێن، سزاو ئازاری خوایان لێ دوور ناخاتەوەو، چەپاڵەیان نادا لە سزاو ئازاری خوا.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴾، واتە: هیچ ئاوەدانییەکمان نەفەوتاندوە، مەگەر ترسێنەری هەبوون، (قَرْيَة) لە قورئاندا یانی: شاری قەرەباڵغ، یاخود کاتی خۆی دەوڵەتە شارەکان (دویلات المدن) هەبوون، هەر شارێك دەوڵەتۆکەیەك بووە، جاری واش هەبووە کە ئیمپراتۆریەتێك دروست بووە، چەند شارێك و چەند وڵاتێك خراونەتە ژێر یەك بەیداغ و یەك حوکمڕانییەوە، ئەگەرنا (قَرْيَة) بە شاری قەرەباڵغ و گەورە دەگوترێ، بۆیە وشەی (قَرْيَة) زیاتر بە ئاوەدانیی لێکدەدەمەوە، یانی: شاری گەورە و قەرەباڵغ، خەڵکی هیچ ئاوەدانییەکمان لەبەین نەبردوە، مەگەر ترسێنەرانی هەبوون، هۆشیار کەرەوانی هەبوون، ﴿ ذِكۡرَىٰ ﴾، بۆ بیرخستنەوەیان ﴿ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾، ئێمەش ستەمکار نەبووین، یاخود: ئێمە ئەو ڕاستییە باس دەکەین وەك بیرخستنەوەو ﴿ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾ ئێمە ستەمکار نەبووین کە لە بەینمان بردوون، چونکە پێشتر ئاگادارمان کردبوونەوە، ترساندبوومانن و هۆشیار کرابوونەوە، بەڵام ئەوان هەر سوور بوون لەسەر کاری خۆیان، لەسەر کوفرو تاوان و لادان و ستەم و خراپەی خۆیان، بۆیە شایستەی ئەوەبوون خوا سزایان بدات.

ئنجا خوا ﷻ باسی قورئان دەکات ئەم تەوەرەیە زۆربەی تایبەتە بە باسی قورئانەوە، ئنجا یەکێك لە تۆمەتەکان کە ئاڕاستەی قورئانیان دەکرد، دەیانگوت: شەیتانەکان بۆ موحەممەدی دەنێرن، ئەوە یەکێك لە تۆمەتەکان بوو، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴾، (ئەم قورئانە) شەیتانەکان دایاننەبەزاندوە، ﴿ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴾، شایستەیان نیەو ناشتوانن، نەشایستەیانەو نە دەشتوانن، ﴿ إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ ﴾، چونکە ئەوان (شەیتانەکان) کەنارگیر کراون لە گوێگرتن، واتە: لە گوێگرتن لە فریشتان کەنارگیر کراون و دوورن.

کەواتە: کاتێك جیبریل لەگەڵ فریشتەکان وەك پەیکێك پەیامی خوا دەهێنن بۆ موحەممەد ﷺ و، وەحیی خوای بۆ دێنن، شەیتانەکان دوورخراونەوەو دەرفەتی ئەوەیان نیە گوێ بگرن.

﴿ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾، ئنجا خوا ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ دەکات: لەگەڵ خوادا ﷻ لە هیچ پەرستراوێکی دیکە نەپاڕێیەوە، وێڕای خوا، هاوار لە هیچ پەرستراوێك مەبەستە، با هیچ پەرستراوێك نەبێتە داوالێکراوت، ئەو پەرستراوە ساختەو بێ نێوەڕۆکانە، لێیان مەپاڕێوە.

هەڵبەتە لێرەدا ئەمە هۆشدارییە بۆ کافرەکان! ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ هەرگیز لە جگە لە خوا نەپاڕاوەتەوە، بەڵام واتە: جگە لە خوا پاڕانەوە گوناهێکی هێندە گەورەیەو شتێکی هێندە گرنگە، پێویست دەکات، پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ هۆشداریی بدرێتێ لەلایەن خواوە، لەبارەیەوە، ﴿ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴾، ئەگەر لە جگە لە خوا بپاڕێیەوە، لە ئازار دراوان دەبی، لەسزادراوان دەبی، کە دوایی باسی دەکەین: مەرج نیە شیرك و لە جگە لە خوا پاڕانەوە، تەنیا ئازارو سزاو ناڕەحەتییەکانی تەنیا لەدواڕۆژدا بن، بەڵکو لە دنیاشدا هەروایە.

﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾، هەروەها خزمە زۆر نیزیکەکانت بترسێنە، وریاو ئاگاداریان بکەوە، ﴿ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، باڵیشت شۆڕبکە بۆ ئەو بڕوادارانەی شوێنت کەوتوون، بۆ ئەوانەی شوێنت کەوتوون لە بڕواداران، واتە: لەگەڵیان میهرەبان و بە شەفەقەت و بە پەرۆش بە.

﴿ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، ئنجا ئەگەر خزمە نیزیکەکانت، یان هەر کام لە بڕواداران سەرپێچییان لێکردی، بڵێ: من دوورم لەوەی ئێوە دەیکەن، واتە: من حاشا دەکەم لە کردەوە خراپەکەتان، ئنجا چ خزمە نیزیکەکانت بن، چ ئەو بڕوادارانە بن، کە شوێنت کەوتوون، ئەگەر لە شتێکدا هەڵەیان کردو لەبەرنامە لایاندا، تۆ دووریان لێ بکەو موجامەلەی کەس مەکە، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ کاتێك خالیدی کوڕی وەلید خوا لێی ڕازی بێ، ئیجتیهادێکی هەڵەو دەکاو، هەندێ خەڵك دەکوژێ بەناهەق، هۆکارەکەشی ئەوە بووە کە خەڵکەکە گوتوویانە: (صَبَأْنا) بەحیسابی خۆیان، واتە: ئێمە وازمان لەدینی خۆمان هێناو،

هاتووین مسولمان بین، بەڵام دیارە هێندێ لە وشەو موفرەداتی زمانی عەرەبیی، بەپێی زاری عەشیرەتەکان مانای پێچەوانەیان هەبووە، خالید وای لێ حاڵیی بووە کە گوتوویانە: هەڵگەڕاینەوە! ئیدی دەستی کردوە بە کوشتنیان، دوایی پێغەمبەر ﷺ وەك لە فەرمایشتی صەحیحدا هاتوە، دەستی بەرزکردۆتەوەو فەرموویەتی: [اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ] (أخرجه البخاري: ٤٠٨٤) واتە: خوایە! من بەرییم لەوەی خالیدی کوڕی وەلید کردی، پێغەمبەر ﷺ کە ئەم قورئانەی هەموو لە دڵ و سینەدا بووە، یەکسەر ئەم ئایەتەی جێبەجێ کردوە.

چونکە پێغەمبەر ﷺ سەرمەشقی ئەهلی ئیمانە، بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین، بۆیە ئەگەر کەسێك هەڵەیەکی کرد، ئەگەر نیزیکیش بێ، نابێ چاوی لێ بپۆشێ و خاتری بگرێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر خۆشیشی دەوێ و ڕێزیشی دەگرێ، بەڵام لەهەڵەکەیدا لەگەڵی نیەو، دەبێ نوختە بخاتە سەر پیت، تاکو خەڵکێك کە لەدوایی دێن، بزانن ئەو هاوەڵە، ئەو کەسە زۆر نزیکە لە پێغەمبەر ﷺ، لەو حاڵەدا نەیپێکاوە.

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ ﴾

لە کۆتایی هەموو ئەو بەسەرهاتانەدا کە لێرەدا هاتوون، خوای پەروەردگار وشەکانی: (العَزِيز) و (الرَّحِيم)ی زۆر بۆخۆی دووبارە کردوونەوە: زاڵی بەبەزەیی، باڵادەستی میهرەبان، واتە: پشت بە باڵادەستی میهرەبان ببەستە، ئەو زاتەی تۆ دەبینێ کاتێك هەڵدەستی، واتە: کاتێ هەڵدەستی هەر هەڵسانێك بێ، یاخود کاتێك کە ڕادەوەستی، لە نوێژێدا ڕادەوەستی، یاخود کاتێك هەڵدەستیەوە بۆ ئیش و کارت، یاخود بەیانیان کە هەڵدەستی، یان کە لە خەو هەڵدەستی، هەروەها هاتن و چوونت لە نێو کڕنووش بەراندا، ئەوەش دەبینێ، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، بەدڵنیایی هەر خوا بیسەری زانایە.

﴿ هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴾، ئنجا خوا ﷻ دەفەرمووێ: ئایا هەواڵتان پێ بدەم شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ یانی: لەگەڵ کێدا هاودەم و هاوڕازن، لەگەڵ کێدا زیاتر نیزیکییان هەیە، کە خوتخوتەو دنەدانی خراپی بۆ بکەن؟ ﴿ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴾، (تَنَزَّلُ) لە ئەصڵدا (تَتَنَزَّلُ)یە، دادەبەزنە سەر هەر زۆر درۆهەڵبەستەرێکی زۆر گوناهبار، (أَفَّاكٍ) سیغەی زێدەڕۆیی درۆ هەڵبەستەر (آفِك)ە، (أَفَّاكٍ) یانی: (كَثِيرُ الإِفْك) کەسێك کە زۆر درۆ هەڵبەستنی هەیە، (أَثِيمٍ)یش ڕێژەکەی زێدەڕۆیی (آثِم)ە، یانی: گوناهبار، (أَثِيمٍ)یش زۆر گوناهبار، کەواتە: مرۆڤ تاکو دوور لە خواتر بێ و گوناهبارتر بێ، هەروەها تاکو درۆزنتر بێ، شەیتانەکان لێی نیزیکترن.

من هەندێ خەڵکم بینیوە کە جادووگەر بووەو دوایی مسوڵمان بووە، دەیگوت: ئێمە بۆ ئەوەی جادوو بکەین، دەبووایە شتی زۆر خراپ و زۆر پیس، بکەین، یەکێ لەوانە ئایەتەکانی قوڕئان بە شتی پیس بنووسین، کە وامان دەکرد، شەیتانەکان زیاتر هاوکارمان دەبوون، هیچ گومانیشی تێدا نیە ئەوەی خوا دەفەرمووێ، وایە.

﴿ يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ ﴾ شەیتانەکان گوێ هەڵدەخەن، (يُلۡقُونَ) یانی: (يَرْمونَ) فڕێ دەدەن، یانی: گوێیان فڕێ دەدەن، مەبەست ئەوەیە گوێ هەڵدەخەن، لە فریشتەکان ﴿ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ ﴾ زۆربەشیان درۆزنن، یانی: شەیتانەکان درۆزنن، یاخود: ئەو کاهینانەی شەیتانەکان گوێیان بۆ لە فریشتان دەگرن کە زانیارییەك لە فریشتەکان بدزن و بیهێنن بۆ کاهینەکان، ئەو کاهینانە زۆربەیان درۆزنن.

﴿ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلۡغَاوُۥنَ ﴾، شاعیرەکانیش، سەرگەردان و بێمرادەکان شوێنیان دەکەون، لێرەدا مەبەست لە شاعیرەکانی ئەهلی کوفرە، چ لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ، چ لەهەموو ڕۆژگارەکاندا ﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّهُمۡ فِي كُلِّ وَادٖ يَهِيمُونَ ﴾، ئایا نابینی چۆن بە هەموو دۆڵاندا دەڕۆن بە سەرگەردانیی، (واد) یانی: دۆڵ، شیو، (يَهِيمون) واتە: بەسەرگەردانیی و سەراسیمەیی و، بەبێ ئامانجیی دەڕۆن.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە شاعیرەکان، ئەوانەی ئەهلی کوفرن، هەرچی بە دڵیاندا هات و بە ئارەزوویان بوو، دەیڵێن، درۆ بێ، ڕاست بێ، چاک بێ، خراپ بێ، هەروەها وەنێو زۆر بابەتان دەکەون بە ناشارەزایی، واتە: بە پێخواسیی بە نێو دەکەون و، هەر تیرەی بە کەنداڵێکی وەدەنێن، هەر جارە مل لە شیوێك دەنێن، مەبەست ئەوەیە، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە کە: بە نێو شیوو دۆڵاندا دەڕۆن، لێرەدا (وادِ) یانی: شیو، خوازراوەتەوە بۆ بابەت، واتە: هەرجارە بە ناشارەزایی و بە سەرگەردانیی بە دوای بابەتێك دەکەون و، لەبارەی بابەتێکەوە دەدوێن.

﴿ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴾، هەروەها ئەوانە ئەوەی دەیڵێن، ئەنجامی نادەن، یانی: شاعیری وا هەیە هەر لە خۆوە دەڵێ: ناوام و ناوام، بەردەوام شیعر، مەگەر چۆن دەنا زێدەڕۆیی زۆری تێدایە، هەر بۆیە شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێ گوتوویەتی:

وَلَوْلا أنْ الشِّعْرُ بِالعُلَمَاءِ يُزْرِي ... لَكُنْتُ الْيَوْمَ أَشْعَرَ مِنْ لَبِيدِ

ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە شیعر گوتن زانایان ناشیرین دەکات، ئەمڕۆ لە (لەبیدی کوڕی ڕەبیعە) شاعیرتر دەبووم.

(لەبید) شاعیرێکی ناودار بووە، بەڵام شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێ هەرچەندە شیعری هەن، بەڵام زۆر پێیدا نەچۆتە خوار، لەبەر ئەوەی شیعر بۆ زانایان جوان نیەو ناشیرینیان دەکات، هەڵبەتە شیعری چاك چاك هەن، دواتر بابەتێکی تێرو تەسەل لەبارەی شیعرو شاعیرانەوە باس دەکەین، بەڵام بە درێژایی مێژوو، بەزۆریی شاعیرەکان لەو بابەتە بوون و کەمێکیان چاك بوون، وەك دوایی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، مەگەر ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێی بهێنرێ و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داون، ئەوانە هەڵاوێردراون لەو حوکمە، کە سەرگەردانەکان شوێنیان بکەون و، بە هەموو دۆڵ و شیواندا بڕۆن و، شتێك بڵێن، کاری پێ نەکەن، ئەوانە لەوە هەڵاوێردراون و وانین، ئنجا چەند سیفەتێکیان لێ باس دەکات:

یەك: ﴿ ءَامَنُوا ﴾، بڕوایان هێناوە، بەهەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

دوو: ﴿ وَعَمِلُوا الصَّٰلِحَٰتِ ﴾، کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون.

سێ: ﴿ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا ﴾، زۆریش یادی خوایان کردوە.

چوار: ﴿ وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا ﴾، خۆشیان سەرخستوە، دوای ئەوەی ستەمیان لێکراوە، واتە: تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە، نەك بەبێ هۆکارو پاساو هێرش بکەنە سەر خەڵك، بەڵکو ئەگەر کەسێك قسەیان پێ بڵێ و ستەمیان لێبکات، ئەوانیش کە دەرفەت دێنن، دوایی تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە، ﴿ وَجَزَٰٓؤُا سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ﴿٤٠﴾ ﴾الشورى، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ کە شاعیرەکانی ئەهلی شیرك و کوفر دەهاتن قسەیان دەگوت بە پێغەمبەرو ﷺ ئیسلام و هەجوویان دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ بە حەسسانی کوڕی سابیت و کەعبی کوڕی مالیك و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەو، هەندێ لەو هاوەڵانە (خوا لێیان ڕازی بێ) کە شاعیر بوون، شاعیری زەبر دەست بوون، دەیفەرموو: ئێوەش وەڵامیان بدەنەوە، وەك دوایی باسی دەکەین.

﴿ وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾، لەمـەودواش ئەوانـەی سـتەمیان کـردوە، دەزانــن چ جـۆرە گەڕانەوەیـەك دەگەڕێنـەوە، یـان بـۆ چ سـەرەنجامێك دەگەڕێنـەوە؟

﴿ مُنقَلَبٍ ﴾ دەگونجـێ چـاوگ بـێ، (إنقلاب) یانـی: (رجوع) گەڕانەوە، دەشـگونجێ نـاوی شـوێن بـێ واتـە: بۆچ شـوێنێك، بۆ چ سـەرەنجامێك دەچنـەوە! دەزانن چـۆن چۆنی دەگەڕێنـەوەو چ گەڕانەوەیـەك دەگەڕێنـەوە، یاخـود دەزانـن بـۆ کـوێ دەگەڕێنـەوە، کـە بـە تەئکیـد ئەوانـەی سـتەمکارن، دەگەڕێنـەوە بۆ سـزاو جەزرەبـەی خوا ﷻ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ناساندنی قورئان: سەرچاوەکەی، هێنەرەکەی، ئەوەی بۆی هێنراوە، زمانەکەی، باسکرانی لە کتێبە پێشووەکاندا، زانرانی لەلایەن زاناکانی جوولەکەوە، ئەگەر بۆ عەجەمێك هاتبایە خوار، بڕوایان پێی نەدەکرد:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُوا۟ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەم قورئانە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانییانە، واتە: پەروەردگاری جیهانییان ئەم قورئانەی دابەزاندووە، نەك فێری موحەممەد ﷺ کرابێ لەلایەن غوڵامێکی نەصرانیی، یان کابرایەکی ئەعجەمییەوە، یان شەیتانەکان خستبیانە دڵی، یاخود فێریان کردبێ، ئەوە هیچ ئەصڵ و بنەمایەکی نیە، کە دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ ﴾ ڕاناوەکە بۆ قورئان دەچێتەوە، هەرچەندە باسی قورئان نەکراوە بەڕاشکاویی، بەڵام وەك زانایان گوتوویانە: (**عَائِدٌ إِلَى مَعْلومٍ مِنَ الْمَقَامِ بَعْدَ ذِكْرِ آيَاتِ الرُّسُلِ الأَوَّلِين**) دوای ئەوەی باسی نیشانەکانی پێغەمبەرانی پێشوو کراوە، بە سیاق و مەقام دەزانرێ کە

مەبەست پێی قورئانە، چونکە: ئەوەی کە دابەزێنراوەو (روح الأمین) هێناویەتی، بۆ سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ، بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بێ و، بە زمانی عەرەبیی هاتبێ، ئنجا لە کتێبە پێشووەکاندا باسی کرابێ، قورئانە.

﴿ وَإِنَّهُ ﴾ (و) (وَالواو عَاطِفَةٌ عَلَى الجُمَلِ السَّابِقَةِ المُتَضَمِّنَةِ لأَخْبَارِ الأَنْبِيَاءِ) (و) بۆ بادانەوەو گێڕانەوەیە بۆ سەر ڕستە پێشووەکان، کە هەواڵی پێغەمبەرانی پێشوویان گرتوونە خۆیان، واتە: وەك چۆن ئەو بەسەرهاتانە هاتوون و ئەو نیشانانە دابەزێنراون، ئەم قورئانەش دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانییانە.

٢)- ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ عَلَىٰ قَلْبِكَ ﴾، واتە: ڕووحی ئەمیندار دایبەزاندۆتە سەردڵی تۆ، وشەی ﴿ نَزَلَ ﴾ خوێنراوەتەوەش (نَزَّلَ)، ﴿ نَزَلَ ﴾ یانی: دایبەزاندوە، (نَزَّلَ) یانی: زۆری دابەزاندوە، ﴿ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴾ ئەوە دیارە کە ناوی جیبریلە، ڕووح بەکوردیی دەبێتە گیان، بۆ بەشەر، ﴿ ٱلْأَمِينُ ﴾ یانی: ئەمیندار، پێشێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، کە بە (إنَّ) و بە (ل) جەخت کراوەتەوە، (إنَّ) بۆ تەئکیدەو، (ل) بۆ دەستپێکردنە، ئەمە بۆ بەرپەرچ دانەوەی نکووڵییکردنی نکووڵییکەرانە، کە نکووڵیی لەوە دەکەن قورئان لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە، بۆ موحەممەد ﷺ دابەزیبێ.

لە قورئاندا چەند وشەیەك بۆ ناساندنی جیبریل بەکارهاتوون: (جبریل، الروح الأمین، الروح، روح القدس)، لە ئایەتەکانی قورئاندا ئەم چوار ناوە هەموویان هاتوون.

شایانی باسە: لە کاتی تەفسیر کردنی سووڕەتی (یونس)دا، باسێکی تێرو تەسەلمان لەبارەی وەحییەوە کردوە، کە ئەویشمان وەك گوشراوو پۆختەیەك لە باسێکی مەوسووعەی: (الإسلامُ كَما يَتَجَلّى فِي كِتابِ الله) وەرگرتوە، لە کتێبی شەشەمی، کە باسی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەکات.

ئنجا ئایا بۆچی (الروح الأمین) بە فەرمانی پەروەردگاری جیهانییان، دایبەزاندۆتە سەر دڵ و دەروونی پێغەمبەر ﷺ؟

٣)- ﴿ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴾، تاکو تۆ لە ترسێنەران بی، بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، وەك لە شوێنی دیکەدا هاتوە: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴿٢٨﴾ ﴾سبأ، ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ﴿١٥٨﴾ ﴾الأعراف، ئنجا بەچ زمانێك؟

٤)- ﴿ بِلِسَانٍ عَرَبِىٍّ مُّبِينٍ ﴾، بە زمانێکی عەرەبیی ڕۆشنکەرەوە، عەرەبیی یانی: زمانێك کە گەلی عەرەبیی قسەی پێ دەکات، بەڵام وشەی عەرەبیی یانی: ڕۆشن، (أَعْرَبَ عَنْ قَصْدِهِ) واتە: نیەتەکەی خۆی ئاشکرا کرد، ﴿ مُّبِينٍ ﴾ دەگونجێ بەمانای ڕۆشن بێ، ئەگەر لە (أبانَ)ی (لازم)ەوە هاتبێ، دەشگونجێ: ﴿ مُّبِينٍ ﴾ لە (أبان)ی (مُتَعَدِّي)ەوە هاتبێ، واتە: ڕۆشنکەرەوە، (أَبَانَ القَمَرُ) مانگەکە دەرکەوت، بەڵام: (أَبَانَ الْمُدَرِّسُ الدَّرْسَ لِلطُّلاَّبِ) واتە: وانەبێژەکە دەرسەکەی ڕوونکردەوە بۆ قوتابییەکان.

وشـەی (لِسـان) بـە مانـای (لغـة) دێ، لـە هەمـوو قورئانـدا بـەس وشـەی (لِسـان) هاتـوە، چ بـە کـۆ، چ بـە تـاك.

٥)- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەم قورئانە لە کتێبەکانی پێشوواندا هەیە، ﴿ زُبُرِ ﴾ کۆی (زَبور)ە، لە کتێبەکانی پێغەمبەرانی پێشوودا هەیە، یانی: (إِنَّهُ لَفِي كُتُبِ الرُّسُلِ السَّابِقِينِ) لێرەدا مەبەست ئەوەیە: ناوی قورئان لەوێدا هەیە، ئەگەرنا قورئان هەمووی لەوێدا نیە، یانی: باس و خواسی قورئان لەوێدا هەیە، یاخود: هەندێ لە ماناو مەبەستەکانی قورئان، کە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو پێغەمبەرانن، (علیهم الصلاة والسلام) لە کتێبە پێشووەکاندا هەیە.

٦)- ﴿ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، ئایا بۆ ئەوان نیشانە نیە، کە زانایانی بەنی ئیسرائیل بیزانن، (بنو إسرائیل) یانی: نەتەوەی ئیسرائیل کە لە یەعقووب پەیدابوون، ئایا بۆ خەڵکی بەگشتیی بەڵگەو نیشانە نیە، کە قورئان لە کتێبە پێشووەکاندا هەیەو زانایانی بەنوو ئیسرائیل دانیان پێدا هێناوە؟ ئێمە کاتی خۆی باسێکی سەربەخۆمان لە تەفسیری سووڕەتی (الأعراف)دا لەو بارەوە کردوە، ئنجا ئێمە هەر باسێك کە لە هەر

شوێنێك كردوومانه، دوایی له شوێنەكانی دیكه، بەس ئاماژەی بۆ دەكەین و، ناكرێ ئەو باسانه له هەموو شوێنەكان دووباره بینەوه، ئەگەرنا ئەم تەفسیره هەرچەنده ئێستاش قەبارەكەی گەورەیه، بەڵام زۆر گەورەتریش دەبێ.

٧)- ﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴾، ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایه سەر هەندێك عەجەمان، غەیری عەرەبان (أعجمين) كۆی (أَعْجَم)ه، (وَهوَ شَديدُ العُجْمَةِ وَهوَ هُنا مُرادِفٌ لِلعُجَمي) (أعجم) كەسێكه زمانێكی زۆر نارۆشنی هەبێ و لێرەدا هاوواتای عەجەمییه، واته: غەیری عەرەب، ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایه سەر هەندێك له عەجەمەكان، واته: غەیری عەرەبەكان.

٨)- ﴿ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم ﴾، ئنجا بەسەریشیدا خوێندبانەوه.

٩)- ﴿ مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴾، دیسان پێی بڕوادار نەدەبوون.

ئـەوەی پێشـێ كـه دەفەرمـوێ: ﴿ أَن يَعْلَمَهُۥ ﴾ واتـه: نـاوی قورئـان بزانـن، بزانـن كـه قورئـان نـاوی لـه كتێبەكانـدا هاتـوه، یاخـود زانایانـی بەنـوو ئیسـرائیل بزانـن كـه لـه كتێبـه پێشـووەكاندا هەیـه، لێرەش كـه دەفەرمـوێ: ﴿ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم ﴾ واتـه: ئەگـەر بابایەكـی غەیـری عەرەبیـش بەسـەریدا خوێندبانـەوه، كـه زمانـی خۆیشـی نیـه، مانـای وایـه ئـەوه موعجیـزه دەبـوو، ئـەوه كـه عەجەمێك ئـەو قورئانـه ڕوون و ڕەوان و ڕەوانبێـژه بخوێنێتـەوه، ئـەو كاتیـش بڕوایـان پـێ نەدەهێنـا، یاخـود: بڕوایـان پـێ نەدەهێنـا لەبـەر ئـەوەی دەمارگیـرن بـۆ گـەل و نەتـەوەو زمانـی خۆیـان.

واتـه: ئێسـتا پێغەمبەرێـك كـه بـه زمانـی خۆتـان و لـه نەتـەوەی خۆتانـه، بـڕوای پـێ ناهێنـن، ئـەوه كـه پێشـنیاری دەكـەن: بۆچـی بـۆ سـەر غەیـری عەرەبێـك دانەبەزیـوه؟ ئنجا ئەگـەر بـۆ سـەر غەیـری عەرەبێـك دابەزیبایـه، كه ئەو زمانەكەشـی عەجەمییـەو بـه عەرەبیـی بەسـەریدا خوێندبانـەوه، هـەر بڕواتـان پـێ نەدەهێنـا، لەگـەڵ ئەوەشـدا كـه ئـەوه لـه خۆیـدا موعجیزەیـه، یاخـود: بڕواتـان پـێ نەدەهێنـا لەبـەر ئـەوەی داخـراوو دەمارگیـرن.

١٠)- ﴿ كَذَٰلِكَ سَلَكۡنَٰهُ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ۝ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾، هەر بەو شێوەیە، [کە دەبێ هەر بشوبهێته خۆی، هێنده سەرسوڕهێنەرە]، خستوومانەتە نێو دڵی تاوانبارانەوە.

ئەوە کە بڕوای پێ ناهێنن، تاکو سزای بە ئێشی خوا نەبینن، لە ئەنجامی ئەوەدا کە خۆیان ئەهلی کوفرو تاوان و خراپەن، هەرکەسێك ئەهلی کوفرو خراپەش بێ، دڵەکەی وەك چۆن موگناتیش بزمارو دەرزیی و ئاسنەواڵە ڕادەکێشێ، بە هەمان شێوە، دڵی ئینسانی کافرو تاوانباریش، هەر خراپە پەلکێش دەکات بەلای خۆیدا، هەروەك دڵی ئینسانی چاکەکاریش، چاکە پەلکێش دەکات بە لای خۆیدا.

ئـەم ئایەتـە موبارەکـە لـە سـوورەتی (الحجر)یشـدا هاتـوە، بـەڵام لـەوێ دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ۝١٢ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ ۝١٣ ﴾، واتـە: ئـاوا بـەو شـێوەیە دەیخەینـە دڵـی تاوانبارنـەوە، بـڕوای پـێ ناهێنـن و، یاسـای پێشـووانیش ڕابـردوە، یاسـایەك کـە خـوا مامەڵـەی پـێ لەگـەڵ گەلـە پێشـووەکان دا کـردوە، تێپەڕیـوە، ئـەوە یاسـا (سنة)ی خوایـە، هـەر کەسـێك تاوانبـار (مجرم)و خراپـەکار بـێ، بـڕوا بـە قورئـان ناهێنـێ، ئێسـتاش هەروایـەو دوای ئێسـتاش هەروادەبـێ.

﴿ سَلَكۡنَٰهُ ﴾ لـە سـوورەتی (الشعراء)دا بـە ڕابـردوو هاتـوە، بـەڵام لـە (الحجر) دا بـە ڕانەبـردوو هاتـوە: ﴿ نَسۡلُكُهُۥ ﴾ کـە دەلالـەت لەسـەر ئێسـتاو لەسـەر بەردەوامیـی دەکات، ﴿ سَلَكۡنَٰهُ ﴾ و ﴿ نَسۡلُكُهُۥ ﴾ یانـی: (أَدْخَلْنَاهُ) و (وَنُدْخِلُهُ): خسـتوومانەتەنێوی و دەیخەینـە نێـوی.

﴿ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾، بـڕوای پێناهێنـن تاکـو ئـازاری بـە ئێـش نەچێـژن، واتـە: ئـازاری بـە ئێشـی دنیـا، یاخـود ئـازاری بـە ئێشـی ڕۆژی دوایـی.

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ ﴾ ئەمە دوو ئەگەری هەن:

یەکەم: دەگونجێ ئەمە ڕستەیەکی دەستپێکەرەوە (إِسْتِئْنافِية) بێ بەڵام هی پێشێ ڕوون بکاتەوە، واتە: کە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ سَلَكْنَـٰهُ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ ڕستەکە لەوێ تەواو بووبێ، ئنجا ئەم ڕستەیە لەنوێ دەست پێبکات و بفەرموێ: ﴿لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾ بڕوای پێ ناهێنن، تاکو ئازاری بە ئێش نەچێژن.

دووەم: دەشگونجێ: ﴿لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾ لە شوێنی (نَصْب)دا بێ و حاڵ بێ لە ڕاناوی: ﴿سَلَكْنَـٰهُ﴾ واتە: بەو شێوەیە خستوومانەتە دڵی تاوانبارانەوە، لە حاڵێکدا کە ئەوان بڕوای پێ ناهێنن[1].

١١)- ﴿فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾، [سزاو ئازارە بە ئێشەکە، هی دنیا، یان هی دواڕۆژ، یان هی هەردووکیان] کت و پڕ بۆیان بێ، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، ﴿بَغْتَةً﴾ (أَي: فَجْأَةً)، کت و پڕ لە ناکاو، بۆیان بێ، ئەو ئازارو سزایەی دنیا، یان هی دواڕۆژ، یان: هی هەردووکیان.

١٢)- ﴿فَيَقُولُوا۟ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ﴾، ئنجا ئەو کاتە دەڵێن: ئایا ئێمە مۆڵەت نادرێین؟! (هل) (إِسْتِفْهام يُرَادُ بِهِ التَّمَنِّي) (هل) ئایا، پرسیار کردنە، بەڵام مەبەست لێی خۆزگە خواستنە، واتە: خۆزگە ئێمە مۆڵەت بدرێین.

---

(١) فتح القدير: ج٤، ص٤١.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسکردنی ئەو ڕاستییە، کە پەلە کردنی کافرەکان لە هاتنی سزای خوا، شتێکی بێجێیە، چونکە ئەگەر خوا ساڵانێکی زۆریش بەهرەمەندیان بکات لە ژیانی دنیاو نازو نیعمەتەکانی، کاتێك سزایەکەی دێ، ئەو بڕە تەمەنە، هیچ دادیان نادات و، خوا هیچ ئاوەدانییەکیشی بەبێ ئاگادار کردنەوەو ترساندن نەفەوتاندوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكْرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٠٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەو شەش ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴾، ئایا پەلە دەکەن لە (هاتنی) سزاو ئازاری ئێمە؟ ئەمە پرسیار کردنە بۆ سەرسوڕماندن، لە لەخۆبایی بوونی ئەوان، یانی: سەرتان سوڕ بمێنێ کە پەلەمان لێ دەکەن، پەلە لە هاتنی سزای ئێمە دەکەن!

٢)- ﴿ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴾، ئایا تۆ دەبینی (هەواڵم پێ بدە) ئەگەر ساڵانێکیش ئەوانمان بەهرەمەند کردو ژیاندمانن، ﴿ أَفَرَءَيْتَ ﴾ دەگونجێ مەبەست پێی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ و دوێنراوەکە ئەوبێ، دەشگونجێ دواندنەکە بۆ کەسێکی دیارییکراو نەبێ، بەڵکو هەموو کەسێك بگرێتەوە.

٣)- ﴿ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴾، دوایی ئەوەی کە هەڕەشەیان پێی لێ دەکرێ، بۆیان بێ.

٤)- ﴿ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ﴾، چ سوودێکیان پێ دەگەیەنێ، ئەو ئەندازەیەی کە پێی بەهرەمەند کراون، لە تەمەن و ساڵانێك کە پێی ژێنراون؟ (ما)ی ﴿ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم

﴿مَا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ﴾ بۆ پرسیار کردنە: (أيّ غَناءٍ يُغْني عَنْهُم تَمَتُّعهم سَنَوات) چ سوودێکیان پێ دەگەیەنێ، چەند ساڵێك بەهرەمەندکردنیان لە ژیانی دنیا؟!

٥)- ﴿وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ﴾، هیچ ئاوەدانییەکیشمان نەفەوتاندوە، مەگەر ترسێنەران و هۆشیارکەرەوانی هەبوون، واتە: هیچ ئاوەدانییەکمان لە هیچ حاڵەتێك دا نەفەوتاندوە، مەگەر لە حاڵێکدا کە هۆشیارکەرەوەو ترسێنەریان بۆ چووەو ئاگاداری کردوونەوە، بۆ ئەوەی بەڵگەیان لەسەر تەواو بکرێ.

٦)- ﴿ذِكْرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾، واتە: ئەمە بیر خستنەوەیە، ئامۆژگارییەو ئێمە ستەمکار نەبووین.

﴿ذِكْرَىٰ﴾ أ- دەگونجێ گوزارەی نیهادێکی قرتێنراو بێ، واتە: (هَـٰذِهِ ذِكرى) ئەمە بیرخەرەوەیە، ئامۆژگارییە.

ب- دەشگونجێ ڕستەیەکی دەستپێکردوو (جملة مُستأنفة) بێ، بەمجۆرە: ئەوەی گوتمان بیرخەرەوەو ئامۆژگارییەو، ئێمەش ستەمکار نەبووین.

ج- دەشگونجێ ﴿ذِكْرَىٰ﴾ تەواوکەری ڕستەی پێشوو بێ: ﴿وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكْرَىٰ ﴿٢٠٩﴾﴾، هیچ ئاوەدانییەکمان نەفەوتاندوە، مەگەر ترسێنەری هەبوون، بۆ بیرخستنەوەو ئامۆژگارییکردن.

(القرطبي) لێرەدا ئەوەی گێڕاوەتەوە: [عَنِ الزُّهري أنَّ عُمَر بن عَبْدالعزيز كانَ إذا أصْبَح أمْسَكَ بِلِحْيَتِهِ ثُمّ قَرأ: ﴿أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾﴾، ثُمّ يَبْكي وَيَقول:

نَهارُكَ يا مَغْرُورُ سَهْوٌ وَغَفْلَةٌ ... وَلَيْلُكَ نَوْمٌ والرَّدَى لَكَ لازِمُ
تُسَرُّ بِما يَفْنَى وَتَفْرَحُ بِالمُنَى ... كَمَا سُرَّ بِاللَّذّاتِ فِي النَّوْمِ حالِمُ
فَلا أنْتَ فِي الأيْقاظِ يَقْظان حازِمٌ ... وَلا أنْتَ فِي النُّوّامِ ناجٍ فَسالِمُ

وَتَسْعَى إِلَى مَا سَوْفَ تَكْرَهُ غِبَّهُ ... كَذَلِكَ فِي الدُّنْيَا تَعِيشُ الْبَهَائِمُ"[1].

شیعری خۆی نەبووە، بەڵام بەڕاستیی شیعرێکی جوانە:

زوهریی دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ڕەحمەتی خوایان لێبێ کە هاوتەمەنی بووەو هاوچەرخی بووە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز شەشەمین خەلیفەی ڕاشید) کاتێك بەیانیان هەڵدەستا، ڕیشی خۆی دەگرت و ئەم ئایەتانەی دەخوێندن: ﴿ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ ﴾الشعراء، دوایی دەگریاو دەیگوت:

ڕۆژەکەت هەر لە بێ ئاگایی و لە سەهوودای هەی لە خۆبایی! شەوەکەشت هەر خەوەو مردنیشت شتێکی پێویستەو هەر بەملت دادێ، بەوە دڵ خۆش دەبی کە دەفەوتێ و، دڵخۆشی بە هیواو ئاواتەکان، هەروەك چۆن بابای خەوتوو خەون دەبینێ و دڵخۆش دەبێ، نە کاتێك کە بێداری بێدارێکی وای کە کاری خۆت چاك ڕاگرتبێ، نەکاتێك کە لە نوستووانیشی، نوستوویەکی وای سەلامەت بی، بەرەو شتێك هەوڵدەدەی کە دوایی سەرەنجامەکەیت زۆر پێناخۆشە، هەر بەو شێوەیە ئاژەڵانیش لە دنیادا ژیاون.

هەڵبەتە حاشای ئەو، چونکە بەڕاستیی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پیاوێکی زۆر صاڵح و دیندارو خواناس بووەو، حوکمڕانێکی پلەیەك بووە لە دادگەریی و چاکەکاریی دا.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص١١٥.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بەرپەچدانەوەی تۆمەتێکی دیکەی باوی کافرەکان بۆ قورئان، گوایە شەیتانەکان دایانبەزاندۆتە سەر موحەممەد ﷺ! بەوە کە شەیتانەکان دەرفەتی گوێ گرتنیان لە فریشتان نیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَـٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەو سێ ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَـٰطِينُ ﴾، قورئان شەیتانەکان دایاننەبەزاندوە، چونکە هەندێك لە کافرەکان وایانزانیوە یان وا بانگەشەیان کردوە، کە قورئان شەیتانەکان بۆ پێغەمبەریان ﷺ دابەزاندوە، ئەو تۆمەتەیان پاڵداوەتەلا، بۆ وێنە لەوبارەوە ئەم گێڕراوەیە هەیە: **(قالَتْ امْرَأَةُ أَبِي لَهَبٍ لَمَّا تَخَلَّفَ رَسولُ اللهِ ﷺ مِن قيامِ اللَّيلِ، لَيْلَةً أَوْ لَيْلَتَيْنِ لِمَرَضٍ، أَرْجُو أَنَّ شَيْطانَكَ قَدْ تَرَكَكَ)**[1] واتە: ژنەکەی ئەبوو لەهەب، {ئامۆژنی پێغەمبەر ﷺ} کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك، یان دوو شەوان نەچوو بۆ شەونوێژ و دیار نەبوو، بە هۆی نەخۆشییەکەوە، گوتی: ئومێدم وایە شەیتانەکەت وازی لێهێنابێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَـٰطِينُ ﴾ شەیتانەکان قورئانیان دانەبەزاندوە.

٢)- ﴿ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ ﴾، شەیتانەکان شایستەیان نیە، لێیان ناوەشێتەوە، بۆیان نالوێ.

٣)- ﴿ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴾، هەروەها تواناشیان بەسەر ئەوەدا نیە، یانی: (وَما يَسْتَطيعونَهُ) کاری وا ناتوانن و پێیان ناکرێ.

---

(١) رواه البخاري: ٤٩٨٣ ومسلم: ١٧٩٧، ولم يذكرا اسم المرأة بل قالا: امرأة من قريش.

٤)- ﴿ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴾، چونکە شەیتانەکان لە بیستن و گوێگرتن (لە فریشتان) کەنارگیر کراون و دوورخراونەوە، (المَعْزُول: لمُبْعَدُ عَن أمرٍ، فَهُوَ في عُزْلَةٍ عَنْهُ) (معزول) کەسێکە لە شتێك دوور دەخرێتەوەو کەنارگیر دەکرێ.

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الحجر)دا، کاتی خۆی، باسێکی پوختمان لەبارەی شەیتانەکان و گوێ گرتنیان لە فریشتانەوە کردوە، بۆیە لێرە لەسەری ناچین.

**مەسەلەی چوارەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی بە خوا بەیەکگرتن و، هۆشیار کردنەوەی خزمە نیزیکەکانی و، میهرەبانیی نواندن لەگەڵ بڕوادارانی شوێنکەوتوویداو، پشت بەخوا بەستنی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:**

١)- ﴿ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾، ئنجا لەگەڵ خوادا، لە هیچ پەرستراوێکی دیکە مەپاڕێوە، ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ، یاخود لە کەسێکی دیاریی نەکراوە.

٢)- ﴿ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴾، ئەگەرنا لەسزادراوان دەبی، ئەمە لە پەناڕا قسە گوتنە بە هاوبەشدانەران، کە بە هۆی شیرکەوە سزا دەدرێن لە دواڕۆژدا، بەڵام ئایا ئەمە تەنیا مەبەستی پێ ئەوەیە کە لەدواڕۆژدا، شیرك دەبێتە هۆی سزاو ئازار، یاخود لە دنیاشدا؟ ئێمە دوایی قسەیەك لەو بارەوە باس دەکەین، کە شیرك و کوفر، هەر لە دنیاشدا مایەی سزاو ئازارو جەزرەبەی ڕووح و جەستەشن.

٣)- ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾، خزمە زۆر نیزیکەکانیشت بترسێنەو وریایان بکەوە، (العَشيرة: الأدْنَوْنَ مِنَ القَبيلَة، وَوَصَفَهم بِالأَقْرَبِين للتَّأكيد) عەشیرەت ئەوانەی کە لەهۆز لێت نیزیکترن و وەسفکردنیان بە: ﴿ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ بۆ جەختکردنەوەیە، ئەوانەی کە زۆر نیزیکن.

٤)- ﴿ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، باڵت شۆڕ بکە بۆ ئەو بڕوادارانەی شوێنت کەوتوون، ئەمە تەعبیرێکە خوازراوەتەوە، یانی: وەك چۆن باڵندە باڵی خۆی

شۆڕ دەکات بۆ بەچکەکانی، تۆش بە شێوەیەکی نەرم و نیان و میهرەبان و بەبەزەییانە، لەگەڵ شوێنکەوتووانی بڕوادارت دا مامەڵە بکە.

٥)- ﴿ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، ئنجا ئەگەر سەرپێچییان لێکردی عەشیرەتەکەت، یاخود هەندێك لە بڕواداران، بڵێ: من بەریم لەوەی ئێوە دەیکەن (لە کردەوە خراپەکانتان)، پێشتر باسمان کرد: نابێ و نەشبووە پێغەمبەر ﷺ موجامەلەی کەس بکات، هەر کەس هەڵەیەکی کردبێ، با نیزیکترین کەسیش بووبێ، ئاگاداری کردۆتەوە.

٦)- ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، پشتیش بە خوای زاڵی میهرەبان ببەستە، کە بەرانبەر دوژمنانت زاڵەو، بۆتۆو شوێنکەوتووانت، میهرەبانە.

٧)- ﴿ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴾، ئەو زاتەی دەتبینێ کاتێك هەڵدەستی، هەڵدەستی بۆ شەونوێژ، یاخود هەڵدەستی بۆ هەر نیش و کارێك، یاخود هەڵدەستی لەنوێژێدا ڕادەوەستی.

٨)- ﴿ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾، هەروەها کاتێك لەگەڵ کڕنووش بردوواندا، لەگەڵ نوێژکەراندا دێی و دەچی، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: [**فَوَاللَّهِ مَا يَخْفَى عَلَيَّ خُشُوعُكُمْ، وَلَا رُكُوعُكُمْ، إِنِّي لَأَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي**] (أخرجه البخاري: ٤٠٨، ومسلم: ٤٢٤).

واتە: سوێند بە خوا خشووعی ئێوەو، چونە ڕکووعی ئێوە لەمن شێردراوە نیەو، من لە پشتمەوە دەتانبینم.

پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێ لە سیفەتەکانی کە موعجیزە بووە بۆی، ئەوە بووە کە لە پشتەوەش خەڵکی بینیوە!

**بەڵگەی نوێژی بەکۆمەڵ:**

(**قَالَ مُقَاتِلٌ لِأَبِي حَنِيفَةَ: هَلْ تَجِدُ الصَّلَاةَ فِي الْجَمَاعَةِ فِي الْقُرْآنِ؟ فَقَالَ أَبُو حَنِيفَةَ: لَا يَحْضُرُنِي، فَتَلَا مُقَاتِلٌ هَذِهِ الآيَةَ:** ﴿ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ ﴾).

موقاتیل بە ئەبوو حەنیفەی گوت: ئایا نوێژی بە کۆمەڵ ڕێی تێدەچێ لە قورئاندا باس کرابێ؟ ئەبوو حەنیفە گوتوویەتی: لەیادم نیە لە هیچ ئایەتێکدا باس کرابێ، موقاتیل ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ ﴾.

واتە: ئەمە بەڵگەیە لەسەر نوێژی بە کۆمەڵ.

**جێ بەجێکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ فەرمانی خوا:**

ئەم فەرموودەیە هەیە لەوبارەوە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ دَعَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُرَيْشًا فَاجْتَمَعُوا، فَعَمَّ وَخَصَّ فَقَالَ: يَا بَنِي كَعْبِ بْنِ لُؤَيٍّ! أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي مُرَّةَ بنِ كَعْبٍ! أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنْ النَّارِ، يَا بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ! أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ! أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي هَاشِمٍ! أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ! أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا فَاطِمَةُ! أَنْقِذِي نَفْسَكِ مِنَ النَّارِ، فَإِنِّي لاَ أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللهِ شَيْئًا، غَيْرَ أَنَّ لَكُمْ رَحِمًا سَأَبُلُّهَا بِبَلَالِهَا} (أخرجه مسلم: ٢٠٤).

واتە: ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ {ئەبوو هورەیرە لە مەدینە مسوڵمان بووە، بەڵام دیارە لە هاوەڵانی بیستوە، هەندێ لە فەرمایشتەکان کە ئەبوو هورەیرە دەیانگێڕێتەوە لە هاوەڵانی دیکەی بیستوون} کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی، پێغەمبەر ﷺ هۆزی قورەیشی بانگ کرد، هەم بە گشتیی قسەی بۆ کردن، هەم بە تایبەتیی، گوتی: ئەی بەنی کەعبی کوڕی لوئەی! خۆتان لە ئاگر دەرباز بکەن، ئەی بەنی موڕڕەی کوڕی کەعب! خۆتان لە ئاگر دەرباز بکەن، ئەی بەنی عەبدوششەمس! خۆتان لە ئاگر دەرباز بکەن، ئەی بەنی عەبدولمەناف! خۆتان لە ئاگر دەرباز بکەن، ئەی بەنی هاشم! خۆتان لە ئاگر دەرباز بکەن، ئەی بەنی عەبدولموتتەلیب! خۆتان لە ئاگر دەرباز بکەن، ئەی فاتیمە! خۆت لە ئاگر دەرباز بکە، من لەلایەن

خـواوە هیـچ سـوودێکتان پـێ ناگەیەنـم، ئەوەنـدە نەبـێ کـە خزمایەتییـەك هەیـە لـە نێـوان مـن و ئێـوەدا دەمـەوێ، ئـەو پەیوەندیـی خزمایەتییـە بگەیەنـم.

(بَلال: مـا يُبَـلُّ بِـهِ الحَلْـقُ، وَبَـلال أَي: عَطـاءٌ، وَصِلَـةُ الرَّحِـم) (بـلال) یـانی: شـتێك کـە قورگـی پـێ تـەڕ دەکـرێ، ئەوەنـدە ئـاوە، هەروەهـا (بَـلال) بـە مانـای بەخشـین و جێبەجـێ کردنـی خزمایەتیـی دێ.

واتـە: هەقـی پەیوەندیـی خزمایەتییتـان بەسـەرمەوە هەیـە، بۆیـە لـە پێـش هەموو خەڵکـدا، ئێـوە ئـاگادار دەکەمـەوە، کـە خۆتـان لـە ئاگـر بپارێزن.

٩)- ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، بە دڵنیاییەوە خوا بیسەری زانایە.

لەبارەی ئەوەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴾

لەگـەڵ خـوادا لەهیـچ پەرسـتراوێکی دیکـە مەپارێـوە، ئەگەرنـا لـە سـزادراوان دەبـی، یاخـود لـە ئـازار چێشـتووان دەبـی.

## کاریگەریی شیرک و کوفر
## لەسەر تێکچوونی دەروونیی و جەستەیی مرۆڤ

(د. محمد راتب النابلسي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، هەم لە ڕای خۆی، هەم لە پزیشکانێك کە لێیان وەردەگرێ، چەند قسەیەك دێنێ، من یەکسەر وەرگێڕانە کوردییەکەیان دێنم، دەڵێ:

ئێستا پزیشکیگەریی دەروونیی خەریکە تێکەڵ دەبێتەوە لەگەڵ پزیشکیگەریی جەستەیی دا، هەتا زانیاریی بەرەو پێشەوە دەچێ، زیاتر ئەوە دەردەخات، کە ئەو کەم و کوڕییانەی تووشی جەستە دەبن، بە هۆی حاڵەتی دەروونییەوەن، یەکێ لە پزیشکەکانی دڵ بۆی باسکردم گوتی: خوێنبەری دڵ ئەوەندە لووس و صافە، بڕواناکرێ، ناگونجێ هیچ شتێك پێوەی بنووسێ، هەروەها خوێنبەرەکانی نێودوەی دڵ، بە تایبەتی خوێنبەری تاجیی، هیچ شتێك پێوەی نالکێ، بەڵام حاڵەتی دەروونیی وەك: ترس و، کینەو بوغزو، ئەو حاڵەتە دەروونییە خراپانە، کەلێن و شوخت پەیدا دەکەن، لەسەر ئەو دەمارانە، کە زۆر زۆر لووس و صافن، شوخت و کەلێنی بچووکی لەسەر پەیدا دەکەن، دوایی ئەو کەلێن و شوختە گچکانە، مادده چەورییەکان لە کاتێك دا کە خوێن جووڵە دەکات، مادده چەورییەکانیان لەسەر کۆدەبێتەوەو لە ئەنجامی ئەوەدا دەمارەکانی خوێن تەسك دەبنەوە، بە هۆی ئەو حاڵەتە دەروونییانەوە کە شوخت و گرێ لەسەر دەمارەکانی خوێن پەیدا دەکەن.

هەروەها هەندێك لە ئاوسانە پیسەکان، بە هۆی حاڵەتی دەروونییەوە پەیدا دەبن، وەك ئاوسانی کوانی سەرەتانیی، هەروەها هەندێك لە نەخۆشییەکانی برینی گەدەو، نەخۆشیی شەکر و خوێن خەست بوونەوە لە مێشکدا، هەروەها هەندێك

---

(١) تفسير النابلسي ج٦ ص ٣٦٥.

لـە ئازارەکانـی ماسـوولکەکان، دکتۆرێـك پێـی گوتـم: ئەگەر فشـاری خوێـن (ضَغـطُ الدَّم) نـاوی بـنرێ: فشـاری خـەم و خەفـەت (ضَغـط الهَـمّ) زۆر باشـترە، ئنجـا ئـەو حاڵەتـە نەخۆشـییە دەروونییانـەش، بـە دڵنیاییـەوە لـە شـیرکەوە سـەرچاوە دەگـرن.

بێگومانیـش بـە هـۆی ئیمانـەوە، ئینسـان حاڵەتـی نەفسـی، ئـارام و هێمـن دەبـێ و لەو نەخۆشـییانەو لـەو دەرهاویشـتە خراپانـە دوور دەبـێ، هـەر بۆیـەش خـوا ﷻ لـە ئایەتەکانـی: (٨١ و ٨٢)ی سـوورەتی (الأنعام)دا، زۆر جێـی سـەرنجە کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَأَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ أَحَقُّ بِٱلۡأَمۡنِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٨١ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢﴾، واتـە: ئایـا کام لـە دوو کۆمەڵـەکان شایسـتەترن بـە هێمنیـی و ئاسـاییش، ئەگـەر بزانـن؟ ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو بڕوایەکەیـان تێکـەڵ بـە سـتەم، (یـانی: بـە شـیرك) نەکـردوە، ئـا ئەوانـە هێمنیـی و ئاساییشـیان هەیـەو، ئەوانـە ڕێ پێشـاندراون و ڕێـی ڕاسـت گرتووانـن.

هێمنیـی و ئاساییشـەکەش ئەوەیـە کـە لـە دنیاشـدا حاڵەتـی ئەمن و سـەقامگیریی دەروونیـان دەبـێ و، لـە دواڕۆژیشـدا حاڵەتـی ئارامیـی و، هێمنیـی و، ئاساییشـیان دەبـێ و لـە سـزای خـوا بـە دوور دەبـن.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کەسانی زۆر درۆزنی گوناهکار، کە گوێ بۆ فریشتان هەڵدەخەن، تاکو قسەیان لێ بدزن بۆ کاهینەکان و، ئەوانیش زۆربەیان درۆزنن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَـٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَـٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَـٰطِينُ ﴾، ئایا هەواڵتان پێ بدەم شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ ئەم پرسیار کردنە ﴿ هَلْ ﴾ مەبەست پێی گرنگیی هەواڵەکەیە، کە شایستەی ئەوەیە لەبارەیەوە پرسیار بکرێ، شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟

٢)- ﴿ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴾، دادەبەزنە سەر هەر زۆر درۆ هەڵبەستەرێکی زۆر گوناهبار، (كَثِيرُ الإِفْكِ، كَثِيرُ الإِثْمِ).

٣)- ﴿ يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ ﴾ (شەتیانەکان) گوێ هەڵدەخەن، یاخود: (کاهینەکان) گوێ هەڵدەخەن بۆ شەیتانەکان، هەردووک واتای هەن. ﴿ يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ ﴾ (إِلْقَاءُ السَّمْعِ: شِدَّةُ الإِصْغَاءِ حَتَّى كَأَنَّهُ إِلْقَاءٌ لِلسمعِ مِن مَوْضِعِهِ) یانی: زۆر باش گوێگرتن، دەڵێی گوێی فڕێداوە بۆ ئەو شوێنەی ئەو هەواڵەی لێ ببیستێ، یانی: زۆر چاک گوێ هەڵدەخەن.

٤)- ﴿ وَأَكْثَرُهُمْ كَـٰذِبُونَ ﴾، زۆربەشیان (زۆبەی کاهینەکان کە گوێ بۆ شەیتانەکان دەگرن) یاخود زۆربەی شەیتانەکان کە گوێ دەگرن بۆ قسەی فریشتان، درۆزنن.

پێشتر باسمان کرد کە ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (الحِجر)دا[1]، بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوە، بەڵام با ئەم فەرمایشتەش لێرەدا هەر بێنین:

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سَأَلَ أُنَاسٌ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْكُهَّانِ فَقَالَ: (إِنَّهُمْ لَيْسُوا بِشَيْءٍ) فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَإِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ بِالشَّيْءِ يَكُونُ حَقًّا؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ فَيَقْذِفُهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ، فَيَخْلِطُونَ فِيهَا أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ كِذْبَةٍ «وَفِي لفظ للبخاري» فَيَزِيدُونَ مَعَهَا مَائَةَ كِذْبَةٍ)} (أخرجه البخاري: ٥٧٦٢، ومسلم: ٢٢٢٨).

دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کەسانێك پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی کاهینەکان، {کاهین، فاڵچیی، ئەوانەی بانگەشەی زانیاریی نادیار دەکەن و درۆش دەکەن} پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەوانە هیچ نین) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ جاری وا هەیە قسەیەك دەکەن ڕاست دەردەچێ، هەق دەبێ؟! فەرمووی: (ئەوە قسەیەکی هەقە، کە جنە دەیدزێ و دەیخاتە گوێی دۆستەکەیەوە {لە کاهینان} ئەویش زیاتر لە سەد درۆی لەگەڵ تێکەڵ دەکات - لە بێژەیەکی بوخارییدا هاتوە دەفەرموێ-: سەد درۆی لێ زیاد دەکات).

---

(١) هەروەها لە تەفسیری سووڕەتی (الصافات)داو، لەتەفسیری سووڕەتی (الجن)یش دا، بە درێژیی قسەمان لەوبارەوە کردوە.

**مەسەلەی شەشەم:**

**شاعیرانی بێبڕوا، کەسانی سەرگەردان شوێنیان دەکەون، ئەوانەی بە هەموو شیوو دۆڵێکدا دەڕۆن و، ئەوەی دەیڵێن: نایکەن، جگە لە بڕوادارانی کردار باشی، زۆر خوا لە یادی، هەقی خۆنەستێن لەوانەی ستەمیان لێ دەکەن و، ستەمکارانیش سەرەنجامیان شوومە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەو چوار ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ﴾، شاعیرەکان، [شاعیرانی بێبڕوا] سەرگەردانان شوێنیان دەکەون ئەمە سەرزەنشتی شوێنکەوتووانەو، پێشتر چاکتریش سەرزەنشتی ئەوانەیە کە پەیڕەوییان لێکراوە. (الغاون) کۆی (الغاوي)یە، کە کەسێکە بێمراد و بێ ئاکامە، دەسخەڕۆو ڕەنجەڕۆیە.

٢)- ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ﴾، ئایا سەرنج نادەی! بە هەموو شیواندا سەرگەردانانە سەراسیمانە دەڕۆن.

لە بارەی شیعرەوە گوتراوە: (أَعْذَبُهُ: أَكْذَبُهُ) شیعر خۆشترینی درۆترینە، ﴿فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ﴾ شاعیرێك کە پابەند نیە بە شەریعەتەوە، تەشبیه کراوە بە حوشترێکی سەرگەردانەوە، کە سەری خۆی هەڵگرتووەو نازانێ بۆ کوێ دەچێ! چونکە: (الهَائِمُ: الذَّاهِبُ فِي الأَرْضِ عَلَى وَجْهِهِ) (هائم) بەزەوییدا ڕۆیشتووی سەری خۆ هەڵگرتوو، (الهيام: الحِيرَةُ وَالتَّرَدُّدُ فِي المَرْعَى) (هیام) بە

سەرگەردانیی و دڵ لە دڵدان دەگوترێ، (الـوَاد: المُنْخَفِض بَـيْنَ عَدْوَتَـيْنِ) نزمایی و گۆملاییەکە دەکەوێتە نێوان دوو قەدپاڵەوە، ئەو وشەو تەعبیرانە بۆ شاعیرانی بێبڕوای سەرگەردان خوازراونەوە، وەك چۆن حوشترێك بە دۆڵ و شیواندا دەڕوا بێ ئەوەی بزانێ بۆ کوێ دەچێ، ئەو شاعیرانەش بە شیوو دۆڵی بابەتاندا دەڕۆن و، لە هەموو دیزان دەبنە نەسوێ و، بە نێو هەموو بابەتان دەکەون بە پێخواسیی.

٣)- ﴿ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴾، هەروەها شتی وا دەڵێن، کە کاری پێناکەن، واتە: زۆر قسان دەکەن بە زێدەڕۆییەوە کە کردەوەیان پێناکەن، لێرەدا بە دڵنیایی مەبەست پێی شاعیرە بێبڕواو بێ بەندوبارەکانە، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾.

٤)- ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکان دەکەن، ئەوانە خوا جیایان دەکاتەوەو هەڵیانداوێرێ.

٥)- ﴿ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾، (ئەوانەی) زۆریش یادی خوا دەکەن.

٧)- ﴿ وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ ﴾، تۆڵەی خۆشیان دەکەنەوە، دوای ئەوەی ستەمیان لێکراوە، نەك ستەم لە خەڵك بکەن.

٨)- ﴿ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾، ئەوانەش کە ستەمیان کردوە، لەمەودوا بۆیان دەردەکەوێ، چ جۆرە گەڕانەوەیەکی خراپ دەگەڕێنەوە!

هەڵبەتە ئەو ئایەتە موبارەکە ترساندن و وریاکردنەوەیە بۆ هەر کەسێك تاکو هەقی خەڵکی پێشێل نەکات.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾ ئەم شێوازە ئەوە دەگەیەنێ، کە خراپ گەڕانەوەو بۆ شوێنی خراپ، گەڕانەوە، چارەنووسی بەدی ستەمکارانە بە هۆی ستەمەکەیانەوە، (المُنْقَلَب: مَصْدَر مِيمي مِنَ الإنْقِلاب،

وَهـوَ المَصـيرُ وَالمَـآل، لأنَّ الإنْقِـلاب هُـوَ الرُّجـوع)، (مُنْقَلَـب) چاوگێکـی میمیـە لـە (إنْقِلاب)ەوە هاتـوە، یـانی: گەڕانـەوە واتە: بۆیـان دەردەکەوێ چ جـۆرە گەڕانەوەیەکی خـراپ دەگەڕێنـەوە، یاخـود بـەرەو چ سـەرەنجامێکی خـراپ دەچنـەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ﴾ ئەمـە سـێ شـێوازی زێدەڕۆیـی تێـدا هـەن:

یەك: (س)ی ﴿ وَسَيَعۡلَمُ ﴾ بەمزووانە بۆیان بەدەر دەکەوێ، هێندەی پێناچێ.

دوو: ﴿ ٱلَّذِينَ ﴾ ئەوانەی ئەوکارە دەکەن، ئەو سەرەنجامە خراپە بۆیان لە بۆ سەدایە.

سێ: ﴿ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ﴾ ئەمە نادیارییەکی تێدایە، بۆ ئەوەی زەین بە هەرلایەکدا بچێ، یانی: ئەوە هەڕەشەیەکە لەوەسف نایەت، بۆیە نەخراوەتە ڕوو و بەناڕوونیی (غامض) هێڵراوەتەوە.

## کورتە باسێک لە بارەی شیعرو شاعیرانەوە

بەڕێـــــزان!

ئەم کورتە باسە لە چوار بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

یەکەم: بەپێی ئەو سێ ئایەتە بەپێزە، شیعریش وەك هەر قسەیەکی دیکە، دەگونجێ باش و پەسندو ستایشکراو بێ، دەشگونجێ خراپ و زەمکراو بێ، چونکە خوا ﷻ باسی شاعیرانی خراپی کردوەو فەرموویەتی:

١)- ﴿يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ﴾ بێمرادان شوێنیان دەکەون.

٢)- ﴿فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ﴾ بەهەموو دۆڵ و شیوان دا سەرگەدانانە مل دەنێن.

٣)- ﴿يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ﴾ ئەوەی دەیڵێن کاری پێناکەن.

هەروەها باسی شاعیرانی باشیشی کردوەو، فەرموویەتی:

١)- ﴿ءَامَنُوا۟﴾ بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەوشتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

٢)- ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ کردەوە چاکەکانیان کردوون.

٣)- ﴿وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ زۆر یادی خوایان کردوە.

٤)- ﴿وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟﴾ دوای ستەملێکراوییان تۆڵەیان ستاندۆتەوە.

بەڵام ئایەتەکە لێی وەردەگیرێ، کە شیعری خراپ و شاعیرانی خراپ، هۆکاری سەرگەردانیی زیاترن و، لە واقیعیش دا هەروایە.

دووەم: پێغەمبەری خواش ﷺ هەر شێوەی تەعبیرە قورئانییەکەی فەرمووە، لە بارەی شیعرو شاعیرانەوە، بۆ وێنە:

١)- {حَسَنُ الشِّعْرِ كَحَسَنِ الكَلامِ، وَقَبِيحُهُ كَقَبِيحِ الكَلامِ} (أخرجه الدارقطني: (٨٥٦/٤ عن أبي هريرة ﷺ).

واتـە: چاکـی شـیعر، وەك چاکـی هـەر قسـەیەکە، خـراپ و ناقـۆڵای شـیعریش، وەك ناقـۆڵاو دزێـوی هـەر قسـەیەکە.

٢)- {الشِّعْرُ بِمَنزِلَةِ الكَلَامِ: حَسَنهُ كَحَسَنِ الكَلامِ، وَقَبِيحُهُ كَقَبِيحِ الكَلامِ} (أخرجه البخاري فـي الأدب المفرد: ٨٦٥، وَصَحَّحَهُ الألباني).

واتـە: شـیعر وەك هـەر قسـەیەکی دیکەیـە، چاکەکـەی وەك چاکـی قسـەی دیکـە وایـەو، خراپەکەشـی وەك خراپـی قسـەی دیکـە وایـە.

سێیەم: پێغەمبەری خوا ﷺ هەم سەرزەنشتی شیعرو، هەم ستایشیشی کردوە، بە گوێرەی حاڵ و مەقام و، بەپێی جۆری شیعرەکەو، کەسایەتیی شاعیرەکە، بۆ نموونە:

١)- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ نَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْعَرْجِ إِذْ عَرَضَ شَاعِرٌ يُنْشِدُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خُذُوا الشَّيْطَانَ أَوْ أَمْسِكُوا الشَّيْطَانَ، لَأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ رَجُلٍ قَيْحاً، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْراً} (أخرجه مسلم: ٢٢٥٩).

واتـە: ئەبـوو سـەعیدی خودریـی ﷺ دەڵـێ: کاتێـك لـە خزمەتـی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ دەڕۆیشـتین، شـاعیرێك هاتـە پێـشی شـیعری دەگـوت، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمـووی: ئـەو شـەیتانە بگـرن، {بـا چیدیکـە شـیعر نەڵـێ، دیـارە شـیعرەکانی خـراپ بـوون} ئەگـەر پیاوێـك هەنـاوی پـڕ بـێ لـە کێـم و زووخـاو، بـۆی باشـترە کـە پـڕ بـێ لـە شـیعر.

هیـچ گومانـی تێدانیـە مەبەسـت پێـی شـیعری خراپـە، شـیعری خـراپ، خولیـاو بیری خـراپ و تەعبیـری بـێ نەزاکـەت و ناشـیرینی تێدایـەو، هێرشـە بـۆ سـەر خەڵـك، نـاو زڕاندنـی خەڵـك، ناشـیرین کردنـی خەڵـك، هـەق گۆڕیـن بـە ناهـەق، ناهـەق گۆڕیـن بـە هـەق، بـە تەئکیـد پێغەمبـەری خـوا ﷺ مەبەسـتی پـێ ئـەو جـۆرە شـیعرە بـووە.

٢)- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {إِنْ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً} (أخرجه أحمد: ٢١١٩٢، والبخاري: ٥٧٩٣).

واتە: بەدڵنیایی لە شیعردا حیکمەت هەیە، واتە: قسەی بە سوود و چاك، ڕێك و سوود بەخش.

٣)- {عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِحَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ: اهْجُ الْمُشْرِكِينَ، فَإِنَّ رُوحَ الْقُدُسِ مَعَكَ} (أخرجه أحمد: ١٨٦٦٥، والبخاري: ٣٨٩٧، ومسلم: ٢٤٨٦).

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە حەسسانی کوڕی سابیتی فەرموو: (هێرش بکە سەر هاوبەش بۆخوا دانەران (ڕۆح القدس) [جیبریل]یش لەگەڵتدایە، هاوکارییت دەکات).

هاوبەش بۆ خوا دانەران قسەیان بە ئیسلام و مسوڵمانان دەگوت، دەبووایە کەسێك هەبێ بەزمانی خۆیان بیاندوێنێ، بەچەکی خۆیان لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو بێتەوە، کە شیعرە.

٤)- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {إِنْ مِنَ الشِّعْرِ حُكْماً، وَمِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا} (أخرجه إبن أبي شيبة: ٢٦٠٠٢، إسناده حسن).

واتە: لە شیعردا حیکمەت هەن و، لە قسە کردن و ڕوونکردنەوەدا، جۆرێك لە جادوو هەیە.

واتە: کاریگەریی پەنهانی بۆ سەر بەرانبەر، هەیە.

٥)- {عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنهما، قَالَ: رَدِفْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْماً فَقَالَ: هَلْ مَعَكَ مِنْ شِعْرِ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ شَيْءٌ، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: هِيهْ، فَأَنْشَدْتُهُ بَيْتًا، فَقَالَ: هِيهْ، ثُمَّ أَنْشَدْتُهُ بَيْتًا، فَقَالَ: (هِيهْ)، حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةَ بَيْتٍ} (أخرجه مسلم: ٢٢٥٥، والبخاري في الأدب المفرد: ٨٦٩، وابن ماجه: ٣٧٥٨، وابن حبان: ٥٧٨٢، والطيالسي: ١٢٧١، والحميدي: ٨٠٩ وغيرهم).

واتـە: عەمـری کـوڕی شـەرید لـە بابیـەوە دەگێڕێتـەوە (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) دەڵـێ: لەپشـت پێغەمبـەرەوە ﷺ سـوار بووبـووم، {حوشـتر بـووە، ئێسـتر بـووە، ئەسـپ بـووە، گوێدرێـژ بـووە} فەرمـووی: لـە شـیعری ئومەییـەی کـوڕی ئەبـی صەڵت دەزانـی؟ گوتـم: بەڵـێ، فەرمـووی: بـۆم بڵـێ، دێـڕە شـیعرێکم بـۆ گـوت، فەرمـووی: بڵـێ، دێڕێکـی دیکەشـم بـۆ گـوت، فەرمـووی: بڵـێ، ئیـدی هـەر بەوشـێوەیە، هەتـا سـەد دێـڕە شـیعرم بـۆ گـوت.

پێغەمبـەر ﷺ دیـارە پێـی خـۆش بـووە، چونکـە شـیعرەکانی مانـای چـاك و تەعبیـری ڕێـك و جـوان و قسـەی ئەسـتەق بـوون.

چوارەم: پێغەمبەری خوا ﷺ وەك چەكێكی كاریگەر، لە بەرانبەر شیعری كافراندا، سوودی لە شیعر وەرگرتووە، شاعیرانی لەو بارەوە هانداون، بۆ وێنە:

أ- {عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَنْزَلَ فِي الشِّعْرِ مَا أَنْزَلَ، فَكَيْفَ تَرَى فيه؟ قَالَ: إِنَّ الْمُؤْمِنَ يُجَاهِدُ بِسَيْفِهِ وَلِسَانِهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَكَأَنَّمَا تَرْمُونَهُمْ بِهِ نَضْحَ النَّبْلِ} (أخرجه أحمد: ٢٧٢١٨، وابن حبان: ٥٧٨٦، وغيرهما).

واتـە: کەعبـی کـوڕی مالیـك ﷺ بـە پێغەمبـەری ﷺ گـوت: خـۆت ئـاگاداری لەبارەی شـاعیرانەوە ئـەوە دابەزێـنراوە، کـە دابەزێـنراوە، ئنجـا ئایـا چـی تێـدا دەبینـی و چۆنـە؟ پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: (بـە دڵنیاییـەوە بـڕوادار بـە شمشـێری و بـە زمانی تێدەکۆشـێ لـە پێنـاوی خـوادا، سـوێند بـەو کەسـەی گیانـی منـی بەدەسـتە، ئـەو شـیعرانەی کـە لـە دژی کافـرەکان دەیڵێـن، وەك تیریـان پێـوە بنێـن {ئەوەنـدە بـە ئـازارە بۆیـان}.

کـە دیـارە لـە بەرانبـەر شـیعری خراپـی ئەوانـدا، مسـوڵمانانیش بەرگریـان کـردوە لـە ئیسـلام و لـە قورئـان و لـە پێغەمبـەر ﷺ، لێـرە دەرفـەت نیـە ئەگەرنـا لـەو بـارەوە شـیعر زۆرن، هـەم لـە سـیرەی (ابـن هیشـام)دا، هـەم لـە سـەرچاوەکانی دیکـەدا، شـیعری زۆر هاتـوون.

ب- {عَنْ ابن عَبّاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ فِي عُمْرَةِ الْقَضَاءِ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ يَمْشِي بَيْنَ يَدَيْهِ، وَهُوَ يَقُولُ:

خَلُّوا بَنِي الْكُفَّارِ عَنْ سَبِيلِهِ

الْيَوْمَ نَضْرِبْكُمْ عَلَى تَنْزِيلِهِ

ضَرْباً يُزِيلُ الْهَامَ عَنْ مَقِيلِهِ

وَيُذْهِلُ الْخَلِيلَ عَنْ خَلِيلِهِ

فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: يَا ابْنَ رَوَاحَةَ! بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَفِي حَرَمِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ تَقُولُ الشِّعْرَ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: خَلِّ عَنْهُ، فَلَهُو أَسْرَعُ فِيهِمْ مِنْ نَضْحِ النَّبْلِ} (أخرجه الترمذي: ٢٨٤٧، والنسائي في الكبرى: ٣٨٥٦، والبزار: ٢٠٩٩، وابن حبان: ٥٧٨٨، وابن خزيمة: ٢٦٨، وعبد بن حميد: ١٢٥٧، وأبو يعلى: ٣٤٤٠).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە عومرەی گێڕراوە (عُمْرَةِ الْقَضَاءِ)دا {واتە: لە ساڵی حەوتەمدا، چونکە لە ساڵی شەشەمدا، ڕێیان لێگیراو صوڵحی حودەیبییەی لێکەوتەوە، ساڵی داهاتوو کە ساڵی حەوتەمی کۆچییە، چوون ئەو عومرەیەیان گێڕایەوە} کاتێ دەچووە نێو مەککەوە، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە لەپێش دەستی پێغەمبەرەوە ﷺ دەڕۆیی، ئەو شیعرەی دەگوت:

ئەی نەوەی کافران ڕێی پێغەمبەر چۆڵ بکەن

ئەمڕۆ لێتان دەدەین لەسەر دابەزاندنی قورئان

لێدانێك کە سەرتان لەسەر ئەو شوێنەی کە لەسەری دانراوە لابچێ[1].

لێدانێك وابکات خۆشەویست ئاگای لە خۆشەویستی نەمێنێ.

---

(١) واتە: سەرتان لە جەستەتان جیا بکاتەوە.

عومەر خوا لێی ڕازی بێ گوتی: ئەی کوڕی ڕەواحە! لە حەرەمی خواداو، لە پێش دەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەو شیعرە (توندە) دەڵێی؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لێیگەڕێ (عومەر!) بە خوا ئەم (شیعر)ە خێراترە، لە کاریگەریی لە کافرەکاندا، لە خێرایی کاریگەریی تیر تێیاندا.

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ هەم شاعیرانی هان داون و، هەم لە شیعریش بەهرەمەند بووەو، لە بواری خۆیدا، وەك چەکێك بەکاری هێناوە، کە ئەوەش شتێکی زۆر لۆژیکییەو زۆر ڕاست و ڕەوانە، کە ئێمە پێویستە لە هەر بوارو، مەیدانەدا بە چەکی شایستەی خۆی شەڕ بکەین و، بەشێوازی گونجاوی خۆی لەگەڵ نەیارانی ئیسلامدا ڕوو بەڕوو ببینەوە.

لێرەش دا کۆتایی بە تەفسیری سووڕەتی (الشعراء) دێنین، لە خوای پەروەردگار داواکارم یارمەتییمان بدات، پەندو عیبرەتی زۆر لە بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەربگرین.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، بمانڕازێنێتەوە بەو ڕەوشت و بەهاو ئاکارە بەرزانەی، کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پێیان ڕازاونەوەدو، زیاتر بەهرەمەندمان بکات لە ڕووناکیی و بەرەکەتی قورئان و، یارمەتییمان بدات، کە وڵات و کۆمەڵگامان بە ڕۆشنایی قورئان زیاتر ڕۆشن بکەینەوەو، بە ڕووحی قورئان زیاتر ببووژێنینەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێــزان!

ئەمڕۆ کـە چـوار (٤)ی شـەووالی سـاڵی (١٤٤٠)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠١٩/٦/٧)ی زایینـی، خـوا پشـتیوان بێـت، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (النَّمـل).

## پێناسەی سووڕەتی (النَّمْل) و بابەتەکانی

### ١)- ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە زیاتـر بـە نـاوی (سُـورَةُ النَّمْـل) نـاسراوە، وەك لـە (صحیـح البُخـاري)و (جامـع الترمـذي)دا هاتـوە، بـەڵام هـەر کام لـە نـاوەکانی: (سُـورَةُ سُـلیمان)و (سُـورَةُ هُدهُد)یشـی، بـۆ بەکارهێـنراون، شـایانی باسیشـە کـە وشـەکانی: (النَّمـل)و (هدهـد) تەنیـا لـەم سـووڕەتەدا هاتـوون و، بەسـەرهاتی پێغەمبـەر سـولەیمان ﷺ لـە هیـچ سـووڕەتێکدا، وەك ئـەم سـووڕەتە بـە درێژیـی نەهاتـوەو، بەسـەرهاتی لەگـەڵ مێرووڵـە قسـەکردن و بیسـتنی، پاشـان ناردنی هودهود بۆ لای شـاژنی (سـبأ)و، هاتنی شـاژنی (سـبأ) بـۆ پایتەختـی حوکمڕانیـی سـولەیمان (قـودس) لـە فەڵەسـتین، تەنیـا لێـرەدا باسـکراوە.

### ٢)- شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـووڕەتە سـووڕەتێکی مەککەییـە و، زانایـان لەسـەر مەککەیـی بـوونی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە یەکدەنگـن، لـە تەفسـیرەکاندا نەکەوتۆتـە بەرچـاوم لـە بـارەی هیـچ ئایەتێـکی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەوە، کـە مەدینەیـی بـێ، ڕاجیاییـان هەبـێ، هەموویـان لەسـەر مەککەیـی بـوونی سـەرجەم ئایەتـەکانی یەکدەنگـن، جـاری وایـە

قسـەیەکی ڕیزپـەڕ دەکـرێ، کـە زانایـان ئیعتیبارێکیان بۆ دانەنـاوە، هیـچ بەڵگەیەکیشی لـە پشـتەوە نیـە، ئـەوە شـایانی بـاس نیـە.

### ٣)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزیندا:

ئـەم سـوورەتە لـە ڕیزبەندیـی (مصحـف)دا، ژمـارە (٢٧) و، لـە ڕیزبەندیـی دابەزیـن (ترتیـب النـزول)دا، ژمـارە (٤٨)، دوای سـوورەتی (الشـعراء) و، پێـش سـوورەتی (القصـص)، دابەزیـوە، واتـە: هەمـان ئـەو شـوێنەی کـە ئێسـتا لـە موصحەفـدا هەیەتی، لـە ڕیزبەندیـی دابەزینیـش دا، هـەر کەوتۆتـە نێـوان ئـەو دوو سـوورەتەوە.

### ٤)- ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە، بە سێ جۆر هاتوە:

أ- هەندێك بە (٩٣).

ب- هەندێك بە (٩٤).

ج- هەندێك بە (٩٥) ئایەتیان داناون، بەڵام زیاتر ژمارەی (٩٣) باوە، لە موصحەفەکانی کە لەبەر دەستمانن، ژمارە (٩٣) نووسراوە، پێشتر هۆکاری جیاوازیی ژمارەی ئایەتەکانمان باسکردوە، کە بریتیە لە کورتیی و درێژیی ڕستەکان و شوێنی وەستانەکان، واتە: یەکێك لە زانایان پێی وابووە ئەو ڕستە قورئانییە تاکو کۆتایی دەچێ، یەکێکی دیکە پێی وابووە دەبێ لە نێوەڕاستیدا بوەستی و، بۆتە دوو ڕستە، بۆیە لە هەندێکیاندا ڕستەیەك بۆتە دوو ئایەت و، لە هەندێکیان دا هەر یەك ئایەتە، درێژیی و کورتییەکە لێرەدایە، نەك یەکێك بڵێ: ئەو ئایەتە هەیەو، یەکێکیان بڵێ: ئەو ئایەتە نیە.

## ٥)- نێوەڕۆکی:

ئەم سوورەتە هەمان نێوەڕۆکی سوورەتە مەککەییەکانی دیکەی هەیە لە:

١- باسی خوا بەیەککرتن و نیشانەکانی خوا ﷻ لە مرۆڤ و دەوروبەرو گەردووندا.

٢- باسی قورئان و پێغەمبەرایەتیی و وەحیی.

٣- باسی ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ و سزاو پاداشتی خوا.

٤- باسی بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لەگەڵ گەلەکانیاندا، کە چییان بەسەرهاتوە؟ کە بەزۆریی وابووە سزا بدرێن، لە ئەنجامی لاملیی و سەرپێچییکاربوونیان دا، لەوەی پێغەمبەران بۆیان هێناون.

## ٦)- تایبەتمەندییەکانی:

لە ئەنجامی تێوەڕامان و سەرەنجدانی خۆم، شەش (٦) تایبەتمەندییم بەرچاو کەوتوون، کە تایبەتن بەم سوورەتەوە:

تایبەتمەندیی یەکەم: تەنیا لەم سوورەتەدا هەردووك وشەی: (نَمْلَة والنَّمْل) لە ئایەتی ژمارە (١٨)داو، وشەی: (هُدْهُد) لە ئایەتی ژمارە (٢٠)دا هاتوون.

تایبەتمەندیی دووەم: هەروەها بەسەرهاتی سولەیمان عليه السلام و شاژنی (سبأ)، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، کە لە ئایەتەکانی: (١٥ - ٤٤)دا، چەند جارێك بە ناوهێنان و بە ئاماژە باسکراون، هەڵبەتە ناوی سولەیمان لە قورئان دا زۆر هاتوە، بەڵام وەك بەسەرهات لەگەڵ (ملكة سبأ)دا، تەنیا لێرەدا هاتوە.

تایبەتمەندیی سێیەم: هەروەها باسی هێنانی تەخت و کورسیی شاژنی (سبأ) لە چاو تروووکانێکدا لە لایەن کەسێکەوە، کە زانیاریی کتێبی لەلا بووە: ﴿ٱلَّذِی عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٤٠)دا.

تایبەتمەندیی چوارەم: تەنیا لەم سوورەتەدا، لە بەسەرهاتی صالح عليه السلامدا، باسی نۆ کۆمەڵ، یان نۆ کەس ﴿تِسْعَةُ رَهْطٍ﴾کراوە، لە ئایەتی ژمارە: (٤٨)دا، کە دەگونجێ مەبەست پێی نۆ کەس بێ، کە لە خراپەکارییدا هەر کامێکیان وەك گرووپێك وابوون، یاخود وشەی (رَهط) هەر لەسەر ئەسڵی مانا زمانەوانییەکەی خۆیەتی، نۆ گرووپی تێکدەر.

تایبەتمەندیی پێنجەم: تەنیا لەم سوورەتدا باسی (دَآبَّةُ الأَرْض)کراوە، لە ئایەتی ژمارە (٨٢)دا، واتە: ژیانداری زەوی و، پێڕۆی زەوی و، زیندەوەری زەوی، لە سوورەتی (سبا)دا: ﴿مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ﴾سبأ: ١٤، لەوێدا باسی (دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ) کراوە، بەڵام مەبەست پێی مۆرانەیە، مۆرانە لە گۆچانەکەی سولەیمانی عليه السلام داوە، بەڵام لێرەدا ئەم (دَآبَّةُ الأرض)، بەو شێوەیە کە لێرە پێناسە کراوە: ﴿أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾﴾، تەنیا لێرەدا هاتووەو کە لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ ئاماژەی پێدراوە، کە دوایی دەیگەینێ، کە ئەوە یەکێکە لە هاتنی نیشانە گەورەکانی ئاخیر زەمان.

تایبەتمەندیی شەشەم: تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی جووڵەی چیایەکان کراوەو، وەك ڕۆیشتنی هەور لە حاڵێکدا، کە بابای بینەر وا دەزانێ وەستاون: ﴿وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾﴾، کە لە ئایەتی ژمارە (٨٨)دا، هاتوە.

**٧)- دابەشکردنی بۆ چەند دەرسێك:**

ئێمە (٩٣) ئایەتەکەی ئەم سوورەتەمان، بۆ هەشت (٨) دەرسان دابەشکردوون، بەم جۆرەی خوارێ:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی: (١ - ٦)، واتە: شەش (٦) ئایەت، پێناسەی قورئان و بڕواداران و بێبڕوایان، ئنجا سەرەنجامی شوومیی بێبڕوایان.

دەرسی دووەم: ئایەتەکانی: (٧ - ١٤)، واتە: هەشت (٨) ئایەت، کورتەیەك لە بەسەرهاتی مووسا ﷺو، ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەی و، گەلە گومڕاییەکەی دا بە گشتیی.

دەرسی سێیەم: ئایەتەکانی: (١٥ - ٤٤)، واتە: سی (٣٠) ئایەت، بەسەرهاتی داوودو سولەیمان، دیارە ئاماژەیەك کراوە بە داوود ﷺ وەك بابی سولەیمان ﷺ ئەگەرنا زیاتر بەسەرهاتی سولەیمان باسکراوە، کە بەلای شیوێکدا ڕۆیشتوە، بە ناوی (وادي النَّمل)و گوێی لە قسەی مێروولەیەك بووە، گوتوویەتی: ئەی مێروولەکان! بچنە نێو کونەکانی خۆتان، بۆ ئەوەی سولەیمان و سوپایەکەی تێکتان نەشکێنن، بەبێ ئەوەی هەستتان پێبکەن، پاشان لێپێچینەوەی سولەیمان لە هودهود، کە دیار نەبووە، کە تێمە لە کوردەوارییدا پەپوو سولەیمانەی پێ دەڵێین، ئەویش دوایی دێ و، هۆی دیار نەبوونەکەی خۆی بۆ باس دەکات، کە چووە سەردانی (سبأ)ی کردوەو، لەوێ شاژنێك حوکمیان دەکات، بینیویەتی، کە خۆی و خەڵکەکەی کڕنووش بۆ خۆر دەبەن.

دوایی سولەیمان نامەیەکی پێدا دەنێرێو، شاژنیش ڕاوێژ دەکات بە کۆڕو مەجلیسەکەی خۆی، ئەوانیش هەموویان هەر ئامادەییەك دەردەبڕن، بەڵام ئەو دەڵێ: دیارییەکی بۆ دەنێرم، بزانم داخۆ وەڵامەکەی چی دەبێ؟ کاتێك دیارییەکە دەگاتە سولەیمان ﷺ، دەڵێ: ئایا ئێوە دەتانەوێ هاوکاریی من بکەن بە ماڵ و سامان؟ ئێوە بە دیاریی خۆتان دڵخۆشن و لە لای من هیچ نیە، ئنجا هەڕەشەیان لێدەکات، کە ئەگەر لەگەڵی تەبا نەبن، سوپایان بۆ دەنێرێ، چونکە ئەو بانگێشتی شاژنی کردوە کە بێ و پێکەوە دیالۆگ و وتووێژ بکەن.

سەرەنجام شاژن دێ، بەڵام بەر لەوەی بێت کورسیی و تەختەکەی کە لەسەری دادەنیشێ، سولەیمان ﷺ وەك موعجیزەییەك بۆی دێنێتە ئەوێ لە چاوتروووکانێکدا، ئنجا کاتێك عەرش و کورسییەکەی خۆی پێشان دەدەن، دەڵێن:

ئایا ئەوە هی تۆیە؟ بەڵام دەستکارییان کردوە، دەڵێ: وەك ئەو وایە، دوایی سولەیمان ﷺ پێی دەڵێ: بچێتە نێو ئەو کۆشکەوە، کۆشکەکەش زەوییەکەی شووشە بەند کراوەو، وا هاتۆتە بەرچاو کە لە ژێریدا رووبار دەڕواو، ڕەنگە ئاویشی تێدا بووبێت، ئیدی ئەو ئافرەتە دەلینگی هەڵدەکات، بۆ ئەوەی تەڕ نەبێ، بەڵام سولەیمان ﷺ دەڵێ: ﴿صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ﴾، ئەوە کۆشکێکە لە شووشەی لووس، شووشە بەند کراوە، ئیدی ئەو ئافرەتە کە ئەو هەموو نیمکانیەتە زۆرە دەبینێ، دەزانێ ئەوە لەسەرووی ئاستی بەشەرەوەیە، وێڕای نیشانەکانی دیکە، بۆیە سەرەنجام مسوڵمان دەبێ و بۆ خوا گەردەنکەچ دەبێ.

دەرسی چوارەم: ئایەتەکانی: (٤٥ - ٥٣)، واتە: نۆ (٩) ئایەت، بەسەرهاتی صالح ﷺو گەلەکەی ثەموود باسکراوە، کە بانگیان دەکات بۆ لای خوا ﷻ: پارێز لە خوا بکەن و، پەلە نەکەن لە هاتنی سزا، بەڵام نۆ کەس، یاخود نۆ گرووپ، لە گەلەکەی هەر خەریکی تێکدان و خراپەکاریی دەبن و، تەگبیر دەکەن و پیلان دادەڕێژن، بۆ صالح ﷺ کە بیکوژن، خۆی و ماڵ و خێزانی، بەڵام پیلانەکە سەری خۆیان دەخوات و، سەرەنجام گەلی ثەموود لە بەین دەچن.

دەرسی پێنجەم: ئایەتەکانی: (٥٤ - ٥٨)، واتە: پێنج (٥) ئایەت، بەسەرهاتی لووط ﷺو گەلەکەیان تێداخراوەتە ڕوو، کە ئەوانیش وەك گەلی ثەموود، سەرەنجامێکی شوومیان دەبێ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە نامادە نابن، بە قسەی لووط ﷺ دەست لەو کارە قێزەونەو لەو ڕەوشت نزمییەی خۆیان هەڵبگرن، کە بریتی بووە لە نێربازیی.

دەرسی شەشەم: ئایەتەکانی: (٥٩ - ٦٦)، واتە: هەشت (٨) ئایەت، باسی پەروەردگارێتیی خواو نیشانەکانی خوا ﷻ، لە ئاسمان و زەویی دا، ئنجا لە رووبارو دەریاییەکان کە نێوانیان خراوەتە بەین و، پێکەوە ئاوێتە نابن، پاشان چیایەکان کە رووبارەکانیان بە نێودا دەڕۆن و، هەرچی خوا ﷻ دەیڕوێنێ، پاشان چۆن خوا ﷻ

لە فریای بابای تێکیراو و ناچار دێ، لە کاتێکدا دەستی لە هەموو پچکان دەبڕێ، ئنجا باسی هەورو باران، پاشان باسی ئەوە کە چۆن خوا ﷻ دروستکراوەکان دەست پێ دەکات و وەدییان دێنێ و دوای لە بەین چوونیان دەشیانگێڕێتەوە، ئنجا چۆن خوا ﷻ بژیوی مرۆڤەکان دەدات، لە ئاسمان و زەوییەوە؟

دەرسی حەوتەم: ئایەتەکانی: (٦٧ - ٧٥)، واتە: نۆ (٩) ئایەت، باسی قسەی کافرەکان لە بارەی قیامەتەوە، کە زیندوو ناکرێنەوەو، کاتی خۆی ئەو بەڵێنە بە باب و باپیرانیشیان دراوە، بەڵام کەس لە قیامەتێوە نەهاتۆتەوە، وەك لە بێبڕوایانی نێو کوردەوارییدا باوە! وەڵام فێرکردنی خواش ﷻ بۆ پێغەمبەر ﷺ کە وەڵامی ددانشکێنیان بداتەوەو، چەند ڕاستییەك بخاتە ڕوو، کە ناڕاستەوخۆ وەڵامی ئەو ئیشکال و پرسیارەی ئەوانیان تێدایە.

دەرسی هەشتەم و کۆتایی: ئایەتەکانی: (٧٦ - ٩٣)، واتە: هەژدە (١٨) ئایەت، باسی قورئان و چەند ڕێنماییەك بۆ پێغەمبەر ﷺ ئنجا باسی ڕۆژی دوایی و ئاخیر زەمان، پاشان چەند بابەتێکی جۆراو جۆر، وەك ژیانداری زەوی (دابة الأرض)و، کۆکرانەوەی مرۆڤەکان لە ڕۆژی دواییدا، پاشان باسی دیاردەی شەوو ڕۆژو، باسی فوو بە کەڕەنادا کردن و باسی چیایەکان، کە پێت وایە وەستاون، بەڵام وەك ڕۆیشتنی هەور دەڕۆن، ئنجا باسی چارەنووس و سەرەنجامی چاکەکاران و خراپەکاران و، دوایی چەند ڕێنماییەکی خوا ﷻ بۆ موحەممەد ﷺ کە کۆتایی سوورەتەکەیان پێهاتوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە شـەش (٦) ئایـەتی سـەرەتای سـوورەتی (النَّمـل) پێکهاتـوە: (١ - ٦)، کـە تیایـدا پێناسـەی قورئـان کـراوە، وەك ڕێنمایـی و دڵخۆشـکەر بـۆ بـڕواداران، پاشـان پێناسـەی بـڕواداران کـراوە بـە سـەرەکییترین خەسـڵەت و سـیفەتیان، دوایـی پێناسـەی بێبڕوایانیـش کـراوە، بـە پێـی سیاق و کـەش و هەوایـەك کـە ئـەم سـوورەتە دەیخـوازێ، پاشـان بـاسی سـەرچاوەی لێوەهاتنـی قورئـان کـراوە، کـە خـوای کاربەجێـی زانایـە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ﴿١﴾ هُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ وَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ﴿٥﴾ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلۡقُرۡءَانَ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، طـا سـین ئەوانـە ئایەتـەکانی قورئـان و کتێبێـکی ڕوونکـەرەوەن ﴿١﴾ ڕێنمایـی و مـوژدە (دڵخۆشـکەر)ن، بـۆ بـڕواداران ﴿٢﴾ ئەوانـەی نوێـژ بەرپـا دەکـەن و زەکات دەدەن، هـەر ئەوانیـش دڵنیـاو بـڕوا پتـەون بـە ڕۆژی دوایـی ﴿٣﴾ بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بڕوایـان بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، کـردەوە (خراپـە) کانیانمـان بـۆ ڕازاندوونـەوە، بۆیـە سەراسـیمە بـوون ﴿٤﴾ ئەوانـە کەسـانێکن (لـە ژیـانی دنیایانـدا) خراپتریـن ئازاریـان هەیـەو، لـە ڕۆژی دواییشـدا

هەر ئەوانن هەرە زیانبار ﴿٥﴾ بێگومان (ئەی موحەممەد) قورئانت لە لایەن (خوای) کارزانی زاناوە پێدەدرێ ﴿٦﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَبُشْرَىٰ): (بُشْرَى وَبَشَارَة: الخَبَرُ السَارُّ)، هەواڵی خۆش، (بَشَارَة، بُشْرَى) بۆیە وایان پێگوتراوە، چونکە هەواڵی خۆش کاریگەریی هەیە لەسەر پێستی دەم و چاوی ئینسان، ڕووخساری دەکاتەوەو گەش و جوانی دەکات، هەروەها بە هەواڵی ناخۆشیش بە پێچەوانەوە: دەم و چاوی ئینسان تێکدەچێ و گرژ دەبێ و دێتەوە یەك.

(يَعْمَهُونَ): سەراسیمەو سەرگەردان دەبن، (العَمَهُ: التَرَدُّدُ فِي الأَمْرِ مِنَ التَحَيُّرِ)، (عَمَه): بریتیە لە دڵ لە دڵدان لە کارێکدا، واتە: نەزانی بە کام لایدا بیخەی، لە ئەنجامی سەراسیمە بوون دا.

(لَتُلَقَّى): واتە: پێت دەدرێ و وەری دەگری، (تُلَقَّى مُضَارِعُ لَقَّاهُ، مَبْنِيٌّ لِلْمَجْهُولِ، أَيْ جَعَلَهُ لَاقِيَاً، وَاللُّقِيُّ وَاللِّقَاء: وُصُولُ أَحَدِ الشَيْئَيْنِ إِلَى شَيْءٍ آخَرَ، قَصْدًا أَوْ مُصَادَفَةً، وَالتَلْقِيَةُ: جَعْلُ الشَيْءِ لَاقِيَاً غَيْرَهُ)، (تُلَقَّى): بکەرەکەی دیار نیە، واتە: وایکرد کە تووشی بێت، (لُقِيّ ولِقَاء): بریتیە لەوەی دوو شت هەبن، یەکێکیان بە وی دیکە بگات، ئنجا یان بە شێوەیەکی نامانجدارانە، یاخود هەروەها بە ڕێکەوت و بە تووش بوون، (تَلْقِيَة): بریتیە لەوەی شتێك بە شتێکی دیکە بگات، کەواتە: لە کوردییدا بۆ وشەی (تُلَقَّى) مەگەر بڵێین: پێت دەدرێ، یان پێت دەبەخشرێ، بە عەرەبیی: (تُعْطَى، أو تُؤْتَى)، بەڵام دیسان مانای (تُلَقَّى) بە تەواویی ناگەیەنێ ﴿ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ ﴾، واتە: تۆ قورئانت تووش دێ و بۆت دێ، بەبێ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕوانیی کردبێ و مەبەستی بووبێ، وەك خوا

دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ ﴿٨٦﴾ ﴾القصص، واتە: تۆ پێشتر ئومێدەوار نەبووی کە قورئانت پێ بدرێ (قورئانت بۆ لا بنێردرێ) یانی: پێغەمبەر ﷺ وە نەبێ چاوەڕێی شتێکی کردبێ، بەڵکو خوا ﷻ وەحیی بۆ ناردوە بەبێ ئەوەی چاوەڕوانیی بکات.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

لەم سوورەتەدا لە دەستپێك و کۆتاییدا، باسی قورئان هاتوە، لەو ڕووەوە وەك سووڕەتی (الشعراء) وایە، سووڕەتی (الشعراء)یش هەم لە سەرەتاوە باسی قورئان هاتوەو، هەم لە کۆتاییدا، ئەم سوورەتەش بە هەمان شێوە، دوای وی سووڕەتی (القصص) دێ، دەتوانین بڵێین: ئەم سوورەتانە کەوتوونە نێوەڕاستی دابەزینی قورئانەوە، لە ڕووی قەبارەو ژمارەی سوورەتەکانەوە، واتە: لە پێش ئەم سوورەتەدا، قورئانێکی زۆر دابەزیوەو، لە دوایی ئەم سوورەتە موبارەکەش قورئانێکی زۆر هاتوە، بۆیەش لێرەدا بۆ وێنە: کە باسی بەسەرهاتی مووسا عليه السلام و هارووني برای لەگەڵ فیرعەونندا کراوە، زۆر بە کورتیی باسکراوە، هەروەها باسی بەسەرهاتی صالح عليه السلام لەگەڵ گەلەکەی (ثمود)داو، بەسەرهاتی لووط عليه السلام لەگەڵ گەلەکەی دا، زۆر بە کورتیی باسکراون، هەروەها ئاماژەیەك کراوە بە داوود عليه السلام و سولەیمان عليه السلام کە خوا ﷻ چی پێداون، بەڵام لە سوورەتەکانی پێش ئەم سوورەتەدا، زۆر شت باسکراوە، کە خوا ﷻ چیداوە بە داوودو چی داوە بە سولەیمان! بۆیە ئەو شتانەی کە لە سوورەتەکانی دیکەدا، درێژەیان هاتوە، بە پێویست نەزانراوە خوا ﷻ لێرەدا درێژە بداتە ئەو بەسەرهاتانەو، ئەو باس و خواسانەی کە لە سوورەتەکانی پێشێ دا هاتوون.

ئەم سوورەتە ئاوا دەست پێدەکات، سەرەتا خوا ﷻ دەفەرمویٚ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

به ناوی خوای به بەزەیی بەخشندە.

هەرکات مرۆڤ ئەو ڕستە موبارەکەی گوت، دەبێ بەلای کەمەوە چوار مەبەستان لە عەقڵ و دڵی خۆیدا ئامادە بکات:

١ - ئەم کارە بە ناوی خوا دەکەم.

٢ - بە پێی شەرعی خوا دەیکەم.

٣ - بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار ئەم کارە دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا، ئەنجامی دەدەم.

﴿ طسٓ ﴾، ئەمانە دوو پیتن: پیتی (ط)، لەگەڵ پیتی (س)، پێشتر چەند جارێك باسمان کردوە، کە (٢٩) سوورەت لە قورئاندا بەو پیتە پچڕ پچڕانە (**الحروف المُقَطَّعَة**)، دەستیان پێکردوە، چونکە پێویستە وا گۆ بکرێن، کە لێك جیان، نەڵێین: (طَسْ) یان (أَلَمْ)، بەڵکو دەڵێین: (طَا سِين)، (أَلِف لام مِيم)، ئێمە باسێکی تێرو تەسەلمان لە بارەی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە لە سەرەتایی سوورەتی (یونس) دا، کردوە، بۆ کەسێك بیەوێ لەو بارەوە بەرچاوو ڕوونتر بێ، با بگەڕێتەوە وێ، کە لە سەرەتای (٢٩) سوورەتدا ئەم پیتانە هاتوون، ئنجا هەیانە پیتێکە وەك: (ص، ق، ن)، هەیانە دوو پیتن وەك: (طه، طس، یس)، هەیانە سێ پیتن وەك: (ألم، ألر، طسم)، هەیانە چوارە وەك: (المص، ألمر)، هەشیانە پێنج وەك: (كهيعص) ئنجا ئایا چ مەبەستێك هەیە لە پشت بەکارهێنانی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە، لە سەرەتای (٢٩) سوورەت دا، کە دووانیان مەدینەیین، بەڵام (٢٧) یان مەککەیین؟ لەوێ قسەی تێرو تەسەلمان لەو بارەوە کردوە، بەڵام لێرەش تەئکید دەکەینەوە کە زیاتر وا پێدەچێ ئەوە مەبەست بێ: ئەو قورئانە، ئەی مرۆڤەکان! کە لەبەر دەستتانەو دەیخوێننەوە، فەرمایشتی خوایەو، هەر لەو پیتانەو لەو دەنگانە پێك هاتوە، کە ئێوە قسەیان پێ دەکەن، بەڵام تەماشا بکەن! ئێوە ناتوانن،

نەك وێنەی ئەو قورئانەو وێنەی دە (١٠) سوورەت، بەڵكو وێنەی سوورەتێكی سێ ئایەتییشی بێنن، وەك (العصر، الكوثر، النصر)، كەواتە: بزانن كە ئەم قورئانە، فەرمایشتی خوایە ﷻ، كە هەر لەو كەرەستەیەی لەبەر دەستی ئێوەشدا هەیە، ئەو قورئانەی پێكهێناوە، بەڵام ئێوە ناتوانن وێنەی سوورەتێكی كورتیش بێنن و، لە بەرانبەریدا دەستەوسانن، كەواتە: دیارە لە كارگەیەكی دیكەی سەرووی بەشەردا، ئەو پیت و دەنگانە لێكدراون و، ئەو فەرمایشتە موبارەكەیان لێ پێكهێنراوە، كە فەرمایشتی بێ وێنەی خوایە ﷻ، بۆیە بزانن كە ئەو قورئانە، ئەو كتێبە، فەرمایشتی خوای پەروەردگارەو، كتێبی خوایەو، خوێندراوەی خوایە ﷻ.

﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ﴾، ئا ئەوانە ئایەتەكانی قورئان و كتێبێكی روونكەرەوەن، دەشگونجێ بڵێی: كتێبێكی ڕۆشنن، روونن، چونكە (مُّبِينٍ) دەگونجێ لە (أبان)ی (لازم)ەوە بێت، یان لە (أبان)ی (مُتَعَدِّي)یەوە، (لازم) ئەوەیە كە پێویستی بە بەركار (مفعول بە) ناكات، وەك (أَبَانَ القَمَرُ) مانگەكە دەركەوت، ڕۆشن بوو، بەڵام (أَبَانَت الشَّمْسُ الأَرْضَ)، (مُتَعَدِّي)یە، یانی: خۆرەكە سەر زەوی رووناك كردەوە، هەڵبەتە قورئان هەم ڕۆشنەو هەم ڕۆشنكەرەوەیە، بۆ ئەو ڕاستییانەی خوا ﷻ خستوونیە دوو توێی ئەو فەرمایشتە بێ وێنەو موبارەكەی خۆیەوە.

﴿ هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئەم قورئانە، ڕێنماییكارەو موژدەدەرو دڵخۆشكەرە بۆ بڕواداران، ئنجا ئایا ئەو بڕوادارانەی قورئان دڵیان خۆش دەكات و موژدەیان پێ دەدات؟ هەم لە دنیادا موژدەی سەرفرازیی و ژیانێكی پاك و چاك و ڕاست و ساغیان پێدەدات، هەم لە دوارۆژدا موژدەی سەربەرزیی و سەرفرازییان پێ دەدات؟

خوا بە سێ سیفەتان ئەو ئیماندارانە پێناسە دەكات: ﴿ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴾، ئەوكەسانەی نوێژ بەرپا دەكەن و،

زەکات دەدەن و، بە ڕۆژی دوایی بڕوایان زۆر پتەوو دامەزراوە، (یوقنون): یانی: (یُؤمنون إیماناً جازماً لا تردُّدَ فیه). بڕوایەکی پتەوی نەلەخشاویان هەیە کە لەرەلەری تێدانیە.

ئنجا دوای پێناسە کردنی ئەو بڕوادارانەی، کە ئەم قورئان و کتێبە ڕوون و ڕۆشنکەرەوەیە، بۆیان دەبێتە ڕێنماییکارو مژدەدەرو دڵخۆشکەر، دێتە سەر پێناسەی بێبڕوایان: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَـٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، کردەوەکانیانمان بۆ ڕازاندووەنەوەو بۆ جوان کردوون، بۆیە ئەوان سەراسیمەو سەرگەردانن.

﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾، ئا ئەوانە خراپترین، ئازاریان هەیە، ﴿ وَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴾، لە دوارۆژیشدا بەس ئەوانن زیانبارترین.

کەواتە: ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾، مەبەستی پێ ژیانی دنیایە، یانی: هەر لە دنیادا، سزای زۆر خراپیان هەیە، کە وا پێدەچێ مەبەست ئەوەبێ بابای بێبڕوا، لە دەروونی خۆیدا ناموڕتاح و ناناسوودەیەو زۆر بەرچاو لێڵە، تەماشای ڕابردووی دەکات هەر تاریکییەو، تەماشای ئێستای دەکات هەر تاریکییەو، تەماشای داهاتووی دەکات هەر تاریکییە، کە ئەوە ناخۆشترین ژیانە، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (طه) لە ئایەتی (١٢٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾، هەر کەسێك پشت لە بەرنامەی من بکات، پشت لە یادی من بکات، منی لە بیر نەبێ، ژیانێکی تەنگ و تاڵ و ناخۆش و بە سووت و سوێی دەبێ.

ئنجا لە دوارۆژیشدا ئەوانەن زیانبارترین و، کەس لەوان زیانبارتر نیە، دەبێ کێ لەو کەسە زیانبارتر بێ، کە لەسەر بوونەکەی خۆی قەرزار دەبێتەوە!! جاری وا هەیە کەسێك بازرگانیی دەکات، زەرەر دەکات، بەڵام دەستمایەکەی ماوە، لە قازانجێ زەرەر دەکات، بەڵام کەسێك کە دەستمایەکەشی بفەوتێ، ئەوە هیچ

کەس لەو زەرەرمەندتر نیە، بابای بێبڕواش لەسەر ئەصڵی بوونەکەی خۆی قەرزار دەبێتەوە، وەك لە سوورەتی (النبأ)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ٤٠﴾، واتە: بێبڕوا لەو ڕۆژەدا دەڵێ: خۆزگە گڵ بوومایە، واتە: خۆزگە هەر دروست نەکرابام، یاخود خۆزگە کە دەمردم و دەبوومەوە بە خاك و خۆڵ، زیندوو نەکرابامەوە، ئنجا کەسێك ئاوات بەوە بخوازێ کە نەبووبایە، مانای وایە لەسەر بوونەکەی خۆی قەرزار بۆتەوە.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلۡقُرۡءَانَ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ عَلِيمٍ﴾، بە دڵنیایی تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) قورئانت بۆ دێ، قورئانت پێت دەدرێ لە لایەن خوای کارزانی زاناوە، خوایەك کە کاربەجێیەو زانایەو ئاگای لە هەموو شتێکە، کەواتە: متمانەت بێ بەو فەرمایشتەی خوا ﷻ کە بۆت دێ، چونکە خوا خاوەنی ئەوپەڕی لێزانیی و کاربەجێیی و زانیاریی و شارەزاییشە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**پێناسەی قورئان و، پێناسەی بڕواداران بە سێ لە خەسڵەتە بنەڕەتییەکانیان:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿طسٓ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ۝١ هُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ۝٣﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە: لە پێنج بڕگەدا:**

**١)- ﴿طسٓ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ﴾، (طا سین) ئا ئەوانە، ئایەتەکانی قورئان و کتێبێکی ڕوون، یان ڕوونکەرەوەن، خوای پەروەردگار قورئانی هەم بە قورئان ناوناوە، لەبەر ئەوەی دەخوێندرێتەوەو، قورئان یانی: (مَقْرُوء)، خوێندراوە، هەم بە (كِتَاب) ناوناوە، چونکە نووسراوەتەوەو دەشنووسرێتەوە، واتە: ئێمە بە دوو شێوە قورئانمان لەبەر دەست دایە: هەم بە خوێندراوەیی و هەم بە نووسراوەیی، بە دوو ڕێیان پێمان گەیشتوە:**

**أ- لە ڕێی زارەکیی (شفهي)یەوە خوێندراوەتەوە، خوا ﷻ فێری جیبریلی کردوەو، ئەویش بەسەر پێغەمبەردا ﷺ خوێندوویەتەوەو، ئەویش بەسەر هاوەڵانی داو، ئەوانیش بەسەر شوێنکەوتووان (تابعین)داو، تاکو گەیشتۆتە ئێمە، ئەوە ڕێگایەکی گەیشتنی قورئانە بە ئێمە، کە بە خوێندنەوە، وەرگیراوەو لەبەرکراوەو گەیەنراوە.**

**ب- لە ڕێی نووسراوەیی (کتابة)ەوە، وەك لە کتێبی: (با لە خزمەت قورئاندا بین)، بە تەفصیلّ باسی چۆنیەتی گەیشتنی قورئان و کۆکردنەوەیمان کردوە، ئەو ئیشکالانەی کە**

لە بارەی قورئان و کۆکردنەوەی قورئانەوە، باسکراون و باس دەکرێن، هەموویانمان پووچاندووەنەوە[(١)]، ئنجا ئایا ئەم قورئانە، چییە؟

٢)- ﴿ هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ڕێنماییکارەو موژدەدەرو دڵخۆشکەرە، بۆ بڕواداران، چ بڕوادارانێك؟

٣)- ﴿ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن.

٤)- ﴿ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، زەکاتیش دەدەن.

٥)- ﴿ وَهُم بِٱلْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴾، هەر ئەوانیش بەڕاستیی، دڵ دامەزراوو بڕوا پتەون بەڕۆژی دواییی.

---

(١) هەروەها لە بابەتی: (قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا) درێژتر و وردتر باسی سەرجەم مەسەلەکانی پەیوەست بە قورئانمان کردوە.

## کورتە باسێک
## شەش وردە سەرنج لەو ئایەتە موبارەکانە (١-٣)

١- (طس): پێشتر باسمانکرد کە ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (یونس)دا، باسی پیتە پچڕ پچڕەکانمان کردوە، باسێکی سەربەخۆمان لەو بارەوە کردوە.

٢- (**القرآن والكتاب**): باسمانکرد کە ئەم ئایەتە موبارەکانە، خوا ﷻ هەم ناوی ناون قورئان، هەم ناویشی ناون (کتاب)، لەبەر ئەوەی هەم بە شێوەی خوێندراوەیی، هەم بە شێوەی نووسراوەیی، بە ئێمە گەیشتوون.

لە سوورەتی (الحجر)دا، هەر ئەم تەعبیرە، بەڵام کەمێک جیاوازتر هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ١﴾، ئەوانە ئایەتەکانی، کتێب و قورئانێکی ڕوون و ڕوونکەرەوەن، پاش و پێش کردنی کتێب و قورئان، دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەو سیاقە کە تێیدا هاتوون، لە سوورەتی (الحجر)دا، کە (کتاب) پێش خراوە، دیارە حاڵەتی کتێب بوون و نووسراو بوونی قورئان پتر خوازراو بووە، بەڵام لێرەدا کە قورئان پێش خراوە، حاڵەتی خوێندراوەبوونی قورئان، زیاتر سروشتی ئەم سیاقە خواستوویەتی.

٣- (**مُبين**): یان لە کرداری (أبان)ی تێپەڕکەر (متعدي)ەوە، هاتوە، واتە: ڕوونکەرەوە، یاخود لە (أبان)ی (لازم)ەوە، هاتوە، واتە: ڕۆشن و ئاشکرا، بۆیە لە یەک کات هەردوو واتایەکەی هەن: قورئان هەم ڕۆشنە لە خودی خۆیدا، هەم ڕوونکەرەوەشە بۆ ڕاستییەکان.

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو قورئانە ڕێنماییکارە، وشەی (هُدَى): بەمانای ڕێنمایی و هاوکارو بە ئامانج گەیەنەر هاتوە، ئنجا لێرەدا پرسیارێك دەکرێ؟ باشە ئەگەر قورئان ڕێنماییکارو هاوکارو بە ئامانج گەیەنەرەو، هەرچی ژیانی مرۆڤ پێویستی پێیەتی تێیدایە، ئایا وردەکارییەکانی ژیانی دنیای تێدان؟ کە چۆن شتان دروست بکەین؟ چۆن بەڕێوەبچین؟ چۆن بخوێنین؟ چی بکەین؟

دەڵێین: بە دڵنیایی ئەو وردەکاریانەی تێدانین، بەڵام قورئان ڕێنمایی مرۆڤ دەکات لە هێڵە گشتییەکاندا، ئەو وردەکاریانە چۆن جێبەجێ بکات، لەو بارەوە با ئەوە بگێڕینەوە، کە (محمد متولي الشعراوي)، ڕەحمەتی خوا لێبێ، لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] قسەیەك لە (شیخ محمد عبده)دوە ڕەحمەتی خوا لێبێ، دێنێ، کە کاتێ خۆی لە فەڕەنسا بووە، ڕۆژهەڵاتناسێك لێی دەپرسێ: ئێوە دەڵێن: قورئان هەموو شتێك کە ژیانی مرۆڤ پێویستیی پێی هەبێ، تێیدایە، ئایا (نیردەبێك)، گەنم، چەند نانی تێدا دەبن، چەند کولێرەی تێدان؟ ئیمام موحەممەد عەبدەش دەڵێ بانگی نانەواچییەك دەکەین و لێی دەپرسین، بابای ڕۆژهەڵاتناس دەڵێ: من دەمەوێ لە قورئان بۆم دەربێنی! شێخ موحەممەد عەبدە دەڵێ: ئاخر قورئان دەفەرموێ: ﴿فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾النحل، ئەگەر نازانن لە شارەزایان بپرسن، قورئان ڕێنمایی کردووم کە لە نانەواچییەکە بپرسم! کەواتە: هەر بەپێی ڕێنمایی قورئان بۆ زانینی وردەکارییەکانی هەر مەسەلەیەك، دەگەڕێینەوە بۆ شارەزایانی ئەو بوارە.

٤- (هُدًى وَبُشْرَىٰ): هەردووکیان چاوگ (مصدر)ن، (هَدَى، يَهْدِي، هِدَايةً وهُدَى)، (بَشَّرَ، يُبَشِّرُ، بُشْرَىٰ وبَشَارَةً)، بەڵام لێرەدا حاڵن، واتە: ئەم ئایەتانەی قورئان و ئەو کتێبە ڕۆشنکەرەوەیە، لە حاڵێکدا کە ڕێنماییکارن و موژدەدەرن بۆ بڕواداران.

کە دەفەرموێ: ﴿هُدًى وَبُشْرَىٰ﴾، واتە: حاڵەتی ڕێنماییکاربوونی قورئان و حاڵەتی موژدەدەریی و دڵخۆشکردنی بوونی بۆ بڕواداران، حاڵەتێکی بەردەوامە، بۆیە بە چاوگ هاتوە، قورئان: چاوگ و سەرچاوەی ڕێنمایی و موژدەدەریی و دڵخۆشییە، بەڵام بۆ بڕواداران.

٥- ﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾: لە زۆر شوێن دا باسمانکردوون، کە بەرپاکردنی نوێژ، پایەی مەعنەویی دینداریی و مسوڵمانەتییە، هەروەها زەکاتدان، پایەی ماددیی دیندارییەو، نوێژکردن ئەوپەڕی بەندایەتیی مرۆڤی تێدا بەرجەستە دەبێ، زەکاتدانیش ئەوپەڕی هاوکاربوون

---

(١) خواطر فضيلة الشيخ محمد متولي الشعراوي حول القرآن الكريم: ج١٧، ص١٠٧٢٩.

و چاکبوونی مرۆڤ بۆ دەوروبەری، تێدا بەرجەستە دەبێ، نوێژ هەقی خوایەو، زەکات هی خەڵکە، ئیسلامیش لە دوو وشەدا خوڵاصە دەبێتەوە: خواپەرستیی و خەڵك دۆستیی.

٦- ﴿ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴾: ئەمە بە شێوازی کورتهەڵێنان هاتوە، یانی: هیچ کەس بروا پتەو نیە، بە ڕۆژیی دوایی ئەوان نەبێ، (يَقِين)یش، (الإِيقَانُ، واليَقِيْنُ: الحُكْمُ بِثبات الشَّيء بِدُونِ تَوَهُّم شَك، وَهُوَ ثَلَاثُ دَرَجَاتٍ: العِلْمُ وَالعَيْنُ وَالحَقُّ)، (یقین وإیقان) بریتیە لەوەی تۆ بڕیار بدەی لەسەر شتێك و، حوکم بەسەر شتێکدا بدەی، بێ ئەوەی هیچ جۆرە دوو دڵییەك هەبێ، ئەویش سێ پلەیە، (عِلْمُ اليَقِيْنِ، عَيْنُ اليَقِيْنِ، حَقُّ اليَقِيْنِ)، بۆ وێنە: بۆت باس بکەن کە شانەی هەنگوین ئاوایە، ئەوە (عِلْمُ اليَقِيْنِ)ە، (عَيْنُ اليَقِيْنِ) ئەوەیە تۆ شانە هەنگوینەکە ببینی و، تەماشای بکەی، (حَقُّ اليَقِيْنِ)یش ئەوەیە کە لێی بخۆی.

لە بارەی (یقین)ەوە، عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوا لێی ڕازیبێ) قسەیەکی جوانی هەیە: کە هەر لە سەرچاوەی پێشوودا[1] هاتوە، کە عەلی (خوا لێی ڕازیبێ) گوتوویەتی: (لَوْ كُشِفَ عَنِ الحِجَابِ مَا ازدَدْتُ يَقِيْناً، لأَنِي صَدَّقْتُ بِمَا قَالَ اللهُ: وَلَيْسَتْ عَيْنِي أَصْدَقَ عِنْدِي مِنَ اللهِ)، قسەیەکی زۆر جوانە، واتە: ئەگەر پەردە لابدرێ، یەقین و بڕوا پتەوییم زیاد ناکات، چونکە ئەوەم بەڕاست داناوە کە خوا ﷻ فەرموویەتی، چاویشم لەلام ڕاستگۆتر نیە لە خوا ﷻ، خوا ﷻ دەفەرموێ: فلان شتە ئاوایە، منیش خوام بە ڕاست داناوە، ئنجا ئەگەر چاوم پێچەوانەی ئەوەی بینی، بۆچی چاوم بە هەڵەدا نەچووبێ، چۆن بڵێم: خوایە ﷻ تۆ ڕاست نافەرمووی!

ئنجا لە سوورەتی (فیل)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ ۝١ ﴾، ئایا نەتبینی پەروەردگارت چی کرد، بە خاوەن فیلەکان، بۆچی نەیفەرمووە: (أَلَم تَعْلَم)، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی (فیل)دا، لە دایك بووە، کەواتە: هیچی نەبینیوە؟ بەڵام خوا ﷻ دەفەرموێ: (أَمْ تَرَ)و نافەرموێ: (أَلَم تَعلَم)؟، چونکە خوا ﷻ ویستوویەتی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بفەرموێ: هەواڵ پێدانی خوا ﷻ بە تۆ، ڕاسترە لە بینینی چاوی خۆت، واتە: ئەگەر بەچاو بتبینیبایە، نەدەبوو ئەوەندە متمانەت پێ هەبووایە، لەوەی کە خوا ﷻ هەواڵی پێداوی.

---

(١) خواطر الفضيلة الشيخ محمد متولي الشعراوي حول القرآن الكريم: ج١٧، ص١٠٧٣٩.

**مەسەلەی دووەم:**

**پێناسەی بێبڕوایان بە سێ لە خەسڵەتە پەستەکانیان و، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە لە دنیادا خراپترین ئازارو سزایان هەیەو، لە دواڕۆژیشدا ئەوپەڕی زیانبارن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ وَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ﴿٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، کردەوەکانیانمان بۆ ڕازاندووەتەوە، بۆمان جوان کردوون. بێگومان مەبەست پێی کردەوە خراپەکانیانە، کە هەر ئەوە شایستەی وانە.

٢)- ﴿ فَهُمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾، بۆیە سەرەنجام ئەوان، سەرگەردان و سەراسیمەن، (رشيد الخطيب الموصلي) لە بارەی مانای ئەم ئایەتەوە دەڵێ: **(وَالمَعْنَى: أَيْ مَضَتْ سُنَّتُنَا فِي أَخْلَاقِ الْبَشَرِ وَشُئُونِهِمْ أَنْ يَسْتَحْسِنُوا مَا يَجْرُونَ عَلَيْهِ وَيَتَعَوَّدُونَهُ، مِمَّا كَانَ عَلَيْهِ آبَاؤُهُمْ، أَوْ مِمَّا اسْتَحْدَثُوهُ بِأَنْفُسِهِمْ، وَيَفْقِدُونَ الإِسْتِعْدَاد لِلنَّظَرِ الصَّحِيْحِ، وَلَا يَسْمَعُونَ قَوْلًا مُخَالِفاً أَو مُبَايِناً لِقَوَاعِدِهِ)**[1].

واتە: یاسای ئێمە لە ڕەوشت و ئاکارو حاڵ و باڵی بەشەردا تێپەڕیوە، کە ئەوەی لەسەری بەردەوام دەبن و، دەیکەن بە عادەت و نەریتی خۆیان، لەوەی باب و باپیرانیان و پێشینانیان لەسەری بوون و، لەوەی بۆ خۆیان دایدەهێنن، پێیان چاک بێ و لە لایان جوان بێ و، ئامادەیی تەماشاکردنی ڕاست و دروست و هەڵسەنگاندن لەلای ئەوان نامێنێ و، هیچ قسەیەك کە پێچەوانەی ئەوە بێ، نایبیستن و، هەر قسەیەك پێچەوانەی بنچینەکانی ئەوەبێ کە پێی ڕاهاتوون، نایبیستن.

---

(١) أولى ما قيل في آيات التنزيل: ج٥، ص٣٤.

٣)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾، ئەوانە خراپترین سزایان هەیە، لە ژیانی دنیادا.

٤)- ﴿ وَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴾، لە ڕۆژی دواییش دا هەر ئەوانەن زیانبارترین.

پێشتریش باسمان کرد، خراپترین ئازار لە دنیادا، ئەو حاڵەتە دەروونییە خراپەیە، کە بابای بێبڕوا پێوەی دەژی، وەك لە سوورەتی: (الشعراء)دا، باسمان کرد، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ ﴾، لە ڕاستییدا شیرك و کوفر، سەرچاوەی گەلێك لە دەردو نەخۆشییە جەستەییەکانیشە، بە هۆی تێکچوونی حاڵەتی دەروونیی و ڕووحیی مرۆڤەوە.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**دەرخستنی ئەو ڕاستییە، کە سەرچاوەی لێوەهاتنی قورئان، خوای کاربەجێی زانایە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ ﴾، (لَتُلَقَّى: أي تُعْطَاهُ وتُؤْتاهُ)، تۆ قورئانت پێ دەبەخشرێ و پێت دەدرێ، کەواتە: موحەممەد ﷺ کەم و زۆر دەستی لە قورئان دا نەبووەو، لە لایەن خوای کارزان و میهرەبانەوە پێیدراوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴿٨٦﴾ ﴾ القصص.**

**٢)- ﴿ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴾، لە لایەن (خوای) کاربەجێی زاناوە.**

**وشەی (لَـدُن)، لـە واتـادا وەك (عِنْـد) وایـە، بـەڵام وشـەی (لَـدُن)، زیاتـر حاڵـەتی تایبەتیـی و نزیکیـی ئـەو شـتە، لـەو کەسـەوە دەگەیەنـێ، وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿ وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ الکهـف، واتـە: لـە لایـەنی خۆمانـەوە بەشـێوەی تایبـەت زانیارییـمان فێرکـرد بـووە.**

**کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئـەم قورئانـەت پـێ دەدرێ لە لایـەن (خـوای) کاربەجێی زاناوە.**

**کەواتـە: ئـەم قورئانـە هـەم حیکمـەتی گرتۆتـە خـۆی، هـەم زانیاریـی لـە هەرچـی دا کـە دەیفەرمـوێ، لە بەسـەرهات و هەواڵی پێشـوان دا، لە خسـتنەڕووی ڕاسـتییەکان دا، لـە حوکمـەکان دا، واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺو ئـەی هـەر کەس کـە قورئـان دەخوێنی! ئـەو پـەڕی متمانـەت هەبێ بـە قورئـان، کـە زانیاریـی و حیکمـەتی گرتۆتـە نێـو خـۆی، چونکـە لـە لایـەن خـوای خـاوەنی ئـەو پـەڕی زانیاریی و ئـەو پـەڕی حیکمەتـەوە هاتوە.**

کۆتایی ئەم دەرسەمان بەو قسەیەی ئیمام (فخر الدين الرازي) دێنین، کە لە تەفسیرەکەی خۆی دا [1] کە بە (مفاتيح الغيب) ناسراوە، دەڵێ:

(فَإِنْ قِيلَ: الحِكْمَةُ إِمَّا أَنْ تَكُونَ نَفْسَ العِلْمِ، أو أن تكون داخلاً فيه، فَلَمَّا ذَكَرَ الحِكْمَةَ، فَلِمَ ذَكَرَ العِلْمَ؟ جَوَابُهُ: الحِكْمَةُ هِيَ العِلْمُ بِالأُمُورِ العَمَلِيَّةِ، فَقَطْ، وَالعِلْمُ أَعَمُّ مِنْهُ، لِأَنَّ العِلْمَ قَدْ يَكُونُ عَمَلِيًّا وَقَدْ يَكُونُ نَظَرِيًّا..).

هەمیشە پێشەوا (فخر الدين الرازي) عادەتی وایە، ئیشکالێك، یان پرسیارێك کە لەسەر ئایەتێك یان ڕستەیەك هەڵدەستێ، وەڵامی دەداتەوە، دەڵێ:

ئەگەر بگوترێ: حیکمەت یان هەر خودی زانیارییە، یاخود لە نێو زانیاریی دایە، ئەدی کاتێك کە حیکمەت باسکراوە، بۆچی زانیارییش باسکراوە؟ (حَكِيمٍ عَلِيمٍ).

وەڵامەکەی ئەوەیە: حیکمەت تەنیا بریتیە لە زانیاریی هەبوون بە شتە کردەییەکان، بەڵام زانیاریی چەمکەکەی گشتییترە، چونکە جاری وایە زانیاریی بریتیە لە شارەزابوون بە شتی کردەیی و، جاری واش هەیە بریتیە لە شارەزابوونی بە شتی تیۆریی.

بەڵام من پێم وایە چەمکی حیکمەت فراوانترە لە چەمکی زانیاریی (عِلم)، حیکمەت بریتیە لەوەی ئینسان لە ڕووی زانیاریی، یان لە ڕووی کردەوەوە، هەق بپێکێ، ئەو کاتە چەمکی حیکمەت فراوانتر دەبێتەوە لە چەمکی زانیاریی، زانیاریی هەر بریتیە لە خودی زانیاریی هەبوون بە شتەکان، (العِلْمُ بِالشَّيءِ عَلَى مَا هُوَ عَلَيْهِ)، زانایان وایان پێناسەی زانیاریی کردوە، زانیاریی هەبوون بە شتێك بەو شێوەیەی کە بۆ خۆی لەسەریەتی، بەڵام حیکمەت بریتیە لەوە کە تۆ زانیارییت پێی بێ، وەك خۆی و، پاشان کردەوەش بکەی بەو شێوە کە ڕاست و تەواوە.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

---

(١) التفسير الكبير: ج٤، ص٦٦.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هەشـت (٨) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەکانی: (٧ - ١٤) کـە تێیانـدا، پوختەیـەکی قۆناغـی سـەرەتای وەحیـی بـۆ هاتنـی مووسـا ﵇و، کرانـە پێغەمبـەری و، ڕەوانەکـرانی بـۆ لای فیرعـەون و گەلەکـەی بـە نـۆ (٩) نیشـانەو بەڵگـەوە، خراوەتـەڕوو، کـە دووانیـان لـەو نـۆ بەڵگـەو موعجیزەیـە (دەسـتی و گۆچانەکـەی) بـوون، سـەرەنجام نکووڵییلێکردنیـان و بـە جادووگـەر تۆمەتبارکـردنی، هەرچەنـدە دڵنیـاش بـوون لـە ڕاسـتیی خـۆی و نیشـانەکانی، دواییـش سـەر بـە فەتارەتچـوونی فیرعـەون و گەلەکـەی، لـە ئەنجامـی بـە درۆدانـانی مووسـا ﵇و هـاڕوونی بـرای دا ﵇، کـە ئەویـش لەگەڵیـدا هـاوکارو پاڵپشـت بـوو.

﴿ إِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهۡلِهِۦٓ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا سَـَٔاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ ءَاتِيكُم بِشِهَابٖ قَبَسٖ لَّعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ﴿٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨﴾ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٩﴾ وَأَلۡقِ عَصَاكَۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفۡ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٠﴾ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسۡنَۢا بَعۡدَ سُوٓءٖ فَإِنِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١﴾ وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖۖ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿١٣﴾ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(یاد بکەوە!) کاتێک مووسا بە خێزانەکەی گوت: (لێرە بوەستن) من ئاگرێکم بەدی کردوە، (دەچم) لە لای ئەو ئاگرەوە، هەواڵێکتان بۆ دێنم (لە بارەی ڕێیەکەمانەوە) یان بڵێسە ئاگر (بزووت)ێکی وەرگیراوتان بۆ دێنم، بەڵکو (ئاگری پێ بکەینەوەو) خۆتان گەرم بکەنەوە ﴿٧﴾ ئنجا کاتێک هاتە لای (ئاگرەکە) بانگ کرا: ئەو کەسەی لە نێو ئاگراکەدایەو، ئەوەش کە لە دەوریەتی پیرۆزدار بێ و، پاکیی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان ﴿٨﴾ ئەی مووسا! بێگومان من خوای زاڵی کارزانم ﴿٩﴾ گۆچانەکەت فڕێدە (ئەویش فڕێیداو بوو بە مارێکی گەورە)، ئنجا کاتێک بینی وەك تیرەمار هەڵبەزو دابەز دەکات و دێ و دەچێ، بە پشت تێکردنەوە ڕایکردو نەگەڕایەوە، خوا فەرمووی: ئەی مووسا! مەترسە بێگومان ڕەوانەکراوان لە لای من ناترسن ﴿١٠﴾ مەگەر کەسێك ستەمی کردبێ، دوایی خراپەکەی بە چاکە گۆڕیبێ، بە دڵنیایی من (بەرانبەری) لێبوردەی بە بەزەییم ﴿١١﴾ هەروەها دەست (ی ڕاست)یشت لە یەخەتەوە بخە بن باڵت، بە سپیەتیی (و درەوشاوەیی) دێتە دەرێ، بەبێ نەخۆشیی، (ئەو دوو بەڵگەو نیشانەیەت دەدەینێ)، لە نێو نۆ نیشاناندا، (حەوتی دیکەش بچۆ) بۆ لای فیرعەون و خەڵکەکەی، چونکە بێگومان ئەوان کۆمەڵێکی لادەرن ﴿١٢﴾ ئنجا کاتێک (مووسا) بە نیشانە پێ بینەرەکانەوە (بەرچاو ڕۆشنکەرەکانەوە) هاتە لایان، (فیرعەون و گەلەکەی) گوتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە ﴿١٣﴾ هەروەها نکووڵییان لێیان (لە ئایەتەکانی) کرد، هەرچەندە لە دەروونی خۆشیاندا لێیان (لە ڕاستییان) دڵنیا بوون، بە هۆی ستەم و خۆبەزلگرتنەوە، ئنجا سەرنج بدە، سەرەنجامی تێکدەران چۆن بوو! ﴿١٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ءَانَسْتُ نَارًا): (أَي: أَبْصَرْتُهَا مِنْ بَعِيدٍ، أَحْسَسْتُهَا، آنَسَ: رَأَى الشَّيءَ مُؤْنِساً لَهُ، الإِينَاسُ: الإِحْسَاسُ والشُّعُور بِأَمْرٍ خَفِيٍّ)، (آنَسْتُ نَارًا): واتە: لە دوورەوە بەرچاوم کەوتوەو هەستم پێکردوە، (آنَسَ) واتە: شتێکی بینی کە ئەو شتە مایەی هۆگریی بوو بۆی، مایەی دڵخۆشیی بوو بۆی، (إیناس): بریتیە لە هەستێکی باش بە شتێکی پەنهان.

(بِشِهَابٍ قَبَسٍ): بڵێسەی وەرگیراو، (أَصْلُ الشِّهَابِ: عُودٌ فِي أَحَدِ طَرَفَيْهِ جَمْرَةٌ وَالْآخَرُ لَا نَارَ فِيهِ)، وشەی (شِهَاب): لە بنەڕەتدا یانی: بزووت، بە کوردیی دەڵێین: بزووت، بزوتێکی دار، بریتیە لە دارێك کە سەرێکی پشکۆو ئاگر بێ و سەرەکەی دیکەی ئاگری پێوە نەبێ، مرۆڤ دەتوانێ بیگرێ، (وَالْقَبَسُ: أَي الْمَقْبُوسُ)، وەرگیراو.

(تَصْطَلُونَ): (أَي: تَسْتَدْفِئُونَ مِنَ الْبَرْدِ، الإصطلاء إِفْتِعَالٌ مِنَ الصَّلي)، (صَلي): واتە: خرانە نێو ئاگر، (إصطلاء) (إِفْتِعَالٌ مِنَ الصَّلِيُّ) واتە: خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە، دیارە شەوێکی ساردی زستان بووە، سەرمایان بووەو ڕێشیان لێ ون بووە، مووسا ﷺ ڕووناکییەکی بەدی کردوە، وایزانیوە ئاگرە، بەخێزانی گوتوە لێرە بوەستە دەچم بزووتێکتان بۆ دێنم، خۆتانی پێ گەرم بکەنەوەو، بەڵکو هەواڵێکیش لە لای ئەو ئاگرەوە بێنم، تاکو بزانین ڕێیەکەمان چۆنە؟

(تَهْتَزُّ): (الإِهْتِزَاز: الإِضْطِرَابُ إِفْتِعَالٌ مِنَ الهَزّ)، (هَزّ): واتە: ڕاوەشاندن و جووڵە، (تَهْتَزُّ): لە (هَزّ)ەوە هاتوە، (إِهْتِزَاز)، واتە: جووڵە جووڵ و هەڵبەزو دابەز.

(جَآنٌّ): کۆیەکەی (جِنَّان)ە، واتە: ماری بچووك، یان تیرە مار، لەبەر ئەوەی ئەو گۆچانەی مووسا فڕێی داوە، لە ڕووی قەبەییەوە مارێکی گەورە بووە، بۆیە وشەی (ثُعْبَان)ی بۆ بەکارهاتوە، بەڵام لە ڕووی جووڵەوە، لە شێوەی مارێکی

گچکەو تیرە ماردا جووڵاوە، کە زۆر بە خێرایی دەجووڵێ، بەڵام وشەی (جَانّ) ناوی کۆیەو تاکی (جِنّ)ە، هەروەها (جَانّ) وەك ناوی کۆ، بۆ جیننەکانیش، بەکاردێ.

(وَلَمۡ يُعَقِّبۡ): (لَمْ يَرْجِع: لم يَلْتَفِت)، نەگەڕایەوەو ئاوڕی نەدایەوە.

(مُبۡصِرَةٗ): بینەر (أَبْصَرَ، يُبْصِرُ فَهُوَ مُبْصِرٌ)، بینی دەبینێ ئەو بینەرە، (مُبْصَر) یش یانی: بینراو، بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: (مُبْصِرَةً): واتە: ئاشکراو ڕوون، (صِيغَ لَهَا وَزْنُ اسْمِ فَاعِلِ الْإِبْصَارِ عَلَى طَرِيقَةِ الْمَجَازِ الْعَقْلِيِّ، وَإِنَّمَا الْمُبْصِرُ النَّاظِرُ إِلَيْهَا)، خوا ﷻ ڕێژگەی (اسْمُ فَاعِلِ)ی (إِبْصَار)، بە شێوەی مەجازی عەقڵیی بەکارهێناوە {بۆ نیشانەکان کە ڕوون بوون و، بوونە هۆی ئەوەی هەر کەسێك تەماشایان بکات هەقیان پێ ببینێ} ئەگەرنا لە ئەصڵدا ئەو کەسەی تەماشایان بکات، چاك دەبینێ، بەڵام وەك ئایەتەکان خۆیان بینەر بووبن، دەشتوانین بڵێین: (مُبْصِر) یانی: پێبینەر، یانی: دەبنە هۆکاری ئەوەی خەڵك ببینێ، هەق ببینێ.

(وَجَحَدُواْ بِهَا): (الْجَحْدُ: الْإِنْكَارُ بِاللِّسَانِ)، (جَحْد) بریتیە لە نکووڵیکردن بە زمان، چونکە دەفەرموێ: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ﴾، بە زمان نکووڵییان لێکرد، بەڵام لە دەروونیاندا، بڕوا پتەوبوون و دڵنیا بوون، کە ئەو ئایەتانە ڕاستن.

(وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ): (أَيْ تَحَقَّقَتْهَا عُقُولُهُمْ)، بە عەقڵ و دڵ دڵنیابوون ئەو نیشانانەی مووسا ؈، ڕاستن، بەڵام بە زمان دانیان پێدا نەدەهێنان و نکووڵییان لێدەکردن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

پێشتریش باسمان کرد، کە لە سوورەتی (الأعراف)دا، ئێمە هەموو ژیانی مووسا ﷺو هارِوونی برای ﷺ لەگەڵ گەلەکەیان، گەلی جوولەکە، بەنوو ئیسرائیل، لە بەرانبەریشیاندا فیرعەون و هامان و قارِوون و قیبتییەکان و دارو دەستەکەیان، ئەو چیرۆکە هەموویمان دابەشکردوە بۆ سێزدە قۆناغ، هەشت قۆناغیمان لەبەر رۆشنایی ئایەتەکانی سوورەتی (الأعراف)دا، ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٧١)دا، واتە: (٦٩) ئایەت، توێژیونەوە، پێنج قۆناغی سەرەتایی ژیانی مووساش ﷺ وەك بەڵێنمان داوە، خوا پشتیوان بێت دوای ئەم سوورەتە، لە سوورەتی (القصص)دا، پێی دەگەین، ئایەتەکانی: (١ - ٤٣)، ئەو پێنج قۆناغەی ماون لە ژیانی مووسا ﷺ، تەنیا لە سوورەتی (القصص)دا، بەو شێوەیە هاتوون، بۆیە هەڵمانگرتوون، بۆ ئەوەی و لەوێ توێژینەوەی تەواویان لەسەر دەکەین و، ئەو کاتەش بەسەرهاتی مووسا ﷺ هارِوونی برای ﷺو گەلەکەیان و، فیرعەون و دارو دەستەکەی، دوا بەسەرهات دەبێ، کە تەواوی دەکەین، لەم تەفسیرەدا، چونکە ئێمە عادەتمان وایە، ژیانی هەر کام لەو پێغەمبەرانەی کە ناویان لە قورئاندا هاتوە، جگە لە موحەممەد ﷺ، بیست و چوارە کەی دیکە، هەر لە ئادەمەوە تاکو عیسا، هەر کامێکیان شوێنێکی تایبەتمان بۆ هەڵبژاردوە، کە لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەل و گشتگیر لە بارەی ژیانی ئەو پێغەمبەرەوە (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بکەین: چەند جاران ناوی لە قورئاندا هاتوەو، رەچەڵەکی چۆن بووە، چیی کردووەو چۆنی کردووەو، قۆناغەکانی ژیانی و، هەڵوێستەکانی؟ هەر کامێکیان لە قەدەر خۆی، بۆیە لێرەدا بە کورتیی بەسەر ژیانی مووسا ﷺو رووبەرِوو بوونەوەی لەگەڵ فیرعەوندا، تێدەپەرین، لە قەدەر ئەم ئایەتانە، بایی ئەوەندەی چەمك و واتای ئایەتەکان روون بکەینەوە، ئەگەرنا وردەکارییەکان لەو دوو شوێنەدا کە

گومانن: ئەوەی سوورەتی (الأعراف) کە تێپەڕی و، ئەوەی سوورەتی (القصص)، خوا پشتیوان بێت باس دەکەین.

﴿ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک مووسا عليه السلام بە خێزانەکەی خۆی گوت، (أهل) واتە: هاوسەری ئینسان، بەڵام جاری وایە، وێڕای هاوسەر، منداڵ و کوڕو کچیش دەگرێتەوە، بۆیە وشەی (خێزان)م بەکارهێناوە، کاتێ مووسا عليه السلام بە خێزانی خۆی گوت، چونکە لە هەندێ ڕیوایەتاندا هاتوە، کە دوو کوڕیشی بوون، یاخود چەند منداڵێکیشی بوون، بەڵام ئەوە لە قورئاندا، دیار نیە، ﴿ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا ﴾، من ئاگرێکم بە چاو ئەنگاوتوە، واتە: بە شێوەیەکی پەنهان بینیومەو بۆتە هۆی هۆگریم و ئاشنایم، بۆتە هۆی ئەوە کە جۆرێک لە هێمنییم بۆ دروست بێ، ﴿ سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ ﴾، بە دڵنیایی بە خێرایی هەواڵێکتان لەو ئاگرەوە بۆ دێنم، واتە: لە لای ئەو ئاگرەوە هەواڵتان بۆ دێنم، وا دیارە ڕێیان لێ ون بووەو شەو بووەو سەرماو سۆڵە بووە، بۆ ئەوەی بزانن ڕێیەکەیان بە کوێ دایە؟ وەك ئێستا نەبووە، شەقامە ڕێگا یان جادەی قیرتاو هەبێ، ﴿ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ ﴾، یاخود ئەگەر هەواڵێکیشم دەست نەکەوت، بە لای کەمەوە، بزووتێکی ئاگرتان بۆ دێنم، ﴿ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴾، بەڵکو خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە، لەبەر ئەوەی وێڕای ئەوەی ڕێیان لێ ون بووە، سەرماشیان بووە.

﴿ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِىَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِى ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا ﴾، ئنجا کاتێک مووسا عليه السلام چوو بۆ لای ئاگرەکە، بانگ کرا، ئایا بانگکردنەکە نێوەڕۆکەکەی چی بوو؟ ئەمە بوو: پیرۆزدارە، بەرکەتدارە، ئەوەی لە نێو ئاگرەکەدایەو، ئەوەش کە لە دەوری ئاگرەکەیە، وا دیارە مووسا چۆتە نێو ئاگرەکەوە، هەڵبەتە ئاگر نەبووە و ڕووناکیی بووە، ئەوەی لە دەوری ئاگرەکەیە، دەگونجێ مەبەست پێی فریشتەکان بن، یان ئەو سەر زەمینەو ئەو خەڵکە بێ کە لەسەر ئەو سەر زەمینە ژیاون، کە ناوچەی (شام) بووە، ﴿ وَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، هەروەها پاکیی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

ئنجا خوا ﷻ یەکسەر دواندی: ﴿ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، ئەی مووسا! ﷺ بە دڵنیایی منم خوای زاڵی کارزان.

﴿ وَأَلۡقِ عَصَاكَۚ ﴾، گۆچانەکەشت فڕێ بدە، هەڵبەتە خوا ﷻ لێرەدا بە کورتیی بۆمان دەگێڕێتەوە، ئەگەرنا لە پێش ئەوەوە، خوا شتی دیکەی فەرمووە، وەك لە سوورەتی (طە)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تِلۡكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ١٧ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيۡهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخۡرَىٰ ١٨ ﴾، بەڵام لێرەدا بۆ ئێمەی کورت دەکاتەوە، کە پێی فەرمووە: من دەتکەم بە پێغەمبەرو، موعجیزەت پێ دەدەم، یەکێك لە موعجیزەکان گۆچانەکەتە، فڕێی بدە، بەڵام لێرە ئەوە هەمووی کورت کراوەتەوەو هاتۆتە سەر ئەوە: کە گۆچانەکەت فڕێ بدە، ﴿ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ ﴾، کاتێك گۆچانەکەی بینی، بوو بووە بە مارێك، هەڵدەبەزیەوە، زۆر بە خێرایی و وەك تیرەمار یان ماری بچووك، ﴿ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ ﴾، مووسا بە پشت هەڵکردنەوەو، پشت تێکردنەوە ڕایکردو ئاوڕیشی نەدایەوە، یاخود نەگەڕایەوە، ﴿ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفۡ ﴾، (خوا ﷻ فەرمووی:) ئەی مووسا! ﷺ مەترسێ، ﴿ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴾، بە دڵنیایی ڕەوانەکراوان لە لای من ناترسێن، چونکە خوا ﷻ کەسێك بکاتە نوێنەرو ڕەوانەکراوی خۆی، بە تەئکید دڵی پڕ دەکات لە دڵنیایی و هێمنیی و ئاساییش و نابێ بترسێ، هەر شتێك ببینن.

﴿ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسۡنَۢا بَعۡدَ سُوٓءٖ فَإِنِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، مەگەر ئەو ڕەوانەکراوانە، کەسێکیان ستەمێك بکات، هەڵەیەك بکات، دوایی یەکسەر ئەو ستەم و خراپەیە بگۆڕێ بە چاکە، چاکە بێنێتە شوێنی خراپە، بە دڵنیایی من لێبووردەی میهرەبانم لەگەڵیدا، واتە: هیچ کام لە پێغەمبەران لە لای من نابێ ترسیان هەبێ، مەگەر یەکێکیان هەڵەیەك و کەم و کوڕییەکی هەبێ و، ئەویش ئەگەر یەکسەر چاکەیەك لە شوێن خراپەکە دابنێ، دیسان ئێمە بەرانبەری لێبووردەو بەبەزەیی و میهرەبانین.

ئنجا دوای ئـەوەی نیشـانەو موعجیـزەی یەکەمـی پـێ نیشـاندا، موعجیـزەی دووەمـی پێشـان دەدات، دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ ﴾، دەسـتت لـە یەخەی کراسـەکەتەوە بخـە بـن هەنگڵتـەوە، لـە سـوورەتی (القصص)، لـە ئایـەتی ژمـارە (٣٢) دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ ﴾، لـە کاتی ترسـدا، دەسـتت بخـە بـن باڵـت، ﴿ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ ﴾، بـە سـپییەتیی و درەوشـاوەیی دێتەدەر، بـێ ئـەوەی نەخـۆش بێـت، واتـە: وەنەبـێ تـووشی بەڵەکیـی، یـان حاڵەتێـکی نەخۆشـیی و نارێکیـی تـووش بووبێـت، ﴿ فِي تِسْعِ آيَاتٍ ﴾، ئـەو دوو نیشـانەو موعجیزەیـەت پـێ دەدەیـن، لـە نێـو نـۆ نیشـاناندا، واتـە: حـەوتی دیکەشـیان لەگەڵـدا دەبـن، ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِ ﴾، بچـۆ بـۆ لای فیرعـەون و گەلەکـەی، کە قیبتییـەکانی میسـرن، ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوان کۆمەڵێـکی لادەر بـوون، بۆیـە تـۆ بچـۆ بەڵکـو بەقسـەت بێنـەوە سـەر ڕێـی ڕاسـت، لـە حوکمـی عەقـڵ و زگـماك و شـەریعەت لایانـداوە، بچـۆ بەڵکـو بیانگێڕیـەوە بـۆ سـەر ڕاسـتە شـەقام.

﴿ فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ آيَاتُنَا مُبْصِرَةً ﴾، ئنجـا کاتێـك نیشـانەکانی ئێمەیـان، هاتنـە لا، کـە زۆر ڕوون بـوون، یاخـود هـۆکاری ئـەوە بـوون خەڵـك ڕێیـان پـێ ببینـن، هـەق و ناهەقیـان پـێ ببینـن، هێنـدە ڕوون و مایـەی هیدایـەت بـوون، وەك نیشـانەکان خۆیـان ببینـن.

﴿ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ مُبِينٌ ﴾، گوتیـان: ئەمـە جادوویـەکی ڕوون و ئاشـکرایە، واتـە: جادووێکـە زۆر ڕوون و ئاشـکرایەو، هەمـوو کـەس دەزانـێ جادوویـە، ﴿ وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴾، نکووڵییـان لێکـرد بـە زمـان، بـەڵام لـە دەروونی خۆیانـدا، دڵنیابـوون لـە ئایەتـەکان دڵنیابـوون، کـە نیشـانەکان کـە خـوا ﷻ بـە مووسـای ﷺ داون، ڕاسـتن، چونکـە ئەوانـە لـە سـەرووی ئاسـتی مرۆڤـەوەن، ئـەدی بۆچـی نکوڵییـان لێکـردن، بەهـۆی سـتەم و خۆبەرزکردنـەوەوە، چاویـان لـە سـتەم و خۆ بەرزکردنـەوەو خـۆ فەرزکـردن بـووە، بۆیـە ئامـادە نەبـوون، دانبنێـن بـەو نیشـانانەی

مووسادا عليه السلام و ملكەچی شەریعەتێك بن، كە مووسا عليه السلام هێناویەتی، ئەو كاتە ئەو شەریعەتە دەستی دەگرتن لە ستەم و خۆ فەرزكردن و خۆ سەپاندن.

﴿ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ ﴾، ئنجا سەرنج بدە! سەرەنجامی تێكدەران و خراپەكاران چۆن بوو! ئەوەبوو دوای ئەوەی مووسا عليه السلام بەڵگەی لەسەر تەواوكردن و بیانوو بڕاوی كردن، مووسا عليه السلام پێش گەلەكەی خۆی كەوت تاكو دەربازیان بكات بە دەریای سووردا، دەریایان بۆ شەق بوو، فیرعەون و سوپاكەی كەوتنە دوایان و، لەو دەریایەدا نغرۆ بوون و فەوتان.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ئاگادارکردنـــەوەی مووســا ﷺ بـــۆ خێـــزانی کـــە لـــە دوورەوە ئاگرێـــکی بـــەدی کـردوەو، دەیـەوێ بچـێ لەوێـوە هەواڵێکیـان بـۆ بێنـێ لـە بـارەی ڕێگاکـەوە، یـان بزووتێـکی ئاگـری بڵێسـەداریان بـۆ بێنـێ، خۆیـانی پـێ گـەرم بکەنـەوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا ﴾، یاد بکەوە! کاتێك مووسا ﷺ بە خێزانی گوت، من ئاگرێکم بەدی کردوە هۆکاری هۆگرییمە، تەنیا (**محمد الطاهر بن عاشور**) لە (**التحرير والتنوير**)دا[1] دەڵێ: (**أهله: زَوْجَهُ وَابْنَانِ صَغِيْرَانِ**)، خێزانی: ژنەکەی و دوو کوڕی گچکەی، کە لە پەیمانی کۆن وەریگرتوە و، تێبینیم کردوە (**محمد الطاهر بن عاشور**) زۆر پشت بە پەیمانی کۆن دەبەستێ! بە زۆرییش قسەکانی وەك ڕاستییەکی سەلمێنراو دێنێ، کە بێگومان لەوەدا نەپێکاوە.

لــە ســوورەتی (القصــص)دا دەفەرمــوێ: (ٱمْكُثُوٓاْ)، بوەســتن، بەمــلاولادا مــەڕۆن، شـوێنێکی بـۆ دیاریکـردون، ئەگەرنـا بـەم شـەوە چـۆن بیاندۆزێتـەوە، (ءَانَسْتُ)، یـانی: لـە دوورەوە بینیومـە، یاخـود ئاگرێکـم بـەر چـاو کەوتـوە، بۆتە هـۆی ئولفـەت و جۆرێك لـە هێمنیـی و ئۆخـژن بـۆم.

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٨، ص٢٢٥.

٢)- ﴿ سَـَٔاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ ﴾، بە زوویی هەواڵێکتان لە لای ئەو ئاگرەوە بۆ دێنم، لە سوورەتی (القصص)، ئایەتی ژمارە (٢٩)دا، دەفەرمویّ: ﴿ لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ ﴾، بەڵکو لە لای ئەو ئاگرەوە هەواڵێکتان بۆ بێنم، بەڵام لێرەدا دەفەرمویّ: ﴿ سَـَٔاتِيكُم ﴾، بە جەزمیی و مسۆگەریی دەیڵێ.

خاوەنی (التفسیر الکبیر)[1]، لێرەشدا ئیشکالێك کە هەڵدەستێ، دەیەوێ لایبەرێ، دەڵێ: بۆچی لە سوورەتی (القصص)دا، دەفەرموێ: ﴿ لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ ﴾، ئومێد وایە، بەڵام لێرەدا، بە جەزمیی دەڵێ: (سأتیکم) هەواڵێکتان بۆ دێنم؟! وەڵامەکەی ئەوەیە، دەڵێ: (قَدْ يَقُولُ الرَّاجِي إذَا قَوِيَ رَجَاؤُهُ سَأفْعَلُ كَذَا مَعَ تَجْوِيزِهِ الخَيْبَةَ)، واتە: بابای ئومێدەوار ئەگەر ئومێدەکەی زۆر بێ، دەڵێ: وادەکەم، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەری هەیە، لەو شتەشدا نەپێکێ و شتەکەشی بۆ نەیەتە دی.

بەڵام پێم وایە وەڵامێکی باشتر لەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە: مووسا ﷺ سەرەتا فەرموویەتی: ﴿ لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ ﴾ ئومێدم وایە بچم هەواڵێك بێنم، دوایی ئومێدەکەی بەهێزتر بووە، ئەوەشی فەرمووە: ﴿ سَـَٔاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ ﴾ بە دڵنیایی هەواڵێکتان هەر بۆ دێنم، واتە: دەگونجێ هەردوو قسەکەی کردبن خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النمل)دا، یەکێکیانی گێڕاوەتەوەو، لە سوورەتی (القصص)دا ئەوی دیکەیان گێڕاوەتەوە.

ئنجا ئەوە بۆ گەلێك شوێنی دیکەی قورئانیش هەر وایە، کە خوا ﷻ جاری وایە شتێك لە یەکێك لە پێغەمبەران دەگێڕێتەوە، یان لە گەلەکەیان، بە سێ جۆر دەیگێڕێتەوە، ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، کە قسەیان لەگەڵ ئەو خەڵکەدا کردوە، چ دەستڕۆیشتوو خۆبەزلگرەکان، چ خەڵکەکە بەگشتیی کە قسەیان لەگەڵ پێغەمبەران دا کردوە، مەرج نیە هەر یەك قسە بوو بێ، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتێك دا یەکێکیان دێنێ و، لەوی دیکەدا یەکێکیان دێنێ و، لەو دیکە یەکێکی دیکەیان دێنێ.

---

(١) ج٢٤، ص١٦٧.

٣)- ﴿أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ﴾، یان بزووتێکی وەرگیراو لەو ئاگرەتان بۆ دێنم، (شِهَاب) بریتیە لە دارێك، یەکێك لە سەرەکانی ئاگری پێوە بێ، ئەوی دیکەش ئاگری پێوە نەبێ و بە دەست بگیرێ، بە کوردیی بزووتی پێ دەڵێین، هەندێکیش گوتوویانە: (شِهَاب: الجَمْرُ المُشْتَعِل)، پشکۆیەکی داگیرساو، کە بە تەئکید پشکۆ ناگیرێ و دەبێ سەرێکی دار بێت.

٤)- ﴿لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾، بەڵکو خۆتان گەرم بکەنەوە، خوا ﷻ لێرەدا زۆر بە کورتیی و پوختیی دەیفەرموێ، هەڵبەتە لە شوێنەکانی دیکەش هەر ئاوا هاتوە، بەڵام ئێمە دەتوانین ئەنجامگیریی بکەین، کە مووسا ﵇و خێزانی دوو گرفتیان هەبوون:

یەکەم: ڕێیان لێ تێکچووە.

دووەم: سەرماشیان بووە.

بەڵگەمـــان چـــییە؟

یەکـەم: بەڵگەمـان ئەوەیە کـە دەفەرموێ: ﴿سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ﴾، یـان دەفەرموێ: ﴿لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ﴾، بەڵکـو هەواڵێکتـان لـە لای ئـەو ئاگـرەوە بـۆ دێنـم، هەواڵـی چییـان بـۆ دێنـێ؟ دیـارە ڕێیـان لـێ ون بـووە و، هەواڵـی ڕێیەکەیـان بـۆ دێنـێ.

دووەم: کـە دەفەرمـوێ: ﴿لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾، أي (تَسْـتَدْفِئُونَ)، بەڵکـو خۆتـانی پـێ گـەرم بکەنـەوە، دیـارە سـەرمایان بـووە، کەواتـە: خـوا ﷻ نەیفەرمـووە ڕێیـان لـێ تێکچـووەو سەرماشـیان بـووەو، زسـتان بـووەو ئـاوا بـووەو، بەڵکـو دوو وشـەی بەکارهێنـاون، یەکسـەر عاقـڵ تێـدەگات، کـە هەواڵەکـە بۆیـە دێنـێ، لەبـەر ئـەوەی ڕێیـان لـێ تێکچـووەو بـە ڕێیـان نەزانیـوەو، بزووتەکـەش بۆیـە دێنـێ، تاکـو خۆیـانی پـێ گـەرم بکەنـەوە، دیـارە سـەرمایان بـووە.

**مەسەلەی دووەم:**

**چوونی مووسا عليه السلام بۆ ئەو شوێنە کە پێی وابووە ئاگری لێیەو، بانگکرانی لە لایەن خواوە ﷻ، ئنجا کرانی بە پێغەمبەرو، پێشاندانی هەر کام لە گۆچانەکەی کە دەبێتە مارێکی گەورەی جووڵە خێرا، هەروەها دەستی کە دوای خستنیە بن قۆڵی لە ڕێی یەخەیەوە، سپیی و درەوشاوەو پرشنگدار دەبێ، پاشان ناردنی بە نۆ بەڵگەو نیشانەوە (لە نێویاندا گۆچانەکەی و دەستی) بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی، تاکو پەیامی خوایان پێ ڕابگەیەنێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨﴾ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ وَأَلْقِ عَصَاكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًۢا بَعْدَ سُوٓءٍ فَإِنِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ۖ فِي تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ فَلَمَّا جَآءَهَا ﴾، کاتێك کە چوو بۆ لای، واتە: چوو بۆ لای ئاگرەکە، ئنجا لەوانەیە یەکێك بڵێ: ئاگر نەبووەو ڕووناکیی بووە! دەڵێین: لە خەیاڵ و گومانی مووسادا عليه السلام ئاگر بووە، چوو بۆ لای ئەوە کە پێی وابووە ئاگرە.

٢)- ﴿ نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا ﴾، بانگکرا کە پێترداربێ کەسێك کە لە ئاگرەکەدایەو، کەسێك کە لە دەوریەتی. (نُودِيَ) بانگکرا! بە بکەر نادیار هاتوە، کە بە دڵنیایی لە لایەن خواوە ﷻ بانگکراوە، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخْلَعْ نَعْلَيْكَ ۖ إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٢﴾ ﴾طه، کەواتە: خوا ﷻ لەو دۆڵە پاکەدا کە ناوی (طُوًى ) بووە، بانگی کردوە (بانگکرا) کە پێزدارو بەرەکەتدار بێ ئەوەی

کە لە نێو ئاگرەکە دایەو، ئەوەش کە لە دەوریەتی، ئەوەی لە نێو ئاگرەکە دایە بەپێی گومانی مووسا ﷺ یان دەبینی ئاگریش بووە، بەڵام ئاگری سووتێنەر نەبووە، یان لە شێوەی ئاگر دابووە، بەڵام گەرم نەبووەو سووتێنەر نەبووە، مووسا ﷺ چۆتە نێوی و واپێدەچێ پانتاییەکی داگرتبێ، (وَمَنْ حَوْلَهَا)، ئەوەی کە لە دەوری ئاگرەکەشە، ئەوەی لە نێو ئاگرەکە دایە، زۆربەی زانایان دەڵێن: مووسا ﷺ بووە چۆتە نێوی، ئەوەی لە دەوری ئاگرەکەیە جیبریل بووە، یاخود ئەوەی لە نێو ئاگرەکە دایە مووسا ﷺ بووەو، ئەوەی لە دەوری ئاگرەکە بووە، ئەو خەڵکە بوون کە لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوون، یان خوا ﷻ بە گشتیی فەرموویەتی، بەرەکەتدارو پیرۆزە ئەوەی لە نێو ئەو ئاگرە دایەو، ئەوەی لە دەوریشیەتی کە فریشتەکانن و مرۆڤەکانن و جیننی بڕوادارن، هەر کەسێکن، ئەو شوێنە هەمووی، چەقەکەی و دەوروبەرەکەی پیرۆزو بەرەکەتدارە.

٣)- ﴿ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، پاکیی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، جارانی دیکەش گوتوومانە: (سُبْحانَ الله)، یانی: (سَبِّحِ اللهَ تَسْبِيحًا، أو أُسَبِّحِ اللهَ تَسْبِيحًا)، خوا بە پاك بگرە بە پاکگرتن، یان من خوا بە پاك دەگرم بە پاکگرتنی تەواو، یانی: (نَزِّهِ اللهَ تَنْزِيهاً عَنْ كُلِّ مَا لَا يَلِيقُ بِهِ، مِثْلُ: الحُلُولِ فِي مَكَانٍ مَا)، خوا بە پاك بگرە، لە هەر شتێك کە شایستەی نیە، وەك ئەوە کە لە شوێنێکی دیارییکراودا بێ.

٤)- ﴿ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، ئەی مووسا! بە دڵنیایی من خوای زاڵی کارزانم، (إِنَّهُ)، ئەو (هـ)ی سەر (إِنَّ)، ڕاناوی حاڵ (ضَمِيرُ الشَّأْنِ)ی پێ دەگوترێ و بۆ تەئکیدە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، واتە: گرنگیی بە دوژمنەکانت مەدە، من زاڵم و کاروباریشت لێزانانە و کاربەجێیانە بۆ ڕادەپەڕێنم، ئەو پەیامەی کە پێتدا دەنێرم و ئەو کارەی کە پێت دەسپێرم، زۆر متمانەداربە بە پەروەردگاری خۆت، هەم باڵا دەستەو، هەم کارزان و کاربەجێشە.

٥)- ﴿ وَأَلْقِ عَصَاكَ ﴾، گۆچانەکەشت فڕێبدە، واتە: پێمان گوت، گۆچانەکەت فڕێ بدە، بەڵام ئەوە پێچراوەتەوە بۆ کورتکردنەوە.

٦)- ﴿ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ ﴾، خوا ﷻ ئەوەی کورت کردۆتەوە: [گۆچانەکەی فڕێداو بوو بە مارێکی گەورە] ئنجا کاتێك بینی وەك تیرە مار، یان وەك مارێکی گچکە هەڵبەزو دابەز دەکات و، جووڵەی خێرا دەکات، وشەی (جَآنٌّ): واتە: ماری گچکە، کە بە (جِنَّان) کۆدەکرێتەوە، وەك لەم فەرموودە هاتوە: [قَالَ أَبُو لُبَابَةَ الأَنْصَارِيُّ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ قَتْلِ الْجِنَانِ الَّتِى تَكُونُ فِي الْبُيُوتِ] (أخرجه البخاري: ٣٣١٢، ومسلم: ٢٢٣٣)، واتە: ئەبوو لوبابەی ئەنصاری خوا لێی ڕازیبێ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست، قەدەغەی کردوە کە مارە خانەکییەکان لە ماڵاندا بکوژرێن.

هەروەها (جَانّ)، یان بابی جیننە (ئیبلیس)، یان کۆی جیننە.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ ﴾، (تَهْتَزُّ): لە (هَزُّ)ەوە هاتوە، (إهْتِزَاز)یش (إفْتِعَال)ە، (إهتِزاز) واتە: (إضطِراب) واتە: جووڵە جووڵ و، هەڵبەزو دابەز، وشەی (هَزّ)یش بە مانای بەرزبوونەوە دێ، هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: (الجَانّ: ذَكَرُ الحَيّات) نێرە مارە، مووسا گۆچانەکەی بینی لە قەبەییدا وەك (ثُعبان) بوو، مارێکی گەورە، حەزیاو ئەژدیها، بەڵام لە خێرایی جووڵەدا، وەك تیرە مارو بەچکە مار بوو، کە ئەوەی بینی ترساو پشتی تێکردو ڕۆیشت، دوورکەوتەوەو ئاوڕیشی نەدایەوە، یاخود نەگەڕایەوە.

٧)- ﴿ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ﴾، ڕووی وەرگێڕاو بە پشت تێکردنەوە، ئاوڕیشی نەدایەوە، یاخود نەگەڕایەوە.

٨)- ﴿ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ ﴾، واتە: (خوا فەرمووی:) ئەی مووسا ؑ مەترسێ.

٩)- ﴿ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾، بە دڵنیایی پێغەمبەران لە نیزیك منەوە ناترسێن، پێغەمبەران لەلای من ناترسێن، واتە: لە کاتێکدا کارێکیان پێ دەسپێرم، نابێ هیچ ترس و بیمێکیان هەبێ، چونکە (لَدَيّ: أي فِي حَضْرَتِي، أي: حِيْنَ تَلقِيّ رِسَالَتِي)، کاتێك لە لای من ئامادە دەبن، کاتێك پەیامی من وەردەگرن، یاخود من ئەرکێکیان پێ دەسپێرم، نابێ ترسیان هەبێ.

۱۰)- ﴿ إِلَّا مَن ظَلَمَ ﴾، مەگەر یەکێکیان ستەمێك بکات.

۱۱)- ﴿ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًا بَعْدَ سُوٓءٍ ﴾، دواییش یەکسەر چاکە لە شوێنی خراپە بکات، چاکە بێنێتە شوێن خراپە.

۱۲)- ﴿ فَإِنِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، ئەو کاتەش من لێبوردەی بە بەزەیی میهرەبانم، ئەمە ئەگەر (مَنْ ظَلَم) مەبەست پێی پێغەمبەران بێ، ئەوە بە هەڵاواردنی پەیوەست (الإسْتِثْنَاء المتَّصِل) دادەنرێ، بەڵام ئایا مەبەست لە ستەمی پێغەمبەران چییە؟! دوو واتایان بۆ لێك داونەوە:

یەکـەم: واتـە پێـش پێغەمبەرایەتیـی، دووەم: نەخێـر هـەر لـە سـەردەمی پێغەمبەرایەتییـدا، بـەڵام بـەو واتایـە کـە: (حَسَـنَاتِ الأَبْـرَار سَـيِّئَاتُ المُقَرَّبِـيْن)، واتـە: ئـەوە لـە قـەدەر پێغەمبـەران بەسـتەم لـە قەڵـەم دەدرێ، ئەگەرنـا بـۆ جگەلـە پێغەمبـەران بـە سـتەم و گونـاح لـە قەڵـەم نـادرێ، چونکـە جـاری وا هەیـە چاکـەی چـاکان، بـۆ زۆر لـە خـوا نیزیـکان، بـە خراپـە لـە قەڵـەم دەدرێ، بـۆ وێنـە: ئەگـەر کەسـێك تەنیـا بـە نوێـژە فـەرزەکان و ڕۆژووە فـەرزەکان، ئیکتیفـا بـکات، بـۆ کەسـێك کـە ئاسـتەکەی نـزم بـێ، چاکـە، بـەڵام بـۆ کەسـێك ئاسـتەکەی بـەرز بێـت، تەنیـا فـەرزەکان بـکات و سـوننەتەکان نـەکات خراپـە، بـۆی بـە خراپـە دادەنـرێ، وەك پێغەمبـەر فەرموویـەتی: (نِعْـمَ الرَّجُـلُ عَبْـدُ اللَّـهِ لَـوْ كَانَ يُصَـلِّي مِـنَ اللَّيْـلِ)[1]، واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر پیـاوی زۆرباشـە ئەگـەر شـەونوێژ بـکات.

لێـرەدا مەبەسـت ئـەوە بـووە، کـە مووسـا ﷺ دڵـی ئـارام بێتـەوە، ئەگـەر گریمان کـەم و کوڕییەکیـشی ببـێ، لـە کاتی هەڵچوونێکـدا، وەك کاتێـك کـە تـووڕە بـووە، ڕیشی هـاڕوونی بـرای گرتـوەو قـژی سـەری گرتـوەو، لەوحـەکانی فڕێـداون، خـوا دەفەرمـوێ: دوای ئـەو تووڕەیـی و هەڵچوونـە، ئەگـەر قسـەیەکی هەڵـەو ڕەفتارێـکی هەڵـەت لـێ بپشـکوێتەوە، بـەڵام دوایـی بگەڕێیـەوەو بـە چـاك بیگـۆڕی، مـن لێبـوردەی بـە بەزەییـم، وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا، دەفەرمـوێ:

---

(۱) أخرجه البخاري: ۱۱۲۲، ومسلم: ۲٤۷۹.

﴿ وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِى مِنۢ بَعْدِىٓ ۖ أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ ۖ وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ ۚ قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى وَكَادُوا۟ يَقْتُلُونَنِى فَلَا تُشْمِتْ بِىَ ٱلْأَعْدَآءَ وَلَا تَجْعَلْنِى مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى وَأَدْخِلْنَا فِى رَحْمَتِكَ ۖ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ ﴾.

مانای وایە مووسا عليه السلام داوای لێبوردنی لە خوا ﷻ کردوە، بۆ ئەوە کە سەرو ڕیشی هارونی برای تێکباهەڵداوەو لەوحەکانی فڕێداون، بە توورەیی، لە سەر خوا ﷻ توورە بووە، بۆیە خوای پەروەردگار لێی نەگرتوە.

بەڵام ئەو ڕایەی دەڵێ: پێش پێغەمبەرایەتیی، پێم ڕاست نیە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنِّى لَا يَخَافُ لَدَىَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾، واتە: ئەوانە لەو حاڵەتەدا کە پێغەمبەرو ڕەوانەکراون، لە لای من ناترسێن، کاتێک من ئەرکێکیان پێ دەسپێرم.

ئنجا ئەوەش کە وا بزانرێ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هیچ شتێکیان نەکردوە، داوای لێبوردنی بۆ لە خوا ﷻ بکەن، ئەوە هەڵەیە، چونکە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، زۆر جاران داوای لێبوردنیان لە خوا ﷻ کردوە، بۆ نموونە:

١)- لە سوورەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى وَأَدْخِلْنَا فِى رَحْمَتِكَ ۖ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ ﴾.

٢)- لە سوورەتی (القصص)دا، مووسا عليه السلام، هەرچەندە پێش پێغەمبەرایەتییە، کابرای قیبتیی دەکوژێ دوایی دەڵێ: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ ﴾.

٣)- هەروەها ئادەم عليه السلام و هاوسەرەکەی گوتوویانە: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾الأعراف.

٤)- هەروەها نووح عليه السلام: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾﴾ هود.

هەروەها پێغەمبەرانی دیکە (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلَام)، داوای لێبوردنیان لە خوا ﷻ کردوە، چونکە گرنکە ئێمە بزانین، کە گوناهکردنی پێغەمبەران، وەك گوناهی خەڵکی دیکە نیە، ئەوان ئەگەر ئیجتیهاد و کۆششێکیان کردبێ و لە بۆچوونێکدا نەیانپێکابێ، پێیان گوناح بووەو داوای لێبوردنیان لە خوا ﷻ کردوە، هەروەها لە کاتی هەڵچوونێکدا، قسەیەکی کەم و زیادیان کردبێ، با بۆ خەڵکی دیکە بە گوناهیش لە قەڵەم نەدرێ، ئەوان بۆ خۆیان بە گوناهیان لە قەڵەم داوە.

ئنجا لە ڕاستییدا ئینسان تاکو زیاتر لە خوا نیزیك بێ و، پلەو پایەو مەقامی بەرزو بێ وێنەی خوا ﷻ، زیاتر دەرك بکات و پێی ئاشنا بێ، خۆی پێ کەمتەرخەمترە، نەك هەر لەسەر گوناهەکانی، بەڵکو لەسەر چاکەکانیشی داوای لێبوردن لە خوا دەکات، وەك پێغەمبەری خاتەم هەر کاتێك سڵاوی لە نوێژە فەرزەکاندا داوەتەوە، سێ جاران فەرموویەتی: (أَسْتَغْفِرُ الله، أَسْتَغْفِرُ الله، أَسْتَغْفِرُ الله)[1]، سێ جاران داوای لێبوردنی لە خوا کردوە، واتە: من داوای لێبوردن لە خوا دەکەم، کە ئەو تاعەت و نوێژەی ئەنجامم دا، شایستەی خوا نیە، بەڵام من هەر ئەوەندەم لە تواناداییە، هەروەها سوورەتی (النصر): ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾﴾، لە مەقامێکدا کە مەککە ئازاد دەکەن، خوا ﷻ پێی دەفەرموێ: داوای لێبوردن لە خوا بکەو، ستایشی بکەو، بە پاکیی بگرەو، داوای لێبوردنی لێ بکە، خوا زۆر تۆبە وەرگرە.

١٣)- ﴿وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ﴾، دەستت لە یەخەکەتەوە، بخە بن باڵت.

---

(١) أخرجه مسلم: ٥٩١.

١٤)- ﴿ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ﴾، بە سپییەتیی، بێ ئەوەی نەخۆشیی هەبێ، دێتە دەرێ، هەڵبەتە لە هەموو شوێنەکان دا دەفەرموێ: (بَيْضَاء)، بە سپییەتیی، بەڵام من پێم وایە، ئەو سپییەتییە، هەر ئەوە نەبووە، سپییەکێ وەك کاغەز، بێ، چونکە دەفەرموێ: ﴿ هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾الشعراء، سپییە بۆ تەماشاکاران، کەواتە: بە شێوەك بووە خەڵك بە سەرسوڕمانەوە بێن تەماشای بکەن، دیارە سپییەتییەکەی وابووە درەوشاوەتەوە و وەك بلاجکتۆرێك شەوقی داوە.

١٥)- ﴿ فِى تِسْعِ ءَايَـٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ﴾، لە نێو نۆ نیشانانْدا {ئەو دوو نیشانەیەشت با هەبن} بچۆ لای فیرعەون و خەڵکەکەی واتە: ئەو دووەو حەوتی دیکەش، زانایان لە بارەی ئەو نۆ نیشانانەوە، زۆر قسەیان کردوون و لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا، لەو بارەوە بە تەفصیلْ قسەم کردوە.

(الفیروز آبادي): گوتوویەتی: نۆ نیشانەکان، ئەمانەن: (عَصاً، سَنَةٌ، بَحْرٌ، جَرَادٌ، وَقُمَّلٌ، يَدٌ، وَدَمٌ، بَعْدَ الضَّفَادِعِ، طَوْفَانٌ)، گۆچان و، ساڵی گرانییەکان و، دەریا (لەت بوونەکە)و، کوللەو، ئەسپێ و دەستی و، خوێن، دوای بۆقەکانیش، تۆفان،

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ﴿١٣٣﴾ ﴾الأعراف، ئەوە پێنج، پێشتریش باسی دووان دەکات: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴿١٣٠﴾ ﴾الأعراف، ئنجا دەستی و گۆچانەکەشی، ئەوە نۆ.

هەندێکیش دەڵێن: دەریا لەت بوونەکەو، کانیی و سەرچاوە بۆ دەرقوڵینیان لە دەشتی سینادا، کە مووسا ﵇ بە گۆچانەکەی لە شاخەکەیدا، لەو بارەوە ڕا جیایی لە نێو زانایاندا هەیە، ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ﴾، بەرەو لای فیرعەون و گەلەکەی، کە خەڵکی میسر بوون، قیبتییەکان.

١٦)- ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان کۆمەڵێکی لادەر بوون، لادەر بوون لە زگماك و عەقڵ و شەرع.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**دوای ئەوەی نیشانە ڕۆشنەکانی خوایان بۆ هاتن (فیرعەون و گەلەکەی)، گوتیان: ئەوە جادوویەو، هەرچەندە دڵنیابوون لە ڕاستییان (بە دڵ و دەروون)، بەڵام بە زار نکووڵییان لێکردن، بە هۆی ستەم و خۆبەرزکردنەوەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَٰتُنَا مُبْصِرَةً قَالُواْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَٰتُنَا مُبْصِرَةً ﴾، ئنجا کاتێك نیشانە ڕۆشنەکانمانیان بۆ هاتن، ئەوە هەمووی پێچراوەتەوە، کە مووسا ؏ چووەوە بۆ میسرو، داوای لە خوای پەروەردگار کرد: هاروونی پێ ببەخشێ وەك پێغەمبەر، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥١﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَٰهُ نَجِيًّا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴿٥٣﴾ ﴾مريم، هەروەها لە کتێب دا یادی مووسا بکە، کە بۆ خوا ساغ و یەکلا بووەو ڕەوانەکراوو پێغەمبەر بوو، لە تەنیشتی ڕاستی طووریشەوە بانگمان کردو بە دواندنی پەنهانەوە نیزیکیمان خستەوە، هاروونی برایشمان لە بەزەیی خۆمانەوە بە پێغەمبەر پێ بەخشی. [کە لەگەڵی بێ وەك وەزیرو پاڵپشت] لێرەدا ئەوە هەمووی پێچراوەتەوەو، یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَٰتُنَا مُبْصِرَةً ﴾، کاتێك نیشانەکانی ئێمەیان پێبینەرانە، یاخود: زۆر ڕۆشنانە، بۆ هاتن.

عەلی کوڕی حوسەین و قەتادە وشەی (مُبْصِرَة)یان خوێندۆتەوە: بە (مَبْصَرَةٌ)، واتە: ڕۆشنکراوە، یانی: (إسْم المَفْعول)، ئنجا گوتوویانە: وەك: (مَجْبَنَة ومَبْخَلَة)وایە، (مَبْصَرَةٌ، أي مَكَان الإبْصَار، أو تَبصير)، شوێنی بەرچاو ڕوونکەرەوە بوون، بەرچاو ڕوونکەرەوە بوون، وەك دەڵێ: (الوَلَـدُ مَجْبَنَـةٌ مَبْخَلَـةٌ)، منداڵ ئینسان ترسنۆك دەکات و چرووکیشی دەکات.

٢)- ﴿ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، گوتیان ئەوە جادوویەکی ئاشکرایە.

٣)- ﴿ وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ﴾، واتە: نکوولّییان لە ئایەتەکان کرد، لە دەروونیشیان دا لێیان دڵنیابوون، (الجُحُودُ: الإنْكَارُ بِاللِّسَان)، (جحود): بریتیە لە نکوولّییکردن بە زمان، یانی: بە زمان دانیان پێدا نەهێنان.

﴿ وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ﴾، بەڵام لە دەروونی خۆیاندا، لێیان دڵنیا بوون، (الإسْتِيقَانُ: أَبْلَغُ مِنَ الإيْقَان، لأن زِيَادَةُ المَبْنَى تَدُلُّ عَلَى زِيَادَةَ المَعْنَى)، (إسْتِيقَان) کە (س) و (ت) خراونە سەر (إيْقَان)، زێدەڕۆیی زیاتری تێدایە لە (إيقان) چونکە زۆریی پیتان، بە هێزیی واتا دەگەیەنێ. یانی: تەواو دڵنیا بوون، لە دڵی خۆیاندا کە ئەو نیشانانە، لە سەرووی ئاستی توانای بەشەرەکانن و موعجیزەن و، خوا ﷻ بە مووسا ﷺ ی داون، بەڵام بەزمان نکوولّییان لێکردن.

٤)- ﴿ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴾، بە هۆی ستەم و خۆ بەرزکردنەوەوە، (ظُلم) یانی: سنوورشکێنیی و سنووربەزێنیی، بەتایبەت مافی ئەوانی دیکە پێشێل بکەی، (عُلُوّ)یش واتە: خۆ بەرزکردنەوەو خۆ بە گەورە زانین، لەبەر ئەوەی ئەگەر بڕوایان بە مووسا ﷺ و بە ئایەتەکانی کردبایەو، پابەندبان بە شەریعەتەکەیەوە، ئەو شەریعەتە ڕێ زوڵمێ دەگرێ و، ڕێ لە خۆبەرزکردنەوەو خۆسەپاندن، دەگرێ، هەموو ئەو تاغووتانەی لەسەر ئاستی ڕژێمە عەلمانییەکانی ناوچەکەو، لەسەر ئاستی حیزبە عەلمانییەکان، کە دانوویان لەگەڵ ئیسلامدا ناکوڵێ، بەهانە دەگرن بە فڵان لایەنی ئیسلامیی و فیسار لایەنی ئیسلامیی، باشە وەرە بۆ خۆت ئیسلام پیادە بکە، چیدیکە وەک بانگەشەی خراپ و ناو بەدکردن مەڵێ: فڵان لایەنی ئیسلامیی تیرۆریستە، هەڵبەتە ئێمە قسەمان لە سەر ئەو لایەنە پەڕگیرو تێپەڕێنەرانەی وەک داعش و ئەوانی پێش وان و ئەوانەی دوای وان نیە، ئێمە دەڵێین: تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ و شەرعڕەو کە دەیەوێ مسوڵمانان ئیسلام پیادە بکەن لە ژیانی خۆیاندا، لە ژیانی تاکیی، خێزانیی، کۆمەڵایەتیی، سیاسییان دا، ئەگەر تۆ ئەو بە تێپەڕێنەرو بە خراپ دەزانی، ئەگەر ڕاست دەکەی، وەرە ئیسلام پیادە بکە، شەریعەت بکە سەرچاوەی یاساکانت، واز لە زوڵم و

قۆرخکاریی بێنە، واز لە گەندەڵیی بێنە، وەرە دادگەریی بچەسپێنە، بۆ ئەوەی ئیسلامییەکان بیانوویان نەمێنێ، بڵێن: گەندەڵیی و قۆرخکاریی و ستەمکاریی، هەیە، ئنجا ئەوە بە نسبەت هەرێمەوەو عێراقەوەو وڵاتانی ناوچەکەوەو، بەگشتیی قسە لە جیهانی ئیسلامیی دەکەم، واتە: ئەوانەی کە ئیددیعای مسوڵمانەتیی دەکەن و لایەنە ئیسلامییەکان و تەوژمە ئیسلامییەکان تۆمەتبار دەکەن، با بۆ خۆیان بێن ئەوەی لایەن و تەوژمیی ئیسلامیی دەیڵێن، پیادەی بکەن، ئەگەر ڕاست دەکەن، بڕوایان بە ئیسلام هەیە.

٥)- ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾، سەرنج بدە! سەرەنجامی تێکدەران چۆن بوو.

(كَيۡفَ)، یان: مەبەست پێی پرسیارکردن نیە، بەڵکو مەبەست پێی سەرنج دان و ڕامانە، یان: مەبەست پێی پرسیارکردنی سەرسوڕمانانەیە، واتە: سەرت سوڕبمێنێ لەو سەرەنجامە شوومەی، کە بە مەل فیرعەون و دارودەستەکەی و گەلە سەرکەشەکەی داهات، کە ئەوە بوو لە دەریای سووردا نغرۆ بوون و خنکان و، بێ قڕە بوون و دوابڕاو بوون!

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، بە دوای ڕێبازو ڕێ و شوێنی پێغەمبەران دا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بچین و، خوا لەو سیفەتانە بە دوورمان بکات، کە لە ناحەز و دوژمنانی پێغەمبەران دا هەبوون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە سی (٣٠) ئایەت، پێك دێ، ئایەتەکانی: (١٥ - ٤٤)، هەموویشی تەرخانکراوە بۆ گێڕانەوەی گۆشەیەك لە بەسەرهاتی سولەیمان عليه السلام و ئاماژەیەکی کورتیش بە داوودی بابی عليه السلام، کە داوودو سولەیمان باب و کوڕ بوون، وێڕای ئەوەی کە پێغەمبەر بوون، لە هەمان کاتیشدا حوکمڕانیش بوون، بەسەرهاتەکەی سولەیمانیش عليه السلام باسی سەفەرێکیەتی بەسەرجەم سوپایەکەیەوە، لە مرۆڤ و، جند، باڵندەو، تێپەڕبوونیان بە لای شارە مێرووولەیەك دا، یان دۆڵێکدا کە بە (وادي النمل)، ناسراوە.

پاشان پرسینی سولەیمان دوای ئەوەی باڵندەکانی بەسەرکردنەوە: ئایا هودهود (کە لە کوردەواریی دا پێی دەڵێن: پەپوو سولەیمانە) لە کوێیە؟ ئنجا هەواڵدانی هودهود بە سولەیمان لە بارەی شاژنی سەبەئەوە، دوایی نامە ناردنی سولەیمان بۆی و، ڕاوێژکردنی شاژن بە بڕیار بە دەستان و قسە ڕۆیشتووانی وڵاتەکەی، لە کۆڕو مەجلیسە تایبەتییەکەیداو، ئامادەیی دەربڕینی قسەڕۆیشتووان بۆ هەر بەرەنگاربوونەوەیەك و، سەرەنجام بڕیار هاتنە سەر ئەوەی، دیاریی بنێرێ بۆ سولەیمان، بەڵام قبووڵنەکردنی سولەیمان و، سووربوونی لەسەر ئەوەی ئەگەر بە شێوەیەکی ئاشتییانەو تەبایی سەردانی نەکات، بۆ وتوێژو دیالۆگ، لەشکر کێشیی لە دژی دەکات، سەرەنجام چوونی شاژن و، پێش ئەوەی کە خۆی بگات، هێنانی عەرش و کورسییەکەی بۆ بارەگای سولەیمان.

دوایی دروستکرنی کۆشکێکی بەرز کە زەوییەکەی شوشە بەند بووەو، وا هاتۆتە بەر چاو کە ئاوی بە ژێردا دەڕوات، سەرەنجام شاژن کە ئەو دیمەنە سەرنجڕاکێشانە دەبینێ، هەروەها دیالۆگ و وتوێژیش دەکات لەگەڵ سولەیمان

دا، دێتە ئەو بڕوایەی کە بۆ خوا ملکەچ بێت، واز لە خۆرپەرستیی و بتپەرستیی بێنێت.

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾ وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَـٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩﴾ وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّى وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَىْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ۩ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذْهَب بِّكِتَـٰبِى هَـٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَـٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَـٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ

وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً
أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ
فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ
خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُمۚ بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ فَلَنَأۡتِيَنَّهُم بِجُنُودٖ لَّا قِبَلَ
لَهُم بِهَا وَلَنُخۡرِجَنَّهُم مِّنۡهَآ أَذِلَّةٗ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن
يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ وَإِنِّي عَلَيۡهِ
لَقَوِيٌّ أَمِينٞ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَۚ
فَلَمَّا رَءَاهُ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا
يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيّٞ كَرِيمٞ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرۡشَهَا نَنظُرۡ أَتَهۡتَدِيٓ أَمۡ
تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتۡ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِۖ قَالَتۡ كَأَنَّهُۥ هُوَۚ وَأُوتِينَا ٱلۡعِلۡمَ
مِن قَبۡلِهَا وَكُنَّا مُسۡلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعۡبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ إِنَّهَا كَانَتۡ مِن قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾
قِيلَ لَهَا ٱدۡخُلِي ٱلصَّرۡحَۖ فَلَمَّا رَأَتۡهُ حَسِبَتۡهُ لُجَّةٗ وَكَشَفَتۡ عَن سَاقَيۡهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ
مِّن قَوَارِيرَۗ قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ
﴿٤٤﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەهـا بـە دڵنیایـی زانیاریـی (یـەکی تایبەت)مـان بـە داوودو سـولەیمان دابـوو، گوتیـان: سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی کـە بەسـەر زۆر لـە بەنـدە بـڕوادارەکانی دا هەڵیبژاردوویـن ﴿١٥﴾ سـولەیمانیش میـراتی (زانسـت و حوکمڕانیـی) لـە داوود گـرت و گـوتی: ئـەی خەڵکینـە! دوانـدنی باڵندانمـان فێرکـراوەو، لـە هەمـوو شـتێك (ی گرنگ)مـان پێـدراوە، بـە مسـۆگەریی هـەر ئـەوەش بەخششـێکی روونـە ﴿١٦﴾ سـولەیمان سـەربازەکانی لـە مـرۆڤ و جنـدو باڵنـدان بـۆ کۆکرانـەوە، لـە حاڵێکـدا کـە زۆر فەرمانبـەر بـوون ﴿١٧﴾ هەتـا کاتێـك گەیشـتنە دۆڵـی مێـروولان (بەلایـدا ڕەتبـوون) مێروولەیـەك گـوتی: ئـەی مێروولـەکان! بچنـە ماڵەکانتانـەوە، بـا سـولەیمان و سـەربازەکانی تێکتـان نەشـکێنن، لـە حاڵێکـدا کـە هەسـت(تان پـێ) ناکـەن ﴿١٨﴾ سـولەیمان بـە زەردەخەنـەوە بـە قسـەکەی پێکـەنی و گـوتی: پـەروەردگارم! یارمەتیـم بـدە سـوپاسی ئـەو چاکەیـەت بکـەم، کـە بـە خـۆم و بـاب و دایکیشـمت بەخشـیوە، هەروەهـا کـە کـردەوەی چـاك بکـەم، تـۆ پەسـندی بکـەی و، بـە بەزەیـی خـۆت بمخـە ڕیـزی بەنـدە چاکەکانتانـەوە ﴿١٩﴾ (ئنجا سـولەیمان) باڵنـدەکانی بەسـەرکردنەوە (چـاوی پێداگێـڕان) گـوتی: ئـەوە چییـە هودهـود نابینـم (ئایـا پەرچێـك ڕێگـرە لـە دیتنـی)، یـان لـە نادیـاران (نـا ئامادەبـووان)ە؟! ﴿٢٠﴾ بـە دڵنیایـی (بـە پێـی جـۆری سـەرپێچییەکەی ئەگـەر لەسـەری سـاغ بێتـەوە) ئازارێـکی تونـدی دەدەم، یـان سـەری دەبـڕم، یـان دەبـێ بەڵگەیـەکی ڕوونـم بـۆ بێنـێ (کـە پاسـاوی ئامادەنەبـوونی بـێ) ﴿٢١﴾ دوای مـاوە پێچوونێـکی کـەم (هودهـود هاتـەوە) گـوتی: ئـاگاداری شـتێك بـووم، کـە تـۆ ئـاگاداری نیـت، لـە سـەبەئەوە هەواڵێـکی ڕاسـت و جێـی دڵنیاییـم بـۆ هێنـاوی ﴿٢٢﴾ مـن ئافرەتێکـم (لـە سـەبەء) دی حوکمڕانیانـەو هەمـوو شـتێکی (کـە حوکمڕانیـی پێویسـتیی بـێ) پێیـدراوەو، تەختێـکی مەزنیشـی هەیـە، (بـۆ حوکمڕانیـی

لەسەری دادەنیشێ) ﴿٢٣﴾ خۆی و خەڵکەکەیم دی لە جیاتی خوا، کڕنووش بۆ خۆر دەبەن (خۆر پەرستن)و شەیتان کردەوە (خراپە)کانیانی بۆ ڕازاندوونەوەو، لە ڕێ (ی ڕاست)ی لاداون، بۆیە ڕێی ڕاستیان نەگرتوە ﴿٢٤﴾ (شەیتان شیرك و کردەوە خراپەکانیانی بۆ جوان کردوون) تاکو کڕنووش بۆ ئەو خوایە نەبەن، کە (شتی) پەنهان و شێراوە لە ئاسمانەکان و زەوی دەردەهێنێ و، ئەوەی پەنهانی دەکەن و، ئاشکراشی دەکەن، دەیزانێ ﴿٢٥﴾ (ئەو) خوایە کە جگە لەوی هیچ پەرستراوێك نیە، خاوەنی تەخت و بارەگای مەزنە ﴿٢٦﴾ (سولەیمان) گوتی: سەرنج دەدەین (لێدەکۆڵینەوە) ئایا ڕاست دەکەی، یان لە درۆزنانی؟ ﴿٢٧﴾ ئەم نووسراوە ببە بۆیان فڕێیدە، ئنجا لێیان دوور بکەوەوە، داخۆ چ وەڵامێك دەدەنەوە! ﴿٢٨﴾ (نامەکەی بردو شاژن) گوتی: ئەی بڕیار بە دەستان! من نووسراوێکی بەڕێزم بۆ فڕێدراوە ﴿٢٩﴾ (کە ئەمە نێوەڕۆکەکەیەتی:) ئەمە لە سولەیمانەوەیەو، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە ﴿٣٠﴾ (داواتان لێدەکەم) کە خۆتانم لە بەرانبەردا بە بەرز مەگرن و، بە (تەبایی و) ملکەچیی وەرن بۆ لام (بۆ وتوێژ) ﴿٣١﴾ (شاژن) گوتی: ئەی قسە بە دەستان! لە بارەی کارەکەمەوە، ڕای خۆتانم پێ بڵێن: من تاکو ئێوە ئامادە(ی کۆڕو کۆبوونەوەکەم) نەبن، بڕیاری یەکلاییکەرەوە نادەم ﴿٣٢﴾ (بڕیار بەدەستان) گوتیان: ئێمە خاوەن هێزین و خاوەن زەبری سەختیشین (لە جەنگدا)، بڕیاری کارەکەش بە دەست خۆتەو، ڕامێنە داخۆ فەرمانت بەچییە؟ ﴿٣٣﴾ (شاژن) گوتی: هەر کات پادشایەکان چوونە شارو وڵاتێکەوە (کاولی دەکەن و) تێکی دەدەن و، خەڵکە باڵادەستەکەشی زەبوون دەکەن (نەرێتیان وایەو) هەر وایان کردوەو هەر وادەکەن ﴿٣٤﴾ منیش دیارییەك (ی تایبەت) یان بۆ دەنێرم، ئنجا چاوەڕێ دەبم، داخۆ نوێنەران چ وەڵامێك دێننەوە! ﴿٣٥﴾ ئنجا کاتێك نوێنەرەکە (بە دیارییەکەوە) هاتە لای سولەیمان، گوتی: ئایا ماڵ و سامانم دەدەنێ! (لە بەرانبەر گەیاندنی پەیامی خوادا، کە پێتان دەگەیەنم)، بێگومان ئەوەی خوا پێیداوم، زۆر باشترە لەوەی بە ئێوەی داوە، بەڵکو ئەوە

تێوەن کە بە دیارییەکەتان زۆر دڵخۆشن ﴿٣٦﴾ (ئەی نوێنەری شاژن!) بگەڕێوە بۆ لایان، مسۆگەر ئەگەر نەیەن بۆ لام، سوپاو سەربازانێکیان بۆ دێنین، کە توانای بەرەنگاربوونەوەیانیان نەبێ و، لە شارو وڵاتەکەشیان بە زەبوونیی وەدەریان دەنێین ﴿٣٧﴾ (دوای ئەوەی شاژن بڕیاری هاتنی دا)، سولەیمان گوتی: ئەی مشوورخۆران! کێتان تەختەکەیم (بارەگای حوکمڕانییەکەیم کە لەسەری دادەنیشێ) بۆ دێنێ بەر لەوەی بە ملکەچیی (و تەبایی) بێنە لام؟! ﴿٣٨﴾ عیفرێتێك لە جینن گوتی: بەر لەوەی لە شوێنی خۆت هەڵسی، بۆتی دێنم و، من لەسەر (هێنانی)یشی بەهێزم و (بۆ پاراستنیشی) ئەمیندارم ﴿٣٩﴾ ئەو کەسەی زانیاریی لە کتێبەوە لە لابوو، گوتی: من بەر لەوەی چاوت بێتەوە لات (بە چاوتروکانێك) بۆت دێنم، ئنجا کاتێك بە ئامادەیی لە لای خۆی بینی (بۆی هێنا) گوتی: ئەمە لە بەخششی پەروەردگارمە، تاکو تاقیم بکاتەوە، ئایا سوپاسگوزاریی دەکەم، یان سپڵەیی! هەر کەسێکیش سوپاسگوزاریی بۆ خوا بکات (سوودەکەی) بۆ خۆیەتی و، هەر کەسێکیش ناسوپاسیی بەرانبەر بە خوا بکات، بێگومان پەروەردگارم بێنیازی بەخشندەیە ﴿٤٠﴾ (سولەیمان) گوتی: تەختەکەی (بگۆڕن و) نامۆ بکەن و سەرنج دەدەین داخۆ: (دەیناسێتەوەو بۆ ناسینی) ڕێی ڕاست دەگرێ، یان لەوانە دەبێ کە ڕێی ڕاست ناگرن؟ ﴿٤١﴾ ئنجا کاتێك (شاژن) هات گوترا: ئەرێ تەختەکەت ئاوا بوو؟ گوتی: دەڵێی ئەوە، (سولەیمان گوتی:) پێش (هاتنی) ئەو ئافرەتەش زانیاریمان درا بوویەو، هەر لە ملکەچان بووین (بۆ خوا) ﴿٤٢﴾ ئەوە ڕێی لێگرت (لە شاژن کە خوا بپەرستێ) کە لە جیاتی خوا دەیپەرست، چونکە ئەو لە کۆمەڵی کافران بوو ﴿٤٣﴾ پێی گوترا: (بە شاژن) بچۆ کۆشکەکەوە، بەڵام کاتێك دیتی، وایزانی شەپۆل (ی ئاو)ە، لاقەکانی هەڵکردن، (سولەیمان) گوتی: ئەوە کۆشکێکی شووشەیی لووسە! (شاژن) گوتی: پەروەردگارم! من (تا ئێستا) ستەمم لە خۆم کردوە (کە بڕوادار نەبووم و ئێستا) لەگەڵ سولەیماندا بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان ملکەچ بووم ﴿٤٤﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مَنطِقَ ): (أي: كَلَام، سُمِّيَ أَصْوَاتِ الطَّيْرِ نُطْقَاً اعْتِبَاراً بِسُلَيْمَان الَّذِي كَانَ يَفْهَمُهُ)، (مَنطِقَ الطَّيْرِ)، واتە: قسەی باڵندە، ئنجا دەنگی باڵندان، بە (كَلَام) ناوبراوە، بە ئیعتیباری ئەوە کە سولەیمان ﷺ لە دەنگی باڵندان حاڵیی بووە، کە پێکەوە دەئاخفن.

(يُوزَعُونَ): (وَزَعْتُهُ عَنْ كَذَا، أي: كَفَفْتُهُ عَنْهُ، وَيُوزَعُونَ: كَانُوا مَسُوسِيْنَ وَمَقْمُوعِيْنَ، أو حُبِسَ أَوَّلُهُمْ عَلَى أخِرِهِمْ)، (وَزَعْتُهُ عَنْ كَذَا)، واتە: گێڕامەوەو قەدەغەم کرد لێی، (يُوزَعُونَ) مەبەست ئەوەیە کە ئەوانە کۆنترۆڵ کراو بوون و، مەشق پێکراو بوون، بەرفەرمان بوون، یاخود (يُوزَعُونَ) واتە: پێشینەکانیان ڕاگیراون تاکو دواینەکان پێیان گەیشتوون، سوپای زۆر دەبێ هی پێشەوە ڕابگیرێ، بۆ ئەوەی هی دواوە پێیان بگات، چونکە لەبەر زۆرییان ماوەی زۆریان دەکەوێتە بەین.

(أَوْزِعْنِيٓ): (أي: أَلْهِمْنِي، أَوْزَعَ بِالشَّيْءِ أُولِعَ بِهِ أي: أَوْلِعْنِي)، یانی: ئیلهامم بکە، یان هۆگری بوو، کەواتە: (أَوْزِعْنِيٓ) واتە: هۆگریم بکە، دەشگونجێ (أَوْزِعْنِيٓ) واتە: خوایە! ڕێم لێ بگرە کە ناسوپاس بم، واتە: یارمەتیم بدە کە سوپاسگوزاربم، چونکە (وَزَعَ) یانی: (مَنَعَ)، (يَزَعُ) یانی: (يَمْنَعُ)، (أَوْزِعْنِيٓ) واتە: خوایە ڕێم لێ بگرە، (أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ )، واتە: (أوزِعِنِي عَنِ الكُفْرَانِ وَأَعِنِّي أَنْ أَشْكُرَكَ)، ڕێم لێ بگرە لە ناسوپاسیی و، یارمەتیم بدە بۆ سوپاسگوزاریی.

(وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ ): واتە: باڵندەکانی بەسەرکردنەوە، (التَفَقُّدُ: التعَهُّد)، واتە: بەسەرکردنەوەو ئاگالێبوون.

(ٱلْهُدْهُدَ ): بە کوردیی پێی دەڵێین: پەپوو سولەیمانە، جۆرە باڵندەیەکە.

(ٱلْخَبْءَ): (الخَبْءُ: كُلُّ مُدَّخَرٍ مَسْتُور، يُقَالُ الجَارِيَةُ المُخْبَأَة)، (خَبْء) هەر شتێكە كە هەڵگیرابێ و پەنهان كرابێ، دەگوترێ: (الجَارِيَةُ المُخْبَأَة)، واتە: كچێك شێردرابێتەوە لە پشت پەردە، كە كچ عادەت وایە، شەرمنترە لە ژن.

(لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا): (لَا يُمْكِنُهُمْ مُقَابَلَتُهَا، لَا طَاقَةَ لَهُمْ عَلَى اسْتِقْبَالِهَا وَدِفَاعِهَا)، واتە: ناتوانن بەرهەڵستیی بكەن، ڕووبەڕووی ببنەوە، یاخود توانایان نیە، لەسەر چوونە پێش و بەرپەرچدانەوەی.

(صَٰغِرُونَ): واتە: زەبوونان و ملكەچان، (الصَّاغِرُ: الرَّاضِي بالمَنْزِلَة الدنِيَّة)، واتە: كەسێكە كە بە پلەیەكی خوارتر ڕازی بێ، بە زەبوونیی و ملكەچیی.

(بِعَرْشِهَا): (العَرْشُ: فِي الأَصْلِ شَيءٍ مُسَقَّفٌ، جَمْعُهُ العُرُوش، سُمِّيَ مَجْلِسُ السُّلْطَانِ عَرْشاً اعْتِبَاراً بِعُلُوِّهِ)، عەرش لە ڕیشەدا بە شتێك دەگوترێ كە سەقفی هەبێ، سەربانی هەبێ، كۆیەكەی (عُرُوش)ە، ئەو شوێنەی كە حوكمڕان لەسەری دادەنیشێ پێی گوتراوە: عەرش، بەو ئیعتیبارەی بەرزە، لەو شوێنەی كە كۆڕو مەجلیسەكە لێی دانیشتوون، بەرزتر بووە.

(عِفْرِيتٌ): جۆرێكە لە جند، (أي: العَارِمُ الخَبِيث)، واتە: زۆر زەبردەست و زۆر پیس و زەبر وەشێن، هەڵبەتە عیفریت دەگونجێ بۆ مرۆڤیش بەكاربهێنرێ، ئەگەر زۆر زەبر دەست و بەهێزو دەستوەشێن بێ.

(طَرْفُكَ): (الطَّرْفُ: تَحْرِيكُ الجَفْنِ، وَطَرْفُ العَيْنِ: جَفْنُهُ، وَعُبِّرَ بِهِ عَنِ النَّظَر)، (طَرْف) جووڵاندنی پێڵووی چاوە، (وَطَرْفُ العَيْنِ) واتە: پێڵووی چاو، بەڵام بەكاریش دەهێنرێ و تەعبیری پێ دەكرێ لە تەماشا كردن، واتە: چاوتروكان، سەرنج دانێك، ئینسان بە هۆی پێڵووەكانەوە چاو دەكاتەوەو، یان چاو دادەخات، (جَفْنَي العَيْنِ) واتە: دوو پێڵووەكانی چاو.

(ٱلصَّرْحَ): (الصَّرْحُ: بَيْتٌ عَالٍ مُزَوَّقٌ اعْتِبَاراً بِكَوْنِهِ صَرْحَاً أي: خَالِصَاً مِنَ الشَّوْب)، (صَرْح): بە ژوورێكی بەرز، ماڵێكی بەرز، خانووێكی بەرز دەگوترێ كە

ڕازێندرابێتەوە، لەو ڕووەوە پێی دەگوترێ: (صَرْح): واتە: هیچ خڵتەی پێوە نیە، هیچ شتی دیکەی تێکەڵ نیە، واتە: لووس و ساف و ڕێك.

(لُجَّةً): (لُجَّةُ البَحْرِ: تَرَدُّدُ أَمْوَاجِه)، (لُجَّةُ البَحْرِ): بریتیە لە جووڵەی شەپۆلەکانی، ئنجا (لُجَّةُ الصَّوْتِ: أي تَرَدُّدُهُ)، دەنگ کە بە شەپۆل دێت، دەلەرێتەوە ئەوەش هەر پێی دەگوترێ: (لُجَّة) کە بە (لُجَج) کۆ دەکرێتەوە.

(مُمَرَّدٌ): (أي مُتَمَلِّس) واتە: زۆر سافکراو، لووس، (شَجَرَةٌ مَرْدَاء، إذَا لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا وَرَق)، (شَجَرَةٌ مَرْدَاء): درەختێکی ڕووت و لووس، کە گەڵای پێوە نەبێت، لووس بووبێت، واتە: گەڵاکانی هەموو وەریوون.

(قَوَارِيرَ): کۆیەکەی (قَارُورة)یە واتە: شووشە، پارچە شووشەیەك.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە ڕیزی ئەو بەسەرهاتانەدا، کە ئەم سوورەتی (النمل)، دەیانگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺو بۆ بڕواداران و شوێنکەوتووی تاکو قیامەت، بریتیە لە بەسەرهاتی داوودو سولەیمان (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هەڵبەتە داوودو سولەیمان، باب و کوڕ بوون، کە خوا ﷻ لە سوورەتی (ص)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: سولەیمانمان بە داوود بەخشیی، باشترین بەندە بوو، زۆر بۆ لای خوا دەگەڕایەوە.

سولەیمان کوڕی داوود بووە (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لە دادوەرییدا هەندێک جار لە بابیشی وردترو لێزانتر بووە، وەك لە سوورەتی (الأنبياء)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾، واتە: داوودو سولەیمان کە دادوەرییان دەکرد، لە بارەی کشتوکاڵێك کە بەشەوێ مەڕی کۆمەڵێکی دیکە پێی وەربوو بوو زەڕی کردبوو، لێی خواردبوو، حوکمە ڕاستەکەمان زیاتر لە سولەیمان گەیاند.

وەك لە تەفسیری سوورەتی (الأنبياء)دا، بە تەفصیل باسمان کردوە، کە ئەو خەڵکەی کشتوکاڵەکەیان خورابوو بە شەوێ، لەلایەن خەڵکێکی دیکەوە، کە ئاژەڵەکەیان چوو بووە نێو کشتوکاڵەکە، کاتێك چوونە لای داوود ﷺ گوتی: مادام ئەو کشتوکاڵە هەمووی خوراوە، با خاوەن زەوییەکە لە قەرەبووی کشتوکاڵەکەیدا

کە خوراوە، مەڕەکانی بدرێنێ و زەوییەکەش هی خاوەن مەڕەکان بێت، بەڵام کە گەیشتنە سولەیمان لە ڕێگا، یاخود سولەیمانیش هەر لەوێ بوو، سولەیمان ﷺ گوتی: جەنابی باب! ئەگەر بە شێوەیەکی دیکە بێ باشترە، با مەڕەکان بدرێن بە خاوەن زەوییەکەو لە بەرهەمەکانیان بەهرمەند بێ، زەوییەکەش بدرێتە خاوەنی مەڕەکان، کشتوکاڵەکەی بۆ ڕەنێو بێنێ، تاکو دەگاتەوە ئەو ئاستەی کە زەڕ کراوە، ئەو کاتە با کشتوکاڵەکە تەسلیمی خاوەن زەوییەکە بکرێتەوەو، مەڕەکانیش تەسلیمی خاوەن مەڕەکان بکرێتەوە، کە دیارە ئەوەیان ڕاستتر بووە، دواییش داوود ﷺ بڕیارەکەی سولەیمانی کوڕی پەسند کرد.

ئنجا خوا ﷻ بەسەرهاتی داوودو سولەیمان دەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ بڕواداران، هەروەها بۆ مرۆڤایەتیی هەمووی تاکو بزاندرێ، کە پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ ئاڵقەیەکە لەو زنجیرەی پێغەمبەرانەی کە هەیانبووە، حوکمڕان بووە، وێڕای ئەوەی پێغەمبەری خوا بووە حوکمڕان و بڕیار بە دەست بووە و، خاوەن ئەمرو نەهیی بووە و، ئەمە ئاماژەیەکیشە بەوەی کە ئەی موحەممەد ﷺ! هەروەها ئەی هاوەڵانی بەڕێزی موحەممەد! دیسان ئەی شوێنکەوتووانی موحەممەد! لە لای خوا ﷻ نیزیکە کە ئێوەش وەک داوودو سولەیمان بکاتە حوکمڕان لە زەوییدا، لەو حاڵەتی چەوساوەییەو بێدەستەڵاتییە، دەرتان بێنێ، سەرەنجامتان بەو شێوەیە بێ، کە هەندێک لە پێغەمبەرانی خوا بوون، حوکمڕان و بڕیار بە دەست و باڵادەست بوون.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە زانیاریمان دابوو بە داوودو سولەیمان (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بە ئەنکید داوودو سولەیمان هەردووکیان پێغەمبەر بوون و حوکمڕانیش بوون، بەڵام کە باسی زانیاریی دەکات، کەواتە: زانیاریی گرنگترین پێکهێنەری هەم پێغەرایەتیی و هەم حوکمڕانییشە، پێغەمبەرایەتیی واتە: وەدەست هێنانی زانیارییەکی تایبەت لە خواوە بەهۆی وەحییەوە، کە لە ڕێی ئاساییەوە خەڵک ناتوانێ بەدەستی بێنێ،

هەروەها حوکمڕانییش پێش هەموو شتێك پێویستیی بە زانیاریی و زانست و شارەزایی هەیە. ﴿ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، (داوودو سولەیمان) گوتیان: ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە بەسەر زۆرێك لە بەندە بڕوادارەکانی دا هەڵیبژاردووین، لەوەدا کە پلەی پێغەمبەرایەتیی پێداوین و، زانیاریی تایبەتیی پێداوین و، هەندێك تواناو ئیمکانیەتی بۆ ڕەخساندووین، کە نەیدلون بە خەڵکی دیکە.

﴿ وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ﴾، سولەیمان میراتی لە داوود گرت، بە دڵنیایی مەبەست پێی میراتی زانیاریی و پێغەمبەرایەتییە، لە ڕووی حوکمڕانییشەوە لە شوێنی بابی دانیشتوە، نەك بە شێوەی حوکمی میراتیی، بەڵام بەو شێوەی کە لە دوای بابی هات و هەمان پلەی پێغەمبەرایەتیی کە بە بابی درابوو، بە سولەیمانیش درابوو، هەروەها هەمان ئیمکانیەت و توانا کە بۆ داوود ڕەخسێنرابوو، خوا ﷻ بۆ سولەیمانیشی ڕەخساند، بەڵکو زیادەشی بۆ خستە سەر، ئەگەرنا ئەوە ناگەیەنێ کە سولەیمان بە شێوەی حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی هاتبێتە شوێنی بابی، بەڵکو یانی: هەمان تواناو ئیمکانیەت کە خوا بە داوودی دابوو، بە سولەیمانیشی دابوو، ئنجا وەك چۆن میراتێك کە بە کەسێك دەگات، پێوەی ماندوو نابێ، ئاوا خوای پەروەردگار ئەو توانایەشی کە بە داوودی دابوو، بە سولەیمانیشیداو پێوەی ماندوو نەبوو، چونکە بەخششی خوا بوو، نەك بۆ خۆی وەدەستی هێنابێ.

﴿ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ ﴾، سولەیمان گوتی: ئەی خەڵکینە! ئێمە دواندنی باڵندانمان فێر کراوە، ﴿ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ﴾، هەروەها لە هەموو شتێکمان پێدراوە، یانی: لە هەموو شتێك کە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی پێغەمبەرایەتیی و، ئەرکی حوکمڕانییمان پێویست بێ، پێماندراوە، ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴾، بێگومان ئا ئەوە بەخششێکی ڕوون و ئاشکراو بێ چەندو چوونە.

ئنجا خوا ﷻ باسی سەفەرێکی سولەیمان ﷺ دەکات: ﴿ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾، سەربازەکانی بۆ سولەیمان کۆکرانەوە، لە جند و مرۆڤ و باڵندان، (فَهُمْ يُوزَعُونَ)، هی پێشیان ڕادەگیرا تاکو هی دوایەیان پێ دەگەیشت، (حُبِس أَوَّلُهُمْ لِآخِرِهِمْ)، (يُوزَعُونَ): (أي: يُمْنَعُون)، یانی: ڕێیان لێ گیرابوو بەملاولادا دابڕۆن، یاخود بێ فەرمانیی و سەرپێچیی بکەن، واتە: مەشق پێکراو بوون و ڕاهێنراو بوون و، فەرمانبەر بوون، سوپای سولەیمان بە پێچەوانەی هەموو سوپایەکانی حوکمڕانانی دنیاوە، تەنیا لە مرۆڤان نەبوون، بەڵکو لە جند و لە باڵندانیش بوو، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ ﴾، (حَتَّى) لێرەدا (حَتَّى الإبْتِدَائِيَّة)یە، واتە: بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن، تاکو بە لای شیوی مێروولان دا تێپەڕین، بە لای دۆڵی مێروولاندا، دیارە شوێنێك بووە بەو ناوە ناسراو بووە، هەندێك دەڵێن: لە فەلەستین و شام بووە، یان شیوێك بووە، شارە مێروولەی زۆری لێبوون، یان شارە مێروولەیەك بووە، ژمارەیەکی زۆر مێروولەی لێ بوون، ﴿ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَٰكِنَكُمْ ﴾، مێروولەیەك گوتی: ئەی مێروولەکان! بچنە نێو خانووەکانی خۆتانەوە، یانی: بچنە نێو کونەکانی خۆتانەوە، کە بۆ ئەوان خانووبەرەو جێگاو ڕێگایە، ﴿ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾، نەبادا سولەیمان و سەربازەکانی بەبێ ئەوەی هەستتان پێبکەن، تێکتان بشکێنن، ئەمە ئیعجازێکی زانستیشی تێدایە، ئێستا دەرکەوتوە کە پێکهاتەی جەستەی مێروولە، زیاتر پێکهاتەیەکی ڕەقە، کە ئەگەر پێی لێبنرێ تێکدەشکێ، نەك پان ببێتەوە، ماددەیەکی شووشەیی ڕەق و ئێقسانییە.

﴿ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا ﴾، (سولەیمان) بە زەردەخەنەوە پێکەنی، بە هۆی قسەی ئەو مێروولەیەوە، یانی: دڵخۆش بوو، بەوە دڵخۆش بوو کە سەربازەکانی و سوپایەکەی هێندە دوور بینن و، هێندە بەڕێکیی دەڕۆن، تەنانەت پێ لە مێروولەش نانێن، مەگەر هەستی پێنەکەن، ئەگەرنا مێروولەش پان ناکەنەوەو تێکی ناشکێنن، بە پێیەکانیان.

﴿ وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ ﴾، هەروەها گوتی: ئەی پەروەردگارم! وام لێ بکەو هانم بدە، کە سوپاسگوزاری ئەو چاکەیەت بکەم، کە لەگەڵ من دا کردووتە، ﴿ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ ﴾، هەروەها ئەو چاکەیەی لەگەڵ دایك و باببشم دا کردووتە، ﴿ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ ﴾، یارمەتییم بدەو هاندەرمبە، کە کردەوەی باش بکەم، تۆ لێی ڕازی بی و پەسندی بکەی، ﴿ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، بە بەزەیی خۆشت بمخە نێو بەندە چاکەکانتەوە.

ئنجا خوا عزوجل باسی ڕووداوێکی دیکەی سولەیمان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ ﴾، هەروەها سولەیمان باڵندەی بەسەرکردنەوە، دیارە چەندان جۆرە باڵندە لە سوپایەکەی دا هەبوون، هەر کامێکیان بۆ ئەرکێك بەکارهێنراوە، ﴿ فَقَالَ مَا لِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ ﴾، گوتی: ئەوە چیمە! بۆچی هودهود نابینم؟ ﴿ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴾، [ئایا خەتای منە نایبینم، شتێك کەوتۆتە بەرچاوم، پەردەیەك، نێوانێك؟!] یاخود هەر ئامادە نیەو لە ئامادە نەبووانە، بۆیە نایبینم؟! ﴿ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾، دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت لەوێ نیەو ئامادە نیە، گوتی: بە دڵنیایی زۆر بە سەختیی ئازارو سزای دەدەم، [لە تەفسیرەکان دا هاتوە: بە سەختیی سزادان و ئازاردانی ئەوە بووە، ئەو پەڕو باڵە جوانەی بڕووتێنێتەوەو، پەڕەکانی بکێشێ] یاخود سەری دەبڕم، یان دەبێ بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرام بۆ بێنێ، واتە: بە پێی تاوانەکەی سزای دەدەم، ئەگەر تاوانەکەی وابێ، هەر بایی سزادان بێ، سزای دەدەم و، ئەگەر بایی سەربڕین بێ، سەری دەبڕم، ئەگەر بەڵگەیەکی ئاشکراشم بۆ بێنێ، نە سەربڕین و ئازاردرانی ناکەوێتە سەر، ﴿ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴾، ماوەیەکی دوور نەمایەوە، یاخود: لە شوێنێك کە دوور نەبوو، مایەوە، (غَيْرَ بَعِيدٍ) هەم دەگونجێ بۆ کات بێ، هەم بۆ شوێن بێ، واتە: شوێنەکەی دوور نەبوو، یان کاتەکە زۆری پێ نەچوو، کە مایەوە، دوایی هودهود هات، ﴿ فَقَالَ أَحَطتُ

بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ ﴾، گوتی: من دەوری شتێکم داوە، تۆ دەورت نەداوە، واتە: من ئاگاداری شتێکم، تۆ ئاگاداری نی ئەی سولەیمان! ﴿ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴾، لە سەبەئەوەش هەواڵێکی جێی دڵنیاییم بۆ هێناوی، دیارە هودهود لە ڕووی هەواڵگرییەوە کاری کردوەو، بە دوای کارەکەی خۆی کەوتوە، بەڵام زۆری پێچووە، بۆیە سولەیمان هەستی بە ئامادەنەبوونی کردوە، ئنجا بۆی دەگێڕێتەوە کە ئەو هەواڵە چییە، بۆی هێناوەتەوە: ﴿ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴾، من ئافرەتێکم بینیوە، حوکمڕانیانە، هی خەڵکی (سبأ) و لە هەموو شتێکی پێدراوە، کە حوکمڕانییەکەی پێویستیی پێ بێ، واتە: پێداویستییەکانی حوکمڕانیی هەموو هەن و پێی دراون، بۆی ڕەخسێنراون و، تەختێکی مەزنیشی هەیە، کە لەسەری دادەنیشێ بۆ حوکمڕانیی کردن، (عَرْش) کاتی خۆی تەختێکی بەرز بووە، لە مەجلیس دایاننـاوە، حوکمڕان لەسەری دانیشتوە، جێی ئەوە هەبووە دوو سێ نەفەریش لەسەری دابنیشن، ئاستەکەی بەرزتر بووە، پێی گوتراوە: (عَرش)، بەو ئیعتیبارە کە سەقفێکی هەبووەو بەرزتر بووە لە ئاستی دانیشتووانی کۆڕو مەجلیسەکە.

﴿ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، ئەو ئافرەتەم بینی، خۆی و گەلەکەی کڕنووش بۆ خۆر دەبەن، لە جیاتی خوا، ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، شەیتانیش کردەوەکانی بۆ ڕازاندوونەوە، ﴿ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، لە ڕێی ڕاست لایداون، ﴿ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴾، بۆیە ڕێی ڕاستیان نەگرتوە.

﴿ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، شەیتان لە ڕێ لایداون، تاکو کڕنووش نەبەن، بۆ ئەو خوایەی کە نهێنیی لە ئاسمانەکان و زەوی دەردێنێ، هەندێک گوتوویانە: ﴿ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ﴾، واتە: (أَنْ يَسْجُدُوا لِلَّهِ)، ڕێی ڕاستیان نەگرتوە، کە کڕنووش بەرن.

هەندێکیش گوتوویانە: ئەوە پرسیارکردنە، کە دواتر لە مەسەلە گرنگەکان دا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، ﴿ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴾، هەروەها خوا ئەوەی کە پەنهانی دەکەن و ئەوەی ئاشکرای دەکەن، هەمووی دەزانێ، ﴿ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴾، خوا جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، خاوەنی بارەگای مەزنە.

هووهود بەو شێوەیە هەواڵەکەی خۆی بۆ سولەیمان گێڕایەوە، بەڵام ئایا سولەیمان ﷺ وەك حوکمڕانێکی وردو کارامە، یەکسەر تەسلیمی ئەو هەواڵەی هودهود دەبێ، یەکسەر هەواڵەکەی لێوەردەگرێ؟! نەخێر، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴾، سولەیمان گوتی: تەماشا دەکەین و سەرنج دەدەین، لێدەکۆڵینەوە، ئایا ڕاستت کردوە، یاخود تۆ لە درۆکەرانی.

﴿ اذْهَب بِّكِتَابِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ﴾، ئەم نووسراوەی من بەرە، ئەو نامەیەی من بەرە بۆیان فڕێبدە، ﴿ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴾، دوایی لێیان دوور بکەوەو، پشتیان تێبکەو، چاوەڕێ بە، سەرنج بدە، داخۆ وەڵام چی دەبێ؟ ئایا نامەیەکت پێدا دەنێرنەوە، داخۆ چیی دەڵێن؟ هەواڵەکەم بۆ بێنەوە.

ئنجا خوا ﷻ ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە، کە هودهود نامەکەی بردو بۆی فڕێدان، ئنجا شاژن نامەکەی بینیی و خوێندیەوەو، ئنجا: ﴿ قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ ﴾، (مَلأ)، ئەو کەسانەن کە بڕیار بەدەستن و هاوکارو یارمەتیدەری حوکمڕانن، گوتی: ئەی هاوکاران و ئەهلی کۆڕو مەجلیسی من، ئەی بڕیار بە دەستان، من نووسراوێکی بەڕێزم بۆ هاویشتراوەو نێردراوە، کە نێوەڕۆکەکەی ئاوایە:

﴿ إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾، بە دڵنیایی ئەمە لە سولەیمانەوەیە، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ﴿ أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ ﴾، لە بەرانبەرمدا خۆتان بە بەرز مەگرن، بە ملکەچیی و تەبایی وەرن

بـۆ لام، ئەمــە نێوەڕۆکەکەیـەتی، بێگومـان سـولەیمان (عليه السلام) تێیـدا نووسـیوە: مـن فڵانکەسـم و لـە فـڵان شـوێنم لـە قـودسی شـام و، وێـڕای ئـەوەی کـە حوکمڕانـم، پێغەمبەرێـکی خـوام و، دەمـەوێ تـۆش لـە پەیامـی خـوا حاڵیـی بکـەم، وەرە بـۆ وتووێـژو بـۆ دیالـۆگ، بـە شـێوەیەکی ئاشـتییانەو، خـۆت بـە بـەرز مەگـرە، کـە بێـی بـۆ لام، بـۆ وتووێـژ، بـەڵام لێـرەدا خـوای پـەروەردگار پوختەکـەی باسـکردوە، ﴿ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى ﴾، شـاژن گـوتی: ئـەی بڕیـار بـە دەسـتان! لـە بـارەی کارەکـەمـەوە ڕای خۆتانـم پـێ بڵێـن، فەتـوام بـۆ بـدەن، پێشـنیاری خۆتانـم بـۆ بکـەن، ﴿ مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴾، مـن هیـچ بڕیارێـکی یەکلاییکـەرەوە نـادەم، تاکـو ئێـوە ئامـادە نەبـن.

ئـا ئەمـەش نێـوەڕۆکی حوکمـی شـووڕایی و ڕاوێـژە، بـە زاراوەی ئەمـڕۆ حوکمـی دیموکراسـیی، واتـە: بڕیـاڕی یەکلاییکـەرەوە بـە دەسـتی مەجلیسـە، ئـەو مەجلیـس و کـۆڕەی نوێنـەرانی خەڵکـن، ﴿ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ ﴾، بڕیـار بـە دەسـتان و ئەهـلی کـۆڕو مەجلیسـەکەی گوتیـان: ئێمـە خـاوەن هێزیـن و خـاوەن زەبـری تونـدو سەختیشـین، هـەم هێزمـان هەیـەو، هـەم لـە شەڕیشـدا زەبـر دەسـتین، ئەگـەر ڕووبـەڕوو ببینـەوە، بـەڵام بڕیـاری کۆتایـی بـە دەسـت تۆیـە، ﴿ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴾، سـەرنج بـدە! داخـۆ فەرمـان بـە چـی دەکـەی؟

﴿ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴾، شـاژن گـوتی: پادشـایەکان عادەتیـان وایـە، کـە چوونـە ئاوەدانییەکـەوە، تێـکی دەدەن و خەڵکـە باڵادەسـتەکەی زەبـوون دەکـەن و، نەریتیـان وابـووە هـەر وایانکـردوەو، هـەر واشـدەکەن، واتـە: ئـەو سـولەیمانە کـە ئـەو نامەیـەی نـاردوە، لـە دوو حـاڵ بـە دەر نیـە: یـان پادشـایەکە وەك باقـی ئـەو پادشـایانە، حوکمڕانێکـە وەك ئـەو حوکمڕانانـەی کـە چاویـان لـە خـۆ فەرزکـردن و خـۆ سـەپاندنە، بەسـەر گـەلان و وڵاتانـدا، یاخـود جۆرێـکی دیکەیـە.

ئنجا شاژن تاقیکردنەوە دەکات بۆ سولەیمان: ﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ﴾، من نێرەرری دیاریی و خەڵاتێك دەبم بۆ لایان ﴿فَنَاظِرَةٌۢ بِمَ يَرْجِعُ ٱلْمُرْسَلُونَ﴾، ئنجا چاوەڕێ دەکەم، داخۆ نوێنەرەکان چ وەڵامێك دێننەوەو بە چی دەگەڕێنەوە بۆ لام.

ئنجا دیسان ئەوە هەمووی پێچراوەتەوە، کە نوێنەرەکە چوو، دیاریی و خەڵاتەکەی بردو، بە دڵنیایی نامەشی پێدا ناردوە.

﴿فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ﴾، کاتێك چووە لای سولەیمان، واتە: نوێنەرەکەی شاژن، دیاریی و خەڵاتەکەی برد، سولەیمان گوتی: ئایا ئێوە ماڵ و سامان دەدەن، بە من؟ ﴿فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم﴾، ئەوەی خوا ﷻ پێیداوم، زۆر باشترە لەوەی بە ئێوەی داوە، واتە: ئەوەی ئێوە هەتانە، زۆر کەمترە لە تواناکانی کە خوا ﷻ بە منی داون، ﴿بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴾، بەڵکو ئێوە هەر خۆتان بەو دیارییەی خۆتان دڵخۆشن و، لە لای ئێوە شتێکی گەورەیە، بەڵام لەلای من شتێکی کەم بایەخەو، تەماعم لە سەروەت و ماڵ و سامانی ئێوەدا نیە، کە نامەم ناردوە گوتوومە: با شاژن بێ، بۆ ئامانجێکی دیکەیە، کە بریتیە لە وتوێژو گەیاندنی پەیامی خوا ﷻ پێی، ﴿ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ﴾، ئەی نوێنەرو شاند! بگەڕێوە بۆ لایان ﴿فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا﴾، بە دڵنیایی سەربازانێکیان بۆ دێنین، کە ناتوانن بەرهەڵستییان بکەن و، لەگەڵیان بەرەنگار ببنەوە، ﴿وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَٰغِرُونَ﴾، ئنجا ئەگەر بە تەبایی نەیەن، مانای وایە ئێمە بە سوپاوە دێین، کە بە سوپاشەوە هاتین، ناتوانن بەرهەڵستیی بکەن، ئەگەر بەرهەڵستییش بکەن، بە دڵنیایی بە زەبوونیی دەریان دەکەین، لە شارو وڵاتی خۆیان و، ملکەچ و زەبوون دەبن.

دیسان ئەوەش لێرەدا پێچراوەتەوە، کە بە تەئکید شاژن نامەی ناردوە، کە ئێمە دێین، بۆیە سولەیمان ﷺ دەڵێ: ﴿قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن

يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ ﴾، گوتی: ئەی بڕیار بە دەستان! کامەتان تەخت و کورسییەکەیم بۆ دێنێ، پێش ئەوەی بە ملکەچیی بێن بۆ لام، نەك وەك زۆربەی ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: بە مسوڵمانیی! بەڵکو بە ملکەچیی، چونکە مسوڵمانیەتیی دوایی تێگەیاندن و قەناعەت هاتنە.

﴿ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ ﴾، عیفریتێك لە جینن [کە جۆرێك لە جینن، زۆر بەهێزو زەبر دەستن و توانایەکی تایبەتییان هەیە] گوتی: من تەختەکەیت بۆ دێنم، بەر لەوەی لە شوێنی خۆت هەڵسی، سولەیمان عادەتی وابووە، پێش نیوەڕۆیان دانیشتوەو نیوەڕۆیان هەڵساوە، واتە: بە چەند سەعاتێك، بە دڵنیاییش من لەسەر هێنانی ئەو تەختە بەهێزیشم و ئەمینداریشم.

﴿ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، ئەوەیان کە زانیاریی لە بارەی کتێبەوە پێدرابوو، لە کتێب شارەزا بوو، کتێبی خوایی، گوتی: ﴿ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ﴾، من بۆتی دێنم بەر لەوەی چاوت بگەڕێتەوە بۆ لات، واتە: لە چاوترووکانێکدا بۆت دێنم، ﴿ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي ﴾، کاتێك تەخت و نشینگەکەی لە لای خۆی بە ئامادەیی بینی، گوتی: ئەوە بەخششی پەروەردگارمە، ﴿ لِيَبْلُوَنِيٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ﴾، تاکو تاقیم بکاتەوە، ئایا سوپاسگوزاریی دەکەم، یاخود سپڵەیی و ناسوپاسیی دەکەم؟ ﴿ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴾، هەر کەسێك سوپاسگوزاریی بکات، سوپاسگوزارییەکەی بۆ خۆیەتی و، هەر کەسێکیش سپڵەیی بکات، ئەوە پەروەردگارم بێ نیازی بەخشندەیە.

﴿ قَالَ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِيٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴾، سولەیمان ﷺ گوتی: تەختەکەی بۆ نەناسراوو نامۆ بکەن، دەستکاریی بکەن و بیگۆڕن، نەك هەمووی بگۆڕن، بەڵکو دەستکاریی هەندێك شوێنی بکەن، وای لێ بکەن

نامۆی بکەن، ئنجا تەماشا دەکەین: ئایا لە ڕێ ڕاستگرتووان دەبێ {لەوەدا کە بیناسێتەوە} یاخود لەوانە دەبێ کە پەی بە شت نابەن و بۆ ناسینەوەی شارەزا نین، سولەیمان و یستوویەتی عەقڵی ئەزموون بکات.

﴿ فَلَمَّا جَآءَتۡ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِۖ ﴾، کاتێک شاژن هات، پێی گوترا: ئایا تەختەکەت ئاوا بوو؟ ﴿ قَالَتۡ كَأَنَّهُۥ هُوَۚ ﴾، ئەویش وەڵامێکی زۆر حەکیمانەی دایەوە، گوتی: دەڵێی هەوە، ﴿ وَأُوتِينَا ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهَا وَكُنَّا مُسۡلِمِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾، زانیارییمان پێش هاتنی ئەو ئافرەتەش پێدرابوو و، ئێمە بۆ خوا ملکەچ بووین، ئەمە زانایان مشتومڕیان هەیە، کە ئایا قسەی سولەیمانە عليه السلام، یاخود قسەی شاژنە؟ کە شاژن بەر لەوەی ئەو موعجیزەیەش ببینێ لە سولەیمان، زانیاریی پێدرابوو، کە سولەیمان شتی سەرسوڕهێنەری هەیە.

ئنجا کە دەڵێ: ئێمە ئەو کاتەش هەر ملکەچ بووین، یانی: ملکەچ بووین و دانپێداهێنەر بووین، بە موعجیزەکانی سولەیمان دا.

یاخود: قسەی سولەیمانە عليه السلام، کە بەر لەوەی ئەو ئافرەتەش بێ، ئێمە زانیارییمان هەبوو و بۆ خواش ملکەچ بووین، یاخود: پێش ئەوەی ئەو موعجیزەیەشی پیشان بدەن، زانیارییمان هەبوو و بۆ خواش هەر ملکەچ بووین.

﴿ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعۡبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ ﴾، بەڵام ئەوەی لە جیاتی خوا دەیپەرست، {کە خۆر بوو} ڕێی لێگرت ﴿ إِنَّهَا كَانَتۡ مِن قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ﴾، چونکە بە دڵنیایی ئەو ئافرەتە لە کۆمەڵێکی کافر بوو، یانی: ڕێی لێگرت کە خوا بپەرستێ، یاخود سولەیمان ڕێی لێگرت، کە چیدیکە لەسەر کوفر بەردەوام بێ و، بەرەو خوا بەیەکگرتن و خواپەرستیی هێنای، هەردوو واتایەکان هەن.

ئنجا سولەیمان عليه السلام شتێکی دیکەی پیشاندا: ﴿ قِيلَ لَهَا ٱدۡخُلِي ٱلصَّرۡحَۖ ﴾، پێی گوترا: بە شاژن، بچۆ نێو کۆشکەکەوە، ﴿ فَلَمَّا رَأَتۡهُ حَسِبَتۡهُ لُجَّةٗ وَكَشَفَتۡ عَن سَاقَيۡهَاۚ ﴾، کاتێک کۆشکەکەی بینی، پێیوابوو شەپۆلی ئاوە، تەختی زەوییەکە

وەك شـەپۆلی ئـاو بـوو، بـەڵام شووشـە بەندبـوو، پێـی وابـوو ئـەوە شـەپۆلی ئـاوە، هــەردووك لاقــی هەڵكـردن، بـۆ ئـەوەی دامێنــی تــەڕ نەبـێ، ﴿قَالَ إِنَّهُۥ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ﴾، سـولەیمان گـوتی: ئـەوە كۆشـكێكە لـە شووشـەی لـووس و صـاف دروسـتكراوە، ئـاو نیـە بـە ژێریـدا بـڕوا، یاخـود: ئـاوە، بـەڵام شووشـە بەنـدەو، جۆگەلـەی ئـاو نیـەو، لاقـت تـەڕ نابـن، ﴿قَالَتْ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى﴾، شـاژن گـوتی: ئـەی پـەروەردگارم! پێشـتر سـتەمم لـە خـۆم كردبـوو [كـە تـۆم نەپەرسـتوە] ﴿وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَـٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾، ئێسـتا لەگـەڵ سـولەیماندا بـۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانیـان ملكەچـم.

دوای ئـەوەی ئـەو هەمـوو موعجیزانـەی بینیـن و، سـولەیمان وتووێـژی لەگەڵـدا كـردوە، ئنجـا قەناعـەتی هاتـوەو، لێـرەدا مسـوڵمان دەبـێ، نـەك لـە پێشـەوە، وەك زۆرێـك لـە توێـژەرەوانی قورئـان گوتوویانـە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**خـوا ﷻ زانیارییـەکی تایبەتیـی بـە هـەر کام لـە داوود و سـولەیمان (علیهـما السـلام) داوە، ئەوانیـش سـتایشی خوایـان لەسـەر کـردوە، سـولەیمانیش لـە ڕووی پێغەمبەرایەتیـی و زانسـت و حوکمڕانییـەوە، لـە شـوێنی بـابی (داوود) دانیشـتوە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾ وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ عِلْمًا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە زانیارییمان بە داوودو سولەیمان دابوو، وشەی: (لَقَد) (ل)، (لَام القَسَم)، لامی سوێندەو (قد) (حَرْفُ التَّحْقِيْق)، پیتی دڵنیاکردنەوەیە، بۆ ئەوە بەکارهاتوە کە خوا ﷻ دوێنراوانی لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، لە شوێنی کەسانێك داناوە، کە نکوولّیی بکەن، لەوە کە داوودو سولەیمان، زانیارییان پێدراوە، یاخود بۆ دڵنیاکردنەوەی بابای دوێندراو، هەر کەسێك کە قوڕئان دەخوێنێ، خوا ﷻ دڵنیای دەکاتەوە کە، ئێمە زانیارییەکی تایبەتمان بە داوودو سولەیمان دابوو، (عِلْماً) کە بە نەزانراو (نَكِرة) هاتوە، نەیفەرمووە، (وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُدَ وَسُلَيْمَانَ العِلْمَ)، بەڵکو بە (نكرة) هاتوە، ئەوە (للتعظيم وَالتَفْخِيم)ە، بۆ مەزنکردن و گەورەکردنە، واتە: زانیارییەکی تایبەت، کە خەڵکی دیکە دەرکی ناکات، کە مەبەست پێی زانیاریی وەحییە، ئەوەی کە خوا ﷻ بە شێوەی تایبەت بە پێغەمبەرانی خۆی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) داوە، بە گشتیی، کە لێرەدا باسی داوودو سولەیمانە، سەلامی خوایان لێ بێ.

٢)- ﴿وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، هەردووكیان (واتە: داوود وسولەیمان) گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی كە بەسەر زۆرێك لە بەندە بڕوادارەكانیدا، هەڵیبژاردووین، واتە: پلەی پێغەمبەرایەتیی و زانیاریی تایبەتیی پێداوین، پلەی پێغەمبەرایەتیی بەرزترین پلەیە كە بە مرۆڤەكان درا بێ، خوای پەروەردگار بە هەندێك لەو مرۆڤانەی كە هەڵیبژاردوون، پێیداون، لە دوای موحەممەدیش ﷺ دەرگای پێغەمبەرایەتیی و وەحیی گاڵە دراوەو داخراوە، ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ...﴿٤٠﴾﴾ الأحزاب، موحەممەد بابی هیچ كام لە پیاوانیان نیە، بەڵكو نێرراوی خواو كۆتایی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بەڵام هەموو پێغەمبەران هەڵبژاردە بوون، خوا ﷻ گوڵبژێری كردوون، وەك دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ﴾النمل، واتە: بڵێ: ستایش بۆ خواو سەلام لەو بەندانەی خوا كە هەڵیبژاردوون، كە بەڵنیایی پێش هەموو كەس، پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، گوڵبژێرو هەڵبژاردەی خوان لە نێو مرۆڤایەتیی دا، بۆیەش دەڵێ: ﴿عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، چونكە پێغەمبەرانی دیكەش (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، هەر هەڵبژێردراو بوون، لە نێو بەندە بڕوادارەكاندا، بۆیە گوتوویانە بەسەر زۆرێك لە بەندە بڕوادارەكان دا هەڵیبژاردووین.

٣)- ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ﴾، سولەیمانیش میراتی لە داوود گرت، سولەیمان میراتی لە داوود گرت، واتە: هەمان ئەرك كە بە داوود سپێردرابوو، بە سولەیمانیش سپێردراو، هەمان زانیاریی كە داوود پێی درابوو، خوا ﷻ بە سولەیمانی كوڕیشی داو، هەمان حاڵەتی حوكمڕانیی و باڵادەستیی كە داوود هەیبوو، خوای پەروەردگار بۆ سولەیمانیشی ڕەخساند، ئەگەرنا لێرەدا مەبەست ئەوە نیە كە سولەیمان بە شێوەی نەرێت و سیستمی حوكمڕانیی و بنەماڵەیی و میراتیی، لە شوێنی بابای دانیشتبێ، وەك دوایی لە سەردەمی ئومەوییەكان و، عەبباسییەكان و، عوسمانییەكانەوە، تاكو ئێستاش ئەو شێوە حوكمڕانییە سەقەتە، بەردەوامەو، شتێكی نامۆیە بە ڕووحی شەریعەت، بەڵكو مەبەست لێرەدا ئەوەیە: وەك چۆن كەسێك میراتێك دەگرێ، پێوەی ماندوو نابێ، بە هەمان شێوەش دوای ئەوەی

خوا ﷻ پلەی پێغەمبەرایەتیی و، هۆکارەکانی حوکمڕانیی بۆ داوود ڕەخساندن، سولەیمانی کوڕیشی پلەی پێغەمبەرایەتیی پێداوەو، هۆکارەکانی حوکمڕانیی بۆ ڕەخساندن، بێ ئەوەی خۆی وەدەستی بێنێ، چونکە پێغەمبەرایەتیی پلەیەکی وەهبییەو کەسبیی نیە، مرۆڤ خۆی وە دەستی ناهێنێ، بەڵکو خوا ﷻ دەیبەخشێ، بە هەر کەس کە بیەوێ، ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ۝١٢٤﴾الأنعام، بۆیەش ئەمە وا تۆخ دەکەمەوە، تاکو هیچ کەس وا تێنەگات، کە حوکمی بنەماڵەیی و میراتیی، شتێکە لە پێغەمبەرانی پێشووش دا هەبووە!! نەخێر، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: خوا ﷻ هەمان شت کە بۆ داوودی ڕەخساند بوو، بۆ سولەیمانیشی ڕەخساند بوو، بۆیەش وشەی (وَرِثَ) بەکاردێنێ، لەبەر ئەوەی میرات ئینسان پێیەوە ماندوو نابێ و، شتێکە بە ئاسانیی دێتە دەستی.

٤)- ﴿وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، هەروەها سولەیمان گوتی: ئەی خەڵکینە! بە دڵنیایی ئەم قسانەی سولەیمان وتارێك بووە، لە کۆڕێکی فراواندا دراوە.

٥)- ﴿عُلِّمۡنَا مَنطِقَ ٱلطَّيۡرِ﴾، دواندنی باڵندانمان فێرکراوە، یانی: دەتوانین بیاندوێنین و لێیان تێبگەین.

٦)- ﴿وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيۡءٍ﴾، لە هەموو شتێکمان پێدراوە، لە هەموو شتێك کە حوکمڕانییەکەمان پێویستیی پێ هەبێ، هۆکارەکان و پێداویستییەکانی حوکمڕانییمان بۆ ڕەخسێندراون و پێمان دراون.

٧)- ﴿إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡمُبِينُ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەوەشە بەخششی ڕوون و ئاشکرا.

جێی سەرنجە، کە خوا ﷻ لە سەرەتاوە باسی داوود ﷺو سولەیمان ﷺ دەکات، کە زانیارییان پێدراوەو، ستایشی خوایان کردوە، کە بەسەر زۆرێك لە بەندە بڕوادارەکانی دا هەڵیبژاردوون، بەڵام دوایی یەکسەر دێتە سەر باسی بەسەرهاتی سولەیمان ﷺ، لەبەر ئەوەی لە شوێنەکانی دیکەدا باسی داوود ﷺ کراوەو، ئەم بەسەرهاتەی سولەیمان: تێپەڕبوونی بە شیوی مێروولانداو، دوایی

قسەکردنی لەگەڵ هودهودو، نامە پێدا ناردنی و ... هتد، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە.

شایانی باسە: لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: داوود یازدە (١١) کوڕی بوون، یەکێکیان سولەیمانە، ئنجا بە دڵنیایی ناگونجێ میرات مەبەستی ماڵ و سامان و حوکمڕانیی بێ، کە سولەیمان ماڵ و سامان و حوکمڕانیی هەمووی لە بابی بگرێ و، دە کوڕەکەی دیکە بێ بەش بن، ستەم لە پێغەمبەران ناوەشێتەوە.

بەڵام وەك گوتمان: بۆیە وشەی: میراتگرتن (إرث، میراث)، بەکارهاتوە، کە لێرەدا بە مانا مەجازییەکەیەتی، چونکە ئەو حاڵەتە گەورەو گرنگەی کە داوود بوویەتی، کە دوایی یەکسەر خوای پەروەردگار بەخشیویەتی بە سولەیمان، چوێنراوە بە ماڵ و سامانێکەوە کە لە بابەوە بۆ کوڕ دەچێ، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە کە سولەیمان بە میراتی گرتبێ، وەك حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی.

ئنجا بێگومان کە دەفەرموێ: (وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ)، هەم وشەی (كُلِّ)، هەم وشەی (شَيْءٍ)، هەردووکیان چەمکێکی گشتییان هەیە، بەڵام لێرەدا (كُلِّ)، بێگومان مەبەست پێی زۆرە، یانی: زۆرێك لە شتانمان پێدراوە، (شَيْءٍ)یش، لێرەدا واتە: شتی گرنگ، کە مەبەست پێی ئەوەیە: هەموو ئەو شتانەی پێویستن بۆ حوکمڕانیی کردن، ئێمە پێماندراون و بۆمان ڕەخسێندراون، ئەگەرنا هەموو شتێك بەڕەهایی، تەنیا هی خوایە ﷻ و هیچ کاتێك هیچ کەسێك هەموو شتێکی نەبووە، بەڵام چەمکە عورفیی و باوەکەی ئاوایە، یەکێك بە یەکێك دەڵێ: تۆ هەموو شتێکت هەیە، یان: تۆ هیچ شتێکت نیە، یانی: هەموو شتێك کە عورف و باوە، خەڵك هەیبێ، هەتە، نەك بە ڕەهایی، یانی: بە پێی عورفی باوی خەڵك ئەو وشەیە بەکاردەهێنرێ و مەبەستەکەی لێ وەردەگیرێ، ﴿وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ﴾، دواییش کە بۆ شاژنی سەبەئیش بەکاردەهێنرێ: ﴿وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ﴾، یانی: هەموو ئەو شتانەی کە باون و، عورف و نەریت وایە کە حوکمڕانان هەیانبن، هەینی، ئەو شاژنەش هەموو شتێك کە عورف و باوە، کە حوکمڕانان هەیانبن، هەینی.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەوە بەخششی ئاشکرایە، وشەی: (الفَضل)، (الزِّيَادَةِ فِي الخَيْرِ وَالنَّفْعِ)، واتە: زێدەیی لە چاکەو سووددا، (المُبِين)یش لێرەدا، بە مانای ڕۆشن و ئاشکرا دێ، واتە: ئەو بەخششە کە خوا بە زێدە پێیداوین، زۆر ڕوون و ئاشکرایە، بۆ هەر کەسێك تەماشای بکات.

لێرەدا سولەیمان کە ئاوا قسە دەکات، ئەو فەرمانەی خوا ﷻ جێبەجێ دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ۝١١﴾ الضحى، واتە: ئنجا باسی چاکەکانی پەروەردگارت بکە، واتە: لەو ڕووەوەیە کە باسکردنی چاکەکانی خوایە، (التَحَدُّثُ بِنِعْمَةِ الله)، ئەگەرنا لەو ڕووەوە نیە، خۆی بەسەر خەڵکدا هەڵکێشێ، بەڵکو دەیەوێ بڵێ: خەڵکینە! خوا ﷻ بەخششێکی زۆری بە ئێمە داوەو، خوا چاکەی زۆری بەسەر ئێمەوە هەیە، ئێوەش لەو چاکەو بەخششە بەهرەمەند بن، کە بریتیە لە پێغەمبەرایەتیی و زانیاریی و، لەو حوکمڕانییەی کە پێغەمبەران دەیکەن، کە حوکمڕانییەکی دادگەرانە بووە، حوکمڕانییەك بووە کە دادگەریی بچەسپێ و، ستەم و خراپەو جیاوازیی ڕیشەکێش بکرێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**کۆکرانـەوەی سـوپایەکەی سـولەیمان ﷺ لـە جنـد مـرۆڤ و باڵنـدان و، گوزەرکردنیـان بـە لای دۆڵـی مێرووولانـداو، بانگکـردنی مێرووولەیـەك لـە مێرووولـەکان کـە بچنـەوە کونـەکانی خۆیـان، نـەوەك سـولەیمان و سـوپایەکەی بیانشـکێنن بـێ ئـەوەی پێیـان بزانـن و، زەردەخەنـە کـردنی سـولەیمان لـە قسـەکەی و، پاڕانـەوەی لـە خـوا ﷻ و ستایشـکردنی بـۆ خـوا ﷻ:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ ﴾، سـەربازەکان بۆ سـولەیمان ﷺ کۆکـرانەوە، سەربازەکانی سولەیمان بۆی کۆکرانەوە، واتە: سوپایەکەی بۆی کۆکرایەوەو بۆی ئامادەکرا، دیارە سەفەرێکی لە پێش بووە گوتوویەتی: سوپایەکەم، بۆ ئامادە بکەن، لێرەدا لە جیاتی وشەی (جَيش)، دەفەرموێ: (جُنُود)، سەربازەکانی بۆ کۆکرانەوە، دەڵێن: (الجُنُودُ: جَمْعُ جُنْد، وَهُوَ جَمْعُ جُنديّ)، کەواتە: (جُنُود)، کۆی کۆیە، ئنجا ئایا سوپاو سەربازەکانی سولەیمان چی بوون؟

٢)- ﴿ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ ﴾، لە جند مرۆڤ و باڵندە، پێکهاتەی سوپایەکەی سێ جۆر بوون: مرۆڤ بوون و، جند بوون و، باڵندەش بوون، هەڵبەتە هەر کامێك لەو سێ پێکهاتەیە، کاری تایبەتیی خۆی هەبووە، بەڵام نەك جند هەموو یەك کارو، مرۆڤ

هەموو یەك كارو، باڵندەش هەموو یەك كاریان بووبێ، بەڵكو هەر لە نێو جنددا كارەكان دابەشكراون، وەك لە شوێنەكانی دیكەدا خوای پەروەردگار باسی دەكات، هەیانبووە، شتیان بۆ لە بنی دەریا دەرهێناوەو، هەیانبووە بۆ شەڕ بەكاری هێناون و، هەیانبوو بۆ پیشەسازیی بەكاری هێناون و، هەیان بووە گرتوونی و كەلەپچەی كردوون، هەروەها مرۆڤەكانیش بە هەمان شێوەو باڵندەكانیش، بۆ وێنە: هودهودی بۆ هەواڵگریی بەكارهێناوەو، هەر یەكەو بۆ شتێكی بەكارهێناوە.

٣)- ﴿ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾، لە حاڵێكدا كە ئەوان، كۆكراونەوە سەریەك، كۆنترۆڵ كراون، (الوَزْعُ: الكَفُّ عَمَّا لَا يُرَادُ، فَشَمَلَ الأَمْرَ وَالنَّهِيَ، أَي مُلْتَزِمُونَ التِزَاماً تَاماً)، (وزع): بریتیە لە نەهێشتنی شتێك كە ناویستریّ، كەواتە: هەم حاڵەتی فەرمان و، هەم حاڵەتی نەهێشتن و قەدەغەكردن، دەگرێتەوە، (فَهُمْ يُوزَعُونَ) واتە: زۆر پابەند كرابوون و بەرفەرمان بوون.

(أو يُحْبَسُ أَوَّلُهُمْ عَلَى آخِرِهِمْ)، یاخود: یانی: هی پێشێیان ڕادەگیرا، تاكو هی دوایە پێدەگەیشت.

بەڵام (فَهُمْ يُوزَعُونَ) زیاتر وایێدەچێ مەبەست پێی ئەوە بێ: ڕێیان لێ دەگیرا بەملاولادا بچن و سەرپێچیی و لاملیی بكەن، یانی: پابەند بوون و ڕێك و پێك بوو، نەك هەر كەسەو بە دۆڵێك دا بڕواو، سەرپێچیی بكەن.

٤)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمۡلِ ﴾، هەتا كاتێك بە لای شیوی مێروولاندا، تێپەڕین، (حَتَّى) بۆ گەیشتنە بە ئامانج، واتە: بەردەوام بوون، هەتا گوزەریان كرد بە لای دۆڵ و شیوی مێروولاندا.

(وَادِ ٱلنَّمۡلِ)، دوو واتای هەن:

یەكەم: ئەو شوێنەی مێروولەی تێدان، چونكە هەر چۆن بێ، شارە مێروولە، هەندێك كون و كەلێنان لە زەویدا دروست دەكەن، كە وەك دۆڵ و شیوان وان، بۆ ئەوان و، لە قەدەر ئەوان وەك دۆڵ و شیوان وان، ئەو كەلین و كونانەی مێروولەكان دروستیان دەكەن و، خانووبەرەی خۆیانیان تێدا بنیات دەنێن، یانی: وەك چۆن مرۆڤەكان بە قەد

پاڵی چیایەکانەوە و، لە دۆڵ و شیوەکاندا خانووبەرە دروست دەکەن، مێروولەش لەو کون و کەلێنانەی لە نێو زەویدا هەن، ئەو کون و کەلێنانە بۆ ئەوان وەك دۆڵ و شیو وان.

دووەم: یاخود شوێنێکی تایبەت بووە، کە پێیگوتراوە: (وَادِ ٱلنَّمْلِ)، کە هەندێك دەڵێن: لە فەڵەستین بووە.

وشەی: (ٱلنَّمْلِ): ناوە بۆ جۆرێك لە زیندەوەر، گچکەیەو شەش پێی هەن، تاکەکەی پێی دەگوترێ: (النَّمْلَة)، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿قَالَتْ نَمْلَةٌ﴾، ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو مێروولەیە مێینە بووە، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێ کە هەر تاکێك بووە، لەو جۆرە، واتە: (النَّمْلَة: وَاحِدُ النَّمْلِ)، (نَملة) یەکێکە لە مێروولە، ئنجا ئایا نێرە یان مێیە؟ نازانین، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا﴾، بە هۆی قسەکەیەوە بە زەردەخەنەوە پێکەنی، ئنجا کە ڕاناوی مێینەی خراوەتە سەر، ئەوە لەبەر ڕاچاوکردنی بێژەی (نَمْلَة)یە، کە ڕاناوی مێینەی بۆ بەکارهاتوە، نەك لەبەر ئەوەی ڕەگەزەکەی مێینە بێت، وەك هەندێك لە توێژەرەوان وایانگوتوە، گوتوویانە: ئەوە مێروولەیەکی مێینە بووە، بە بەڵگەی ئەوە کە فەرموویەتی: (نَملَة)، بەڵام، نەخێر (نَملَة) واتە: مێروولەیەك، ئنجا نێر بێ، یان مێ، هەروەك (بَقَرَة)، یانی: ڕەشەوڵاخ، ئنجا نێر بێ یان مێ، پێی دەگوترێ: (بَقَرَة)، هەرچەندە ئێستا وا باوە کە هەر گوتیان: (بَقَرَة)، واتە: مانگاو، (ثَور)یش، واتە: گا، بەڵام لە ڕاستییدا لە زمانی عەرەبییدا: ﴿سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ ﴿٤٣﴾﴾یوسف، واتە: حەوت ڕەشەوڵاخ، ئیدی مەرج نیە، نێر بن، یان مێ بن.

٥)- ﴿قَالَتْ نَمْلَةٌ﴾، مێروولەیەکیان گوتی:

٦)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَٰكِنَكُمْ﴾، ئەی مێروولەکان! بچنە نێو کونەکانی خۆتانەوە، بچنە نێو خانووبەرەو شوێنەکانی خۆتانەوە.

٧)- ﴿لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾، بۆ ئەوەی سولەیمان و سەربازەکانی تێکتان نەشکێنن، لە حاڵێکدا کە هەست ناکەن.

(الحَطْمُ: الكَسْرُ لِشيءٍ صَلْبٍ)، (حَطْم): بریتیە لە شكاندنی شتێكی ڕەق، ئنجا لە تەفسیركاندا هاتوە: (واسْتُعِيرَ هُنَا للرَّفْسِ بِجَامِعِ الإهلاكِ)، لێرە خوازراوەتەوە بۆ پێلێنان و پانكردنەوە، لەبەر ئەوەی هەر شتێك پان بكرێتەوە دەفەوتێ، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە وا نیەو، ئەو تەعبیرە ئیعجازێكی علمیی تێدایە: كە ئێستا دەركەوتوە پێكهاتەی جەستەی مێروولە، لە ماددەیەكی ڕەقەو، ئەگەر پێی لێبنرێ، دەشكێت، وەك چۆن شووشەیەك دەشكێت، جەستەی مێروولەش تێك دەشكێت، نەك پان ببێتەوە، بۆ وێنە: كە پێ لە كرمێك دەنێی، پان دەبێتەوە، بەڵام مێروولە تێك دەشكێت و، كرپەو دەنگی شكانی دێ، وەك شووشەیەك.

ڕستەی: ﴿ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ ﴾، ئەمە وەك ئەوە وایە: (لَا أعْرِفَنَّكَ تَعْمَلُ كَذَا)، تۆ نەناسم ئاوا بكەی، یانی: ئاواتان لێ نەیەت، تاكو سولەیمان و سەربازەكانی تێكتان نەشكێنن.

﴿ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾، (و) لێرەدا (الواو حَالِيَة) واتە: لە حاڵێكدا كە هەست ناكەن، لە حاڵێكدا ئەوان هەست ناكەن، ئەمە ستایش و مەدحێكی گەورەی سولەیمان ﷺو سوپایەكەیەتی، كە ئەوانە پێ لە مێروولەش نانێن، مێروولەش تێكناشكێنن، ئەگەر پێی بزانن، لە حاڵێكدا كە پێ نەزانن، پێ لە مێروولە دەنێن، بەڵام ئەگەر ببینن، پێ لە مێروولەش نانێن، چ جای باغ و كشتوكاڵی خەڵك بشێلن، یان خەڵك بە ناهەق بكوژن، یان ئاژەڵ و مەڕو ماڵی خەڵك وە بەرخۆبدەن! بەڵكو پێ لە مێروولەش نانێن.

٨)- ﴿ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا ﴾، زەردەخەنەی هاتێ، لە حاڵەتی پێكەنیندا، بەهۆی قسەكەیەوە، سولەیمان بە زەردەخەنە پێكەنی، دیارە پێكەنینی پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، زیاتر حاڵەتی زەردەخەنەی هەبووە، چونكە (ضَاحِكاً) دەڵێ: (حَال مِن التَبَسُّم)، یانی: (ابْتَسَمَ، ضَحِكَ تَبَسُّماً، أو ابتَسَمَ ضَاحِكاً)، یانی: زەردەخەنەی هاتێ، لە حاڵەتی پێكەنیندا، كە پێكەنینەكەی بریتیی بوو لە زەردەخەنە، كە زەردەخەنە كەمترین حاڵەتی پێكەنینە، واتە: بە قاقا پێنەكەنی، پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بە قاقا پێنەكەنیون،

وەك خەڵكێك لەسەر پشت بکەوێ و، مرۆڤ لە حاڵەتی عاتیفیدا پێکەنینی زۆری بۆ دێنێ، پێغەمبەران بەو شێوەیە نەبوون، وەك لە پێغەمبەری خاتەم گێڕدراوەتەوە، بۆیە زەردەخەنەی هاتوە، یانی: دڵخۆش بووە، سوپایەکەی هێندە صاڵح و چاکن پێ لە مێرووەلەش نانێن، مەگەر مێرووەلەکان نەبینن و هەستیان پێ نەکەن.

٩)- ﴿وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ﴾، سولەیمان گوتی: پەروەردگارم! یارمەتییم بدە، سوپاسی ئەو چاکەیەت بکەم، کە لەگەڵ مندا کردووتە، هەروەها لەگەڵ باب و دایکیشم دا، (أوزِعنِي) یانی: (ألهِمْنِي)، واتە: فێرم بکە، یاخود هانم بدە، وام لێ بکە سوپاسگوزاربم بۆ تۆ، لەسەر ئەو چاکەیەی کە لەگەڵ منت کردوە، یاخود (أوزِعنِي) هەر لەسەر نەسڵە زمانەوانییەکەیەتی (وَزَعَهُ) واتە: (مَنَعَهُ)، کەواتە: (أوزِعنِي) یانی: (امْنَعْنِي عَنْ الغَفْلَةِ كِي أَظَلَّ شَاكِرَاً)، واتە: ڕێم لێبگرە لە بێ ناگایی تاکو سوپاسگوزار بم، یان (أمْنَعْنِي مِنِ الكُفْرَانِ كَي أشكُرَك) ڕێم لێبگرە لە ناسوپاسیی، تاکو بەردەوام سوپاسگوزار بم بۆ تۆ.

﴿وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ﴾، هەروەها سوپاسگوزاریی ئەو چاکەیەشت بکەم کە لەگەڵ باب و دایکم دا کردووتە، چاکەی دایك بابیش هەر نیعمەتێکە بۆ ڕۆڵە دەگەڕێتەوە، هەر وەك چۆن چاکەیەك کە لەگەڵ ڕۆڵەکانیش دەکرێ، دیسان بۆ باب و دایکان دەچێتەوەو بۆ ئەوانیش نیعمەتە، باب و دایکێك ڕۆڵەیەکی باشیان هەبێ، چ کوڕ، چ کچ، بۆ ئەوانیش نیعمەتە، هەروەك باب و دایکیش ئەگەر چاك بووبن، بۆ ڕۆڵەکان نیعمەتە، ئەگەر ئەو مرۆڤە شانازیی بە باب و دایکیەوە بکات، بە دڵنیایی لە چاکەی ئەوانیش بەهرەمەند بووە.

١٠)- ﴿وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ﴾، هەروەها یارمەتییم بدە، کە کردەوەی باش بکەم، جێی پەسندی تۆ بێت، تۆ لێی ڕازی بی.

١١)- ﴿وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، بە بەزەیی خۆشت بمخە نێو بەندە چاکەکانتەوە، واتە: بمخە نێو ڕیزی ئەوانەوە.

## ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی زەقی
## (محمد الطاهر بن عاشور)

لێرەدا بە باشی دەزانم هەڵەیەکی زەقی (**محمد الطاهر بن عاشور**)، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ڕاست بکەینەوە، هەڵبەتە توێژەردوانی دیکەش جاری وا هەیە قسەیەك دەکەن، پێم هەڵەیە، بەڵام شتێك کە زۆر بە پێویستی نەزانم، نامەوێ تەفسیرەکەی خۆمی پێ قەڕەباڵغ بکەم، بەڵام لەبەر ئەوەی (**محمد الطاهر بن عاشور**)، هەم زانایەکی گەورە بووە لە زانایانی تونس، هەم تەفسیرەکەشی شتی زۆر وردی تێدایە، بۆیە بە چاکم زانی ئاماژە بەو هەڵەیەی بکەم، هەڵەکەشی ئەوەیە کە لە تەفسیری ئەم ڕستەیەدا: ﴿ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ ﴾، دەڵێ: (**وَوَالِدَاهُ هُمَا أَبُوهُ دَاوُدُ بْنُ يَسِّي وَأُمُّهُ بَثْشَبَعَ بِنْتُ الْيَعَامَ، وَهِيَ الَّتِي كَانَتْ زَوْجَةَ (أُورِيَا) الْحِثِّيِّ، فَاصْطَفَاهَا دَاوُدُ لِنَفْسِهِ، وَهِيَ الَّتِي جَاءَتْ فِيهَا قِصَّةُ نَبَإِ الْخَصْمِ الْمَذْكُورَةُ فِي سُورَةِ ص**)[1].

واتە: باب و دایکی سولەیمان ئەمانەن: بابی داوودی کوڕی یەسسییە، دایکیشی (**بَثْشَبَعَ بِنْتُ الْيَعَامَ**)، ئەویش کە پێشتر ژنی (**أُورِيَا الْحِثِّيِّ**) بوو، بەڵام داوود بۆ خۆی هەڵیبژارد، ئەو ئافرەتەیە کە بەسەرهاتی (**نَبَإِ الْخَصْمِ**)، کە لە سوورەتی (ص) دا، باسکراوە، لە بارەیەوە هاتوە.

ئنجا لێرەدا ئەو زانایە کەوتۆتە دوو هەڵەی زەقەوە:

**یەکەم:** دەڵێ: دایکی سولەیمان: (**بَثْشَبَعَ بِنْتَ الْيَعَامَ**)، ژنی (**أوريًا الحثّي**) بووە، کە ئەوە لە (پەیمانی کۆن)دا، هاتوە، ئنجا من هەم لە: (**موسوعة: الإسلامُ كَما يتَجَلّى في كتاب الله، الكتاب السادس، الإيمان برسُل اللهِ وأنبيائه**)، لەوێدا باسم کردوە، هەم لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)یشدا، کە ئەو بەسەرهاتەی پەیمانی کۆن (العهد القديم) وەك گەلێك چیرۆکی

---

(١) التحرير والتنوير، ج١٩، ص٢٤٤.

دیکەی، بە هیچ جۆرێك ڕاست نیەو، لەگەڵ عەقڵ و لۆژیك و، لەگەڵ پێگەی بەرزی پێغەمبەرانیش دا ناگونجێ، کە پەیمانی کۆن لە: (سفر صَموئيل الثاني، إصحاح: ١١ و ١٢، وسفر الملوك، إصحاح: ٢)دا باسی دەکات و کورتەکەی ئەوەیە:

ڕۆژێـك داوود ﷺ لەسـەر بـان پیاسـە دەکات، ئافرەتێـك دەبینـێ خـۆی دەشـوات، زۆری پـێ جـوان دەبێـت، دوایـی بـە دوایدا دەنێـرێ و دەیهێنێ بۆ ماڵی خۆیـان و لەگەڵی جـووت دەبـێ، دوایـی کـە دەزانـێ خێـزانی (أُورِيَا الْحِثِّيّ)ە، ئوریـا دەنێرێتـە پێشـەوەی جەنـگ و، بـە سـوپایەکەش دەڵـێ: ئەگـەر شـەڕ گـەرم داهـات، ئێـوە بکشـێنەوە، بـا ئوریـا بکـوژرێ، ئیـدی ئوریـا دەکـوژرێ و، دوایـی داوود ژنەکـەی مـارە دەکاتـەوە!

کـە ئەمـە مسـوڵمانێکی ئاسـایی و عادەتیـی، شـتێکی نـاوا لـە خـۆی ناوەشـێنێتەوە، تاکـو لـە داوود بوەشـێتەوە، ئێمـەش مولـزەم نیـن، ئـەو ئەفسـانەو ئـەو شـتە بـێ مانایانـەی لـە پەیـمانی کۆنـدا هاتـوون، کـە شـتی دیکـەی لـەوەش بـێ ماناتـری تێدایە، بێنیـن لەسـەر پێغەمبەرانیـان بکەینـە مـاڵ.

ئـەوە هەڵـەی یەکەمـی خـاوەنی (التحريـر والتنويـر)ەو، ئەدەبـوو ئـەو قسـەیە بێنێ لـە پەیـمانی کۆنـەوە، یەکسـەر بـە موتڵەقیـی وەری بگـرێ و، بیکاتـە مـاڵ لەسـەر داوودو، ئـەو ئافرەتـەش بکاتـە دایـکی سـولەیمان، کـە ئافرەتێـك بـێ لـە مـاڵ و مێـردی خـۆی بـێ و، لەگـەڵ پیاوێـکی دیکـەدا ڕابوێـرێ، ئنجـا سـولەیمانی بـە زگ بکـەوێ! ئنجـا ئەگـەر وابـێ سـولەیمان لـە کاتێکـدا، بـە زگـی دایـکی کەوتـوە - چونکـە لـە پەیـمانی کۆنـدا دەڵـێ: ئافرەتەکـە گـوێ: دوو گیانـم، دوای ئـەوەی داوود لەگەڵـی جـووت بـوو - جـارێ هـەر لـە ژێـر نیکاحـی مێردەکـەشی دابـووە، کـە ئوریایـە! ئـەوەش تۆمەتێـکی زۆر خراپـە، هـەم بـۆ سـولەیمان، هـەم بـۆ بـاپی سـولەیمان، پێـش سـولەیمان.

دووەم: ئەوەیە کە یەکسەر (محمد الطاهر بن عاشور)، دەڵێ: (وَهِيَ الَّتِي جَاءَتْ فِيهَا قِصَّةُ نَبَإِ الْخَصْمِ الْمَذْكُورَةُ فِي سُورَةِ ص) کە مەبەستی ئەم ئایەتانەن: ﴿وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ

﴿هَٰذَآ أَخِي لَهُۥ تِسۡعٞ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ وَلِيَ نَعۡجَةٞ وَٰحِدَةٞ فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ ٢٣ قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦۖ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٞ مَّا هُمۡۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّۤ رَاكِعٗاۤ وَأَنَابَ ۩ ٢٤ فَغَفَرۡنَا لَهُۥ ذَٰلِكَۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ٢٥ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ ٢٦﴾.

ئـەم ئایەتانـە بـاسی بەسـەرهاتەن کـە پێـی دەگوتـرێ: بەسـەرهاتی (نَبَأُ الخَصْمِ)، کـە کورتەکـەی ئەوەیـە: داوود ﷺ ڕۆژێـك خەریـکی خواپەرسـتیی بـوو لـە ژووری تایبەتیـی خۆیـدا، (میحراب واتـە: ژووری تایبەتیـی خـوا پەرسـتیی)، دوو کـەس دەچن بـۆ لای بەسـەر دیـواردا دەچـن، (داوود پێغەمبـەر بـووەو حوکمـڕان و پادشـا بـووە، پاسـەوانی هەبـووە، چـۆن ئـەو دوو کەسـە هاتن؟) لێیـان ترسـا و ڕاچڵەکی، پێیـان گوت: مەترسـێ! ئێمـە دوو کەسـین ناکۆکیـی و دەمەقاڵێیـمان بـووە، لـە نێوانمانـدا دادوەریی بکـەو سـتەم مەکـەو، ڕێـی ڕاسـتمان پـێ نیشـان بـدە، یەکێکیـان قسـە دەکات، وەك داواکار (مدَّعي)، دەڵـێ: ئەمـە برامـە، نەوەدونـۆ (٩٩) مـەڕی هەیـە، منیـش مەڕێکـم هەیـە، گوتوویـەتی مەڕەکـەی خۆشـت بـدە بـە مـن، لـە قسانیشـدا بەسـەرمدا زاڵ بـووە، داوود ﷺ بەبـێ ئـەوەی گـوێ لـەوەی دیکـە بگـرێ، کـە داوا لەسـەر کـراو (مدَّعـى عليـه)ە، یەکسـەر دەڵـێ: سـتەمی لێکـردووی کـە داوای لێکـردووی مەڕەکـەی خـۆت بخەیـە گـەڵ مـەڕەکانی وی و، تـۆ هیـچ مـەڕت نەمێنـن، ئەویـش سـەد (١٠٠) مـەڕی هەبـن، سـتەمی لێکـردووی، زۆریـش لەوانـەی کـە پێکـەوە تێکـەڵ دەبـن، سـتەم لـە یەکـدی دەکـەن، مەگـەر ئەوانـەی ئیمانـدارو خـاوەنی کـردەوەی باشـن.

دوایـی داوود بـۆی دەرکـەوت کـە خـوا تاقییکـردەوە، داوای لێبـوردنی لـە پـەروەردگاری کـردو کـڕووشی بـردو گەڕایـەوە، (دوایـی خـوا ﷻ دەفەرمـوێ:) خـواش لێیبوردو بۆویـش لـە لای ئێمـە هەیـە، نیزیکیـی و سـەرەنجامێکی بـاش، (دوایـی خـوا دەفەرمـوێ:) ئـەی داوود! تۆمـان کـردوە بـە جێنشـین لـە زەوی دا، دادوەریـی لـە

نێوان خەڵکدا بکە بە هەق و، بە دوای ئارەزوو مەکەوە، بە دوایی عاتیفە مەکەوە، ئەگەرنا لە ڕێی خوا لات دەدا، ئەوانەی لە ڕێی خوا ﷻ لا دەدەن، سزایەکی سەختیان هەیە، بە هۆی ئەوەوە کە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لە بیرچووە.

ئەمە کۆی بەسەرهاتەکەی قورئانە، وەك لە ئایەتەکان دا هاتوە.

ئنجا ئەمە کوا باسی ئافرەتی تێدایە؟ لە ڕاستیدا ئەو بەسەرهاتە هەر ئەوەیە کە خوای پەروەردگار داوود کە حوکمڕان بووەو، دادوەرییشی لە نێوان خەڵکدا کردوە، تاقیکردنەوەیەکی بۆ هێناوەتە پێش، دوو فریشتە لە شێوەی دوو پیاودا چوونە لای، داوایەکی ورووژێنەریان بۆ باسکردوە، زۆر عاتیفە بزوێن بووە، ئەوەندە ورووژێنەرو عاتیفە بزوێن بووە، داوود لە بیری چووە لە داوا لەسەر کراو (مُدّعى عليه)ەکە بپرسێ: ئایا ئەو داواکەر (مُدّعى)ە، ڕاست دەکات؟! یەکسەر گوتوویەتی: ستەمی لێکردووی.

هەڵەکەی داوود لەوە دابووەو، باسی ژنان هەر لە گۆڕێدا نیە، بەداخەوە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان، هاتوون ئەو بەسەرهاتەی کە لە پەیمانی کۆندا هەیە، کە بوختانێکە بە داوود کراوەو بە سولەیمانیش هەر کراوە، گوایە: دایکی لە کاتێکدا ئەوی وەسك کەوتوە، کە لە ژێر نیکاحی مێردێکی دیکەدا بووەو داوود بە زینا لەگەڵی جووت بووە، ئەمە تۆمەتە بۆ سولەیمانیش و، بۆ داوودیش، هاتوون ئەو بەسەرهاتەی لە پەیمانی کۆندا هەیە، لەگەڵ ئەو ئایەتانەی سوورەتی (ص)دا، لێکیان داون، کە ئایەتەکانی سوورەتی (ص)، هیچ پەیوەندییان بەو بەسەرهاتەوە نیەو، شتی ئاواش نەك لە داوود ﷺ، بەڵکو لە مسوڵمانێکی ئاساییش ناوەشێتەوە، تەماع لە ژنی برادەرێکی خۆی بکات و، بینێرێ بە کوشتی بدات و، دواتر ژنەکەی مارە بکاتەوە!! شتی ئاوا چۆن لە پێغەمبەران دەوەشێتەوە؟ بۆیە بە پێویستم زانی ئەو هەڵەیە، ڕاست بکەمەوە، کە ئەگەر لە هەندێك لە تەفسیرکانی دیکەدا هاتبایە، ڕەنگە بە پێویستم نەزانیبایە، ڕاستی بکەمەوە، بەڵام (التحرير والتنوير) تەفسیرێکی موعتەبەرەو، پێم ناخۆش بوو، ئەو دوو هەڵەیە، ئاوا بەسەریان دا بڕۆم.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بەسەرکردنەوەی سولەیمان ﷺ بۆ باڵندان و، دیارنەبوونی هودهودو، هەڕەشەلێکردنی بە سزادانی، ئەگەر بەبێ پاساو غایب بووبێت، پاشان قسەکردنی هودهود لە بارەی شاژنی سەبەئەوە، کە خۆی و گەلەکەی خۆر دەپەرستن و، شەیتان گومڕای کردوون و، لە ڕێی خوا لایداون:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيۡرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَآ أَرَى ٱلۡهُدۡهُدَ أَمۡ كَانَ مِنَ ٱلۡغَآئِبِينَ ۝٢٠ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابٗا شَدِيدًا أَوۡ لَأَاْذۡبَحَنَّهُۥٓ أَوۡ لَيَأۡتِيَنِّي بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ۝٢١ فَمَكَثَ غَيۡرَ بَعِيدٖ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ وَجِئۡتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٖ يَقِينٍ ۝٢٢ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ۝٢٣ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ۝٢٤ أَلَّا يَسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ۝٢٥ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ۝٢٦﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەژدە بڕگەدا:**

١)- ﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيۡرَ﴾، (سولەیمان) باڵندەکانی بەسەرکردنەوە، چاوی پێداگێڕان، **(التَفَقُّدُ: التَفَعُّلُ، يَدُلُّ عَلَى التَكَلُّفِ، والتَفَقُّدُ: طَلَبُ الفَقْدِ، ثُمَّ تَوَسَّعُوا فِيْهِ فَأَطْلَقُوه عَلَى طَلَبِ مَعْرِفَةِ سَبَبِ الفَقْدِ)**، (تَفَقُّد) واتە: بە دوای دیار نەماندا گەڕان، دوایی چەمکەکەیان فراوان کردوەو، بەکاریان هێناوە بۆ گەڕان بە دوای هۆکاری دیار نەماندا، کەواتە: (وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيۡرَ)، واتە: چاوی پێدا گێڕاو، بەسەریانەوە گەڕاو پشکنینی.

٢)- ﴿فَقَالَ مَا لِيَ لَآ أَرَى ٱلۡهُدۡهُدَ أَمۡ كَانَ مِنَ ٱلۡغَآئِبِينَ﴾، سولەیمان گوتی: ئەوە چیمە! بۆچی هودهود نابینم؟ واتە: چ شتێك بۆتە هۆکاری نەبینینی من بۆ هودهود؟

واتە: ئایا هۆکاری نەبینینی من بۆ هودهود، خۆمم، یاخود خۆیەتی کە لێرە نیە؟ واتە: ئایا من نایبینم و شتێك بۆتە پەردەو نێوان نایبینم، یاخود هۆکارەکە ئەوەیە کە ئەو لێرە نیەو ئامادە نیە؟ [هودهود کە بە کوردیی (پەپوو سولەیمانە)ی پێ دەڵێن، جۆرێکە لە باڵندە، دەنگێکی تایبەتیی هەیەو، بۆنێکی ناخۆشی لێ دێ، سەری وەك ئەوە وایە کڵاوێکی ڕەشی لەسەر بێ، پێڵووەکانی چاوی زەردن، نینۆکەکانی ڕەشن، هەم دانەوێڵە دەخوات و هەم کرمیش، لە دوورەوە ئاو دەبینێ، ئەگەر ئاو لە ژێر زەویشدا هەبێ، هەستی پێ دەکات، بۆیە لە هەر شوێنێك کە باڵی ڕاوەشاندن، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە لەو شوێنەدا، یاخود لە ژێر ئەو شوێنەو لە زەویدا ئاو هەیە].

سولەیمان ﷺ هەم بۆ ئەوە بەکاری هێناوە، هەم بۆ هەواڵگریی و نامە هێنان و بردنیش بە کاری هێناوە.

٣)- ﴿ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ ﴾، بە دڵنیایی یان زۆر بە سەختیی سزای دەدەم، یان سەری دەبڕم، واتە: بە پێی جۆری سەرپێچییەکەی، سزای دەدەم.

٤)- ﴿ أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾، یاخود دەبێ بەڵگەیەکی ڕوونم بۆ بێنێ، بۆ هۆکاری ئامادە نەبوونی، بۆچی لێرە نیە؟ واتە: هەر چۆن بێ دەربازی نابێ لە سزادان، مەگەر بەڵگە بێنێ، ئنجا جۆری سزادانەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ جۆری سەرپێچییەکەی، ئەگەر سەرپێچییەکەی زۆر سەخت نەبێ، ئەوە بەس سزای دەدەم و، ئەگەر زۆریش سەخت بێ، سەری دەبڕم.

٥)- ﴿ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴾، مانەوەی هێندەی پێنەچوو، (بَعِيدٍ) دوور یان سیفەتە بۆ کات، یان بۆ شوێن، واتە: لە شوێنێك کە دوور نەبوو، یاخود کاتێك کە دوور نەبوو، زۆری پێ نەچوو، بە کورتیی: دوای ماوەیەکی کەم، کە پێی نەچوو، گەڕایەوە.

٦)- ﴿ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ ﴾، گوتی: شتێکم زانیوە کە تۆ نەتزانیوە، (اطَّلَعْتُ عَلَى مَا لَمْ تَطَّلِعْ عَلَيْهِ)، لە شتێك ئاگادار بووم، تۆ لێی ئاگادار نی، وشەی (إحَاطَة): بریتیە لە دەورەدانی شتێك، شتێك وەخۆ بگری، بیخەیە ژێر ڕکێفی خۆتەوە، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ زانیاریی هەبوون بە شتێك، ئاگاداریی هەبوون لە شتێك.

٧)- ﴿ وَجِئۡتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٖ يَقِينٍ ﴾، لە سەبەئەوە هەواڵێکی جێی دڵنیاییم بۆ هێناوی، کە هیچ گومانی تێدانییە، (سَبَأ) ناوی هۆزێکە، لە وڵاتی (سبأ) پیاوێك بووە، ئەو هۆزە لەو پیاوەوەن و وەچەی ئەون، کە ئەوانە لە عەرەبی بە عەرەبکراو (الْمُسْتَعْرَبة)ن، لە ئەسڵدا عەرەب نەبوون، بە عەرەب کراون، پایتەختی وڵاتی (سَبَأ)، شاری (مأرِب) بووە، لە نێوانی (مأرِب) و (صَنْعَاء)دا، سێ قۆناغە ڕێ بووە.

٨)- ﴿ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ ﴾، من ئافرەتێکم بینی، حوکمڕانیانە، (تَمْلِكُهُم مِنَ الْمُلْكِ وَلَيْسَ مِنَ الْمِلْكِ)، (مِلْك) واتە: خاوەنداریێتیی، بەڵام (مُلْك) واتە: حوکمڕانێتیی، واتە: ئافرەتێکم بینی حوکمڕانیانە، شاژنیانە.

٩)- ﴿ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ ﴾، لە هەموو شتێکی پێدراوە، واتە: لە هەموو شتێك کە پێویست بێ بۆ حوکمڕانیی، یانی: هۆکارەکانی حوکمڕانیی بۆ ڕەخسێندراون، لە سوپاو کۆڕو مەجلیسێك کە ڕاوێژیان پێبکات، لە کەسانێك کە لە شوێنەکان بیانکات بە بەرپرس، وەك ئێستا پێیان دەگوترێ: پارێزگارو قائیمقام و، لە کەسانێك کە کاروبارەکانی جێبەجێکردنیان پێ دەسپێردرێ، کە ئێستا پێیان دەڵێن: وەزیران و ئەنجومەنی وەزیران، هەموو هۆکارەکانی لە ڕووی ماددیی و مەعنەویی و بەشەرییەوە، بۆ ڕەخسێندرابوون.

١٠)- ﴿ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ﴾، تەخت و نشینگەیەکی مەزنیشی هەیە، لە ڕووی قەبارەیەوەو لە ڕووی بەهاو نرخییەوە.

١١)- ﴿ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، بینیم خۆی و گەلەکەی کڕنووش بۆ خۆر دەبەن، لە جیاتی خوا.

١٢)- ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴾، شەیتانیش کردەوەکانیان بۆ ڕازاندووونەوە.

١٣)- ﴿ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، لە ڕێی ڕاست لایداون، (سَبِيل) یانی: (صِرَاط الله الْمُسْتَقِيم)، یانی: لەو ڕاستە ڕێیەی کە هەر ئەوە ڕێیە، بەس ئەو ڕێیە ڕێیە، بۆ کەسێك کە تۆزێك عەقڵ و ویژدانی پێیە.

١٤)- ﴿فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ﴾، بۆیە سەرەنجام ئەوانە ڕێی ڕاست ناگرن.

١٥)- ﴿أَلَّا يَسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ {لە ڕێی ڕاست لایداون} تاکو کڕنووش نەبەن بۆ ئەو خوایەی کە نهێنیی لە نێو ئاسمانەکان و زەوی دەردەهێنێ، ئەوە واتایەکی و، چەند واتایەکی دیکەشی هەن، کە لە کۆتایی تەفسیری ئایەتەکەدا دەیانخەینە ڕوو.

لێـرەدا ئـەوەی پێویسـتە هەڵوەسـتەی لەبەردەمـدا بکەیـن، ئەوەیـە: کـە ئـەم هودهـودە لـە چەنـد وشـەیەکی کورتـدا، کۆمەڵێـك زانیاریـی، گرنگـی: جوگرافیـی و ئابووریـی و سیاسـیی و ئاینییـی و شارسـتانیی و ئاوەدانیـی، بـۆ سـولەیمان دەخاتـە ڕوو، کـە لـە دە (١٠) وردە خـاڵ دا دەیانهێنیـن:

١- ﴿وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ﴾، لە ڕووی جوگرافییەوە دیاریی کرد هەواڵەکە لە کوێوە دێ؟ لە (سبأ)ەوە.

٢- ﴿بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾، لە ڕووی هەواڵگرییەوە، ئەو هەواڵە کە دێ، هەواڵێکی جێی دڵنیاییەو جێی گومان نیە، قیل قال و پڕوپاگەندەو بانگەشەی بێ جێ نیە.

٣- ﴿إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ﴾، لە ڕووی سیاسییەوە، ئافرەتێکم بینی کە حوکمڕانیان بوو، کە ئەوەش شتێکی سەیرەو، ئەو کاتەش هەر شتێکی ڕیزپەڕ بووە، کە ئافرەتێك لە جیاتی پیاو، حوکمڕان بێ، لە ڕووی سیاسییەوە.

٤- ﴿وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ﴾، لە هەموو شتێك پێدراوەو، سەرجەم هۆکارەکانی حوکمڕانیی بۆ ڕەخسێندراون.

٥- ﴿وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ﴾، نشینگەو تەختێکی مەزنیشی هەیە.

٦- لە ڕووی ئاینییەوە: ﴿وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ اللَّهِ﴾، خۆی و گەلەکەیم بینی، کڕنووش بۆ خۆر دەبەن، لە جیاتی خوا، یانی: خۆر پەرستن.

٧- بۆچی وایان لێهاتوە؟ ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، شەیتان کردەوەکانی بۆیان ڕازاندوونەوەو، بۆی جوان کردوون، یانی: هودهود شیکاریی دەکات: بۆچی ئاوا بوون؟ دەڵێ: شەیتان بەو دەردەی بردوون و بەو مەرەدەی بردوون.

٨- ﴿ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، ئنجا شەیتان لە ڕاستە ڕێ لایداون.

٩- ﴿ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴾، بۆیە بە ڕێیە نازانن، ئنجا ئایا بۆچی شەیتان لە ڕاستە ڕێ لایداون و کردەوەکانی بۆ جوان کردوون؟

١٠- ﴿ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، تاکو کڕنووش نەبەن، بۆ ئەو خوایەی کە نهێنیی لە ئاسمانەکان و زەوی دەردەهێنێ.

١٦)- ﴿ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴾، هەروەها خوا دەزانێ ئەوەی پەنهانی دەکەن و ئەوەی ئێوە ئاشکراشی دەکەن، هەڵبەتە خوێندراویشەتەوە: (وَمَا يُخْفُون وَمَا يُعلِنُون)، واتە: ئەوەی ئەوان ئاشکرای دەکەن و، ئەوەش پەنهانی دەکەن:

١٧)- ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، ئەمە دەگونجێ هەر قسەی هودهود بێ: خوا، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە.

١٨)- ﴿ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ خاوەنی تەختی مەزنە، ئەو تەختە مەزنەی کە هەر ئەوە تەختی حوکمڕانییەو، لەگەڵ هی حوکمڕان و پادشاکاندا بەراورد ناکرێ.

زانایــان چەنــد مانایەکیــان لێکداوەتەوە بــۆ ئــەو ڕســتەیەی کــە خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾:

یەکەم: ﴿ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، (أَلَّا يَسْجُدُوا۟)، واتە: بۆ ئەوەی کڕنووش بۆ خوا نەبەن، لە ڕێ لایداون.

دووەم: ئەوە کە دەفەرموێ: (أَلَّا يَسْجُدُوا)، ئەمە دەکرێتە چاوگێك و دادەڕێژرێ لە حاڵەتی چاوگ و، دەبێتە جێدار (بدل) بۆ (أَعْمَـٰلَهُمْ)، یانی: ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾، کە بریتیە لە: کڕنووش نەبردنیان بۆ خوا ﷻ (عدم سجودهم لله).

سێیەم: لێرەدا (أَلَّا) بە مانای (هَلَّا)یە، کە مەبەست پێی هاندانە بۆ کڕنووش بردن.

چوارەم: هەندێکیان گوتوویانە: (أَلاَ يَسجُدوا) مُرَكَّبٌ مِنْ «يَا» النِّدَاء وفِعْل أمْرٍ: أَلاَ يَسْجُدوا)، واتە: ئاگاداربن! کڕنووش بەرن، بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.

بەڵام من مانای یەکەم و دووەمم زیاتر بە دڵن.

پوختەی قسەکە ئەوەیە:

کە هودهود دەڵێ: من ئەو شاژنەم بینی، خۆی و گەلەکەی خۆر دەپەرستن و شەیتان کردەوەکەی بۆ جوان کردوون، بۆیەش بۆی جوان کردوون و لە ڕێ لایداون، تاکو کڕنووش بۆ خوا نەبەن و خوا نەپەرستن، هەمیشە پەرستنی جگە لە خوا، ئنجا خۆرە، مانگە، دارو بەردە، هەواو ئارەزوویە، حیزبە، ڕژێمە، مرۆڤە، هەرچی هەیە، دەبێتە بەدیل و جێگرەوە بۆ خواپەرستیی، واتە: بۆ ئەوەی خەڵك خوا نەپەرستن، تووشی بتپەرستیی و شت پەرستیی دەکرێ و، شەیتانیش بەو دەردەی بردوون، خۆر پەرستیی بۆ ڕازاندوونەوە، تاکو کڕنووش بۆ خوا نەبەن و خوا نەپەرستن.

**مەسەلەی چوارەم:**

**نامە ناردنی سولەیمان ﷺ بە هودهود دا بۆ شاژنی سەبە، کە بە تەبایی و ئاشتیی بێتە لای و، ڕاوێژکردنی شاژن بە دەستڕۆیشتووانیی وڵاتەکەی و، ئامادەیی پیشاندانیان بۆ جەنگ و، هەڵبژاردنی شاژن بۆ بژاردەی ئاشتییانەو، ناردنی دیارییەکی گرنگ بۆ سولەیمان ﷺ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٢٧﴾ اذْهَب بِّكِتَابِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُوا نَحْنُ أُولُو قُوَّةٍ وَأُولُو بَأْسٍ شَدِيدٍ وَالْأَمْرُ إِلَيْكِ فَانظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ ﴿٣٥﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە نۆزدە بڕگەدا:**

دوای ئەوەی هودهود بە سولەیمانی گوت: لە سەبەئەوە هەواڵێکی جێی دڵنیایی و مسۆگەرم بۆ هێناوی، پاشان نێوەڕۆکی هەواڵەکەی بۆ شیکردەوە:

١)- ﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾، سولەیمان گوتی: ڕادەمێنین، ساغی دەکەینەوە، ئایا ڕاستت کردوە، یاخود لە درۆکەرانی، سولەیمان ﷺ گومانی ئەوە کە هودهود درۆ بکات، لە لای زاڵتر بووە، لە گومانی ڕاستکردنی، ئەوەش بە تەئکید بۆ تەمبێ کردن و پەروەردەکردنی سوپایەکەی بە گشتیی، لە پەنای هودهود دا، کاریگەرترە، بۆ ئەوەی ئەوانەی خراپەکارن، تەماع لەو حوکمڕانە نەکەن، کە دەتوانن بە ئاسانیی کڵاوی لەسەر بنێن و هەڵیخەڵەتێنن، ئەوە لایەکی مەسەلەکە، لایەکەی دیکەشی: ئەوە

هاندانە، بۆ هودهود کە هەرچی زووتر ڕاستیی بڵێ و، ئەگەر لەو هەواڵەدا زێدەڕۆییەکی کردبێ و، کەم و کورتییەکی هەبێ، ڕاستی بکاتەوە، بەر لەوەی ئەو دەست بکات بە لێکۆڵینەوەو ڕامان، هودهود بۆ خۆی چاو بە هەواڵەکەی خۆیدا، بگێڕێتەوە.

٢)- ﴿ ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا ﴾، ئنجا سولەیمان هودهود دەنێرێ، دەڵێ: ئەم نووسراوەم بەرە، (كِتَاب) واتە: نووسراو، چاوگە، (كَتَبَ، يَكْتُبُ، كَتَاباً وكِتَابَةً)، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ ناو، لە ئەصڵدا بە مانای نووسراوە، بەڵام دوایی وەك ناو بۆ نامەو کتێب بەکارهێنراوە.

٣)- ﴿ فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ ﴾، بۆیان فڕێ بدە، حوکمڕانان و پادشایان ڕاناوی کۆ بۆ یەکدی بەکاردێنن، وەك ڕێزلێگرتن، لە هەموو ئایەتەکاندا، هەم سولەیمان ڕاناوی کۆ بۆ شاژن بەکاردێنێ و، هەم شاژنی سەبەء ڕاناوی کۆ بۆ سولەیمان بەکاردێنێ، وەك دوایی دەیگەینێ.

کە دەفەرموێ: (فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ)، بۆیان فڕێ بدە، لە بەر ئەوەیە کە هودهود دەستی نەبووە، بە دەستی پێشکەشی بکات، بەڵام نامەکەیان لە باڵی بەستوە، یان بە دەندووکی هەڵیگرتوە، یان بە پێیانەوە بەستوە، بە شێوەیەك کە بتوانێ بە دەندووکی بە شێوەیەك بیکاتەوە، ئنجا هەر دەبێ بۆیان فڕێ بدات، یاخود: (فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ)، یانی: نامەکەیان وێبدە.

٤)- ﴿ ثُمَّ تَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَٱنظُرۡ مَاذَا يَرۡجِعُونَ ﴾، دوایی لێیان دوور بکەوەو پشتیان تێبکە، سەرنج بدە، داخۆ چی دەڵێن؟ داخۆ چ وەڵامێك دەدەنەوە، واتە: شاژن چ وەڵامێك دەداتەوە؟ وەك گوتمان ڕاناوی کۆی بۆ بەکارهێناوە.

ئنجا خوا ﷻ ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە، کە هودهود لە قودسەوە، ڕۆیشت بەرەو وڵاتی (سبأ)، کە شارەکەیان (مَأْرِب)ەو، ئنجا چوو بۆ لای کۆشکی شاژنی سەبەء، پاشان دەرگایان بۆ کردۆتەوە، یاخود شوێنەکەی ئاوەڵا بووە، یان باڵە فڕەی کردوە، ئەو کاتە کۆتری نامەبەر هەبووەو، هودهودیش بۆ ئەو مەبەستە بەکارهێنراوەو زانیویانە کە نامەیەکی پێیە، ئیدی دەرفەتیان داوە، نیزیك بێتەوەو نامەکەیان لێوەرگرتوە، ئەوە هەمووی دەپێچرێتەوەو، یەکسەر باسی ئەوە کراوە کە نامەکەی پێگەیشتوە.

٥)- ﴿ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ ﴾، شاژن گوتی: ئەی دەستڕۆیشتووان، ئەی بڕیار بە دەستانی خەڵکەکەم کە لە دەوروبەرمن.

٦)- ﴿ إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ﴾، بە دڵنیاییەوە من نووسراوێکی بەڕێزم بۆ فڕێدراوە.

بۆیە گوتراوە (کتاب کریم) چونکە: بە دڵنیایی نامەیەك لە سولەیمانەوە بێ، کە وەك پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوا، لە لووتکەی ڕەوشت بەرزیی و لە لووتکەی ئاکار پەسندیی دا بووە، بێگومان ماددەی نامەکە، دەبێ شتێکی زۆر نایاب بووبێ، ئنجا پێست بووبێ، یان هەر شتێك بووبێ، دیارە ماددەیەکی نایاب بووە، ئنجا نێوەڕۆکەکەشی زۆر بەڕێزو حورمەتەوە نووسراوە، کە پوختەکەی خوای پەروەردگار لێرەدا گێڕاویەتەوە، دیارە هودهودیش بە ڕێزو حورمەتەوە نامەکەی وێداوەو بۆی فڕێداوە، کەواتە: (كِتَٰبٞ كَرِيمٌ)، واتە: نامەیەکی بەڕێز، یان نامەیەکی زۆر پەسندو چاك، چونکە: (الكَرِيْمِ هُوَ الجَيِّدُ مِنْ نَوْعِهِ)، (کریم) یانی: شتی هەرە چاك لە جۆری خۆی.

ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە کاتێك کەسێك نامە دەنووسێ بۆ کەسێك، پێویستە هەم ئەو شتەی کە نامەکەی لێ دەنووسێ، لە قەدەر لایەنی بەرانبەر بێ، نامەیەك کە بۆ حوکمڕانێك دەنووسرێ و، بۆ کەسێکی گەورە دەنووسرێ، یان بۆ زانایەك دەنووسرێ، جیایە لەوەی کە بۆ گەنجێك دەنووسرێ، یان بۆ کەسێکی دیکەی سادەو ئاسایی دەنووسرێ، هەر کەسە بە پێی خۆی: (لِكُلِّ مَقَامٍ مَقَال)، دەبێ مرۆڤ ڕێز لە هەموو کەس بگرێ، بەڵام هەر کەسە بە پێی خۆی، چونکە هەندێك کەس ئەگەر لە خۆی زیاتر ڕێزت لێنا، هەر بڕواش ناکات!

من زۆرجار لە ڕێ و بانان دەگەمە خەڵك و، عادەتم وایە سەلام لە هەموو کەس دەکەم، ئنجا لەبەر ئەوەی خەڵکێکی سادەو لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لە خوار، کە نەیانبینیوە بەرپرسان سڵاوی لێ بکەن، هەیە من سەلامی لێ دەکەم، سەری سوڕدەمێنێ و وەڵام ناداتەوە، هەیە کەمێك سەرسام دەبێت، دوایی وەڵام

دەداتەوە، چونکە ڕانەهاتوە سڵاوی لێ بکرێ، بەڵام لە ئیسلامدا دەبێ هەموو کەس ڕێزی لێ بگیرێ و، سڵاو لە هەموو کەس بکرێ، مەبەستم ئەوەیە کە هەر کەسە، دەبێ بە ئەندازەو بە پێی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، وەك لە فەرموودەدا هاتوە: کە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ)، گوتوویەتی: {أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ نُنَزِّلَ النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ} (أخرجه أبو داود: ٤٨٤٢، وذكره مسلم في مقدمة صحيحه)، واتە: پێغەمبەری خوا فەرمانی پێکردووین، خەڵك لە پێگەی خۆیاندا دابنێین.

عائیشە بەو بۆنەیەوە ئەوەی گوت، کە ڕۆژێك سواڵکەرێك هات، دایکمان عائیشە لەتکە نانێکی وێدا، پیاوێکی بە ڕێ و جێش هات، داوای خواردنی کرد، دایکمان عائیشە فەرمووی: لێکردو دانیشت و نانیان بۆ هێنا، ئنجا لەو بارەوە پرسیاری لێکرا، ئەوەیان دائنیشتاندو ڕێزت لێناو نانتان بۆ هێنا، ئەوەی دیکەش لەتکە نانێکت پێدا؟ لەوەوە گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وا فەرمانی پێکردووین کە خەڵك لە پێگەی خۆیاندا دابنێین، هەڵبەتە کارەکەی دایکمان عائیشە زۆر حەکیمانە بووە، چونکە کەسێك کە سواڵکەرە، لەتێك نان لەو وەردەگرێ و، یەکێ لەوو لەو، بە ماڵاندا دەگەڕێ، بەڵام ئەوەی دیکە کە پیاوێکی بەڕێ و جێ بووە، ڕەنگە ڕێبوارێك بووبێ، ڕێی کەوتۆتە ماڵی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر لەتکە نانێکی پێ بدەن، بە سووکایەتیی دەزانێ! بۆیە دەبێ هەر کەسە بەپێی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

ئنجا باسی نێرەری نامەکە دەکات:

٧)- ﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ ﴾، بە دڵنیایی ئەم نامەیە لە سولەیمانەوەیە، تاکو بزانرێ سەرچاوەی لێوەهاتنی نامەکە کوێیە؟

٨)- ﴿ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴾، بێگومان بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، کە لە بەرانبەرمدا خۆتان بە بەرز مەگرن و، بە تەبایی و ئاشتییانە وەرن بۆ لام.

زۆربەی تەفسیرەکان[1]، لێرەدا ئەم وشەی (مُسۡلِمِينَ)یان، بە مسوڵمانەتیی تەفسیر کردوە، بەڵام ئەوە ڕاست و گونجاوە نیەو، مانایەکەی ئاوایە: ﴿ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ ﴾، خۆتان لە بەرانبەرم دا بە بەرز مەگرن، ( أَلَّا تَعۡلُواْ )، ڕاناوی کۆ وەك ڕێزو حورمەت بۆ شاژن بەکارهێنراوە، واتە: ئەی شاژن! لە بەرانبەر مندا خۆت بە بەرز مەگرە، ﴿ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴾، بە ملکەچیی وەرن بۆ لام، واتە: بە تەبایی و بە ئاشتییانە، بەڵام تەفسیرەکان زۆربەیان دەڵێن: ﴿ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴾، واتە: بە مسوڵمانەتیی وەرن بۆ لام، کە ئەو مانا لێکدانەوەیە، هەڵەیە، چونکە (مُسْلِم) لە ئەصڵی زمانی عەرەبییدا بە مانای ملکەچە، (وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ)، واتە: بە ملکەچیی وەرن بۆ لام، مسوڵمان بۆیە پێی دەگوترێ: (مسلم) چونکە بۆ خوا ملکەچە، ئنجا ناگونجی شاژنی سەبەء، مسوڵمان بێ کە نەزانێ مسوڵمانەتیی چییە! سولەیمانیش لەوە عاقڵترو تێگەیشتووترەو، شارەزاترە لە پەیامی خواو ئایینی خوا، کە نەزانێ ئایین فەرز ناکرێ و بەسەر خەڵکدا ناسەپێنرێ، تاکو پێی بڵێ: وەرە ئەگەر مسوڵمان دەبی، لە بەرانبەر مندا خۆت بە بەرز مەگرەو مسوڵمان بە! چونکە: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴿٢٥٦﴾ ﴾البقرة، زۆریی نیە لە ئایین دا، ئەمە بەڵێ ئایەتێکی قورئانەو بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ هاتوە، بەڵام ئەوە ڕاستییەکی بووناسیی و ئیمانییەو، بۆ هەموو پێغەمبەران هەر وابووە، خوا پەرستیی و دینداریی ناگونجێ فەرز بکرێ، خوا پەرستیی و دینداریی سەروکاری لەگەڵ عەقڵ و دڵی مرۆڤدا هەیە، لەگەڵ دیوی پەنهانی مرۆڤدا هەیە، ئنجا چۆن دەتوانی بە زۆر دیوی پەنهانی مرۆڤ قەناعەت پێ بێنی؟! هەرگیز ئەوە ناگونجێ، بۆیە: ﴿ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴾، یانی: بە ملکەچیی وەرن، بە تەبایی و ئاشتییانە وەرن و، ناچارم مەکەن هێز بەکاربێنم، بۆ هاتنە سەرتان، نەك بۆ شەڕ، بەڵکو بۆ ئەوەی بە تەبایی و لە باریی پەیامی خوات پێبگەیەنم، من پەیامێکی خوام پێیەو، تۆ شاژنێکی وڵاتێکت بە دەستەوەیە، وەرە ئەو پەیامەی خوام لێ وەربگرە، وەرە

---

(١) بۆ نموونە بڕوانە: التحرير والتنوير: ج١٩، ص٦٠، التفسير الكبير للرازي: ج٢٤ ص (١٧٩)، (المختصر في تفسير القرآن الكريم: ص (٣٧٩)، جامع البيان للطبري: ج١٩، ص١٥٢.

با دیالۆگ و وتوێژ بکەین، داخۆ قەناعەتت دێ، یان نا، بە بەڵگە؟ هەر ئەوە شایستەی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هەر ئەوەش مانا ڕاستەکەیەتی، بە بەڵگەی ئەوەش کە لە کۆتاییدا شاژن دەڵێ: ﴿ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾، پەروەردگارم! من ستەمم لە خۆم کردوە، واتە: لە ڕابردوودا، ستەمم لە خۆم کردوە کە مسوڵمان نەبووم، ئێستاش لەگەڵ سولەیماندا بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان ملکەچ دەبم و مسوڵمان دەبم، واتە: دوای دیالۆگ و دیتنی موعجیزەکانی سولەیمان، لە کۆتاییدا مسوڵمان بووە، نەك بە نامە ناردنەکە.

ئنجا شاژن لەسەر ڕاوێژکردنی خۆی بە بڕیار بە دەستانی وڵاتەکەی، بە قسە ڕۆیشتووەکانی کۆڕو مەجلیسەکەی بەردەوام دەبێ:

٩)- ﴿ قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي ﴾، شاژن گوتی: ئەی دەستڕۆیشتووان و ئەوانەی چاوو دڵی خەڵك پڕ دەکەن، لە سام و ڕێز! لە بارەی کارەکەمەوە، ڕای خۆتانم پێ بڵێن، (الإفْتَاءُ: الإخْبَارُ بِالفَتْوَى وَهِيَ إزَالَةُ مُشْكِلٍ يعرَض)، (إفتاء) بریتیە لە هەواڵدان بە فەتوا، (فتوى)ش بریتیە لە لابردنی گرفتێك کە هاتۆتە پێش، کە دەڵێ: ﴿ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي ﴾، (الأَمْرُ: الحَالُ المُهم)، (أمر) حاڵێکی گرنگ، کە خەفەت بەخش بێ بۆ مرۆڤ، واتە: وابکات کە گرنگیی پێ بدات و خەفەتی بۆ پەیدا بکات، ئنجا ئایا بۆچی شاژن دەڵێ: لە بارەی کارەکەتانەوە ڕای خۆتانم پێ بڵێن؟

١٠)- ﴿ مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴾، من عادەتم نەبووە، بڕیاری یەکلاییکەرەوە لە کارێك بدەم، تاکو ئێوە ئامادە نەبن، یانی: من هیچ کارێکم نەکردوە، تاکو ئێوە ئامادە نەبن، یانی تاکو ئێوە ڕازی نەبن، لەو بڕیارەدا کە یەکلایی دەکەمەوە، ئنجا چ بە قسەکردن بێ، چ بە بێ دەنگ بوون، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەو شاژنە شاژنێکی عاقڵ بووەو، ئەوەی کە ئێستا پێی دەڵێن: حوکمی دیموکراسیی، حوکمی خەڵك، ئەو دەستڕۆیشتووان (ملأ)ە، کە بە دەوریەوە بوون، کە نوێنەرانی خەڵك بوون، وەك چۆن ئێستا

پەرلەمان هەیە، ئەنجوومەنی نوێنەران هەیە لە وڵاتانی ئێمەدا، لە وڵاتانی دیکەدا کۆنگرێس هەیەو، ئەنجوومەنی پیران هەیەو ئەنجومەنی لۆردات هەیە، دۆما هەیەو، کنێست هەیە، ئەو شاژنەش دیارە بەو شێوە حوکمڕانیی کردوە، وەك من لەو دیبەیتەی لەگەڵ کاك مەلا بەختیاردا کردوومە، بە ناوی: (دیموکراسیی و سیکۆلاریزم لە ئەزموونی کوردستاندا)، گوتوومە: ئێمە لە قورئاندا نموونەی گەڕانەوە بۆ حوکمی گەل و ڕای خەڵکمان هەیە، ئەوەتا خوا ﷻ باسی ئەو شاژنە دەکات، کە سەرەنجامیشی سەرەنجامێکی خێرە، چونکە سەرەنجام لەگەڵ سولەیماندا دێتە نێو ئیسلامەوە، کەواتە: پرس و ڕا کردن بە خەڵك، لە ڕاستییدا مرۆڤ بەرەو ڕاستیی دەبات.

بە پێچەوانەوەش: خوا ﷻ کە لێرەدا مەدحی ئەو ئافرەتە دەکات و بە شێوەیەك دەیگێڕێتەوە کە دەبێتە مەدح و ستایش بۆی، لە چەندان ئایەتی قورئاندا، زەم و سەرزەنشتی فیرعەون دەکات، ئەو ئافرەتە دەڵێ: ﴿مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ﴾، من هیچ بڕیارێکم نەداوە، لە ڕابردوودا تاکو ئێوە ئامادە نەبن، ئایا ڕاتان چییەو ڕای خۆتانم پێ بڵێن، ڕاوێژیان پێ دەکات، بەڵام فیرعەون دەڵێ: ﴿مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٢٩﴾غافر، واتە: هەر ئەوەتان پێ دەڵێم کە خۆم بەڕاستی دەزانم و، هەرچی منیش دەیڵێم، بەس بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنماییتان دەکەم، واتە: فیرعەون خۆ سەپێن بووە، ڕای خۆی پێ پەسند بووە، خواش ﷻ سەرزەنشتی دەکات، دەشزانین کە سەرنجامی فیرعەون چۆن بووە؟ سەرەنجامی ئەو شاژنەش چۆن بووە؟ کەواتە: خوا ﷻ لە قورئانەکەی خۆیدا پێمان دەفەرموێ: وەك فیرعەون مەکەن، بڵێن بەس ڕای خۆمان پێ پەسندەو، ڕای خەڵکتان پێ هیچ نەبێ و، خۆتان بە پەرستراوو پەروەردگار بزانن و، خەڵکتان پێ خزمەتکارو کۆیلەو بەردەست و ژێر دەست و کەودەن و نەفام بێ و، پێتان وا بێ پێویست بەوە ناکات و شایستەی ئەوە نین، پرس و ڕایان پێ بکەن! ئەگەر وەك فیرعەون بن و ئاوا بیربکەنەوە، سەرەنجامیشتان وەك هی فیرعەون دەبێ، نەخێر وەك شاژنی سەبەء بن، بەڵێ ئافرەتێکە، بەڵام تەماشای ڕەگەزەکەی مەکەن، تەماشای نێوەڕۆك بکەن، مرۆڤەکان بە ڕەگەزو ناوونیشان بەرزو نزم نابن، بەڵکو پێوەری مرۆڤ بە نێوەڕۆك و کردەوەیە، تەماشا

بکەن ئەو ئافرەتە چەندە سەر ڕاست بووە، چەندە لێزان بووە، کە بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕای ئەنجوومەنی بڕیاردان لە وڵاتەکەیدا، هیچ بڕیارێکی نەداوەو، هەر بابەتێك، پێویستیی بە ڕاوێژکردن بێ، هەڵینەبڕیوەو یەکلایی نەکردۆتەوە.

١١)- ﴿ قَالُوا۟ نَحۡنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأۡسٍ شَدِيدٍ ﴾، بڕیار بە دەستان (مَلَأ) گوتیان: ئێمە خاوەنی، هێزین و خاوەنی زەبری توندیشین، واتە: هەم هۆکارەکانی جەنگمان هەن، هەم زەبرو زبرییشمان هەیە، چونکە هەیە هۆکاری جەنگی هەیە، بەڵام غیرەتی نیەو، توانای جەنگی نیە، یاخود مەشق و ڕاهێنانی نەکردوە، بەڵام گەلی سەبەء گوتوویانە: ئێمە هەم لە ڕووە ماددییەکەیەوە، هۆکارەکانی جەنگمان هەن، هەم لە ڕووی مەعنەوییشەوە، ئازایەتیی و غیرەت و خۆڕاهێنان و مەشق لەسەر چەکیشمان هەیە.

١٢)- ﴿ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ ﴾، کارەکەش بۆ تۆ دەگەڕێتەوە، واتە: بڕیاری کۆتایی بە دەست تۆیە.

١٣)- ﴿ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴾، بۆ خۆت سەرەنج بدەو ڕامێنەو هەڵیسەنگێنە، بزانە داخۆ فەرمانت بە چیی دەبێت! واتە: بە جەنگ، یاخود بە ئاشتیی؟

تەماشا ئەو ئافرەتە بکەن! تاکو لێی ورد دەبیەوە، عەقڵ و فامیدەیەیی تێدا دەبینی.

١٤)- ﴿ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا ﴾، وا دیارە شاژن زۆر شارەزای مێژووو شارەزای حوکمی پادشایان و وڵاتان بووە، دەڵێ: بە دڵنیایی پادشایەکان ئەگەر بچنە ئاوەدانییەکەوە، تێکیدەدەن.

١٥)- ﴿ وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةً ﴾، پادشایەکان خەڵکی ئاوەدانییەکان ئەوانەی عەزیزو باڵادەستن، زەبوونیان دەکەن، واتە: ئەوانەی کار بەدەست و حوکمڕان بوون لەو شارو ئاوەدانییانەدا.

١٦)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴾، عادەتیشیان وایە بەو شێوەیان کردوەو، هەر واشدەکەن، واتە: بەپێی ئەزموونی من: پادشاو حوکمڕانەکان، هەروایانکردوە و هەرواشدەکەن، ئنجا

ئەگەر ئێمە بەشەڕ بێین لەگەڵ سولەیمان دا، ئەگەری ئەوەی هەیە بەسەرماندا زاڵ بێت و بێتە وڵاتەکەمانەوە، ئنجا کە بێتە نێو وڵاتەکەمانەوە، وەك عادەتی پادشایان تێکیدەدات و کاولی دەکات و، ئەو خەڵکەش کە باڵادەستی تێیدا[1]، مەبەست پێیان ئەو بەرپرسانەیە کە حوکمڕان بوون، ئەوانەش زەبوون دەکات، عادەتیشیان وایەو هەر واشدەکات، واتە: هەم حوکمڕانەکان دوور دەخاتەوەو، هەم پاسایەکان دەگۆڕێ و، هەم ماڵ و منداڵ و خەڵکەکەش بە کۆیلەو بە دیل دەگرێ و بە تاڵان دەیانبات، لێرەدا بە تەئکید شاژنی سەبەء (مَلِكَةُ سبأ)، بەپێی ئەزموونی خۆی و شارەزایی خۆی قسە دەکات، واتە: پادشایانم هەر وا بینیون، ئنجا ئەمە ڕێ خۆشکردنە بۆ ئەو بڕیارەی دوایی دەیدات، یانی: ئەگەر سولەیمان پادشا بێ و، لەو حوکمڕانانە بێ کە ئێمە ناسیومانن، ئەگەر بێتە وڵاتەکەمانەوە، بەو شێوەیە دەکات، بۆیە:

١٧)- ﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ﴾، من نێرەری دیارییەك دەبم، بۆ لایان، (إِلَيْهِم) بۆ لایان ڕاناوی کۆ بۆ سولەیمانە، واتە: من دیارییەك بۆ سولەیمان دەنێرم، بەڵام بە ڕێزەوە ناوی دێنێ، بێگومان کە دیارییەکە دەنێرێ، بەس ئەوە نیە کە یەك قەتار وڵاخ بڕۆن: حوشترەو ئێسترەو هەرچی هەیە، بە زێڕو زیوو گەوهەرو مرواریی و شتی نایابەوە، بەڵکو نامەیەکیش دەنێرێ و نوێنەرێکیش دەنێرێ، دەچێ بۆ لای سولەیمان و، دەڵێ: ئەوە نامەی شاژنە، ئەو دیارییانەشی بۆ ناردووی و، ئەوەش نامەکەیەتی، بەڵام خوای زاناو شارەزا ئەوە هەمووی کورت دەکاتەوە، چونکە ئەوەی بەلای شاژنەوە گرنگ بووە، نامەو نوێنەرەکە نەبووە، بەڵکو دیارییەکە بووە، چونکە دەیەوێ سولەیمان تاقیبکاتەوە، ئایا پادشاییەکە، بە دوای موڵك و ماڵ و ساماندا وێڵە، ئەگەر وایە با بۆی نەیەت بۆ (سبأ)و وڵاتەکەشمان کاول بکات و، وڵاتەکە غارەت بکات و تاڵانی بکات، بەڵکو ئەوەتا خۆمان سامان و دیاریی و خەڵاتێکی چاکی بۆ دەنێرین.

وشەی (هَدِيَّة) بە پێی سیاق و سەلیقە ئەوە دەزانرێ، یانی: شاندێك دەنێرین، کە هاوڕێ بێ لەگەڵ نامەیەك و لەگەڵ دیارییەکیشدا، دیاریی (هَدِيّة)یش بریتیە لەوەی دەدرێ بە کەسێك، بە مەبەستی خۆ لێك نیزیك کردنەوەی و خۆ لەلا

---

(١) أعزة أهلها: أهلها الأعزة، الأعزة: جمع عزيز، يانى: باڵادەست و کاربەدەست.

خۆشەویست کردنی.

١٨)- ﴿فَنَاظِرَةٌۢ بِمَ يَرْجِعُ ٱلْمُرْسَلُونَ﴾، ئنجا چاوەڕێ دەکەم، بزانم نوێنەران بە چی دەگەڕێنەوە، لێرەوە دەزانین کە شاژن کە دیارییەکە دەنێرێ، بە نوێنەراندا دەینێرێ، دەڵێ: بزانم نوێنەران و نێردراوان، بە چ وەڵام و ئەنجامێکەوە دەگەڕێنەوە! (فَنَاظِرَةٌ: إِسْمُ فَاعِلٍ، نَظَرَ بِمَعْنَى انتَظَرَ)، واتە: (ناظرة) ناوی بکەرە لە (نظر)ەوە هاتوە، یانی: چاوەڕێی کرد، چاوەڕێ دەبم، بزانم ڕەوانە کراوان و نێردراوان بە چی دەگەڕێنەوەو، چ ئەنجامێکم بۆ دێننەوە؟

ئەمە لێی وەردەگیرێ کە ئەو شاژنە زۆر عاقڵ و فامیدەو لێزان بووە، ویستوویەتی سولەیمان تاقی بکاتەوە: ئەگەر پادشایەك بێ، وەك ئەو پادشایانەی دیکە، کە بە دوای غارەت و تاڵان و کۆکردنەوەی ماڵ و ساماندا دەگەڕێ، ئەوە دیارییەکە قبووڵ دەکات، بۆیە ئەگەر دوای قبووڵکردنی ئەو دیارییە، تەماعی شەڕو شۆڕی بوو، خۆی بۆ ئامادە دەکات، بەڵام ئەگەر وەك لە نامەکەیدا دەبینرێ، پێغەمبەری خوا بێ، کە خوا بە کورتیی و پوختیی گێراویەتەوە، ئەگەرنا حەتمەن لە نامەکەدا گوتوویەتی: من پێغەمبەری خوام و، پەیامی خوام بۆ هاتوەو، تۆ وەرە لەگەڵم بدوێ، با ئەو پەیامەی خوات پێڕابگەیەنم و، پێی قەناعەت هاتوو، (مُقْتَنِع) دەبی، بەڵام ئەگەر واشبێ پێغەمبەری خوا بێ، چاوی لە تاڵان و دەستکەوت و سامان نیەو، هەر سوور دەبێ لەسەر داواکارییەکەی خۆی کە بچم و گوێی لێ بگرم و، پەیامەکەی خوام پێبگەیەنێ.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**بردنی دیارییەکەی شاژن، بۆ سولەیمان ﷺ و، قبووڵنەکردنی و، هەڕەشەکردنی کە ئەگەر نەیەن بۆ گفتوگۆی تەبایانە، سوپایان بۆ دەبات، پاشان دوایی بڕیاردانی شاژن بەسەردان کردنی بۆ لای سولەیمان و، داواکردنی سولەیمان کە بەر لەوەی خۆی بێت، یەکێک تەختەکەی بۆ بێنێ و، هێنانی لە لایەن ئەوکەسەوە کە زانیاریی لە کتێبی ئاسمانیی لەلایە، لە چاوترووکانێکدا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاءَ سُلَيْمَانَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّا آتَاكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ارْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَا أَذِلَّةً وَهُمْ صَاغِرُونَ ﴿٣٧﴾ قَالَ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ الَّذِي عِندَهُ عِلْمٌ مِّنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە حەفدە بڕگەدا:**

١)- ﴿فَلَمَّا جَاءَ سُلَيْمَانَ﴾، کاتێك شاندو نوێنەرەکان هاتنە لای سولەیمان، **(فَلَمَّا جَاءَ الْمُرْسَلُون، أو الوَفْدُ سُلَيْمَانَ)**، یانی: کاتێك نوێنەرانی شاژن، یان: شاندەکە هاتە لای سولەیمان، ئەمە بەچی دەزانین؟ لە کاتێك دا کە ڕستەی: ﴿فَلَمَّا جَاءَ سُلَيْمَانَ﴾، وشەکانی: (رَسُول، مُرسَلُون، وَفد)، نەهاتوون؟! بە بەڵگەی قسەکەی شاژن ئەوە دەزانین، کە دەڵێ: ﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ ﴿٣٥﴾﴾، من دیارییەکیان بۆ دەنێرم و چاوەڕێ دەکەم، بزانم ڕەوانەکراوان چ ئەنجامێك دێننەوە، کەواتە: لەوەوە دەزانین، کە ئەو ڕەوانەکراوەو نێردراوانە ئەوانە بوون، کە چوون بۆ لای سولەیمان ﷺ.

۲)- ﴿ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ ﴾، سولەیمان گوتی: ئایا بە ماڵ و سامان هاوکاریی من دەکەن؟! دیسان لێرەدا خوای زاناو توانا قسەکان زۆر کورت و پوخت دەکاتەوە، چونکە یەکێك لە ڕووە زۆر گرنگەکانی ئیعجازی قورئان، بریتیە لە بە کورتیی (إیجاز) فەرمایشتکردن و، باس نەکردنی ئەو شتانەی کە پێویست ناکات باس بکرێن و، بە سیاق و سەلیقە دەزانرێن، هەر دیارە کە نوێنەرەکە دەچێ بۆ لای سولەیمان و دەڵێ: ئەوە دیاریی و خەڵاتەکانن کە شاژن بۆی ناردووی و، نامەکەی وێدەداو، لێی حاڵیی دەکات و، دیارییەکانی پێشان دەدات، ئەوە هەمووی دەپێچرێتەوە، (أَتُمِدُّونَنِ) ڕاناوی کۆی بۆ شاژن بەکارهێناوە، واتە: ئایا ئەی شاژن! ئەی بڕیار بە دەستانی وڵاتی (سبأ)، ئەمە پرسیارلێکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، ئایا ماڵ و سامان دەدەن، بە من، هاوکاریی من بە ماڵ و سامان دەکەن، دیاریی و خەڵاتی ماڵ و سامانم دەدەنێ؟ وشەی: (أَتُمِدُّونَنِ)، خوێندراویشەتەوە: (أَتُمِدُّنِّ) واتە: دوو نوونەکان تێکدا دەغم کراون.

۳)- ﴿ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم ﴾، ئەوەی خوا بە منی داوە، زۆر چاکترو زیاترە لەوەی بە ئێوەی داوە.

٤)- ﴿ بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴾، بەڵکو ئێوە بە دیارییەکەی خۆتان دڵخۆشن، واتە: ئەم دیارییە، لە چاوی ئێوەدا، شتێکی گەورەو گرنگە، بەڵام لە لای من، شتێکی کەم بایەخ و بچووکە، چونکە:

یەکەم: ئیمکانیەت و توانای ماددیی زۆرم هەیە.

دووەم: من لایەنی ماددیی ژیانی دنیام پێ شتێك نیە، تاکو بایەخیی پێ بدەم و، بە دواییدا وێڵ و عەوداڵ بم.

هەڵبەتە سولەیمان کە ئەو دیارییەی ڕەتکردۆتەوە، بەو ئیعتیبارە ڕەتی کردۆتەوە، کە وەك بەرتیل (رشوة) بووەو، ئاوا هاتۆتە بەر چاوی، یاخود وەك بەرتیل و جێگرەوە بۆ وەرگرتنی هیدایەتی خواو، گەیاندنی هیدایەتی خوا بە شاژن و بە خەڵکی (سبأ)، دیارە ئەوانەش کە خاوەن مەبدەئن، مەبدەئەکانیان بە پارەو سامان ناگۆڕنەوەو بازرگان نین، چۆن زیاتر قازانج بکەن وابکەن و، چۆن

زیاتریان دەست بکەوێ، وابکەن، بەڵکو مەبەدەنیین و دەیانەوێ مەبەدەنەکانیان بچەسپێنن و، بکەیەنن، بۆیە سولەیمان دەڵێ:

٥)- ﴿ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا ﴾، (ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ): ئەی نوێنەر! بگەڕێوە بۆ لایان، واتە: بگەڕێوە بۆ لای شاژن، بەڵام بەڕێزەوە ناوی دێنێ، پادشاو حوکمڕانان عادەتیان وابووە، بە ڕێزو حورمەتەوە ناوی یەکدی بێنن، ﴿ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا ﴾، بە دڵنیایی سوپایەکیان بۆ دێنین، سەربازانێکیان بۆ دێنین، کە نەتوانن بەرهەڵستیی ئەو سوپایەو سەربازانە بکەن.

(القِبَلُ: الطَّاقَةُ وَأَصْلُهُ المُقَابَلَةُ، فَأُطلِقَ عَلَى الطَّاقَةِ، لأَنَّ الَّذِي يُطيقُ شَيْئاً يثبُتُ لِشَيءٍ يُقَابِلُهُ)، (لا قِبَل لَهُم)، وزەو توانایان بەسەریدا ناشکێ، کە لە ئەصڵدا لە بەرانبەر (مقابلة)ەوە، هاتوە، بەڵام (قِبَل) بۆ تواناو وزە بەکارهاتوە، چونکە کەسێك شتێك بتوانێ، لە بەرانبەری دا دەچەسپێت و ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

٦)- ﴿ وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴾، بە دڵنیایی لەوێ بەزەبوونیی دەریان دەکەین، لە حاڵێك دا کە داماوو ملکەچن، ڕاناوی (ها) بۆ شارەکە دەچێتەوە، کە شاری (مَأرِب) و، پایتەختی (سبأ) بووە، واتە: لە پایتەخت و شارەکە کە کردوویانە بە چەقی حوکمڕانیی لەوێ دەریان دەکەین و، وە دەریان دەنێین بە زەبوونیی، ﴿ وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴾، لە حاڵێکدا کە دەستەپاچەو هیچ لە دەست نەهاتوون، ئەگەر ئێمە بە سوپاوە بچین و لەگەڵمان بە شەڕ بێن و تێکبگیرێن، سەرەنجامی شەڕو تێکگیرانەکەیان لەگەڵ ئێمەدا، هەر تێکشکانە بە مسۆگەریی، سولەیمان ﷺ زۆر لە خۆی و سوپایەکەی خۆی ڕابینیوەو، دڵنیا بووە، بۆیە ئەگەری ئەوەی دانەناوە کە ئەوان بەسەریان دا زاڵ دەبن، بەڵکو هەر یەکسەر فەرموویەتی: لە شارەکەیان دەریان دەکەین بە ملکەچیی، لە حاڵێکدا کە زەبوونن و، دەستەپاچەو هیچ لە دەست نەهاتوون.

وشەی (صَاغِر) من پێم وایە بە مانای زەبوون نایەت، چونکە پێشێ (أَذِلَّة) ی بەکارهێناوە، کە کۆی (ذَلِيل)، بەڵام (صَاغِر) بە مانای دەستە پاچەو هیچ

لـە دەسـت نەهاتـوو، دێ، چونکـە (إسْمُ فَاعِـل)ە، لـە (صَغُـرَ) واتـە: بچـووك بـوو، نابـووت بـوو، هەرچەنـدە (صَغُـرَ) یـان بـە (ذَلَّ) لێکداوەتـەوە، بـەڵام چاوگەکـەی: (صَغَارٌ)، یـانی: دەسـتەپاچەیی و، هیـچ لـە دەسـت نەهاتوویـی و، هیـچ پێنەکـران لـە بەرانبـەر ئـەو کەسـەدا، کـە هاتۆتـە ڕووبـەڕووی.

ئنجا لێـرە دیسـان ئـەوە هەمـووی پێچراوەتـەوە: کە شـاندەکەی شـاژن چوونەوەو، دیاریـی و خەڵاتەکەیـان بـردەوە بـۆ لای شـاژن، دیـارە پەیامەکـەی سولەیمانیشـیان پێگەیانـدوە، بۆیـە ئـەوە دەپێچرێتـەوە، کـە شـاژن، نامـە، یـان نوێنـەر دەنێرێتـەوە، کـە: باشـە ئێمـە دێیـن، بـۆ وتوێـژ، بـە شـێوەیەکی ئاشـتییانە دێیـن و پێویسـت نـاکات تـۆ سـوپاو سـەربازان بێنـی، ئـەوە هەمـووی دەپێچرێتـەوەو یەکسـەر دەڵـێ:

٧)- ﴿قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ﴾، ئەی دەستڕۆیشتووان و بڕیار بە دەستانی کۆڕو مەجلیسەکەم! کامتان تەخت و کورسیەکەیم بۆ دێنێ، بەر لەوەی بەملکەچیی بێنەلام؟ (عَرْش) وەك گوتمان، ئەو کورسیی و تەختەیە کە حوکمڕان لەسەری دادەنیشێ، یانی: ئەی بڕیار بەدەستان! کامتان کورسیی و تەختەکەیم بۆ دێنێ، پێش ئەوەی بە تەبایی بێن؟ کورسی و تەختەکەیم بۆ بێنن، تاکو کە هات سەری سوڕبمێنێ، کە چۆن کورسیی و تەختەکەی، کە بەس خوا دەزانێ چەند ژووری لەسەر داخستوون و، لە چ قەڵایەکی مەحکەم دابووەو، چەند سەربازو پاسەوان و ئێشکچیی هەبوون، ئەدی چۆن سولەیمان پێش خۆی کورسی و تەختەکەی بگەیەنێتە وێ؟! لێرەدا کە دەفەرموێ: (قبل أن يأتوني مسلمين) زۆربەی توێژەرەوانی قورئان پێشتریش ئاماژەمان پێدا، دیسان وایان لێکداوەتەوە، بەر لەوەی شاژن بە مسوڵمانەتیی بێ بۆ لام، لە ڕستەی: ﴿يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ﴾دا، ڕاناوی کۆی بەکارهێناوە، بەڵام لە هەر مەبەست پێی شاژنە، بەڵام بۆ ڕێزو حورمەت، بەکارهاتوە، بەڵام دیسان مەبەست ئەوە نیە کە بە مسوڵمانەتیی بێ، چونکە جارێ ئەصڵەن نەهاتوەو، پەیامی خوای پێنەگەیوەو، نازانێ ئیسلام چییە، ئنجا جارێ کە نازانێ ئیسلام چییە، چۆن مسوڵمان بوەو، چۆن ئیسلامی قبووڵ کردوە؟ نەخێر، (مُسْلِمِينَ)، یانی: (خَاضِعِيْن)، یانی: بە ملکەچیی و بە تەبایی و بە ئاشتییانە و بە (مُسَالِم)یی.

٨)- ﴿ قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ ﴾، عفریتێك لە جینن گوتی، (عِفْرِيْتٌ: الشَّدِيْدُ الَّذِي لَا يُنَالُ وَلَا يُصَابُ فَهُوَ يُتَّقَى لِشَرِّه)، (عِفْرِيْت) تەفسیرەکان بە زۆر شێوە لێکیان داوەتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە، لێرە دەڵێ: ئەو بە هێزەیە کە کەس ناتوانێ زەبری لێ بدات و، کەس پێی ناوێرێ، بۆیە خۆ لە خراپەی دەپارێزرێ، هەندێکی دیکە گوتوویانە: ئەو کەسەی زۆر خراپەکار بێ و، زۆریش بە زەبر بێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە (عفریت) جۆرێکە لە جینن، کە زۆر بە توانایەو، تواناکەشی زیاتر لە خراپەدا بەکاردێنێ، بەڵام ئەو عیفریتەی لە سوپای سولەیماندا بووە، ملکەچ بووە بۆ چاکەو، تواناو وزەکانی بەکارهێناون، بە فەرمانی سولەیمان.

٩)- ﴿ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ ﴾، (عفریتێك لە جند گوتی:) من تەخت و کورسییەکەیت بۆ دێنم، پێش ئەوەی لە شوێنی خۆت هەڵسی.

ئەم ڕستەیەش دوو واتای هەن:

یەکەم: واتە: کە دادەنیشی، پێش ئەوەی هەڵسی، یانی: چەند چرکەیەك و چەند خولەکێکی پێدەچێ.

دووەم: کە زیاتر پێدەچێ ئەوە مەبەست بێ: سولەیمان ﷺ عادەتی وابووە، کە پێش نیوەڕۆیان دانیشتووەو نیوەڕۆیە هەڵساوە، بۆ دادوەریی و حوکمڕانیی دانیشتووەو خەڵك موراجەعەی پێکردوە، بۆ وێنە: لە سەعات هەشت (٨)ی بەیانییەوە، یان زووتر دانیشتوەو نیوەڕۆ هەڵساوە، واتە: بە چەند سەعاتێك بۆت دێنم، کە ماوەی چەند ڕۆژە ڕێیەکە، لە یەمەنەوە بۆ شام.

کە دەفەرموێ: ﴿ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ ﴾، لەو بارەوەش ئەم شوێنەوارە دێنین: (قَالَ السُّدِّيُّ وَغَيْرُهُ: كَانَ سُلَيْمَانُ يَجْلِسُ لِلْقَضَاءِ، وَالْحُكُومَاتِ، وَلِلطَّعَامِ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ إِلَى أَنْ تَزُوْلَ الشَّمْسُ)[1].

---

(١) تفسير القرآن العظيم: لابن كثير، ج٣، ص٣٦٣.

واتـە: سـوددیی و غەیـری ئەویـش گوتوویانـە: سـولەیمان ﷺ بـۆ دادوەریـی و بـۆ چارەسـەری کێشـەی خەڵـك و بـۆ نـان خـواردن، لـە سـەرەتای ڕۆژەوە تاکـو خـۆر لای دەداو بـەلای خـۆر ئـاوادا، تاکـو دوایـی نیـوەڕۆ، دادەنیشـت. کەواتـە: کـە گوتوویـەتی: ﴿ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ ﴾، واتـە: کـە دانیشـتی پێـش ئـەوەی هەڵـسی، واتـە: لـە چێشـتەنگاوەوە تاکـو لای نیـوەڕۆ، مـن ئـەو کورسـیی و تەختـەت، بـۆ دێنـم.

١٠)- ﴿ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ ﴾، من لەسەر هێنانی ئەو کورسیی و تەختەش، هەم بەهێزم، هەم ئەمینداریشم، واتە: بەهێزم لەسەر هەڵگرتنی و، ئەمینداریشم لەسەر پاراستنی کە دەستکاریی نەکرێ و، ئەگەر شتێکی لەسەر بێ، بە هەر شێوەیەك دانراوە، دەیهێنم.

سـولەیمان ﷺ ئـەوە بـاس نەکـراوە، بـەڵام وادیـارە پێـی زۆر بـووەو، چەنـد سـەعاتێك زۆرە، ئـەو کورسـیی و تەختـە لـە یەمەنـەوە بگاتـە شـام، کـە لـە ڕاسـتییدا ئێسـتا لـەم سـەدەی بیسـت و یـەکی زایینـی و، سـەدەی پـازدەی کۆچییشـدا، بـە چەنـد سـەعاتێك شـتێك لـە یەمەنـەوە بهێـنرێ بـۆ شـام، هـەر زۆر نیـە، بـەڵام دیـارە سـولەیمان ﷺ خـوا ﷻ توانایـەکی زۆر سەرسـوڕهێنەری پێـداوە، بۆیـە پێـی زۆر بـووەو، داوای کـردوە کـە دەمـەوێ خێراتـر بـێ، بـۆ لام.

١١)- ﴿ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، ئەو کەسە کە زانیاریی لە کتێبی لە لا بوو، گوتی:

١٢)- ﴿ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ﴾، من بۆتی دێنم بەر لەوەی کە چاوت بگەڕێتەوە بۆ لات، واتە: کە تەماشای شتێك دەکەی و سەرنجی دەدەی، پێش ئەوەی چاوتی لەسەر لابدەی، دەیهێنم بۆ لات.

یاخـود (طَـرْف) بـە مانـای (جَفْـن) پێڵـووی چـاو، دێ، یـانی: کـە چـاوت دەکەیـەوە، پێـش ئـەوەی چـاوت بترووکـێ، بـە چاوتروووکانێـك بـۆت دێنـم، واتـە: لـە چەنـد چرکەیەکـدا، نـەك لـە چەنـد خولەکێکیـش دا، لـە چەنـد چرکەیەکـدا بـۆت دێنـم.

ئنجا لێرەدا زانایان زۆر مشتومڕیان بووە، لەوبارەوە کە: دەبێ ئەوە کێ بێ، ئەو توانا لە ڕاددەبەدەرەی هەبووەو، ئەو توانا یاسادڕ (خَارِق العَادة)یەی هەبووە؟

أ- هەندێك گوتوویانە: (آصَفِ بْنِ بَرْخِيَا)یە، کە لە بەنوو ئیسرائیل بووەو، سولەیمان خۆشی لە بەنوو ئیسرائیل بووە، کە لەبارەیەوە گوتراوە: (كَانَ صِدِّيْقاً يَحْفَظُ اسْمَ اللهِ الأَعْظَم)، زۆر بڕوا پتەو بووەو، ناوی هەرە مەزنی خوای لەبەر بووە.

ب- هەندێك گوتوویانە: کەسێکی زانا بووە، بە کتێبی خوا ﷻ.

ج- هەندێکی دیکە گوتوویانە: هەر سولەیمان خۆی بووە، بۆ وێنە: (الشعراوي) لە (خواطر)ەکەی خۆیدا[1] وایگوتوە.

بەڵام زۆربەیان دەڵێن: (آصَفِ بْنِ بَرْخِيَا) بووە، بۆ نموونە: تەفسیری (إبن الكثير)، [2] تەفسیرەکان هەموویان لەو بارەوە ڕا جیاییان هەیە، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: (آصف بن برخيا) بووە.

منیش دەڵێم: خوا ﷻ هیچی نەفەرمووە، ڕوونی بکاتەوە کێ بووە، پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە هیچ شتێکی بە سەندێکی ڕاست لێ نەگێڕدراوەتەوە، بۆیە ڕاسترو چاکتر وایە، بڵێین: خوا تەنیا ئەوەندەی فەرمووە، ئەو کەسەی زانیاریی لە کتێب، لە لابوو، کە مەبەست پێی کتێبی ئاسمانییە، ئەو کەسەی زانیاریی لە کتێبی ئاسمانیی لە لا بوو، ئاوای گوت و ئاوای کرد، بەڵام کێ بوو؟ دیارنییە، بەڵام بە دڵنیاییی کەسێك بووە لە نیزیکانی سولەیمان و، لە کاربەدەستانی و، لەوانە بووە کە لە کۆڕو مەجلیسەکەیدا بوون و، لەوانە بووە کە کاروبارەکانی بۆ ڕاپەڕاندوون، وەك ئەنجومەنی وەزیرانی ئێستا، واتە: یەکێك بووە لەوانەی زۆر لە سولەیمان نیزیك بوون و، زۆری تێڕابینیوە، بەڵام ئەوە کە سولەیمان بۆ خۆی بوو بێت، هەرچەندە هەندێك لە تەفسیرەکان وایانگوتوە، بەڵام ئەوە

---

(١) ج١٧، ص١٠٧٨٥.

(٢) ج٢، ص٣٦٤.

ناگونجێ، چونکە دەڵێ: (أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ)، من بۆی دێنم، یانی: دواندن لەگەڵ سولەیمان دەکات، ئنجا سولەیمان چۆن بە خۆی دەڵێ: بۆی دێنم؟! هەندێك لە ڕوونکەرەوان خوا لێیان ڕازی بێ، ڕەنگە باش سەرنجی عیبارەتەکەیان نەدابێ، ئەگەرنا نینسان بۆ خۆی ناڵێ من بۆی دێنم، ﴿ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ ﴾، ئنجا ئەگەر وابووایە، خوا ﷻ: یەکسەر دەیفەرموو: (قَالَ سُلَيْمَانُ أَنَا ءَاتٍ بِهِ)، سولەیمان فەرمووی من بۆ خۆم دەیهێنم، ئنجا نەشیدەفەرموو: ﴿ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَ ﴾، بەڵکو دەیفەرموو: (قَبلَ أَنْ يَرتَدَّ إِلَيكُم طَرْفُكُم)، پێش ئەوەی چاوتان بگەڕێتەوە لاتان، بە چاوتروکانێك دەیهێنم! بێگومان سولەیمان نەبووە، چونکە سولەیمان پێغەمبەری خوا بووەو حوکمڕان بووەو، حوکمڕانیش عادەت نیە بۆ خۆی شتەکان بکات، بەڵام کەسێك بووە کە نیزیك هاوکاری سولەیمان بووەو، بەردەستی بووەو کار ڕاپەڕێنەری بووە.

١٣)- ﴿ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ ﴾، ئەوە هەموو دەپێچێتەوە کە چۆن بۆی هێنا؟ چونکە مادام بە چاوتروکانێك بێ، پێویست ناکات، درێژەی بدرێتێ: کاتێك سولەیمان تەختەکەی بینی لە لای خۆی، سەقامگیر بوو، ئامادە بوو.

١٤)- ﴿ قَالَ هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي ﴾، گوتی: ئەوە لە بەخششی پەروەردگارمە، کە بەو خێراییە ئەو تەختەم بۆ هات، لە یەمەنەوە بۆ شام.

١٥)- ﴿ لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُ ﴾، تاکو تاقیم بکاتەوە: ئایا سوپاسگوزاریی دەکەم، یاخود سپڵەیی دەکەم، چونکە سوپاسگوزرایی دەبێتە هۆی زیادبوون، وەك گوتراوە: (الشُّكْرُ قَيْدُ النِّعْمَةِ المَوْجُودَةِ)، سوپاسگوزاریی بەستنەوەیە بۆ ئەو نیعمەتەی کە هەیە، ناهێڵێ لە دەست بچێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡ ۝٧ ﴾ إبراهیم، واتە: بە دڵنیایی ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن، بۆتان زیاد دەکەم.

١٦)- ﴿ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦ ﴾، هەر کەسێك سوپاسگوزاریی بکات، سوودی سوپاسگوزارییەکە بۆ خۆیەتی.

١٧)- ﴿ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴾، هەر کەسێکیش سپڵەیی بکات، بە دڵنیایی پەروەردگارم بێ نیازی بەخشندەیە، بێ نیازە لە سوپاسگوزارییەکە، بەخشندەشە خەڵك سوپاسی بکات و نەکات، ئەگەر بیەوێ پێیان دەبەخشێ.

ئەوە کە سولەیمان ﷺ دیارییەکەی ڕەتکردۆتەوە، وەك گومان: لەبەر ئەوە بووە، کە ئەو بە بەرتیل (رشوة) لێی حاڵی بووە، ئەگەرنا دیاریی نابێ ڕەت بکرێتەوە، (الهدِيّة لا تُرَدُّ)، هەرچەندە ئەوە بەس قسەیەکی باوەو فەرموودە نیە، پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: {إِنِّي نُهِيتُ عَنْ زَبْدِ الْمُشْرِكِينَ} (أخرجه: أبو داود: ٣٠٥٧، والترمذي: ١٥٧٧، والبيهقي في الكبرى: ١٩٢٦٤).

واتە: من لێم قەدەغەکراوە دیاریی و بەخششی هاوبەش بۆ خوادانەران وەربگرم.

بۆ ئەوەی منەتبارو چاو بەرەژێریان نەبێت، کەواتە: سولەیمان ﷺ لەو ڕووەوە ئەو دیارییەی وەرنەگرتوە، ئەگەرنا دیاریی وەردەگیرێ.

**مەسەلەی شەشەم:**

**ئنجا بەر لەوەی شاژن (بلقیس)بێ، سولەیمان ﷺ گوتی: تەختەکەی دەستکاریی بکەن و بیگۆڕن، تاکو بزانین دەیناسێتەوە، یان نا؟ ئنجا کە هات و لێیان پرسی: ئایا تەختەکەی تۆ ئاوابوو؟ گوتی: دەڵێی ئەوە، سەرەنجام بە هۆی ئەوەوە کە لە خەڵکێکی کافر بوو، ملی نەدا بۆ خواپەرستیی و، سولەیمانیش کۆشکێکی هەبوو، زەوی حەوشەکەی شووشە بوو، شێوەی شەپۆلی ئاوی دەکرد، بۆیە (شاژن) لاقی هەڵکردن تاکو تەڕ نەبێ، سولەیمانیش پێی گوت: ئەوە کۆشکی شووشەییە، نەك ئاوی جۆگەلە، ئەویش لە ژێر کاریگەریی ئەو هەموو موعجیزانەدا مسوڵمان بوو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ ۖ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ ۚ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدْخُلِى ٱلصَّرْحَ ۖ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ ۗ قَالَتْ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا ﴾، سولەیمان گوتی: تەختەکەی بۆ نەناس، بکەن، لێی بگۆڕن، واتە: دەستکاریی بکەن، (**اجْعَلُوا الْعَرْشَ مُنْكَراً مُغَيَّراً عَنْ شَكْلِهِ، كَمَا يَتَنَكَّرُ الرَّجُلُ لِلنَّاسِ، لِئَلاَّ يَعْرِفُوْه**)[1]، واتە: تەختەکە نەناسراوو گۆڕدراو بکەن، لەو شێوەیەی کە لەسەریەتی، وەك چۆن پیاوێك خۆی دەگۆڕێ و نەناس دەکات، بۆ ئەوەی خەڵك نەیناسنەوە.

---

(١) التفسير الكبير، ج٢٤، ص١٨٢.

٢)- ﴿ نَنظُرۡ أَتَهۡتَدِيٓ ﴾، [تەختەكەی بۆ نەناس و دەستكاریی بكەن] ئنجا ئێمە سەرنج دەدەین: ئایا ڕێی ڕاست دەگرێ بۆ ناسینەوەی تەخت و كورسییەكەی؟

٣)- ﴿ أَمۡ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهۡتَدُونَ ﴾، یاخود لەوانە دەبێ كە ڕێی ڕاست ناگرن، واتە: ئایا دەیناسێتەوە، یاخود نایناسێتەوە؟ كورتەكەی ئەوەیە، بەڵام خوا ﷻ بەو تەعبیرە هێناویەتی، چونكە ئەوە موناسەبەتیشی هەیە، لەگەڵ هیدایەت وەرگرتن و هیدایەت وەرنەگرتنی دا، واتە: ئایا لەوەشدا هیدایەت وەردەگرێ، كە تەختەكەی بناسێتەوە، هێندە عەقڵ و سەلیقەی هەبێ، كورسیی و تەختەكەی خۆی بناسێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا كە دەستكاریی كراوە؟ ئنجا مەزندەی ئەوەی لێ دەكرێ، ئەو عەقڵ و سەلیقەیەی بیگەیەنێ بەوەش، كە هیدایەتی مەعنەوییش وەربگرێ و پەیامی خواش وەربگرێ و، خوا بناسێ و لەمەودوا تەنیا خوا بپەرستێ و خۆر نەپەرستێ.

ئەوە لە تەفسیرەكاندا باس نەكراوە - یان من نەمبینیوە - بەڵام من وای تێدەگەم، كە ئەمە ئاماژەیە بەوەش، كە ئەگەر لەمەدا هیدایەت وەربگرێ، مەزەندەی ئەوەی لێ دەكرێ، هیدایەتە مەعنەوییەكەش وەربگرێ، ئەگەرنا مانا ڕواڵەتییەكەی ئەوەیە: ئایا كورسی و تەختەكەی خۆی دەناسێتەوە، یان نایناسێتەوە؟

هەندێكیش گوتوویانە: ﴿ أَتَهۡتَدِيٓ أَمۡ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهۡتَدُونَ ﴾، واتە: ئایا بەهۆی ئەو كورسیی و تەختەوە، كە لە یەمەنەوە بۆی هاتوە، بۆ ئێرە، بە چاوترووكانێك، پێغەمبەرایەتیی سولەیمانی پێ دەناسێ، یاخود پێی ناناسێ؟ ئایا دەبێتە هۆی هیدایەتی، یاخود نابێتە هۆی هیدایەتی؟

٤)- ﴿ فَلَمَّا جَآءَتۡ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِۖ ﴾، كاتێك شاژن هات، گوترا: ئایا تەختەكەی تۆ ئاوایە؟ نەگوتراوە: (أَهَذا عَرْشُكِ)، ئایا ئەمە تەختەكەتە؟ چونكە ئەمە دەبوو بە جۆرێك لە فێركردن و تەڵقین، بەڵكو گوتوویەتی: (أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِ): یانی: (أَمِثْلَ هَذا العَرْشِ، عَرْشُكِ؟)، ئایا تەختەكەی تۆش، وەك ئەم تەختە بوو؟ تەماشا بكەن، چ وەڵامێكی عاقڵانەو زانایانە دەداتەوە!

٥)- ﴿ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ ﴾، گوتی: دەڵێی ئەوە، بۆیەش وایگوتوە چونکە: لە سەرێکەوە کورسی و تەختەکەی خۆی دەناسێتەوە، لە لایەکی دیکەوەش دەستکاریی کراوەو گۆڕدراوە، پاشان بەو خێراییە، چاوەڕوان نەکراوە، لە یەمەنەوە هاتوە بۆ وێ، ئەویش زانیویەتی لەوێ لە کۆشکدایەو پاسەوانی هەیەو، دەرگای لەسەر داخستوە، ئنجا ئەگەر یەکسەر بڵێ: ئەوە، ئەدی چۆن هاتوە بۆ ئێرە؟ ئنجا دەستکارییش کراوە، ئەگەر بشڵێ ئەو نیە، زۆر بەوی دەچێ! بۆیە وەڵامێکی زۆر لێزانانەو کارامانەی داوەتەوە، گوتوویەتی: دەڵێی ئەوە، نەگوتوویەتی ئەوە، نەگوتوویەتی ئەو نیە، نە نکووڵیی لێکردوەو، نە یەکسەریش دانی پێداهێناوە، بەڵکو سنوورێکی میانجیی گرتوە.

٦)- ﴿ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴾، لە پێش ئەو (شاژن)دا، زانیاریمان پێدرا بوو و، ئێمە مسوڵمان بووین، ملکەچ بووین.

زانایان زۆر لەو بارەوە مشتومڕیان کردوە، ئایا ئەم قسەیە هی کێیە؟! زانیاریمان لە پێش ویدا پێدراوەو، ئێمە بۆ خوا ملکەچ بووین:

أ- هەندێك گوتوویانە: قسەی شاژنە، یانی: زانیاریمان پێش ئەم موعجیزەیەش، لە بارەی پێغەمبەرایەتیی داوودو سولەیمانەوە پێدرا بوو، ﴿ وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴾، ئێمە پێشتریش بۆ خوا ملکەچ بووین.

ب- هەندێك گوتوویانە: ئەوە هەر قسەی سولەیمان و خەڵکەکەی دەوروبەریەتی، واتە: ئێمە پێش ئەم موعجیزەیەش، زانیاریمان بە خواو توانای بێ سنووی خوا ﷻ، پێدرا بوو، یاخود: پێش ئەوەی ئەو ئافرەتەش بێ، ئێمە زانیاریمان پێدرابوو هەر بۆ خواش ملکەچ بووین.

هەردووك ئەگەرەکەی هەن و، ئەوەش یەکێکە لە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان کە خوا ﷻ، ڕستەیەك یان وشەیەك دەفەرموێ، کەس ناتوانێ بڵێ: بەس ئەوە مانایەکەیەتی، بەڵکو زۆر جاران ئەو مانایەش هەڵدەگرێ و، مانایەکی دیکەش

هەڵدەگرێ و، دەگونجێ زۆر شتی دیکەشی لەسەر بگوترێ، هەرگیز نهێنییەکانی قورئان نابڕێن، هەرگیز گەوهەرەکانی دەریای قورئان نابڕێن.

٧)- ﴿ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ اللَّهِ ﴾، ئەوەی پێشتر لە جیاتی خوا دەیپەرست، گێڕایەوە.

ئەو ڕاناوە (ها) بۆ شاژن دەگەڕێتەوە، بە دڵنیاییەوە، یانی: (صَدَّت المَلِكَةَ)، شاژنی گێڕایەوە، لە خواپەرستیی و لەوە کە تەنیا خوا بپەرستێ، ئەوەی لە جیاتی خوا دەیپەرست، یانی: (صَدَّهَا عِبَادَتُهَا لِغَيْرِ الله، عَنْ عِبَادَتِهَا لِله)، پەرستش ئەنجامدانی بۆ جگە لە خوا، گێڕایەوە لە پەرستن ئەنجامدان بۆ خوا ﷻ، واتە: بتپەرستیی و خۆرپەرستیی ڕێی خواپەرستیی لێگرت، یان جگە لە خواپەرستیی، ڕێی خوا پەرستیی لێگرت، ئەم ڕستەیە دوو مانای دیکەشی هەن دوایی لە کۆتایی تەفسیرکردنی ئایەتەکەدا، باسیان دەکەین.

٨)- ﴿ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴾، چونکە بە دڵنیایی ئەو ئافرەتە لە کۆمەڵێکی کافر بوو، واتە: ئەویش هەر لەسەر ئایینی خەڵکەکەی خۆی بوو، واتە: هۆکاری خوا نەپەرستنی ئەوە بوو، کە لە کۆمەڵێکی کافر بوو، نەك لە خودی خۆیدا، قەناعەتی بە کوفر بوو بێ، بەڵام خەڵك و کۆمەڵگایەکەی کافر بوو، ئەویش وەك وانی کرد، بۆ دڵڕاگرتنی ئەوان، نەك بۆ خۆی قەناعەتی وابووبێ.

ئنجا ڕستەی: (وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ اللَّهِ) - وەك پێشتریش گوتمان - واتایەکی دیکەشیان بۆ لێکداوەتەوە:

أ- خوا گێڕایەوە ولایدا لەوەی کە لە جیاتی خوا دەیپەرست: (وَصَدَّها اللهُ: عَمَّا كَانَت تَعْبُدُ مِنْ دُونِ الله)، خوا گێڕایەوەو دووری خستەوە لەوەی کە لە جیاتی خوا دەیپەرست و بەرەو خوا بەیەکگرتنی هێنا، ﴿ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴾، چونکە پێشتر لە کۆمەڵی بێبڕوایان بوو.

ب- کە (وَصَدَّها): ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ سولەیمان، یانی: (وَصَدَّها: سُلَيْمَانُ عَمَّا كَانَت تَعْبُدُ مِنْ دُونِ الله)، سولەیمان گێڕایەوە لەوەی لە جیاتی خوا دەیپەرست، لەو

خۆرپەرستیی و جگە لە خواپەرستییەی گێڕایەوە، کە ئەمە ئەنجامێکە پێش خراوە، واتە: لە ئەنجامی ئەو وتوێژەی لەگەڵیدا کردو، لە ئەنجامی ئەو موعجیزانەدا کە پیشانیدان، سولەیمان بوو بە هۆی هیدایەتی و، بوو بە هۆی دەرباز بوونی لە بتپەرستیی و هێنانی بەرەو لووتکەی بەرزی خواپەرستیی، کە خوا بەیەکگرتن (توحید)ە.

٩)- ﴿ قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ ﴾، پێی گوترا: بچۆ نێو ئەو کۆشکەوە، وشەی (صَرْح) بە مانای کۆشك (قصر) دێ و، بە مانای حەوشەی خانووش، دێ، واتە: ئەو حەوشەیەی کە کراوە بۆ کۆشکەکە، دەگرێتەوە، وشەی (صَرْح) زیاتر مەبەست پێی کۆشکە، بەڵام ئاشکرایە پێش ئەوەی بچێتە کۆشکەکەوە، دەبێ بچێتە حەوشەکەیەوە.

١٠)- ﴿ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً ﴾، کاتێك کۆشکەکەی بینی، یاخود حەوشەی کۆشکەکەی بینی، پێی وابوو شەپۆلە، یاخود پێی وابوو جووڵەی ئاوە، (لُجَّة) کە بە (لُجَج) کۆ دەکرێتەوە، بریتیە لە جووڵەی شەپۆل، (مَوجَة) کە بە (أَمْوَاج) کۆدەکرێتەوە، یانی: شەپۆل، شەپۆلەکان، وایزانی کە جووڵەی ئاوە، ژێر زەوییەکەوە دەبیترێ.

١١)- ﴿ وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا ﴾، لاقەکانی خۆی دەرخستن، واتە: داوێنی خۆی هەڵکرد، بۆ ئەوەی تەڕ نەبێ، وایزانی شەپۆلی ئاوەو جۆگەلەیە، (سَاقَيْهَا) خوێندراویشەتەوە: (سَأْقَيْهَا).

١٢)- ﴿ قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ ﴾، سولەیمان گوتی: ئەوە کۆشکێکی سپیی و سافە لە شووشان، بێگومان بێژەری ئەو قسەیە سولەیمان بووە، چونکە ئەو لە پێشوازیی دا بووە.

(صَرْحٌ) کۆشکێکە، (مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ): (مُمَرَّد) یانی: (مُمَلَّس)، لووس و سپیی و صاف (مِّن قَوَارِير)، (قَوَارِير) کۆی (قَارُورة)یە، واتە: شووشە، یانی: کۆشکێکی شووشە بەندەو، تەختەکەشی وا دروستکراوە، ئاوەکەی بە ژێردا بڕوات، بەڵام ئەوە شووشەیەو پێش ئەوەی لاقت بچێتە نێو ئاوەکە، شووشەکە دەیگرێتەوەو ئاوەکە بە ژێریدا دەڕوات.

١٣)- ﴿ قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ﴾، شاژن گوتی: پەروەردگارم! من ستەمم لە خۆم کرد.

١٤)- ﴿ وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، [لە ڕابردوودا ستەمم لە خۆم کردوە، کە تۆم نەپەرستوە] ئێستاش لەگەڵ سولەیماندا بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان ملکەچم.

ئائە لێرەدا شاژن مسوڵمان دەبێ.

کەواتە: کە سولەیمان نامەکەی بۆ دەنێرێ و دەنووسێ: ﴿ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ ﴾، کە ڕوونکەرەوان (مفسّرين) وایان لێکداوەتەوە، مەبەست پێی مسوڵمانەتییە، لە ڕاستییدا لێی حاڵیی نەبوون، چونکە پێش ئەوەی بێ بۆ لای سولەیمان و، وتوێژی لەگەڵدا بکات و، پەیامی خوای تێ بگەیەنێ و، بۆی باسی بەرنامەو ئایینی خوا بکات، مەعقووڵ نیە، مسوڵمان بێ، چونکە بڕوا بە شتێکی نەناسراو ناهێنێ! سولەیمان لە بنەڕەت دا بۆیە بانگی کردوە، کە بیدوێنێ و ئەو شتانەی پێشان بدات و سەرەنجام قەناعەتی بێت، نەك بە نامەیەك و بە هەڕەشەو فشار، مسوڵمان بێ، چونکە ئەوە:

١- پێچەوانەی سروشتی ئایینی خوایە: ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ﴿٢٥٦﴾ ﴾البقرة.

٢- پێچەوانەی عەقڵ و سەلیقەی سولەیمانەو، پێچەوانەی حیکمەتی سەفەرو هاتنەکەی شاژنی سەبەئیشە، چونکە بۆچی چووە بۆ شام؟! بۆ ئەوەی سولەیمان ئەو موعجیزانەی پێشان بدات، تەختەکەی لە چاو تروکانێك دا لە یەمەنەوە بۆ بێنێ، پاشان ئەو کۆشك و تەلارەی بە شووشە بەند بۆ دروست بکات، کە لە سەرووی تواناو ئیمکانیەتی بەشەرەو، سەرەنجام دەزانی کە سولەیمان توانایەکی سەرسوڕهێنەری پاسا دڕ (خارق العادة)ی، پێدراوە، کەواتە: دەبێ پێغەمبەری خوا بێ، وێڕای ئەوەی وتوێژیشی لەگەڵدا کردوە، کە خوا ﷻ باسی وتوێژەکە ناکات، بەڵام بە دڵنیایی ئەوە هەمووی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، ئنجا دوای هەموو ئەوانە، دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە مسوڵمان بێ.

شایانی باسە: لە بەسەرهاتی سولەیماندا شت زۆر باس کراوە، بۆ وێنە: بۆچی سولەیمان حەوشەی قەصرەکەی وا هەڵخستوە، کە شاژن هات وابزانێ ئاوەو داوێنی هەڵ بکات، کراسەکەی هەڵبکات تاکو لاقی تەڕ نەبن؟

دەڵێن: لەبەر ئەوەی سولەیمان زانیویەتی دایکی جینییەو، پێیەکانی وەك پێی کەر وان! یان هەندێك گوتوویانە: لەبەر ئەوەی سولەیمان بیستوویەتی: مووی لاقی شاژن وەك مووی وڵاخ وایە، ئنجا گوتوویەتی: با بزانم وایە، یان نا؟ بەڵام ئەو حیکایەتانە لە ڕاستییدا هیچ نین و خەیاڵی هەندێك لە زانایان، دایانتاشیون و، وا پێدەچێ ئەو جۆرە زانایانەی زۆر سەرقاڵ نەبوون و کەم نیش بوون، بواریان هەبووەو بە خەیاڵی خۆیان ئەو شتانەیان داتاشیون، ڕەنگە زۆریشیان هەر لە ئیسرائیلییاتەوە وەرگیرا بن، بەڵام کتێبی خوا لەوە بەرزترە، کە بەو حیکایەت و بەسەرهاتە بێ سەنەدو ناماقووڵانە، تەفسیر بکرێ، بۆیە من نەوانەم هیچیان باس نەکردن، مەگەر جاری وایە بۆ دەرس و پەند لێوەرگرتن، یان بۆ ئاگادارکردنەوەی بینەران و بیسەران و خوێنەرانی بەڕێز، ئاماژە بە شتێك بکەم، ئەگەرنا ئەو جۆرە قسانە هی ئەوە نین، تەفسیری کتێبی خوایان پێ قەڕەباڵغ بکرێ!

لە کۆتایی بەسەرهاتی سولەیماندا ﷺ لەگەڵ شاژنی سەبەء دا دەڵێین: هەندێك لە زانایان گوتوویانە: شاژن (ملكة) ناوی بەڵقیس بووە، بەڵام ئەویش لە قورئاندا نەهاتووەو لە سوننەتیشدا نەهاتووە، لەبەر ئەوە ناتوانین بە مسۆگەریی بڵێین: ناوی بەڵقیس بووە، بەڵام بە هەر حاڵ وا گوتراوە، بۆیەش هەر بە شاژن ناوم هێناوە، چونکە خوا وایفەرمووە: ﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةً تَمۡلِكُهُمۡ﴾، یانی: (وَجَدتُّ مَلِكَةً)، شاژن، ئەویش نافرەتێکە: پادشایەو ژنیشە، بەو واتایە (شاژن) من بەو واتایەم بەکارنەهێناوە، کە ژنی شایە، بەڵکو بەو واتایەم بەکارهێناوە کە ژنێکی شایە، شایەکی ژنە، پادشاو حوکمڕانێکی نافرەتە.

## کورتە باسێک:
## حیکمەت و حوکمە شەرعییەکانی بەسەرهاتی سولەیمان (عليه السلام)

بەڕێـــزان!

بـۆ ئـەم کورتـە باسـە، سـەرنجی زۆر لـە تەفسـیرەکانم داوەو بـۆ خۆشـم ڕامـاوم و، سـەرەنجام، چـل (٤٠) حوکـم و حیکمەتـم لـەو بەسـەرهاتەدا، هەڵهێنجـاون، کـە بـە کورتیـی و پوختیـی باسـیان دەکـەم و، ئامـاژەش بـە ئایەتـەکان کەلێیـان وەردەگیرێـن، دەکەین:

١- بەرزیی پلەو پایەی زانیاریی و زانایان، خوا ﷻ، کە باسی داوودو سولەیمان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾ ﴾النمل، واتە: بە دڵنیایی زانیارییمان بە داوودو سولەیمان دابوو و، گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بەسەر زۆرێك لە بەندە بڕوادارەکان دا ئێمەی هەڵبژاردوە {بە هۆی ئەوەوە کە زانیاریی تایبەتیی پێداوین}.

ئنجـا ئەمـە بەرزیـی پلـەو پایـەی زانیاریـی و زانایـان دەگەیەنـێ، کـە خـوا ﷻ لـە نێـو هەمـوو ئـەو شـتانەدا کـە بـە داوودو سـولەیمانی دابـوون، بـاسی زانیاریـی دەکات، ئەوانیـش کـە دەڵێـن: سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی بەسـەر زۆرێـك لـە بەنـدە بڕواداره‌کانیـدا هەڵیبژاردوویـن، واتـە: بەهـۆی ئـەو زانیارییـە تایبەتییـەوە کـە پێمانـدراوە.

٢- سولەیمان میراتی زانیاریی لە داوود گرتوە، نەك میراتی حوکمڕانیی، بەو واتایە کە حوکمی بنەماڵەیی و میراتیی، یان میراتی ماڵ و سامان، مەبەست بێ، بە بەڵگەی: ﴿ وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ ﴾النمل، واتە: سولەیمان میراتی لە داوود گرت

و گوێ: ئەی خەڵکینە! دواندنی باڵندانمان فێرکراوە، کەواتە: ئەوەی کە سولەیمان لە داوودی بە میرات گرتوە، زانیاریی بووە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [إِنَّا مَعْشَرَ الأَنْبِيَاءِ لَا نُورَثُ مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ] (أخرجه البخاري: ٤٠٣٣، ومسلم: ١٧٥٧)، واتە: ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران میراتمان لێ ناگیرێ، هەرچی بەجێمان هێشت، خێرو صەدەقەیە، دەبێ بدرێ بە خەڵك، واتە: ماڵ و سامان لە پێغەمبەران لە میرات ناگیرێ.

پاشان بە پێی (پەیمانی کۆن)، داوود یازدە کوڕی بوون و، یەکێکیان سولەیمان بووە، ئنجا چۆن سولەیمان لە نێو هەموو کوڕەکانیدا، میرات لە بابی دەگرێ، ئەوانی دیکەش میراتی لێ نەگرن؟! بەڵام نا، مەبەست لە میرات، میراتی زانیارییە، وەك لەو فەرمایشتەی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە: [العُلَمَاءُ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ] (أخرجه أبو داود: ٣٦٤١، والترمذي: ٢٦٨٢، وابن ماجه: ٢٢٣٠، وابن حبان: ٥٨)، واتە: زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن.

هەڵبەتە وەك پێشتریش گوتمان: سولەیمان لە شوێنی داوود بۆتە حوکمڕان، بەڵام نەك بە پێی حوکمی بنەماڵەیی و میراتیی، بەڵکو بە پێی تواناو شایستەیی و لێهاتوویی خۆی، دیارە خەڵکی وڵاتەکە، هەڵیانبژاردوەو ئەرکی حوکمڕانییان پێ سپاردوە، بەڵام ئەوەی کە لە داوودی بابی وەریگرتوە، زانیاریی بووەو، ئەرکی پێغەمبەرایەتییش بووە، کە خوای پەروەردگار، ئەرکی پێغەمبەرایەتیی کە بەخشراوەو وەدەستهێنراو نیە، خوا پێی بەخشیوە، بەڵام بۆیە وشەی میراتی بۆ بەکارهاتوە، لەبەر ئەوەی وەك چۆن میرات لە باب و دایکەوە بە ڕۆڵە دەگات، یان لە خزمەوە بە خزم دەگات، بێ ئەوەی میراتگر پێوەی ماندوو بێ، یانی: ئەو پلەو پایەو زانیاریی و پێغەمبەرایەتییەش بە سولەیمان درا، بێ ئەوەی پێیەوە ماندوو بێ، واتە: لێرەدا خوای بەخشەر وشەی (وَرِثَ)ی بەکارهێناوە، لەو ڕووەوە کە وەك سامانێك کە بابای میراتگر دەگات، بێ ئەوەی پێیەوە ماندوو بێ، سولەیمانیش بەو زانیارییەوە کە زانیاریی وەحییەو، بەو پێگەو پلەو پایەیەوە، کە پێغەمبەرایەتییە، پێوەی ماندوو نەبوو بوو، هەوڵی بۆ بدات و تەقەللای بۆ بکات، تاکو دەستی

بکـەوێ، بەڵکـو خـوا پێـی بەخشـیبوو، بـێ نارەقـە کـردن و مانـدوو بـوون، بـەڵام بێگومـان شایسـتە بـووە، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ ﴾ الأنعام: ١٢٤، خـوا ﷻ خـۆی دەزانـێ، پەیامـی خـۆی لـە کـوێ دادەنـێ!

٣- باسکردنی چاکەی خوا ﷻ:

وا باشە مرۆڤ کە خوا چاکەیەکی لەگەڵدا کرد، باسی بکات و یادی بکات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴾ الضحى: ١١، باسی چاکەی پەروەردگارت بکە، کە لێرەدا خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەدوێنێ، بەڵام هەموو کەسێکی دیکەش دەگرێتەوە، بەڵگەشمان لە سوورەتی (النّمل)دا، ئایەتەکەی (١٦)یە، کە دەفەرموێ: ﴿ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ ﴾، (دیارە لە کۆڕێکی گشتییدا سولەیمان ؈ ئەو قسەیەی بۆ خەڵك کردوە) ئەی خەڵکینە! دواندنی باڵندامان فێرکراوە، واتە: بزانن خوا ئەو نیعمەتەی بە ئێمە داوە، باسی نیعمەتەکەی خوای کردوە، ﴿ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِينُ ﴾ ١٦، هەروەها لە هەموو شتێکمان پێدراوە، بێگومان ئا ئەوە بەخششێکی ئاشکرایە [کە خوا بە ئێمەی داوە].

٤- ﴿ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾ النمل: ١٧، واتە: سەربازەکان بۆ سولەیمان لە جندو مرۆڤ و باڵندان کۆکرانەوە، ﴿ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾، هی پێشییان ڕادەگیرا، تاکو هی دوایی پێیان دەگەیشت، یاخود (يُوزَعُونَ)، واتە: (يُضبطون) واتە: زەبت کرابوون، کۆنترۆڵکرابوون، ڕاهێنرا بوون، (القرطبي)[1] دەڵێ: (فِي الْآيَةِ دَلِيلٌ عَلَى اتِّخَاذِ الْإِمَامِ وَالْحُكَّامِ وَزَعَةً يَكُفُّونَ النَّاسَ، وَيَمْنَعُونَهُمْ مِنْ تَطَاوُلِ بَعْضِهِمْ عَلَى بَعْضٍ، إِذْ لَا يُمْكِن الحكّام ذَلِكَ بِأَنْفُسِهِمْ)، واتە: لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە پێشەواو حوکمڕانان، بۆیان هەیە، کەسانێك دابنێن بەسەر خەڵکەوە، سەرپەرشتییان بکات و، ڕێ بگرن لەوەی هەندێکیان ستەم لە هەندێکیان بکەن، چونکە ناتوانن بۆ خۆیان ڕاستەوخۆ ئەو کارە ئەنجام بدەن [دەبێ بە هۆی هاوکارانەوە ئەنجامی بدەن].

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٣، ص١٣٨.

٥- کوشتنی ژیاندارو زیندەوەران دروست نیە، مەگەر زیان بگەیەنن، وەك دەبینین: هودهود، ئەو خزمەتە گەورەیە دەکات بە سولەیمان ، هەواڵێکی بۆ دێنێ کە سولەیمان و نەیزانیوەو چندو مرۆڤیش نەیانزانیوە، بەڵام باڵندەیەك توانیوەتی ئەو زانیارییەی بۆ بێنێ.

پاشان مێروولەکە کە سولەیمان بە لای شارەکەیاندا دەڕوات، بە لای شێوەکەیاندا دەڕوا، ئەویش مێروولەکانی دیکە دەدوێنێ، کەواتە: هەرکام لە جۆری ژیاندارانیش، کۆمەڵ و دروستکراوانێکن خوا دروستی کردوون و بێ حیکمەت نیە، بۆیە دروست نیە، بکوژرێن، مەگەر زیان بگەیەنن، پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە لێی گێڕاروەتەوە: {عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنْ اَلدَّوَابِّ: اَلنَّمْلَةُ، وَالنَّحْلَةُ، وَالْهُدْهُدُ، وَالصُّرَدُ} (أخرجه أحمد: ٣٠٦٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وأبو داود: ٥٢٦٧، وابن ماجه: ٣٢٢٤، وابن حبان: ١٠٧٨)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردوە لە کوشتنی چوار لە ژیانداران: مێروولە، هەنگ، (مێشەنگوینە) هودهود (ئێمە پەپوو سولەیمانەی پێ دەڵێین) و، صورەد (ئەویش جۆرە باڵندەیەکە سەرێکی گەورەی هەیە).

هەڵبەتە ئێمە لە سوورەتی (الأنعام)دا، لەو بارەوە باسێکی تایبەتمان کردوە، کە چ کاتێك دروستە زیندەوەران و ژیانداران، کامیان دروستە بکوژرێ و کامیان نەکوژرێ؟

٦- قسەی ئەو مێروولەیە: ﴿ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: مێروولەیەك گوتی: ئەی مێروولەکان! بچنە نێوماڵەکانی خۆتانەوە، بۆ ئەوەی سولەیمان و سەربازەکانی لە کاتێکدا هەستتان پێناکەن، تێکتان نەشکێنن، ئەمە مەدحێکی گەورەیە بۆ سولەیمان و بۆ سوپایەکەشی، کە تەنانەت پێ لە مێروولەش نانێن، مێروولەش ناکوژن، مەگەر هەستی پێ نەکەن، ئنجا چ جای بەسەر وڵاتان وەربن و، وڵاتان غارەت بکەن و خەڵك بکوژن و، خەڵك بە سۆغردو بێگار بگرن و، مەرو ماڵیان بە تاڵان بەرن! بەڵکو پێ لە مێروولەش نانێن!

٧- کە لە ئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ: ﴿ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا ﴾النمل، بەزەردەخەنە پێکەنی بەهۆی قسەکەیەوە، ئەمیش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە عادەتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، ئەوە بووە کە لە کاتی پێکەنیندا، زیاتر بە شێوەی زەردەخەنە پێکەنیون، واتە: بە زەردەخەنە پێکەنین عادەتی پێغەمبەران و شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانە: زەردەخەنەی کرد، لە کاتی پێکەنیندا، بە هۆی قسەی مێروولەکەوە، بە دڵنیایی سولەیمان پێی خۆش بووە، ئەو مێروولەیە ئەو مەدحەی سولەیمان و سوپایەکەی دەکات: مێروولەکان وریابن! نەوەك سولەیمان و سوپایەکەی تێکتان بشکێنن، لە کاتێکدا کە هەستتان پێناکەن، واتە: ئەگەر هەستتان پێ بکەن، ئەتانەت پێ لە مێروولەش نانێن، پێشتریش باسمان کرد، کە ئەمە ئیعجازێکی عیلمیشی تێدایە، کە دەڵێ: ﴿ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ ﴾، چونکە جەستەی مێروولە زیاتر لە ماددەیەك کە شووشەیی و ڕەقە، دروست بووەو، کاتێك کەسێك پێی پێدا بنێ، تێك دەشکێ، نەك پان ببێتەوە، وەك کرم و سیسرکەو هەندێك لە زیندەوەران، بەڵکو تێك دەشکێ، لەبەر ئەوەی ماددەکەی ڕەقە، ئەمەش ئیعجازێکی عیلمییە، کە دوایی لە مێروولە کۆڵدراوەتەوەو لێی وردبوونەتەوەو، تەماشایان کردوە، مێروولە کاتێ پێی لێی بنێی، تێك دەشکێ، نەك پان بێتەوە.

٨- کە دەفەرموێ: ﴿ وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَا أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ الْغَائِبِينَ (٢٠) ﴾النمل، ئەمەش حوکمێکی گرنگی لێ وەردەگیرێ، وەك (القرطبي) لە سەرچاوەی ئاماژە بۆ کراودا دەڵێ: (فِي هَذِهِ الآيَةِ دَلِيلٌ عَلَى تَفَقُّدِ الإِمَامِ أَحْوَالَ رَعِيَّتِهِ، وَالْمُحَافَظَةِ عَلَيْهِمْ)، لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە پێشەواو حوکمڕان، دەبێ ئاگای لە کۆمەڵگاکەی خۆی بێ و، پارێزگارییان لێ بکات و بەسەریان بکاتەوەو سەرپەرشتییان بکات.

٩- کە سولەیمان دەفەرموێ: ﴿ لَأُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَذْبَحَنَّهُ ﴾النمل، یان زۆر بە سەختیی هودهود سزا دەدەم، یاخود سەری دەبڕم، (القرطبي) دەڵێ: (هذا دَليلٌ عَلَى أَنَّ الْحَدَّ عَلَى قَدْرِ الذَّنْبِ لَا عَلَى قَدْرِ الْجَسَدِ، أَمَا إِنَّهُ يُرْفَقُ بِالْمَحْدُودِ فِي الزَّمَانِ وَالصِّفَةِ)[1]،

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٣، ص١٤٧، ١٤٨.

كە سولەیمان دەڵێ: ﴿فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلۡهُدۡهُدَ أَمۡ كَانَ مِنَ ٱلۡغَآئِبِينَ ٢٠ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابٗا شَدِيدًا أَوۡ لَأَاْذۡبَحَنَّهُۥٓ أَوۡ لَيَأۡتِيَنِّي بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ٢١﴾، چیمە! بۆچی هودهود نابینم، یان لە نائامادانە؟ یان بە سەختیی سزای دەدەم، یان سەری دەبڕم، یان دەبێ بەڵگەیەكی ڕوونم بۆ بێنێ، دەڵێ: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە سزادان بە پێی گوناهانە، نەك بە پێی جەستە، بەڵام دیارە كەسێك كە سزا دەدرێ، پێویستە هەم لە ڕووی كاتەوەو، هەم لە ڕووی سیفەتەوە، میهرەبانیی لەگەڵدا بەكاربهێنرێ.

ئەوە شتێكی دیكەیە، بەڵام لە قەدەر تاوان خەڵك سزا دەدرێ، نەك لە قەدەر جەستەیان.

١٠- كە هودهود بە سولەیمان دەڵێ: ﴿وَجِئۡتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٖ يَقِينٍ ٢٢﴾النمل، من لە سەبەئەوە هەواڵێكی جێی دڵنیاییم بۆ هێناوی، (القرطبي)[1]، دەڵێ: (فِي الْآيَةِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ الصَّغِيرَ يَقُولُ لِلْكَبِيرِ، وَالْمُتَعَلِّمَ لِلْعَالِمِ، عِنْدِي مَا لَيْسَ عِنْدَكَ، إِذَا تَحَقَّقَ ذَلِكَ وَتَيَقَّنَهُ)، واتە: لە ئایەتەكەدا، بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە كە بچووك بۆی هەیە بە گەورە بڵێ و، فێرخواز بۆی هەیە بە زانا بڵێ (قوتابی بە مامۆستا بڵێ) من زانیارییەكم لەلایە كە تۆ لەلات نیە، بە مەرجێك ئەوەی ساغكردبێتەوەو گەیشتبێتە دڵنیایی كە شتێكی لەلایە، كە لەلای مامۆستایەكەی و، گچكەكە شتێكی لەلایەو لەلای گەورەكە نیە.

١١- كە دەڵێ: ﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ﴾النمل، ئەمە بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، كە حوكمڕانیی ئافرەتی شایستە، دروستە، لە كاتێكدا كە پیاوێكی وەك ئەو شایستە نەبێ، بەڵێ ئەم ئایەتە: ﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ﴾النمل، من ئافرەتێكم بینی كە شاژن و حوكمڕانیان بوو، ئەمە بە ئاشكرا حوكمڕانیی ئافرەتی شایستە دەگەیەنێ، لە كاتێكدا كە پیاوێكی وەك ئەو شایستە نەبێ، وەك لە كتێبی: (ئافرەت و خێزان)و، لە كتێبەكانی دیكەم دا، باسم كردوە، كە لە ئەصڵدا حوكمڕانیی هی پیاوانە، وەك چۆن سەرپەرشتیی خێزان هی پیاوانە: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ٣٤﴾النساء، سەرپەرشتیی كۆمەڵگاش، باشتر

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٣، ص١٤٨.

هی پیاوانەو، پیاوان زیاتر لە توانایاندا هەیە، بەو ئەرکە هەڵسن، بەڵام بە دەگمەنیش و بە ڕیز پەڕ، ڕێ دەکەوێ، ئافرەتێکی شایستە هەبێ، لە کاتێکداو لە کۆمەڵگایەکداو لە شوێنێکدا، کە هیچ پیاوێك بۆ ئەوکارە وەك وی شایستە نەبێ، ئەو کاتە دروستە، ئەو ئافرەتە ببێتە حوکمڕان، چ بە حوکمی ناچاریی و پێویستیی بێ، چ بە حوکمی ئەوە بێ، کە ئەو لە هەموویان باشتر دەتوانێ ئەو کارە بکات، کەچی لە تەفسیرەکاندا هەموویان لە کاتێکدا دەیانەوێ ئەو ئایەتە تەفسیر بکەن، ئەو فەرمایشتە دێنن: **(لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوا أَمْرَهُمْ إِمْرَأَةً) (أخرجه أحمد: ٢٠٥٣٦، والبخاري: ٦٦٨٦، والترمذي: ٢٣٦٢)**، واتە: کۆمەڵێك ئافرەتێکیان کردبێتە سەرپەرشتیارو گەورەی خۆیان، سەرفراز نابن.

کـە ئـەوە کاتێـك کیسـرا دەمـرێ و کچەکـەی (بـوران) لـە شـوێنی دەبێتـە حوکمـڕان، پێغەمبـەر ﷺ بـۆ ئـەوانی وا فەرمـووە، کـە وەك واقیـع دواییـش سـەرفراز نەبـوون، بۆیـەش وا دەڵێـم، چونکـە ناگونجـێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ شـتێك بفەرمـوێ، لەگـەڵ واقیعـدا تێکبگیـرێ، (مارگرێـت تاتشـەر) لـە بەریتانیـاو، (ئەندیـرا غاندیـی) لـە هیندسـتان و، (ئنجێـلا مێـرکل) لـە ئەڵمانیـاو، (گۆڵـدا مانیـر) لـە نێـو قـەوارەی جوولەکەکانـدا و، مەلیکـەی سـەبەء، کاتی خـۆی، هەندێـك لـە ئافرەتـان سەرپەرشـتیی خەڵکەکـەی خۆیـان کـردوەو، خەڵکەکەشـیان سـەرفراز بـووە، ئنجـا وەك چـۆن ئایـەت هـۆی هاتنـە خـوارەوەی هەیـە، فەرمـوودەش هـۆکاری هاتـن (سـبب الـورود)ی هەیـە، هـۆی گوتـرانی فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەر ﷺ، واقیعـی خەڵـکی فـارس بـووە، کـە دوایـی فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ واقیعەکەشـدا هاتۆتـە دی، بـەڵام پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەك حوکمێـکی گشـتیی و ڕەهـا نەیفەرمـووە، هـەر کۆمەڵگایـەك ئافـرەت بکەنـە سەرپەرشـتیارو حوکمـڕانی خۆیـان، سـەرفراز نابـن، چونکـە واقیعەکـە وا نیـەو، پێغەمبەریـش ﷺ شـتێك نافەرمـوێ پێچەوانـەی واقیـع بـێ، بۆیـە بەڕاسـتیی زۆر گرنگـە ئێمـە قورئـان وەك قورئـان تەماشـا بکەیـن، وەك فەرمایشـتی خـوا ﷻ، هەروەهـا فەرمایشـتی پێغەمبەریـش وەك فەرمایشـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، کـە بـە تەئکیـد ئـەوەی خـوا ﷻ دەیفەرمـوێ، ڕەهـا **(مطلق)**یـەو بـێ سـنوورە، بـەڵام ئـەوەی

کە بەشەر دەیڵێ، ئەگەر پێغەمبەری خواش ﷺ بێ، سنووردارەو پێغەمبەری خواش ﷺ هەرگیز شتێکی نەفەرمووە، لەگەڵ فەرمایشتی خوادا ﷻ دژ بوەستێ.

کەواتە: ئەگەر دژ وەستانێکمان بینی لە نیوان قورئان و سوننەت دا، وەك لێرەدا بەرچاو دەکەوێ، ئەوە چاك حاڵیی نەبوونی ئێمەیە، یاخود ئەوەیە کە ئێمە، ویستوومانە حوکمێك لە فەرمایشتەکە وەربگرین، کە لێی وەرناگیرێ، کە وەك گوتمان: پێمان وابێ بە ڕەهایی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، هەر کۆمەڵگایەك ئافرەت بکەنە سەرپەرشتیارو گەورەی خۆیان، سەرفراز نابن، کە ئەو واینەفەرمووە، بەڵکو بۆ کۆمەڵگایەکی دیاریکراو، ئەوەی فەرمووە.

١٢- کە سولەیمان بە هودهود دەڵێ: ﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ٢٧﴾النمل، سەرنج دەدەین، ڕادەمێنین، بزانین ڕاستت کردوە، یاخود لە درۆکەرانی؟ (القرطبي) دەڵێ: (دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ الْإِمَامَ يَجِبُ عَلَيْهِ أَنْ يَقْبَلَ عُذْرَ رَعِيَّتِهِ، وَيَدْرَأَ الْعُقُوبَةَ عَنْهُمْ فِي ظَاهِرِ أَحْوَالِهِمْ بِبَاطِنِ أَعْذَارِهِمْ، لِأَنَّ سُلَيْمَانَ لَمْ يُعَاقِبِ الْهُدْهُدَ حِينَ اعْتَذَرَ إِلَيْهِ)، واتە: ئەم ڕستە قورئانییە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە، کە پێشەواو حوکمڕان دەبێ، پۆزشی خەڵکەکە وەربگرێ و سزایان لێ دوور بخاتەوە، لە ڕواڵەتی حاڵیان، بە هۆی پۆزشی پەنهانیان، چونکە سولەیمان سزای هودهودی نەدا، دوای ئەوەی پۆزشی بۆ هێنایەوەو بۆی ڕوونکردەوە.

١٣- کە سولەیمان عليه السلام دەفەرموێ: ﴿ٱذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ﴾النمل، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە دروستە مسوڵمان نامە بنێرێ بۆ کافران، بۆ هەر مەبەستێك بێ، چ بۆ گەیاندنی پەیامی خوا بێ، چ بۆ هەر مەبەستێکی دیکە بێ، چونکە نامە ناردنەکە، بۆ خۆی شتێکی ڕەوایەو حوکمەکە دەگەڕێتەوە بۆ نێوەڕۆکەکەی: ئەگەر نێوەڕۆکەکەی واجب بێ، ئەوە نامە ناردنەکە واجب دەبێ و، ئەگەر نێوەڕۆکەکە سوننەت بێ، نامە ناردنەکە سوننەت دەبێ و، ئەگەر ڕەوا بێ، ڕەوا دەبێ، بە پێچەوانەشەوە: ئەگەر نێوەڕۆکەکەی حەڕام بێ، بۆ تەسلیم بوون بێ، بۆ ماستاو بۆ کردنیان بێ، ئەو کاتە حەڕام دەبێ، واتە: نامە ناردن بۆ کافران، پێنج حوکمە شەرعییەکانی بەسەردا دەچەسپن، نەك یەك حوکمی هەبێ.

١٤- مرۆڤ دەبێ لەگەڵ ئەوانەی کە حوکمڕان و کاربەدەستن، کاروباری خەڵکیان بە دەستە، ئەدەب و ڕێزی زیاتر ڕاچاو بکات، ئەوەتا سولەیمان بە هودهود دەڵێ: ﴿ فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ ﴾، نامەکەیان بۆ فڕێبدە دوایی لێیان دوور بکەوەوە، یانی: بە ڕێزو حورمەتەوە نامەکەیان وێدە، دوایی لێیان دوور بکەوەوە، نەك هەر لە بن لووتی بێ! ئەوەش ڕێزو ئەدەب نواندنێکە، ﴿ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴾، دوایی سەرنج بدە، بزانە داخۆ وەڵامیان چی دەبێ؟ واتە: لێیان دوور بکەوەو مۆڵەتییان بدە، خۆیان نامەکە دەخوێننەوە، شاژن دەیخوێنێتەوە بۆ کۆڕو مەجلیسەکەی و، بۆیان باس دەکات، تۆ نابێ هەر لەوێ بی، دەبینی قسەیەکی ئەمانەت و تایبەتییان هەیە، پێیان خۆش نیە، تۆ گوێت لێ بێ.

١٥- کاتێك مرۆڤ نامەیەکی بۆ دێ، ئەگەر سڵاوی تێدا بێ، یاخود هەر شتێکی تێدابێ، پێویستە وەڵامەکەی بداتەوەو سڵاوەکەی بۆ بنێرێتەوە، چونکە نامە ناردن لە کەسێکی نادیارەوە، وەك سڵاو کردنە لە کەسێکی ئامادە و دیار، ئەمیش هەر (القرطبي) ئاماژەی پێداوە، کەواتە: وەڵامی سڵاو دانەوەیەك، کە لە نامەدا هاتوە، پێویستە، وەك چۆن وەڵامی سڵاوکردنی ڕووبەڕوو، پێویستە.

١٦- (القرطبي) دەڵێ: (اتَّفَقُوا عَلَى كَتْبِ «بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ» فِي أَوَّلِ الْكُتُبِ وَالرَّسَائِلِ، وَعَلَى خَتْمِهَا، لِأَنَّهُ أَبْعَدُ مِنَ الرِّيبَةِ، وَعَلَى هَذَا جَرَى الرَّسْمُ) (١)، واتە: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن و دەبێ (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، لە سەرەتای نامەو کتێب بنووسرێ، هەروەها مۆریش بکرێ (واژۆ بکرێ) ئەوە لە گومانەوە دوورترە، بەو شێوەیەش عورف و نەرێت هاتوە، لەو بارەوە ئەو فەرمایشتەش هەیە: (وَقَالَ أَنَسٌ: لَمَّا أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى الْعَجَمِ قِيلَ لَهُ: إِنَّهُمْ لَا يَقْبَلُونَ إِلَّا كِتَابًا عَلَيْهِ خَتْمٌ، فَاصْطَنَعَ خَاتَمًا وَنَقَشَ عَلَى فَصِّهِ» لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ» وَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِهِ وَبَيَاضِهِ فِي كَفِّهِ)، (أخرجه البخاري: ٦٥١٧، ومسلم: ٢٠٩٢).

ئەنەس دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستی نامە بنووسێ بۆ عەجەم (واتە: غەیری عەرەبە حوکمڕانەکان) پێی گوترا: ئەوانە نامەیەك وەرناگرن، کە مۆر

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن، ج١٣، ص١٥.

نەکرابێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد مۆرێکیان بۆ دروست کردو، کە لەسەر نەقێمەکەی نووسرا بوو، (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ)، ئەنەس دەڵێ: وەك ئێستا تەماشای سپیەتیی و بریقەی ئەنگوستیلەکە بکەم، لە دەست و پەنجەی پێغەمبەردا ﷺ.

١٧- کە دەڵێ: ﴿إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ٢٩﴾، من نامەیەکی بە ڕێزو بە حورمەتم بۆ هاتوە، یان نامەیەکی زۆر چاکم بۆ هاتوە، پێویستە مرۆڤ لە نامە ناردندا، ڕاچاوی ڕێزگرتنی بەرانبەر بکات، هەم لە ماددەی نامەکەو، هەم لە نێوەڕۆکەکەیدا، وەك پێشتریش ئاماژەیەکمان پێدا، ئنجا: ﴿أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ٢٩﴾، هەم نێوەڕۆکی و هەم ڕواڵەتیشی دەگرێتەوە، وا دیارە هەم لە جۆرە ماددەیەکدا بۆی نووسیوە، کە شایستەی پادشایان و حوکمڕانان بێ، هەم نێوەڕۆکەکەشی بەڕێزو حورمەتەوە بۆی نووسیوە، کە شایستەی لایەنی بەرانبەر بێ.

١٨- گرنگی ڕاوێژکردن: کە شاژن دەڵێ: ﴿مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ﴾، من هیچ بڕیارێك یەکجاریی نادەم، یەکلایی ناکەمەوە، تاکو ئێوە ئامادە نەبن، کەواتە: کە خوا ﷻ بەسەرهاتی ئەو ئافرەتەمان بۆ دەگێڕێتەوە لەگەڵ خەڵکەکەی، کە دواییش سەرەنجامێکی خێری بووە، یانی: بە هۆی ئەوەوە بووە کە سیاسەتێکی ڕاست و دروستی بووەو، حوکمڕانییەکی ڕەشیدی بووە، کە بناغەکەی بریتیی بووە لە ڕاوێژکردن و پرس و ڕا بە خەڵك کردن، نەك خۆسەپاندن و تەنیا ڕای خۆ دیتن.

١٩- ئەوە کە سولەیمان ﷺ دیارییەکەی وەرنەگرتوەو گوتوویەتی: ﴿أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُمۚ بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ ٣٦﴾، وەك پێشتر باسمان کرد، هۆکارەکەی ئەوە بووە، کە شاژن وەك بەرتیل (رشوة) ئەو دیاریی و خەڵاتەی بۆ ناردوە، وەك بە دیل بۆ ئەوە، کە بچێ بۆ لای و گوێ لە پەیامی خوا بگرێ، بۆیە سولەیمان وەری نەگرتوە، ئەگەرنا دیاریی و خەڵات، لە خەڵك وەردەگیرێ، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ، وَيُثِيبُ عَلَيْهَا} (أخرجهُ البُخَارِي: ٢٥٨٥)، واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازیبێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دیاریی وەردەگرت و پاداشتیشی لە بەرانبەردا دەدایەوە.

کەواتە: ئەوە کە دەفەرموێ: {إِنِّي نُهِيتُ عَنْ زَبْدِ الْمُشْرِكِينَ} (أخرجه: أبو داود: ٣٠٥٧، والترمذي: ١٥٧٧، أخرجه أبو داود: ٣٠٥٧، والترمذي: ١٥٧٧، والبيهقي في الكبرى: ١٩٢٦٤)، واتە: من لێم قەدەغەکراوە کە دیاریی و بەخششی هاوبەش بۆ خوادانەران، وەربگرم.

یانی: ئەگەر چاوەڕوانییەکی ناشەرعییان هەبێ، لە بەرانبەریدا، یان بۆ ئەوەی کە منەت بارو چاو بەرەژێریان نەبێ، بەڵام ئەگەر کافرێك دیارییەك بنێرێ، وەك کاتێ خۆی حوکمڕانی میسر دیاریی بۆ پێغەمبەر ﷺ نارد، هەروەها هیرەقڵ نامەی بۆ پێغەمبەر ﷺ ناردوەو دیاریی بۆ ناردوە، یان حوکمڕانانی دیکە جاری وابووە، دیارییان ناردوە، بۆ ئەو، یان بۆ خەلیفە ڕاشیدەکان، ئەوانیش دیارییان بۆ ناردوونەوە، ئەگەر بزانی لە بەرانبەر ئامانجێکی ناشەرعییدا نییە، دروستە، دیاریی وەربگیرێ، وەك (القرطبي) هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتەدا کە پێشتر باسمان کرد، دەڵێ: (الْهَدِيَّةُ مَنْدُوبٌ إِلَيْهَا، وَهِيَ مِمَّا تُورِثُ الْمَوَدَّةَ وَتُذْهِبُ الْعَدَاوَةَ)[1]، ئەمە وەك قسەی خۆی دەیهێنێ، دەڵێ: دیاریی ناردن، شتێکی پەسندەو، خۆشەویستیی پەیدا دەکات و، دوژمنایەتیی و ناکۆکیی لا دەبات.

هەروەها ئەو فەرمایشتەش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دێنێ، کە دەفەرموێ: {تَصَافَحُوا، يَذْهَبُ الْغِلُّ، وَتَهَادُوا تَحَابُّوا، وَتَذْهَبُ الشَّحْنَاءُ}، (أخرجه: مالك في الموطأ ج٢، ص٩٠٨، مرسلا عن عطاء الخراساني، وضعفه الألباني: ٢٤٣٨)، واتە: توقە بکەن، کینەو بوغز لا دەچێ و، دیاریی بدەن بە یەکدی دەبێتە هۆی یەکدی خۆشویستنتان و، دەبێتە هۆی لاچوونی ڕق و بوغز لە نێوتاندا.

هەڵبەتە ئەگەر لە ڕووی سەنەدەوە بێ هێزیش بێ، بەڵام زانایان گوتوویانە: بۆ کردەوە باشەکان (فضائل الأعمال) جار جار کار بە فەرموودەی بێ هێزیش دەکرێ.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٣، ص١٦١.

٢٠- کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ﴾، عیفریتێك لە جینن گوتی: من بۆتی دێنم بەر لەوەی لە شوێنی خۆت هەڵستی، کە پێش نیوەڕۆیان دادەنیشت و کاتی نیوەڕۆ هەڵدەستا.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە عیفریت دەتوانێ سوود بگەیەنێ، دیارە بۆ پیاوێکی وەك سولەیمان ﷺ، کە خوا ﷻ جینني بۆ دەستەمۆ کردوە، بەڵام دەشگونجێ زیانیش بگەیەنێ، ئەگەر دەستەمۆ نەکرابێ، وەك لەو فەرمایشتەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {إِنَّ عِفْرِيتًا مِنَ الجِنِّ يَفْتِكُ عَلَيَّ البَارِحَةَ لِيَقْطَعَ عَلَيَّ صَلاَتِي، وَإِنَّ اللَّهَ أَمْكَنَنِي مِنْهُ فَذَعَتُّهُ} (أخرجه البخاري: ٤٦٦١، ومسلم: ٥٤١).

واتە: دوێنێ شەو عیفریتێك ویستی زەبرم لێ بداو نوێژەکەم لێ ببڕێ، خواش منی بەسەردا زاڵ کرد، دەنگمدا.

(ذَعَتُّهُ: قُلْتُ، دَعْ دَعْ، أو دُعْ دُعْ، وَهُوَ أَمْرُ الرَّاعِي بِالنعِيْقِ بِالغَنَمِ)، مرۆڤ کە مەڕو بزن دەنگ دەدەت، کە بە کوردیی بە شێوەیەك دەنگ دەدرێن، بۆ وێنە: بە سەگ دەگوترێ: چغە، بە کەر دەگوترێ: هۆش، بەڵام بە عەرەبیی شتێکی دیکە دەگوترێ، (فَذَعَتُّهُ)، یانی: وەك چۆن ولاخ دەنگ دەدرێ، ئاوا دەنگم داو، دوور کەوتەوە.

٢١- کە عیفریتە کە دەڵێ: ﴿وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ﴾، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە هەر کارێك پێویستیی بە دوو سیفەتان هەیە، بۆ هەر کەسێك بیەوێ ئەنجامی بدات:

یەکەم: توانای ئەنجامدانی کارەکەی هەبێ.

دووەم: ئەمینداریش بێ، توانای هەبێ ئەنجامی بدات و، پارێزەریش بێ بۆی.

جاری وایە، کەسێك توانای هەیە کارێك ئەنجام بدات، بەڵام ئەمانەتی نیە، جاری وایە توانای پاراستنیت هەیە، بەڵام توانای ئەنجامدانیت نیە، بە هەردووکیان تەواو دەبێ، ﴿وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ﴾، من لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە، هەم بەهێزم و بە توانام، هەم ئەمینداریشم، کە زایە نەبێ لە دەستم و زیانی پێ نەگات.

٢٢- ﴿ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ﴾، ئەو کەسەی زانیاریی لە کتێب لە لا بوو، گوتی: من بۆتی دێنم بەر لەوەی چاوت بگەڕێتەوە بۆ لات، یان: پێڵووی چاوت، کە دەیکەیەوە، پێش ئەوەی بینووقێنی، چونکە پێڵووی چاوت کە دەیکەیەوە، لێت دوور دەکەوێتەوەو، کە دەینووقێنی دێتەوە بۆ لات، (طَرْف) یش هەندێك گوتوویانە: (جَفْنُ العَيْن)، پێڵووی چاو، یانی: بە چاوتروکانێك بۆت دێنم، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە زانیاریی لە هێز لە پێشترە، ئەوەی دیکە گوتوویەتی: ﴿ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴾، بەڵام ئەوەیان دەڵێ: ﴿ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ﴾، کاتێك ئینسان کە زانیاریی بوو، هێزیشی دەبێ و، ئەمانەتیش دەبێ، ئەگەر زانیاریی تێرو تەواوو ڕاستەقینە بێ.

٢٣- گێڕانەوەی نیعمەتەکان بۆ خوا ﷻ، عادەتی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، پێچەوانەکەشی هی قارِوونە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ﴾، کاتێك لەلای خۆی تەختەکەی بەسەقامگیریی بینی، گوتی: ئەمە بەخششی پەروەردگارمە، نەیگوت بە شان و شەوکەتی خۆم، ئنجا ئەگەر عیفریتە جینییەکە گوتوویەتی: بە چەند سەعاتێك بۆت دێنم و، ئەوەی زانیاریی کتێبی خوای لەلا بووە، گوتوویەتی: بە چاوتروکانێك، یان بە چەند چرکەیەك بۆت دێنم، ئەوە خوا ﷻ ئەو توانایەی بۆ سولەیمان ڕەخساندووەو، ئەو نیعمەت و چاکەو بەخششە، هی پەروەردگارییەتی.

٢٤- قسەیەکی (الماوردي) دێنین، کە دەڵێ: (وَالْقَوْلُ بِأَنَّ أُمَّ بِلْقِيسَ جِنِّيَّةٌ، مُسْتَنْكَرٌ مِنَ الْعُقُولِ، وَخَلَقَ اللهُ الْآدَمِيَّ مِنْ صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ، وَخَلَقَ الْجَانَّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وَيَمْنَعُ الْإِمْتِزَاجُ مَعَ هَذَا التَّبَايُنِ، وَيَسْتَحِيلُ التَّنَاسُلُ مَعَ هَذَا الْإِخْتِلَافِ)[1].

واتە: ئەو قسەیەی کە گوتراوە: دایکی بەڵقیس (یانی: دایکی شاژنی سەبەء)، جینییە، (یانی: مێینەی جند) بووە، لە عەقڵاندا ڕەفزکراوەو نکووڵییلێکراوە،

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٣، ص١٧٩.

خوا ﷻ مرۆڤی لە قوڕێکی وشک هەڵاتووی وەك قوڕی سوورەوە کراو دروست کردوەو، جینیشی لە بڵێسەی ئاگر دروست کردوە، ئنجا لە کاتێکدا ئەو دوو جیاوازییانە هەن، ناگونجێ تێکەڵ بوون هەبێ، ناشگونجێ وەچە کەوتنەوە هەبێ، لەگەڵ ئەو لێك جیاییەدا.

قسەکەشی ڕاستە، هەرچەندە هەندێك لە زانایان لە کتێب و بەرهەمەکانی خۆیاندا، باسی ئەوەیان کردوە، کە دەگونجێ هاوسەرگیریی لە نێوان مرۆڤ و جندا ببێ، لە هەندێك لە کتێبەکانی (إبن تيمية)دا ڕەحمەتی خوای لێبێ، بینیومە، بەڵام لە ڕاستییدا، ئەوە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو، ئەوانەی هاوسەرگیریی دەکەن لەگەڵ جندا بە زۆریی ئەوانەن کە شێت دەبن و تێك دەچن، باوای شێت پێی وایە هاوسەرگیریی دەکات! بەڵام ئەوە کە بەکردەوە وەچەیان لێ بکەوێتەوە، ئەوە موستەحیلە، دەگونجێ وەك خەیاڵێك بێ، وەك من بە هۆی ئەفەرێکی سێیەمەوە، قسەم لەگەڵ هەندێك لە جندا کردوە، دەڵێن: ئەوانەی پێیان وایە لە نێوان ئەوان و ئێمەدا هاوسەرگیریی دەبێ، ئەوە هەر خەیاڵێکەو، ئێمە وەك شەیتانەکان فێڵیان لێ دەکەین، کە هەست بە جۆرێك لە لەززەت دەکەن، بەڵام لە ڕاستییدا مەسەلەکە زۆر لەوە دوورترە کە وەچە ببێ، چونکە مرۆڤ مرۆڤەو جندیش جندە! بەڵێ جند لە ئاگر دروستکراون، لەو شێوە ماددەیەی کە ئێمە هەین، ئەوان بەو شێوەیە نین، کەواتە: ئەوە هیچی بنچینەیەکی جێ پشت پێبەستنی نیە، هەرچەندە هەندێك لە زانایان باسیان کردوەو، باسی حوکمەکانیشیان کردوە، ئایا ئەگەر پیاوێك ئافرەتێکی جند بێنێ و منداڵیان لێ بکەوێتەوە، یان ئەگەر ئافرەتێکی مرۆڤ، شوو بە پیاوێکی جند بکات و منداڵیان لێ بکەوێتەوە، چی بکەن و چۆن بکەن؟ لە هەندێك کتێباندا ئەو شتانە باسکراون، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە زیاتر لە چوارچێوەی خەیاڵ و خولیاو خوتخوتە دایە، کە شەیتان و جندەکان دەیڕەخسێنن، بە پێی زانیاریی بەندە، کە تاکو ئێستا پێی گەیشتووم، بەڵێ وەك (الماوردي) گوتوویەتی: ناگونجێ

ئـەو دوو جـۆره دروسـتکراوە، لێـك جیاییـە، هیـچ جـۆره تێکەڵیـی و هاوسـەرگیرییەکی بـە مانـای هاوسـەرگیرییان لـە نێوانـدا هەبـێ.

٢٥- تێپەڕبوونی سولەیمان و سوپاکەی، بە لای ئەوە شارە مێرووڵەیەدا، پاشان قسەکردنی لەگەڵ هودهودو، دواتر ناردنی نامە بە هودهود بۆ شاژنی (سبأ)و باقی ڕووداوەکان، ئەو بەسەرهاتە، ئەوە دەگەیەنێ کە ڕووناکیی خواناسیی و خوا بە یەکگرتن، لە هەموو دروستکراوەکاندا هەیە، تەنانەت لە باڵندەکانیش دا، ئەوەتا هودهود کە باسی شاژنی (سبأ) بۆ سولەیمان ﷺ دەکات، ڕەخنەیان لێ دەگرێ کە چۆن کڕنووش بۆ خۆر دەبەن؟ ئەوانە شەیتان ڕێی لێ تێکداون، پاشان پێناسەی خوا ﷻ دەکات، وەك لە سوورەتی (النور)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ ۖ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ ﴾.

واتـە: ئایـا نابینـی، {بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ} کـە هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و زەوییدا هەیـە، خـوا بـە پـاك دەگـرێ و، باڵندەکانیـش بـە ڕیـز دەوەسـتن، هـەر کامێکیـان پاڕانـەوەی خـۆی و خـوا بـە پاکگرتنـی خـۆی، دەزانـێ و، خـواش زانایـە بـەوەی کـە دەیکـەن.

کاتێ خـۆی ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (الإسراء)دا، باسـێکی سـەربەخۆمان لـە بـارەی خـوا بـە پاکگرتـن و سـتایشی خـوا کـردنی، سـەرجەم دروسـتکراوەکانەوە، کـرد، لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم ئایەتـە موبارەکـەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ ﴾.

٢٦- شکاندنی پەردەو دیواری لە خۆبایی بوون، بۆ هیدایەت دانی کەسانێك کە گیرۆدەی لە خۆبایی بوون (غرور) بوون، زۆر گرنگە، هەر بۆیەش سولەیمان ﷺ دوو کاری کردن، تاکو شاژنی (سبأ)، هیدایەت بچێتە نێو دڵ و دەروونیەوە:

یەکەم: تەخت و کورسییەکەی بۆ هێنا، لە چاو تروووکانێکدا، لە یەمەنەوە بۆ شام.

**دووەم: کۆشکێکی بۆ دروستکردبوو، هەر بۆ وی، یان کۆشکەکە پێشتر دروستکرا بوو و پێشانی شاژنی (سبأ)یدا، کە هەر کام لەو دوو کارە، لە سەرووی سنووری توانای جند و مرۆڤیشەوە بوون، ئنجا ئەوە بوو کە ئەو شاژنە، کە پادشاو حوکمڕان بووەو ئیمکانیات و دەستەڵاتی زۆری بووە، ئنجا بە هۆی ئەوەوەش مرۆڤ جۆرێك لە لەخۆبایی بوون و، لە کەوڵی خۆ دەرچووونی بۆ دروست دەبێ، بۆیە سولەیمان ﷺ بەو زمانە دواندی، کە تێیدەگات، هەڵبەتە ئەگەر ئەو دوێنراوە شاژن و، حوکمڕان نەبووایە، بە دڵنیایی سولەیمان ﷺ بە زمانێکی دیکە دەیدواند، بەڵام گوتراوە: (لِكُلِّ مَقَامٍ مَقَال)، بۆ هەر شوێنە جۆرە قسەیەك هەیە.**

**٢٧- پێغەمبەران و بەندە چاکەکانی خوا، هەموو توانای ماددیی و مەعنەوییان بۆ هیدایەت دانی خەڵك بەکاردێنن، وەك سولەیمان ﷺ کردی، وەك بینیمان: کاتێك کە باڵندەی بۆ دەستەمۆ بووە، هودهود نامەی پێدا دەنێرێ، پاشان عیفریتی جند ئامادەیی دەردەبڕێ کە کورسیی و تەختەکەی شاژنی بۆ بێنێ، لە ماوەی چەند سەعاتێکدا، دوایی ئەوەی کە زانیاریی لە کتێبی خوای لەلایە، بە چەند چرکەیەك بۆی دەهێنێ، پاشان ماڵ و سامانەکەی و سوپایەکەی کە لەبەر دەستیدا هەیە، هەمووی بەکاردێنێ، بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامی خواو، هیدایەت دانی خەڵك، بۆ ڕاستە شەقامی خوا، نەك بۆ پارەو سەروەت و سامان وەسەر یەکنان و، دەستەڵاتی خۆ ڕانان بەسەر خەڵکداو، ستەم و چەوساندنەوە کردن، لەگەڵ دروستکراوەکانی خوادا.**

**٢٨- مرۆڤ هەرچەندە توانادار بێ، نابێ لە هاوکاریی ئاوانی دیکە بێ نیاز بێ، هودهود چ ڕۆڵێکی گرنگی بۆ سولەیمان ﷺ گێڕا! لە حاڵێکدا کە بەپێوو سولەیمانە (هُدهُد) باڵندەیەکی بێهێزە، لە چاو مرۆڤ، بەڵام هاوکارییەکی باشی سولەیمانی ﷺ کرد، کە پێغەمبەرێکی خوا بووەو خاوەن ئیمکانیەتێکی زۆر بووە، ئەگەر هودهود نەبووایە، ڕەنگە هەواڵی ئەو شاژنەی سەبەئی نەزانیبووایە، پاشان ئەو نامەیە کە بەو شێوەیە بۆیان بنێرێ و، بانگیان بکات بۆ وتوێژ، تاکو پەیامی خوایان پێ بگەیەنێ.**

**٢٩-** حوکمڕان هەرگیز نابێ، حوکمی نادیاریی (الحكم الغيابي)ی بەسەر کەسدا بدات و، پێویستە بە باشیی گوێ لە بابای تۆمەتبار، یان گومانلێکراو بگرێ، قسەی خۆی بکات و هەڵوێستی خۆی ڕوون بکاتەوە، ئەو کاتە ئەگەر بەڵگەیەکی ئیقناع کەری پێ بوو، بێگومان دەبێ لێی وەربگرێ و لێی بسەلمێنێ، نەك لەبەر ئەوەی تۆمەتباری کردوەو گومانی خراپی پێبردوە، هەر لێی لە بەهانە بێ، ئەگەر پۆزشیش بێنێتەوە، بەڵکەو پاساویشی پێ بێ، هەر نادیدەی بگرێ، وەك سولەیمان ﷺ دوای ئەوەی هودهود قسەی بۆ دەکات، هەڵبەتە یەکسەر تەسلیمی قسەکەی نابێ، بەڵام گوێی بۆ دەگرێ و، دوایی قسەکەشی لێ وەردەگرێ، سولەیمانیش ﷺ پێش هەمووان خۆی لەو بارەوە قازانج دەکات.

**٣٠-** دەبێ هێندە ڕێی ئازادیی دەربڕین و بیروڕا بدرێ، کە بچووکترین کەس بتوانێ قسەی خۆی بکات و، بیرو ڕای خۆی بخاتە ڕوو، بە تایبەت بۆ کەسانێك کە حوکمڕانن و دەسەڵاتیان هەیە، دەبێ بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ ئەوانەدا بکەن، کە لەبەر دەستیانن، کە نەك تەنیا ئەوانەی بڕیار بە دەستن، بەڵکو بچووکترین کەسیش بتوانێ بیرو ڕای خۆی دەرببڕێ و، ئەوەی بە چاکی زانی، بیخاتەڕوو.

**٣١-** دەگونجێ کەسێکی ئاسایی شتانێك بزانێ، کە بابایەکی خاوەن پێگەی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و زانایەکی گەورە، نەیانزانێ، بۆیە مرۆڤ نابێ بە زانیارییەکەی خۆی و، بە توانایییەکەی خۆی لە خۆی بایی بێ و، لە کەوڵی خۆی دەربچێ و، زانیارییەکەی بۆی ببێتە پەردەیەك کە لە زانیاریی ئەوانی دیکەو، ئەزموون و شارەزایی ئەوانی دیکە، هەر کەسێك بن، بێ بەشی بکات و، وای لێبکات زانیارییەکەی بۆی ببێ بە قۆزاخەیەك، وەك چۆن کرمی ئاوریشم قۆزاخەیەك لە لیکی خۆی بە دەوری خۆی دا دروست دەکات، دوایی هەر بۆ خۆی لەو قۆزاخەیەدا دەخنکێ و، ڕێی چوونە دەری لێ دەگیرێ، نابێ مرۆڤ بەو شێوەیە بکات، کە لە دەسەڵاتەکەی خۆی و، زانیارییەکەی خۆی و، توانایەکانی خۆی، قۆزاخەیەك بۆ خۆی دروست بکات و، خۆی تێدا قەتیس بکات.

٣٢- پێویستە مرۆڤ تەسلیمی بەڵگەو دەلیل بێ، ئەگەر لە بچووکترین کەسیشەوە بخرێتە ڕوو، هەر کەسێك بە بەڵگە قسە بکات، مرۆڤ دەبێ تەسلیمی بێت، خوای پەروەردگار لە چەند شوێنێك لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١١١﴾﴾البقرة، هەم لە سوورەتی (البقرة)دا، وا دەفەرموێ، هەم لە سوورەتی (الأنبياء) و (النمل)دا، خوا ﷻ ئاماژە بە هێنانی بەڵگە دەکات، کەواتە: هەر کەسێك بەڵگەی پێ بێ و مادام بە بەڵگە قسە بکات، پێویستە بەرانبەرەکەی هەر کەسێك بێ، تەسلیمی بەڵگەو دەلیل بێ، کوردەوارییش دەڵێن: (لە هەقێ ئاو ڕادەوەستێ)، (لە بەرانبەر هەقدا، ئاو دەوەستێ).

٣٣- لە یەك جیایی ئایین - بە چەمکە باوەکەی، کە بریتیە لەو بەرنامەیەی لە خواوە هاتوە - لەگەڵ سیاسەت و حوکمڕانیی دا، ئنجا چ ئایینی خوایی ڕاست، وەك هی سولەیمان ﷺ، یان هی هەڵە، وەك هی شاژن، کە ئەویش هەر جۆرێك بووە لە ئایین، کە خۆریان پەرستوە، بەڵێ لێك جیایی ئایین و سیاسەت و حوکمڕانیی، پێچەوانەی واقیع و مێژووشە، هەم پێچەوانەی واقیعە، تەماشای دنیا بکەن: ئایینەکان چ ڕاست بن، وەك ئیسلام، چ هەڵە بن، وەك ئەو بەرنامە خواییانەی کە گۆڕدراون، یان ئەوانەی مرۆڤ دایناون، گرنگ ئەوەیە ئایین، واتە: هەبوونی بڕولو عەقیدەیەك کە مرۆڤ لە سەرووی خۆیەوە دایبنێ و، پێی وابێ لە سەرووی خۆیەوە بۆی هاتوە، لەگەڵ سیاسەتکردن و حوکمڕانییدا، لێك جیایی ئەو دووانە، کە ڕەوتی سیکۆلاریزم بانگەشەی بۆ دەکات، پێچەوانەی واقیع و مێژووشە، نە لە مێژوودا وابووەو، نە لە واقیعی ئێستاش دا وایە، واتە: نابێ لێك دابڕێن، وەك گوتم بە نسبەت ئیسلامەوە، کە دیارە خوا ﷻ ئیسلام، دوا پەیام و دوا هیدایەتی خوایە بۆ ئاکو بۆ کۆمەڵ، ئاکو ژیانی ئاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی خۆیانی پێ ڕێك بخەن، ئەوانی دیکەش چ خۆیان پاڵ بدەنە لای خواو ئاسمان، چ ڕیشەیەکی بەشەرییان هەبێ، هەمیشە ئایین تێکەڵ بە سیاسەت دەبێتەوە.

٣٤- کلتوورو نەرێتی کۆمەڵگا، کاریگەریی ئەرێنیی، یان نەرێنیی لەسەر مرۆڤ هەیە، وەك لەو ئایەتە قورئانییەدا دەردەکەوێ: ﴿وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ اللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ

مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴾، ئەوە لایدا لە خوا پەرستیی [شاژنی لادا لە خواپەرستیی] کە پێشتر لە جیاتی خوا دەیپەرست، چونکە ئەو لە کۆمەڵێکی کافرو بێبڕوا بوو، واتە: چونکە کۆمەڵگاکەی وابوو، ئەویش کارتێکراو بوو، بە نەریت و عادەتی کۆمەڵگایەکەی خۆی، کەواتە: کلتوورو فەرهەنگ و نەریتیی کۆمەڵگا، چ چاك بێت، چ خراپ بێت، کاریگەریی لەسەر مرۆڤ هەیە.

٣٥- حوکمی پادشایەتیی و خۆ سەپاندن، هەمیشە سەری لە تێکدان و وێرانکارییەوە دەردەچێ، وەك شاژنی (سبأ) گوتوویەتی: ﴿ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴾، بە دڵنیایی پادشایەکان [واتە: ئەوانەی کە خۆیان بەسەر خەڵك و وڵاتاندا دەسەپێنن، حوکمڕانیی پادشاییانە دەکەن] کاتێك چوونە ئاوەدانییەکەوە، تێکی دەدەن و خەڵکە باڵادەستەکەشی زەبوون دەکەن و، هەر بەو شێوەیەش دەکەن.

ئا ئەوە حوکمی پادشایەتیی و خۆسەپاندنە، کە هەمیشە ئەو دەرهاویشتە خراپانەی دەبن.

٣٦- مەرج نیە، هەمیشە ڕاو بڕیاری زۆرینە لەسەر هەق بێت، بە بەڵگەی ئەوە، کە کاتێك شاژنی (سبأ)، ڕاوێژ دەکات بە بڕیار بە دەستەکانی، ئەوان زیاتر پێشنیاری جەنگی بۆ دەکەن و دەڵێن: ﴿ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴾، واتە: گوتیان: ئێمە خاوەن هێزین و خاوەن زەبری توندین، بەڵام بڕیارەکەش بە دەست تۆیەو بزانە فەرمانت بە چییە! ئنجا ئەگەر بە قسەی ئەو بڕیار بە دەستانە بووایە، بە قسەی (مَلأ) بووایە، شاژنی سەبەء و وڵاتەکەی زیانبار دەبوون، چونکە ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەیەی لەگەڵ سولەیمان و سوپایەکەیدا، دەیانکرد، بە دڵنیایی هەر تێکشکانیان پێ دەبڕا، بۆیە مەرج نیە هەمیشە ڕای زۆرینە، بیپێکێ، بۆیە دەبێ لە ڕووی بەڵگەوە، لە بیرو ڕایەکان بکۆڵدرێتەوە، نەك لە ڕووی داخۆ کێ گوتوویەتی و چەند کەس گوتوویانە؟ هەر بۆیە گوتراوە: (أُنْظُرْ إِلَى مَا قِيلَ، وَلَا تَنْظُرْ إِلَى مَنْ قَالَ)، تەماشا بکە چی گوتراوە، تەماشا مەکە کێ

گوتوویەتی، جاری وایە سەد کەس لەسەر ڕایەك کۆدەبنەوە، بەڵام بە هەڵەداچوون، چونکە هەمووی چاولێکەریی یەکدییە، بەڵام ڕەنگە یەك کەس پێکابێ.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوە نیە، کە حوکمی زۆرینە ڕەفز بکرێ، چونکە لەو شتانەدا کە زۆربەی خەڵك سەریان لێی دەردەچێ و، عەقڵیان پێی دەشکێ، ڕای زۆرینە دیارە بەکاردێ، هەم لە سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامییدا وایە: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾الشورى، کاروباریان لە نێوایان دا بەڕاوێژە، پێغەمبەریش ﷺ بە ڕای زۆرینەوە پابەند بووە، هەروەها لە دیموکڕاسییشدا وایە، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە مەرج نیە هەمیشە، زۆربە بیپێکن، بە تایبەتیی لەو شتانەدا کە هی خەڵکی پسپۆڕو شارەزان و هی ئەوە نین، کە بە گشتیی خەڵك سەری لێیان دەربچێ، لەوەدا ڕای خەڵکی پسپۆڕو شارەزا، ڕەچاو بکرێ، لە رووی بەڵگەوە، باشترە لەوەی کە تەماشای ڕەشایی و ئاپۆرایی خەڵك بکرێ، وەك من زۆرجار گوتوومە: ئەگەر مەسەلەیەکی تەندروستیی بێتە ئاراوە، پرس بە پزیشکێك دەکرێ، نەك بە خەڵك بە گشتیی، ئەرێ خەڵکینە! ڕاتان چییە؟ هەروەها بابەتێکی زمانەوانیی بێتە پێشێ، دەبێ پرس بە شارەزایانی زمان بکرێ، نەك لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵك دەڵێن: فاعیل کە مەرفووعە، دەبێ مەنصووب بێ! نەخێر، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خەڵکی شارەزا.

٣٧- دەبێ بانگەواز کاران وریابن، پەیامی خوا بە تەماع و دیاریی نەگۆڕنەوە، وەك سولەیمان عليه السلام کاتێك کە دیاریی و خەڵاتەکەی لە شاژنەوە پێ دەگات، دەڵێ: ﴿ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم ﴾، واتە: ئایا ئێوە ماڵ و سامان بۆ من دەنێرن و هاوکاریی دەکەن، ئەوەی کە خوا پێی داوم، باشترە لەوەی بە ئێوەی داوە.

٣٨- پەیامی تەنیا خواپەرستیی، فەرزە بگەیەنرێ بە هەر کەسێك و هەر شوێنێك کە دەلوێ، تەماشا دەکەین: سولەیمان عليه السلام لە شامەوە، کە ئەو کاتە شام و یەمەن، بە بارو سوارو پێرۆ هاموشۆیان لە نێواندا بووە، یەمەن شوێنێکی دوورە دەستە، بەڵام سولەیمان

ﷺ کە دەبیستێ شاژنێك لەوێ هەیەو، خەڵکەکەشی خۆر دەپەرستن، دەیەوێ پەیامی خوای پەروەردگاری پێ بگەیەنێ.

٣٩- پێویستە لە ژیانی ژیانداران ورد بینەوە، واتە: چ زیندەوەران و، چ پەڕەوەران و، چ ئاژەڵان و، هی وشکانیی و هی دەریایی و، هی نێو هەوا، لێیان بکۆڵینەوە، چونکە ژیانیان زۆر ڕێك و پێك و سیستماتیکەو، دەگونجێ مرۆڤ زۆر شتیان لێ فێر بێ، ئەو زیندەوەرانەش کە ناویان لە قورئاندا هاتوە، بە پێی ئەوە کە من تەماشام کردوە، ڕەنگە هی دیکەش هەبن، بەڵام ئەو نۆیەم بۆ دەرکەوتوون:

١- (ذباب)، مێش، کە لە سوورەتی (الحج) - ٣٧ - دا هاتوە.

٢- (بعوضة)، مێشوولە، کە لە سوورەتی (البقرة) - ٦٢ - دا هاتوە.

٣- (دابة الأرض)، مۆرانە، کە لە سوورەتی (سبأ) - ١٤ - دا، هاتوە.

٤- (العنكبوت)، جاڵجاڵۆکە، کە لە سوورەتی (العنكبوت) - ٤١ - دا، هاتوە.

٥- (النَّمل)، مێرووله، کە لە سوورەتی (النمل) - ١٨ - دا، هاتوە.

٦- (النحل)، مێشەنگوین، (هەنگ) کە لە سوورەتی (النحل) - ٦٨ - دا، هاتوە.

٧- (فراش)، پەپوولە، کە لە سوورەتی (القارعة) - ٤ - دا، هاتوە.

٨- (قُمَّل)، ئەسپێ، کێچ، کە لە سوورەتی (الأعراف) - ١٣٣ - دا، هاتوە.

٩- (الجراد)، کوللە، کە لە سوورەتی (الأعراف) - ١٣٣ - دا، هاتوە.

شایانی باسە: خاوەنی (الجواهر في تفسير القرآن الكريم)، (الطنطاوي)، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، سی (٣٠) لاپەڕی تەواوی تەرخان کردوە بۆ باسی مێروولە، کە دیارە ئەویش لە زانا ڕۆژئاوایی و ئەورووپاییەکانەوە، زانیاریی زۆری هێناوە لە بارەی ژیانی مێروولەو شارەکانی و چۆنیەتی ژیانی کۆمەڵایەتییان و، چۆنیەتی کشتوکاڵییان و، چۆنیەتی ڕێك و پێکیی کاریان، بە تەفصیل باسی کردوە.

---

(١) ج٧ ص ١٣ - ١٤ و ١٥٦ - ١٨٦.

٤٠- ڕستەی: ﴿فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ وَجِئۡتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٖ يَقِينٍ﴾ النمل،
واتە: من شتێکم زانیوە، تۆ نەتزانیوە، لە سەبەئەوە هەواڵێکی جێی دڵنیاییم بۆ هێناوی.

لێـی وەردەگیـرێ کـە مرۆڤ دەگونجێ زۆر شـت لـە باڵندان فێر ببێ، بـە کردەوەش ئێسـتا وایـە، لـە واقیعـی ئێسـتادا، ئـەم تەکنۆلۆجیایـەی ئێسـتا کـە دەیبینیـن، کۆمەڵێك لـەو شـتانەی کـە مـرۆڤ دروسـتی کـردوون، بـە لاسـایی کردنـەوەی هەندێـك لـە باڵنـدان، یاخـود دروسـتکراوەکانی دیکـە خـوای پـەروەردگارە، بۆیـە خـوا ﷻ بـاسی ئـەو هەمـوو زیندەوەرانـەی کـردوە لـە قورئانـداو، هەندێـك لـە سـوورەتەکانی قورئـان هـەر بـە نـاوی زیندەوەرانـەوە ناونـراون، بـە تایبەتیـی سـوورەتی (النمـل)و (النحـل)، ئەمـە لێـی وەردەگیـرێ کـە مـرۆڤ دەتوانـێ بـە سـەرنجدان و لێوردبوونـەوەی ژیـان و، چۆنیەتیـی کارکـردن و، بەڕێوەچـوونی زینـدەوەرو پـەڕەوەران، هەروەهـا ژیانـداران بـە گشـتیی، زۆر شـت فێـر ببـێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

پێناسە: ئەم دەرسە لە نۆ (٩) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی: (٤٥ - ٥٣)، باسی بەسەرهاتی گەلی (ثمود) دەگرێتە خۆی، کە صاڵح ﷺ پێغەمبەریان بووەو، زۆر بە کورتیی بەسەرهاتەکەیان خراوەتە ڕوو، کە چۆن صاڵح ﷺ بانگی گەلی خۆی (ثمود)ی کردوە، بۆ لای خوا ﷻ، بەڵام ئەوان بوونە دوو کۆمەڵی ناکۆك و خراپەکار، دیارە کەمینەیەك بڕوایان پێ هێناوەو، زۆربەشیان دژی بوون، بێبڕوایەکانیان کەوتوونە پیلانگێڕان، لە دژی صاڵح و بڕواداران، کە نۆ کەس یاخود نۆ گرووپ سەرپەرشتییان کردوون، هی خراپەکارەکان، سەرەنجام خوا ﷻ بڕوادارانی پارێزکاری دەرباز کردوون و، بێبڕوایانی ستەمکاری لە بەین بردوون.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ ۖ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا۟ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمْ عِندَ ٱللَّهِ ۖ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ وَكَانَ فِى ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا۟ تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَٰهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةًۢ بِمَا ظَلَمُوٓا۟ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها بە دڵنیایی صاڵحی برایانمان بۆ لای گەلی ثەموود نارد، کە خوا بپەرستن، کەچی ئەوان بوونە دوو کۆمەڵی پێکەوە ناکۆك ﴿٤٥﴾ (صاڵح) گوتی: ئەی گەلەکەم! بۆچی پەلە دەکەن بەوەی بەڵاو خراپەتان بەسەر بێ، بەر لەوەی خۆشیی و چاکەتان بۆ دەستەبەر بێ؟ دەبوایە داوای لێبوردن لە خوا بکەن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ ﴿٤٦﴾ (گەلەکەی) گوتیان: خۆت و ئەوانەی لە گەڵتدان، مایەی نەگبەتییمانن، گوتی: نەگبەتییتان لەلایەن خواوەیە بە هۆی خراپییتانەوە، بەڵکو (ڕاستییەکەی ئەوەیە) ئێوە کۆمەڵێکن (لە لایەن خواوە) تاقی دەکرێنەوە (بە خۆشییان و بە ناخۆشییان) ﴿٤٧﴾ لە شارەکەشدا نۆ کەس (یان نۆ گرووپ) هەبوون، بەردەوام خراپەکاریی و تێکدانیان لە زەویدا دەکردو، چاکسازییان نەدەکرد ﴿٤٨﴾ (لە بەینی خۆیاندا) گوتیان: بۆ یەکدی سوێند بە خوا بخۆن، کە (دەبێ) خۆی و خێزانەکەی شەوکوژ بکەین، دوایی بە سەرپەرشتیارو خوێن ئەستێنەکەی بڵێین: ئامادەی فەوتانی خێزانەکەی نەبووین و، ئێمەش ڕاستگۆیین ﴿٤٩﴾ ئیدی ئەوان پیلانێکی بڕەزایان گێڕاو، ئێمەش تەگبیرێکی تەواومان کرد، لە حاڵێکدا کە ئەوان هەستیان پێ نەکرد ﴿٥٠﴾ ئنجا تەماشا بکە! سەرەنجامی فێڵەکەیان چۆن بوو، ئێمە خۆیان و خەڵکەکەیانمان تێکڕا تەخت کردن ﴿٥١﴾ ئەوەش خانووو ماڵەکانیانن، بە هۆی ستەمکردنیانەوە چۆڵ و هۆڵن، بەسەریەکدا ڕماون، بێگومان لەوەدا نیشانەیەکی گەورەو گرنگ هەیە بۆ کۆمەڵێک بزانن ﴿٥٢﴾ ئەوانەش کە بڕوایان هێنابوو و، پارێزیان دەکرد، دەربازمان کردن [لەو سزایەی بەسەر بێبڕوایەکانماندا سەپاند] ﴿٥٣﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَخۡتَصِمُونَ): (الْمُخَاصَمَةُ: أَنْ يَتَعَلَّقَ كُلُّ وَاحِدٍ بِخُصْمِ الْآخَرِ أَيْ: جَانِبِهِ)، (مُخَاصَمَة): ئەوەیە کە هەر کامێك لە دوو لایەنەکان، یەخەی ئەوەی دیکە بگرێت، (خُصْم)، واتە: یەخە، یاخود لاتەنیشت، کەواتە: (يَخۡتَصِمُونَ)، یانی: پێکەوە ناکۆك بوون، دەمەقاڵێیان بوو.

(ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ): واتە: بە هۆی تۆوە نەگبەتیمان بۆ هات، (تَطَيَّرَ فُلَانٌ، وَطَيَّرَ، أَصْلُهُ التَّفَاؤُلُ بِالطَّيْرِ ثُمَّ يُسْتَعْمَلُ فِي كُلِّ مَا يُتَفَاءَلُ بِهِ، وَيُتَشَاءَمُ، طَائِرُهُمْ عِنْدَاللهِ، أَيْ: شُؤْمُهُمْ (طَائِرُهُ فِي عُنُقِهِ) أَيْ عَمَلُهُ الَّذِي طَارَ عَنْهُ مِنْ خَيْرٍ وَشَرٍّ)، وشەی (تَطَيَّرَ): ئەصڵەکەی ئەوەیە کە باڵندەیان هەڵفڕاندوە، ئنجا بەکاریان هێناوە بۆ ڕەشبینیی، یان گەشبینیی [باڵندەکە ئەگەر بە لای ڕاستدا فڕی بێ، گوتوویانە: (تَفَاءَلُوا)، ئەوە کارەی دەتانەوێ بیکەن، بیکەن، چونکە ئەوە خێری تێدایە، ئەگەر بەلای چەپدا ڕۆیشتبێ، گوتوویانە: (تَشَاءَموا)، مادام لای چەپی گرتوە، ئەوە نەگبەتیی و بێ خێرییە، ئەو کارەو ئەو سەفەرە مەکەن] دوایی وشەی (تَطَيَّرَ) بەکارهێنراوە بۆ هەر شتێك کە بۆ گەشبینیی، یاخود ڕەشبینیی، بەکاربهێنرێ، کە دەگوترێ: (طَائِرُهُمْ عِنْدَ اللهِ)، واتە: نەگبەتییەکەیان لە لایەن خواوەیە، یانی: بڕیاری سزادران و بەلا بەسەردا هاتنتان، لە لایەن خواوەیە، بەڵام دیارە بە هۆی خراپەی خۆتانەوەیە، کە لەسوورەتی: (الإسراء)، ئایەتی (١٣)دا، دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦ﴾، (طَائِرَهُ أَيْ: عَمَلَهُ)، ئەو کردەوەیەی کە لەوەوە دەرچووە، وەك باڵندەیەك فڕیوە، ئنجا خێر بێ، یان شەڕ بێ، هەر کەسە کردەوەی خۆی لە ئەستۆی خۆیەتی، کە کردەوەکەی مایەی خۆشبەختیی، یاخود بەد بەختییەتی.

(**رَهۡطٖ**): (**الرَهْـطُ: العِصَابَـةُ دُونَ العَـشْرَة، تِسْـعَةُ رَهْـطٍ، أي: تِسْـعَةُ جَمَاعَـاتٍ أو مَجْمُوعَـاتٍ**)، (**رَهْـط**): بـە كۆمەڵـە خەڵێـك دەگوتـرێ: كـە لـە دە (١٠) كەمـتر بـن، هەندێـك دەڵێـن: لـە سـێ تاكـو نـۆ، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ تِسۡعَةُ رَهۡطٖ ﴾، دەگونجـێ نۆ گـرووپ، نـۆ كۆمەڵـە خەڵـك، بـن، بەشـێك لـە زانایانیـش دەڵێـن: ﴿ تِسۡعَةُ رَهۡطٖ ﴾، یـانی: (**تِسْـعَةُ أشْـخَاصٍ**)، نـۆ كـەس ئنجـا ئایـا وشـەی (**رَهْـطْ**) لـە زمـانی عەرەبییـدا بـۆ كەسـێك بـە كاردێ؟ بەڵـێ، وەك دەگوتـرێ، (**خَمْـسُ ذودٍ**)، (**ذَود**) یـانی: كۆمەڵـە حوشـتر، بـەڵام لێـرەدا، واتـە: پێنـج حوشـتر، ئـەو كاتـەش وا لێكدەدرێتـەوە، كـە هـەر كامێـك لـەو كەسـانە، وەك كۆمەڵێـك وایـە لـە كاریگەریـی و توانـاو دەسترۆیشـتوویەتییدا، چ بـە بـاری خێـردا، چ بـە بـاری شـەڕدا.

(**تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ**): واتـە: لـە نێـوان خۆتانـدا سـوێند بـە خـوا بخـۆن، (**قَسَـمَ وَأقْسَـمَ، أي: حَلَـفَ**)، (**تَقَاسَـم**): لەسـەر كێـشی (**تَفَاعُـل**)ە، هـەر كامێكیـان سـوێند بـە خـوا بخـوات، بـۆ ئـەوی دیكـە، یـانی: لـە بەینـی خۆتانـدا سـوێند بـە خـوا بخـۆن، واتـە: پێكـەوە پەیـمان بـدەن و پەیمانەكەشـتان بـە سـوێند، جەختـی لەسـەر بكەنـەوە.

(**لَنُبَيِّتَنَّهُۥ**): واتـە: بـە شـەوێ بەسـەری دا بدەیـن، یـان بـە شـەوێ بیفەوتێنیـن، (**البَيُوتُ: مَا يُفْعَلُ بِاللَّيْـلِ، البَيَاتُ وَالتَّبْيِيـتُ: قَصْـدُ العَـدُوِّ لَيْـلًا**)، (**بَيُـوتٌ**): هـەر كارێكـە بـە شـەوێ دەكـرێ، (**بَيَـاتٌ وتَبْيِيـتٌ**): بریتیـە لـەوە كـە شـەوێ دوژمنێـك بـە نامانـج بگیـرێ.

(**مَهۡلِكَ**): (**المَهْلِـكَ: مَصْـدَرٌ مِيمِـيٌّ مِـنْ أهْلَـكَ**)، (**مهلـك**) چاوگـی میمییـە، یـانی: فەوتانـدن، (**مَهْلِـكَ أهْلِـهِ**) فەوتانـدنی خێزانەكـەی.

(**وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا**): واتـە: ئـەوان پیلانێـكی بێـرەزاو گەورەیـان گێـڕا، (**المَكْـرُ: صَرْفُ الغَـيْرِ عَـمَّا يَقْصِـدُهُ بِحِيلَـةٍ، وَذَلِـكَ ضَرْبَـان: مَكْـرٌ مَحْمُـود، وَذَلِـكَ أنْ يُتَحَـرَّى بِـهِ فِعْـلُ جَمِيْـلٍ، وَمَذْمُـوم، وَهُـوَ أنْ يُتَحَـرَّى بِـهِ فِعْـلُ قَبِيْـحٍ**)، وشـەی (**مَكْـر**): بـە مانـای لادانی كەسـێكە، لـەوەی كـە دەیـەوێ، بـەڵام بـە فێـڵ لای بـدەی، ئەویـش دوو جـۆرە:

مەکری ستایشکراو هەیە، ئەویش ئەوەیە کە کردەوەیەکی چاکی پێ بهێنرێتە دی، مەکری سەرزەنشتکراو و خراپ هەیە، ئەویش ئەوەیە کە کردەوەی خراپی پێ بهێنرێتە دی.

(خَاوِيَةً): یان بە مانای (خَالِيَةٌ)، (خاڵیی)یە، یان (ساقطةٌ) (کەوتوو)ە، (**أَصْلُ الخَواءِ: الخَلَاءُ، يُقالُ: خَوى بَطْنُهُ مِنَ الطَّعَامِ يَخْوَى خَوَاءً، وَأَخْوَى أَبْلَغُ مِنْ خَوَى، كَمَا أَنْ أَسْقَى أَبْلَغُ مِنْ سَقَى**)، وشەی (خَاوِيَة): ئەصڵی (خَواءِ) لە (خلاء)ە، بە مانای بۆشایی و بەتاڵیی دێ، دەگوترێ: (خَوَى بَطْنُهُ مِنَ الطَّعَامِ يَخْوَى خَوَاءً)، زگی لە خواردن خاڵیی بوو، بۆش بوو، خواردنی تێدا نەبوو، ئنجا (أَخْوَى)، مانایەکەی بەهێزترە لە (خَوَى)، ئەگەر بگوترێ: (أَخَوَى بَطْنُهُ مِنَ الطَّعَامِ)، مانایەکەی بەهێزترە، هەروەك چۆن (أَسْقَى) لە (سَقَى)، مانایەکەی بەهێزترە، واتە: خواردنەوەی پێدا، بەڵام هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (سَقَاهُ) واتە: خواردنەوەی پێدا، بەڵام (أَسْقَاهُ)، واتە: خواردنەوەی بۆ ئامادە کرد، وشەی (خَاوِيَة) وەك چۆن بە مانای (خَالِيَةٌ) دێ، یانی: خانووەکانیان بۆشن، بە مانای (سَاقِطة)ەش، دێ، واتە: ڕووخاون و ڕماون، هەڵبەتە خانووبەرەش کاتێ دانیشتووانەکانیان تێیاندا نەبن و خاڵیی بن، لە دانیشتووان، سەرەنجام بەسەریەکیشدا دەڕووخێن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئێمە پێشتریش گوتمان: کە لە تەفسیری سوورەتی (الحجر)دا، بە درێژیی بەسەرهاتی صاڵح و گەلەکەیمان، کردوە، بۆیە لێرەدا بە خێرایی بەسەریدا ڕەت دەبین.

خوا ﷻ هەر لە ڕیزی ئەو بەسەرهاتانەی لەم سوورەتە موبارەکەدا، بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و بۆ هاوەڵانی بەڕێزی بە پلەی یەکەم، لە دوای ئەوانیش بۆ هەموو جیلەکانی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ، دەیانگێڕێتەوە: بەسەرهاتی گەلی ثەموودو پێغەمبەرەکەیان (صاڵح)ە، عليه السلام، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا﴾، بە دڵنیایی بۆ لای گەلی ثەموود، صاڵحی برایمان نارد، بۆچی خوا ﷻ تەئکید دەکاتەوە؟ لەبەر ئەوەی دوێنراوەکان - هەڵبەتە لە بێبڕوایان، نەك لە ئیمانداران - وا مەزندە کراون، کە بڕوایان بەوە نەبێ خوا پێغەمبەرێکی بە ناوی صاڵحی بۆ لای گەلی ثەموود ناردبێ، بۆیە خوا ﷻ بە (ل)ی سوێندو (قد)ی ساغکردنەوە هێناویەتی، واتە: سوێند بە خوا، دڵنیابن ئێمە صاڵحی برایمان بۆ لای گەلی ثەموود نارد، ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ﴾، پێی فەرموون، بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و خوا بپەرستن، دیارە ئەوان شتی دیکەیان پەرستوە، ﴿فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ﴾، کتوپڕ ئەوانت بینی، بوونە دوو کۆمەڵی پێکەوە ناکۆك، کەمینەیەك لایەنگری صاڵح بوون، بڕوایان پێ هێناوەو، زۆرینەیەکیش لەگەڵی ناکۆك بوون و دژی بوون.

﴿قَالَ يَـٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ﴾، گوتی: ئەی گەلەکەم! بۆچی پەلە دەکەن، لە (هاتنی) خراپە پێش چاکە، واتە: بۆچی پەلە دەکەن خراپەتان بەسەر بێ، بەڵاتان بەسەر بێ، پێش ئەوەی چاکەتان بێتە ڕێ، خراپەتان

بەسەر بێ و، بەڵاتان بەسەر بێ، بە هۆی بێبڕواییتانەوە، پێش ئەوەی چاکەتان بێتە ڕێ، بە هۆی ئیمانەوە، یان: بۆچی پەلە دەکەن، کە خوا لە دواڕۆژدا سزاتان بدات، لەسەر بێبڕواییتان، لە جیاتی ئەوەی کە پاداشتتان بداتەوە، بە هۆی ئیمانتانەوە؟ ﴿لَوۡلَا تَسۡتَغۡفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾، دەبووایە داوای لێبووردن لە خوا بکەن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ، بە هۆی داوای لێبووردن لە خوا کردن و، پەشێمان بوونەوەو، گەڕانەوەو، ڕێی ڕاست گرتنەوە، چونکە بەزەیی خوا، بە گوێرە نابەخشرێ و، بە کەسانی شایستە دەبەخشرێ، ﴿قَالُواْ ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ﴾، گوتیان: ئێمە نەگبەتییمان تووش بوو، بەڵامان تووش بوو، بە هۆی خۆت و ئەوانەوە کە لەگەڵتن، دیارە دەبێ دوای ئەوەی صاڵح دەستی کردوە بە بانگەوازو گەیاندنی پەیامی خوا پێیان، ناڕەحەتییان تووش بووبێ و بەڵاو گرفتارییان بەسەرهاتبێ، ئنجا لە ڕووی کشتوکاڵیان و لە ڕووی ئاژەڵیانەوە، یاخود لە ڕووی ژیانی دیکەیانەوە، گوتوویانە: ئەو بێخێریی و نەگبەتییە، بە هۆی صاڵح و ئەوانەوەیە کە لەگەڵیدان، واتە: بڕواداران.

﴿قَالَ طَـٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾، صاڵح پێی فەرموون: نەگبەتییەکەتان لەلایەن خواوەیە، واتە: ئەو بەڵایەی ئێوە بە نەگبەتیی دەزانن، ئەوە لە لایەن خوای دادگەرەوە بڕیاری لەسەر دراوە، ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ﴾، بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە: ئێوە کۆمەڵێکن، تاقیدەکرێنەوە، ئنجا خوا کە بەندەکانی تاقیدەکاتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗ ۖ ٣٥﴾ الأنبياء، بە خۆشیی و بە ناخۆشیی تاقیتان دەکەینەوە، ئەوە واتایەکی، واتایەکی دیکەی: ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ﴾، بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکن خوا سزاتان دەدات، یانی: (تُفۡتَنُونَ)، واتە: (تُعَذَّبُون)، خوا سزاتان دەدات، بە هۆی هەڵوێستی نەرێنیی و خراپتانەوە لە بەرانبەر من و، لە بەرانبەر ئەو پەیامە خواییەدا کە بۆم هێناون.

﴿وَكَانَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ تِسۡعَةُ رَهۡطٖ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ﴾، هەروەها لە شارەکەدا (شاری حیجری پێگوتراوە، ئێستاش شوێنەوارەکانی ماون،

لـە سـەرووی دورگـەی عەرەبیـی و لـە نێـوان شـام و دوورگـەی عەرەبییەوەیـە)، نـۆ کـەس هەبـوون، یاخـود نـۆ تاقـم و گـرووپ هەبـوون، خراپەیـان لـە زەوییـدا دەکـرد، (لـە زەوی وڵاتـێ کـە گەلـی ثەمـوودی تێـدا دەژیـا) هەرگیـز چاکەکارییـان نەدەکـردو، چاکسـازییان نەدەکـرد، هـەر سـەرگەرمی خراپـەو تێکـدان بـوون، ئنجـا ئـەو نـۆ کەسـە، یاخـود ئەو نـۆ گـرووپ و دەسـتەو تاقمـە، ﴿ قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ ﴾، گوتیـان: وەرن بـا بەیەکـەوە سـوێند بـە خـوا بخۆیـن، سـوێند بـۆ یەکـدی بخۆیـن، بـە خـوا، چونکـە (تَقَاسُم) لەسـەر کێـشی (تَفَاعُل)ە، لـە (قَسَم)ەوە هاتـوە، واتـە: هـەر کامێکـمان سـوێند بخـوات بـۆ دڵنیـا کـردنی ئـەوی دیکـە، کـە ڕاسـت دەکات، لـە جێبەجێکـردنی ئـەو پیـلان و نەخشـەیەدا کـە دایدەڕێژیـن، وەرن بـا پێکـەوە سـوێند بـۆ یەکـدی بخۆیـن بـە خـوا، دیـارە ئەوانـە خواناسـیش بـوون و خوایـان ناسـیوە، بـەڵام هاوبەشـیان بـۆ دانـاوەو، بـەو شـێوەیە نەیانپەرسـتوە کـە شایسـتەی خوایـە.

ئنجـا ئایـا بۆچـی سـوێند بـۆ یەکـدی بخـۆن بـە خـوا؟ ﴿ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ﴾، کـە بـە شـەوێ خـۆی و خێزانەکـەی شـەوکوژ بکەیـن، (تَبیِیت): ئەوەیـە کـە دوژمـن بـە ئامانـج بگیـرێ بـە شـەوێ، واتـە: بـە شـەوێ بیانفەوتێنیـن، خـۆی و خێزانەکـەی، ﴿ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ ﴾، دوایـی بـە دڵنیاییـەوە بـە سەرپەرشـتیارو خوێـن ئەسـتێنەکەی دەڵێیـن، ﴿ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ ﴾، ئێمـە فەوتـانی خێزانەکەیـمان ئـاگا لـێ نەبـووە، واتـە: ئێمـە ئامانجـمان فەوتانـدنی ساڵحـە، بـەڵام بـا خێزانەکـەشی پێـوە بفەوتێنیـن، دوایـی سـوێند دەخۆیـن، بـۆ خزمـەکانی و ئەوانـەی خوێنکـرو خوێـن ئەسـتێنني، بـۆ ئـەوەی سـوێندمان لـێ نەکـەوێ، دەڵێیـن: ئێمـە ئاگامـان لـە فەوتاندنی خێزانەکـەی نەبـووە، چونکـە خێزانەکـەی لـە پەنـای ساڵحـدا دەفەوتێـن و، ئێمـە بـە ئامانجیـان ناگریـن، بـە پلـەی یەکـەم ئێمـە مەبەسـتمان پـێ ساڵحـە، بـۆ ئـەوەی سـوێندمان لـێ نەکـەوێ، ویسـتوویانە سـوێندەکەیان لـێ نەکـەوێ، بـە حیسـابی خۆیـان، ﴿ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴾، بـە دڵنیایی ئێمـە لـە ڕاسـتانین، لـەو قسـەیەماندا کـە دەیکەیـن.

﴿ وَمَكَرُواْ مَكْرًا ﴾، ئەوان پیلانێکی بێڕەزاو، پیلانێکی تەواو و بە مانای وشەیان گێڕا، ﴿ وَمَكَرْنَا مَكْرًا ﴾، ئێمەش نەخشەیەکی بە مانای وشەمان دانا، (مَكر) دەگونجێ بۆ چاکە بەکاربێ، دەشگونجێ بۆ خراپە بەکاربێ، ئەو نەخشەیەی دادەنرێ، ئەگەر ئامانجێکی باشی لە پشتەوە بێ، ئەوە مەکرێکی باشەو، ئەگەر ئامانجێکی خراپی لە پشتەوە بێ، ئەوە مەکرێکی خراپە، وەك (راغب الأصفهاني)، دەڵێ: (هُنَاك مَكرٌ مَحْمُود وَمَكرٌ مَذْمُوم)، بەڵام بۆ خوای پەروەردگار، وشەی نەخشەمان بەکارهێناوە، نەك فێڵ، چونکە (مَكر) بە مانای فێڵ و پیلان دێ، بەڵام بۆ خوای تاك و پاك، دەبێ تەعبیرو وشەیەك بەکاربێ، کە شایستەی خوا ﷻ بێ، هەڵبەتە لە قورئاندا خوای بەبەزەیی هەر وشەی (مَكر)ی بۆ خۆی بەکارهێناوەو، وشەی (كَيد)یشی بەکارهێناوە، ﴿ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ ﴾الطارق، کە لە زمانی عەرەبییدا، (مَكر)و (كَيد) و (حيلة) هەر سێکیان بە مانای فێل دێن، وەك لە نامیلکەی: (ئەحمەدیی)دا دەڵێ:

{مەکرو کیدو حیلە فێڵە، جەبین و جەبهە تەوێڵە} (جبين) و (جبهة) هەردووکیان بە نێوچاوان دەگوترێن، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە زمانی کوردییدا ئەگەر بڵێی: فێڵباز، یان فێڵی کرد، یان پیلانی گێڕا، زیاتر بە مانا خراپەکەی لێکدەدرێتەوە، بۆیە پێویستە کاتێك کە وشە قورئانییەکان، تەرجەمە دەکەین، چ بۆ کوردیی بێ، چ بۆ زمانێکی دیکە بێ، تەماشا بکەین، ئەگەر ئەو وشەیە، وشەیەك بێ، بۆ هەردووك باری خێرو شەڕدا بەکاربێ، قەیناکات، بەکاری بێنین، بەڵام ئەگەر تەنیا بۆ بارە نەرێنییەکەی بەکاربێ، دەبێ وشەیەکی دیکە، کە ئەو واتایە بگەیەنێ، بۆ بارە ئەرێنیەکەی بەکاربێنین بۆ خوا ﷻ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿٢٧﴾ ﴾الروم، واتە: سیفەتی هەرە بەرز، هی خوایە لە ئاسمانەکان و زەویدا، نابێ وشەو تەعبیرێك بۆ خوا بەکاربهێنرێ، کە شایستەی نەبێ، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەوان پیلانێکی تەواویان گێڕا، پیلانێکی بێڕەزا، ئێمەش نەخشەیەکی باشمان دانا، ﴿ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾، بێ ئەوەی ئەوان هەستی پێ بکەن.

﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ ﴾، سەرنج بدە! سەرەنجامی پیلانەکەیان و فێڵەکەیان چۆن بوو؟ ﴿ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾، ئێمە خۆیان و گەلەکەیامان هەموو کاولکردن، بەسەریەکماندا ڕماندن و، تەختمان کردن، لێرەدا خوا ﷻ ئەوانی تەشبیه کردوە بە خانووێکەوە، کە دەڕووخێنرێ، ئەگەرنا (تَدمیر) بە مانای ڕوخاندن و ڕماندنی خانووبەرەیە، بەڵام ئەوانی تەشبیه کردوە، بە چەند بینایەکەوە، کە دەڕووخێنرێن، یانی: بەسەر یەکدا دەخرێن، هەموویامان تێکڕا ڕووخاندو تەختمان کردن.

﴿ فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ خَاوِيَةَۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْۚ ﴾، ئا ئەوانە ماڵەکانیانن، چۆڵن بە هۆی ستەمەکەیانەوە، یاخود (سَاقِطَةً) یانی: بەسەر یەکدا ڕماون، بە هۆی ستەمێکەوە کە کردیان، (ما) لە (بِمَا ظَلَمُوٓاْ)دا (ما)ی چاوگیی (مصدرية)یە، یانی: (بِظُلمِهِم)، بەستەمەکەیان یاخود (بِمَا ظَلَمُوٓاْ)، (ب) هۆکاریی (سببية)یە، یانی: (بالظُّلمِ الذي فعلوه)، بەو ستەمەی کە کردیان، خانووبەرەکانیان چۆڵ و هۆڵن، بەسەریەکدا ڕماون، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾، بێگومان لەوەدا نیشانەیەکی گەورەو گرنگ هەیە، بۆ کۆمەڵێک بزانن، بەڵام خەڵکێک کە نەزان و نەفام و بێ ئاگابێ، هیچ پەند وەرناگرێ، ﴿ وَأَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾، ئەوانەش کە بڕوایان هێنا بوو و پارێزیان دەکرد، ئەوانەمان دەرباز کرد، واتە: دەربازمان کردن لەو سزایەی ئەوانی گرتەوەو، ئەوانی فەوتاندن و سەریان پێی بە فەتارەت چوو.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**ڕەوانەکردنی صاڵح ﷺ بۆ لای گەلی ثەموودو، ئامۆژگاریی کردنی بۆیان و، تۆمەتبارکردنی ئەوان بۆی، کە خۆی و شوێنکەوتووانی هۆکاری نەگبەتیی و بەڵادارییان و، بەرپەرچدانەوەی صاڵح بۆیان، کە بە پێی سیستمی خوا ﷻ: لە ئەنجامی خراپەو لادانی خۆیانەوە، نەگبەتیی و بەڵایان بەسەر دێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ ۖ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا۟ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمْ عِندَ ٱللَّهِ ۖ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا﴾، بە دڵنیایی ئێمە صاڵحی برایانمان بۆ لای گەلی ثەموود نارد، (و) بادەرەوە (عاطیفة)یە، بۆ سەر ئەو بەسەرهاتانەی پێشتر باسکراون، واتە: وەك چۆن ئەو بەسەرهاتانە بوون، وەك چۆن: مووسامان ﷺ بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی نارد، هەروەها داوودو سولەیمانمان ناردن، بە هەمان شێوەش صاڵحمان بۆ لای گەلی ثەموود نارد، کە برای خۆیان بوو، ئنجا (ل) لامی سوێندە: سوێند بە خوا، (قَد)یش بۆ ساغکردنەوە (تَحقِیق)ە، یانی: سوێند بە خواو بە دڵنیایی ئێمە صاڵحی برایانمان بۆ لای گەلی ثەموود نارد، بۆیەش فەرموویەتی: صاڵحی برایان، لەبەر ئەوەی هەر لە گەلی ثەموود بووە، لە ڕووی ڕەچەڵەك و لە ڕووی نەتەوەییەوە، ئەگەرنا هەموو پێغەمبەران برای گەلە کافرەکانیان بوون، لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە.

(لقد)یـش کـە بـۆ جەختکردنـەوەو دڵنیاکردنەوەیـە، مەبەسـت پێـی دانـانی دوێنراوانـە - وابـن یـان نـا - وەك نکووڵییکـەران لـە نێـررانی پێغەمبـەران علیهـم السلام بـۆ لای کۆمەڵگایەکاینـان.

٢)- ﴿ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ ﴾، کە خوا بپەرستن، (أن: تَفۡسِيرِيَّةٌ) (أن) بۆ ڕوونکردنەوەیە، ئەوەی لە دوایی (أن) دێ، ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەوەی پێشتر گوتراوە، پێی فەرموون: بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، خوا بپەرستن.

٣)- ﴿ فَإِذَا هُمۡ فَرِيقَانِ يَخۡتَصِمُونَ ﴾، ئیدی کت و پڕ ئەوان بوونە دوو کۆمەڵی پێکەوە ناکۆك، پێکەوە بە دەمەقاڵێ هاتن، بە (ف) (تعقیب)و، بە (إذا)ی (فُجائية)، یانی: یەکسەر بە دوای ئەوەدا، کتوپڕ بوونە دوو کۆمەڵی پێکەوە ناکۆك و، پێکەوە تێکگیراو، پێکەوە دەمەقاڵێکەر، کە بێگومان کتوپڕ ڕووی نەداوەو ماوەیەکی پێچووە، بەڵام لەبەر ئەوەی دابەش بوونەکەیان لە بەرانبەر صاڵحدا، کە زۆرینەیان پێی بێبڕوا بوون و کەمێکیان بڕوایان پێ هێناوە، شتێکی ناپەسند بووە، وەك شتێکی چاوەڕوان نەکراو بووبێ، بۆیە بەوجۆرە هاتوە. پێشێ دەفەرموێ: (فَرِيقَانِ)، بەڵام لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (يَخۡتَصِمان)، دەفەرموێ: (يَخۡتَصِمون)، بە ئیعتیباری ئەوە کە هەر کام لەو دوو کۆمەڵە، ژمارەیەکی زۆر خەڵکیان تێدا بووەو، هەموویان کۆمەڵە خەڵکێك بوون، بۆیە ڕاناوی کۆی بۆ بەکارهێناون، ئنجا ئەو دوو کۆمەڵەش، کۆمەڵی خۆ بەزلگرانی بێبڕوا بوون، کە زۆرینە بوون، هەروەها کۆمەڵی چەوسێنراوانی بڕوادار بوون.

٤)- ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ لِمَ تَسۡتَعۡجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾، (صاڵح) گوتی: ئەی گەلەکەم! {یانی: من یەکێکم لە ئێوەو گەلی خۆمن و خەڵکی خۆمن} بۆچی پەلە دەکەن، لە هاتنی خراپە، پێش چاکە، ئەمە چەند واتایەکیان بۆ لێکداونەوە:

أ- بۆچی پەلە دەکەن لە خراپە، کە بریتیە لە بە درۆدانانی من، لە جیاتی چاکەو پێش چاکە، کە بریتیە لە بڕواهێنان بە من؟

ب- بۆچی پەلە دەکەن لە هاتنی خراپە، کە بریتیە لە سزا بەسەردا سەپێنرانتان، پێش چاکە، کە بریتیە لەوەی خوا بەزەیی پێتاندا بێت و چاکەتان لەگەڵدا بکات؟

ج- بۆچی پەلە دەکەن لە شتێکدا کە سزاتان بۆ دێنێ، سزای خراپتان بۆ دێنێ، لە پێش ئەوەداو، لە جیاتی ئەوەی پەلە بکەن لە کردەوەیەکدا، لە هەڵوێستیکدا کە پاداشتی چاکتان بۆ بێنێ؟

٥)- ﴿لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾، دەبووایە داوای لێبوردن لە خوا بکەن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنرێ.

ئەمە هاندانیانە بۆ گەڕانەوە، پیشتر ڕەخنەیان لێ دەگرێ: ئێوە بۆچی پەلە دەکەن، کە خراپەتان بەسەر بێت؟ بۆچی خراپە هەڵدەبژێرن بەسەر چاکەدا؟ دواییش هانیان دەدات کە بگەڕێنەوەو داوای لێبوردن لە خوا بکەن، واز لە پەلەکردن لە سزاو بەڵا بەسەر هێنرانیان، بێنن یان: وازبێنن لە هەڵبژاردنی خراپە - کە بێبڕواییە بە صالح - و ڕوو لە چاکە بکەن و داوای لێبوردن لە خوا بکەن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ.

٦)- ﴿قَالُوا اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ﴾، گوتیان: ئێمە بە هۆی تۆو ئەوانەوە کە لەگەڵت دان، بەڵامان تووش بوو، نەگبەتیمان بۆ هات، پێشتر گوتمان: (تَطَيُّر) لە چییەو هاتوە: عەرەبەکان عادەتیان وابووە ئەگەر ویستبیان کارێك بکەن، باڵندەیان هەڵفڕاندوە، ئنجا ئەگەر بەلای ڕاستدا ڕۆیشتبێ، پێیان وابووە ئەو کارەی کە بە تەمان بیکەن، چاکەو گوتوویانە: (تَفَاءَلُوا)، یان (تَيَامَنُوا)، ئەگەر بەرەو لای چەپیش فڕیبێ، پێیان وابووە کە کارەکە خراپەو گوتوویانە: (تَشَاءَموا) ئەگەر نە بەلای ڕاست و نە بەلای چەپیشدا، فڕی بێ، جارێکی دیکە باڵندەیەکی دیکەیان هەڵفڕاندوە، ئنجا لەوەوە وشەی (تَطَيُّر)، بە مانای ڕەشبینیی (تَشَاؤم)و بە مانای گەشبینیی (تَفَاؤل) بەکارهاتوە، بەڵام زیاتر بە مانای ڕەشبینیی (تَشَاؤم)، واتە: بێخێریی و نەگبەتیی لەو شتەدا هەیە، ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو حاڵەتی ڕەشبینیی و گەشبینییە، لە هەڵفڕاندنی باڵندەوە، سەرچاوەی

گرتوە، بۆیە وشەی (تَطَيُّر)یان بۆ بەکارهێناوە، ئەگەرنا هەر شتێکی دیکەش بێ، تۆ بیکەی بە نیشانە بۆ گەشبینیی و ڕەشبینیی، هەر (تَطَيُّر)ی پێ دەگوترێ، چونکە ئەصڵەکەی لەوێوە هاتوە.

٧)- ﴿ قَالَ طَـٰٓئِرُكُمْ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، (صالح) گوتی: نەگبەتیی ئێوەو بەڵایەکەتان کە بەسەرتان هاتوە، بە پێی یاسای خوایە لە دروستکراوەکانی دا، بە پێی سیستمێکە خوا ﷻ دایناوە، کە هەر کەسێك خراپە بکات، خراپەی بەسەر دێ و، خراپەی دێتەوە ڕێ، هەر کەسە چیی بچێنێ، ئەوە دەدوورێتەوە، ئێوەش تۆیی بێبڕواییتان چاندوە، بۆیە بەرهەمی نەگبەتیی و بێ خێریی و بەڵاو گرفتاریی دەدوورنەوە، واتە: ئەو بەڵایەی کە بەسەرتان هاتوە، لەلایەن خوای کارزانەوەیەو بە هۆی سیستمی خوایە ﷻو، ئەوە جۆرێکە لە سزادانی خوا ﷻ، بۆ ئێوە.

٨)- ﴿ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴾، بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکن سزا دەدرێن، یان: لادەدرێن، یان: تاقییدەکرێنەوە.

وشەی: (بَلْ) بۆ (إضْراب)ە، واتە: گواستنەوە لە حاڵێکەوە بۆ حاڵەتێکی سەرووتر، ئنجا ئەمە سێ واتای هەن:

أ- هۆی نەگبەتییەکەتان ئەوەیە کە شەیتان ئێوەی لاداوەو ئێوە لا دەدرێن، (تُفْتَنُون): (تُحَرَّفُون)، ئێوە لادەدرێن، بە هۆی ئەوەوەیە کە شەیتان لاتان دەدات.

ب- مەسەلەکە ئەوەیە کە ئێوە لە لایەن خواوە تاقیدەکرێنەوە، دوایش بەڵاتان بەسەر دێ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە دەرنەچوون لە تاقیکردنەوەی خوا ﷻ.

ج- یاخود (تُفْتَنُون)، یانی: (تُعَذَّبون)، واتە: هۆی بێبڕواییتانەوە، ئێوە هەم لە دنیادا، هەم لە دوارۆژیشدا سزا دەدرێن، ﴿ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴾، ئێوە کۆمەڵێکن سزا دەدرێن، ئەو بەڵاو نەگبەتییانە هۆکاریان ئەوەیە کە سزا دەدرێن، هەم لە دنیادا سزا دەدرێن، هەم لە دوارۆژیشدا.

کەواتــە: بزانــن کــە ســەرچاوەی نەگبەتیــی و نەهامەتیــی و گرفتارییەکانتــان خۆتانــن، نــەك مــن و خەڵکەکــەم، کــە لەگەڵمــدان، هۆکارەکــەی خۆتانــن، بــەڵام خــوا ﷻ ئــەو ســزایەتان بەســەردا دەدات، لەبــەر ئــەوەی هەمــوو شــتێك لــە خــوای پەروەردگارەوەیــە، ئــەم دنیــاو گەردوونــەش شــاری بــێ خــاوەن نیــە، خــواش بــە پێــی سیســتمێکی دادگەرانــە، دروســتکراوەکانی سەرپەرشــتیی دەکات و بەڕێوەدەبــات.

**مەسەلەی دووەم:**

**پیلانگێرانی نۆ کەس (یان نۆ تاقم)ی تێکدەر لە دژی صالح ﷺ، کە سوێند بۆ یەکدی بخۆن بە خوا: صالح و خێزانەکەی شەوکوژ بکەن، دوایی بە خزمەکانی بڵێن: ئامادەی فەوتانی خێزانەکەی نەبووین و ئاگامان لێ نەبووە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ ﴾، لە شارەکەدا، نۆ کەس (یان نۆ کۆمەڵ) هەبوون دیارە (ال)ی سەر (الْمَدِينَةِ)، بۆ عەهدە، واتە: لە شارە زانراوەکەدا، کە شاری (حیجر) بووە، پایتەختی وڵاتی خۆیان، ئەو کاتە دەوڵەتۆکە شارەکان (دويلات المدن) هەبوون، واتە: هەر شارێك دەوڵەت بووە، لەوێدا نۆ کەس هەبوون، (تِسْعَةُ رَهْطٍ) یانی: (تِسْعَة رِجَال)، یاخود (رَهْطٍ) هەر لەسەر مانا زمانەوانییەکەی خۆیەتی، کە بریتیە لە کۆمەڵە خەڵکێك لە سێ تاکو نۆ، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، یانی: (تِسْعُ مَجْمُوعَاتٍ)، نۆ گرووپ هەبوون.

٢)- ﴿ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴾، تێکدان و خراپەکارییان دەکرد لە زەوییداو چاکەکاریی و چاکسازییان نەدەکرد، (فِي الْأَرْضِ) لێرەدا (ال)ی (الأرض) بۆ (عهد)ە، واتە: سەر زەمینێ کە گەلی ثەموودی لێ دەژیان، کە (حجر)ە، لەسەر زەمینەکەدا، لە وڵاتی حیجردا، تێکدانیان دەکرد، (وَلَا يُصْلِحُونَ)، هەرگیز چاکسازییان نەدەکرد، بەس خەریکی خراپەو تێکدان بوون.

٣)- ﴿ قَالُوا تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ ﴾، ئنجا ئەو نۆ کەسە خراپ و تێکدەرە، یاخود ئەو نۆ دەستەو تاقمە: گوتیان وەرن، سوێند بەخوا خۆرانە، یان: سوێند بەخوا بخوێن بۆ یەکدی، کەواتە: (تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ)، دوو واتای هەن:

أ- (قَالَ بَعْضُهُم لِبَعْض إحْلِفُوا بِاللّه)، به یەکدییان گوت: وەرن با سوێند به خوا بخۆین، بۆ یەکدی.

ب- (قَالُوا مُتَقَاسِمِیْنَ باللّه)، گوتیان له حاڵێکدا که سوێندیان بۆ یەکدی بۆ خوا دەخوارد.

٤)- ﴿لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ﴾، به دڵنیایی خۆی و خێزانەکەی شەوکوژ دەکەین، (لَنُبَيِّتَنَّهُۥ)، یانی: به شەو هێرشیان دەکەینە سەری، (البَيَاتُ: مُبَاغَةُ العَدُوِ لَيْلًا، أو قَصْدُ العَدُوّ لَيْلًا) (بیات) ئەوەیە کتوپڕ شەو بەسەر دوژمندا بدرێ، یاخود شەو دوژمن بە ئامانج بگیرێ، که به کوردیی: شەوکوژم بۆ بەکارهێناوە، چونکه مەبەستیان بووە بە شەوێ بیانکوژین و بیانفەوتێنین.

ئنجا ئەو (لَنُبَيِّتَنَّهُۥ) خوێندراویشەتەوە: (لَتُبَيِّتُنَّهُ)، یانی: وەرن دەبێ سوێند بە خوا بخۆن، بیانفەوتێنن، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (لَيُبَيِّتُنَّه وَأَهْلَهُ)، واتە: بێگومان خۆی و خێزانەکەی دەبێ بفەوتێندرێن.

به هەر سێ شێوەکان خوێندراوەتەوە.

٥)- ﴿ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدۡنَا مَهۡلِكَ أَهۡلِهِۦ﴾، دوایی به سەرپەرشتیارەکەی، دەڵێین: ئێمه ئاگاداری فەوتانی خێزانەکەی نەبووین.

ئەم (ل)ە، بۆ سوێندە (لام القسم)، (ن) کەش بۆ جەختکردنەوەیە، یانی: بەختکردنەوەوە سوێند دەخۆین بۆ سەرپەرشتیارەکەی، بۆ خوێن ئەستێنەکەی، ئەو کەسەی بەرگریی لێدەکات و خوێنکرو خوێن ئەستێنیەتی، که:

﴿مَا شَهِدۡنَا مَهۡلِكَ أَهۡلِهِۦ﴾، ئێمە ئاگامان لە فەوتانی خێزانەکەی نەبووە. (مَهْلِك)، بە دوو جۆری دیکەش خوێنراوەتەوە: أ- (مَهْلَك) و ب- (مُهْلَك)، (مَهْلِكَ أهلِهُ أي هَلَاكَهُ)، فەوتانی خێزانەکەی ئاگامان لێی نەبووە، (مَهْلِك)، هەم بە مانای چاوگ (مصدر) دێ، واتە: (هَلَاكَهُ)، هەم بە مانای ناوی شوێن (إسْمُ المَكَان) دێ، واتە: شوێنی فەوتانەکەی، ئێمە لەوێ نەبووین، (مَا شَهِدنَا)، یانی: (مَا حَضَرْنَا)،

ئامادە نەبووین، ئنجا (مَهْلَكَ أهلِهِ) و (مُهْلَكَ أهلِهِ)، هەردووكیان بە هەمان شێوە، بە مانای چاوگ و بە مانای شوێن دێن، واتە: خۆی و خێزانەكەی دەفەوتێنین، دوایی سوێند بۆ ئەو كەسە دەخۆین كە سەرپەرشتیاریەتی و خوێنكرو خوێن ئەستێنیەتی، سوێندی بۆ دەخۆین، بە دڵنیاكردنەوە، كە ئێمە ئاگامان لە فەوتانی خێزانەكەی نەبووە.

٦)- ﴿ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ ﴾، بە دڵنیاییش ئێمە لە ڕاستانین، واتە: لەبەر ئەوەی مەبەستیان ئەوە نەبووە خێزانەكەی بفەوتێنن، بۆیە ئەگەر سوێندیش بخۆن، سوێندیان لێناكەوێ! سوێند خواردنی بە درۆ، هێندە خراپە گەلی ثەموودیش و لە نێویان دا ئەو نۆ كەسە خراپ و ملهوڕە، یان ئەو نۆ دەستەو تاقمە خراپەش، ویستوویانە سوێندی بە درۆ نەخۆن، بە جۆرێك لە جۆرەكان پینەو پەڕۆیەكی بۆ بكەن و، حیلە شەرعییەكی بۆ بدۆزنەوە!

دیارە ئەوانە جۆرێك لە عەقیدە و دینداریبیان هەبووە، مادام خوایان ناسیبێ، جۆرێك لە دینداریبیان هەبووە، ئنجا بە پێی ئەو دینەی خۆیان، سوێندی بە درۆ خراپ بووە، بەڵام ئامادە بوون، پێغەمبەری خوا بكوژن! هەڵبەتە دەبێ بە پێغەمبەریان نەزانیبێ؟ بە دڵنیایی بڕیار بە دەستەكان و كاربەدەستەكان زانیویانە، بابەتەكە چۆنە! بەڵام خەڵكیان بەوجۆرە چەواشە كردوە.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**پیلانگێڕانی نۆ کەسەکەو، نەخشەی مەحکەمی خوا لە دژیان و، سەرەنجام فەوتانیان و مانەوەی ماڵ و خانووەکانیان بە چۆڵیی و ڕماویی و، دەربازکردنی بڕوادارانی پارێزکار، لەو بەڵاو سزایە کە بەسەر بێبڕوایەکاندا هاتوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ خَاوِيَةَۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا ﴾، ئەوان پیلانێکی بێرەزایان گێڕا، ئێمەش نەخشەیەکی باشمان، دانا، لە دژی پیلانەکەی ئەوان و بۆ پووچەڵکردنەوەی پیلانەکەی ئەوان.

٢)- ﴿ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەوان هەستیان پێنەدەکرد.

هەڵبەتە خوا ﷻ (لَطِيفٌ خَبِيرٌ)ە، پەنهانکاری شارەزایە، نەخشەی خوا ﷻ، مرۆڤەکان هەستی پێناکەن، هەڵبەتە هەندێ لە تەفسیرەکان زۆرجاران هەندێ قسە دەکەن، کە بە بۆچوونی من لە خەیاڵدانی خۆیانەوە، بە خەیاڵ و ئەندێشەو بیرکردنەوەی خۆیان، ئەو قسانە دەکەن و، مادام ئایەتەکە هیچ شتێکی دیاریی نەکردوە، بۆمان نیە بڵێین: بە دڵنیایی هەر ئەوە مانایەکەیەتی، بۆ وێنە: لەوبارەوە کە ئایا ئەو پیلان و فێڵەی ئەو نۆ کەسە، یان نۆ تاقمە کردیان، لە دژی صالح و خێزانەکەی چی بوو؟

أ- هەندێکیان گوتوویانە: ئەو نۆ کەسە، یان تاقمە چوونە دەر، شمشێرەکانیان دەرکێشا بوو لە کالانەکانیان و، بە ڕووتیی بە دەستیانەوە گرتبوون و، هێرشیان کرد، بۆ سەر ماڵی صالح، بەڵام فریشتە بەرد بارانیان کردن و بە بەرد کوشتیانن.

ب- هەندێکی دیکە گوتوویانە: ئەو نۆیە چوونە نێو خندرکێکەوە، نێو ئاودڕێکەوە کە ئاو دڕیبووی، یان شوێنێك کە ئاو بنکۆڵی کردبوو، چوونە ژێری و خۆیان لەوێدا پەنهان کرد، بۆ ئەوەی دوایی شەبەیخوون بکەنە سەر صالح و ماڵ و خێزانەکەی، خواش ﷻ ئەوێی بەسەردا ڕووخاندن.

بێگومان بە شێوەیەك لە شێوەکان خوای دادگەر سزای داون، کە لە شوێنی دیکەدا دیاریکردوە، کە دەفەرموێ: ئەوان پیلانیان گێڕاو، ئێمەش نەخشەیەکی باشمان دانا، بۆ پووچەڵکردنەوەی پیلانەکەی ئەوان، ئەوە چەمکەکەی گشتییە، (الطبري) خوا لێی ڕازی بێ، زۆر جوان دەڵێ: دەگونجێ بە شمشێر بووبێ، دەشگونجێ شتێکیان بەسەردا ڕووخابێ، بۆ وێنە: چووبنە نێو ئەشکەوتێك و ئەشکەوتەکەیان بەسەردا ڕووخابێ، دەشگونجێ خوا ﷻ بە مەلائیکەتان بەرد بارانی کردبن، هەموویان دەگونجێن، بەڵام هیچی مسۆگەرو ڕوون نیە، بۆیەش خوا ﷻ هەندێك جاران، جۆری سزایەکە دیار ناخات، بۆ ئەوەی زەین بە هەموو لایەك دا بچێت، ئەگەرنا لێرەدا بۆ نۆ کەس، یان تاقمەکە باسی نەکردوە، وەك لە بەسەرهاتی صالح و گەلەکەی دا لە کاتی توێژینەوەی سوورەتی (الحجر)دا، لەوێدا باسمان کردوە کە: گەلی ئەموود بەگشتیی بە هاڕژن و دەنگێکی بێڕەزا فەتێنراون: ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾، واتە: هاڕژن و چریکەیەکی گەورە دەمەو، بەیان گرتنی، لەوێدا باسی کردوە، نیدی ئایا زانایان ئەوەیان لە یاد نەبووە، کە خوا ﷻ باسی سزایەکەیانی کردوە، بە گشتیی بۆ گەلی ئەموود، یان ڕەنگە مەبەستیان ئەو نۆ کەسەو نۆ تاقمە بووبن، کە ئەوانە ڕەنگە بە جۆرێکی تایبەت فەوتێندرابن، بۆیە ئاوا هەندێکیان گوتوویانە: وا فەوتاون، هەندێك گوتوویانە وا فەوتاون، بەڵام گەلی ئەموود هەموویان بە هاڕژن و چریکەیەکی گەورە، فەوتاون.

٣)- ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ ﴾، سەرنج بدە! سەرەنجامی پیلانەکەیان چۆن بوو، لێی ورد بەوە؟!

٤)- ﴿ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾، ئێمە خۆیان و گەلەکەیانمان تێکڕا فەوتاندن.

کەواتـە: خـوا ﷻ کـە لـە سـووڕەتی (الحجر)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُصۡبِحِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾، واتـە: هـاڕژن و چریکەیـەکی گـەورە بـەرە بەیـان گرتنـی، کەواتە ئەو نۆیـەش لەگـەڵ گەلەکـەی خۆیانـدا، بـەو چریکـەو هاڕژنـە فەوتـاون، بۆیـە پێویسـت بـەوە نـاکات، شـتی دیکـە لـە خەیاڵـدانی خۆمانـدا نامـادە بکەیـن، بـۆ تەفسـیری ئایەتـەکان، چونکـە قورئـان هەندێـکی هەندێکی تەفسـیر دەکات، لە ڕاسـتییدا باشـترین شـێواز بـۆ توێژینـەوە لـە بـارەی بەسـەرهاتی پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَمِ) و گەلەکانیانـەوە، ئەوەیـە کـە ئێمـە ئایەتـەکانی کـە بـاسی هـەر گەلێـك و، هـەر پێغەمبەرێـك لەگـەڵ گەلەکـەی دا، دەکـەن، هەموویـان پێکـەوە بێنیـن، وەك ئێمـە وامانکـردوە، لـەم تەفسـیرەدا، لـە هـەر شـوێنێك بەسـەرهاتی پێغەمبەرێکـمان لەگـەڵ گەلەکەیـدا بـاس کردبـێ، ئایەتـەکانی کـە پەیوەسـتن، بـە ژیـانی ئـەوە پێغەمبـەرەو بەسـەرهاتی لەگـەڵ گەلەکەیـدا، هەموویانمـان هێنـاوە، چونکـە بـە هەمـوو ئایەتـەکان، ئنجـا هەمـوو گۆشـەو لایەنـەکانی بەسـەرهاتەکە، ڕوون دەکەنـەوە، چونکـە خـوا ﷻ ئـەو بەسـەرهاتانە، کـە لـە چەنـد سـووڕەتێکدا دووبـارە دەکاتـەوە، لـە هـەر سـووڕەتەدا، بـە پێـی ئـەو بارودۆخـە کـە پێغەمبـەر ﷺ و هـاوەڵانی تێیـدا بـوون، کاتی خـۆی، کـە دوایـی بـۆ ئێمـەش دەبنـە سـەر مەشـق، بـە پێـی ئـەوە، خـوا ﷻ گۆشـەیەك، یاخـود بەشـێك لـە بەسـەرهاتی پێغەمبەرێـکی هێنـاوە، یاخـود لـە شـوێنێك بـە وردیـی هێناویـەتی و وردەکارییـەکانی باسـکردوون، بـەڵام لـە شـوێنێك بـە پوختیـی هێناویـەتی، وەك ئێـرە، ئـەوە هەمـووی ئـەو کـەش و بارودۆخـە کـە ئایەتـەکانی تێـدا هاتوونـە خـوارێ، خوازیـاری ئـەو شـێوازە بـوون، یاخـود هـی ئەوەنـدە بەشـەی و ئـەو لایەنـەی ئـەو بەسـەرهاتە بـوون.

بۆیە ئەگەر بمانەوێ وێنەیەکی تەواوو تێرو تەسەل و گشتگیرمان لە بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَامِ)، دەستبکەوێ، دەبێ هەموو ئەو ئایەتانەی پەیوەستن بە بەسەرهاتی پێغەمبەرێك و گەلەکەیەوە، هەموویان پێکەوە بێنین.

٥)- ﴿ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوٓا۟ ﴾، ئەوە ماڵەکانیانن و خانووبەرەکانیانن، چۆڵ و هۆڵن، بە هۆی ئەو ستەمەوە، کە کردیان!

خوا ﷻ قڕە بڕی کردن و، دوا بڕاوی کردن و، خانووبەرەکانیان چۆڵ و هۆڵن، کە ئێستاش خانووبەرەکانی گەلی ثەموود لە حیجر هەر ماون و، هەن، شوێنەکانیان ماون، (خَاوِيَة) کە لە ئەسڵدا لە: (خَوَى بِمَعْنَى خَلَى)یە، یانی: چۆڵ بووو بە تاڵ و بۆش بوو، بەڵام دەشکونجێ بە مانای داڕماون، بێ، چونکە خانووبەرە، ئەگەر خەڵکەکە تێیاندا نەماو بە تاڵکران و چۆڵکران، بەسەر یەکدا دەڕووخێن و دادەتەپن.

٦)- ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾، بە ڕاستیی لەوەدا، نیشانەیەکی گەورەو گرنگ هەیە، بۆ کۆمەڵێك بزانن.

بەڵام خەڵکی نەزان، لە هیچ پەند وەرناگرێ.

٧)- ﴿ وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴾، ئەوانەش کە بڕوایان هێنا بوو و، پارێزیان دەکرد، ئەوانەمان دەرباز کرد.

شایانی باسە: خوا ﷻ لێرەدا لە دوای گەلی (سبأ)، باسی گەلی ثەموود دەکات، دواییش باسی لووطو گەلەکەی دەکات، ڕەنگە حیکمەتەکەی ئەوەبێ: لە ڕووی جوگرافییەوە، ئەو سێیە لێك نزیك بوون، (سبأ) لە یەمەن، (ثمود) لە حیجر کە لە باکووری نیوە دورگەی عەرەبییە، لە نێوان شام و نیوە دورگەی عەرەبیی دا، گەلی (لوط)یش کە شوێنەکەیان، دەریاچەی مردوویە، ئەو سێ گەلە، لە ڕووی جوگرافییەوە لێك نیزیكن، بۆیە خوا ﷻ لەم سوورەتەدا بە دوای یەکدا هێناونی.

پێویستە بشزانرێ کە: ئەو بەشەی بەسەرهاتی صالح ﷺ و گەلی ثەموود، تەنیا لێرەدا هاتووە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾، تەنیا لێرەدا هاتووە، کە گەلی ثەموود نۆ کەسیان، یاخود نۆ دەستەو تاقمیان، بە تەمابوون صالح تیرۆر بکەن و، شەوکوژی بکەن، تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا، ئەو گۆشەو بەشە لەو بەسەرهاتە هاتووە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە پێنج ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی: (٥٤ - ٥٨)، کە باسی پوختەی بەسەرهاتی لووطو گەلەکەیان تێدایە، هەر لە سەرەتاوە تاکو ئەنجام، کە سەر بە فەتارەت چوونیانە، بەو سزا قورس و ناوازەیەی، کە بوونە پەند بۆ مرۆڤایەتیی، خوا ﷻ تەنیا ئەوانی بەو شێوەیە سزا داوە، شوێنەکەیشی بۆتە شوێنەوارێك کە دەریاچەی مردوویە، بۆ ئەوەی دەرس و پەندی لێوەربگیرێ.

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾ ۞ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوٓا۟ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها **لووطیش** (یاد بکەوە!) کە بە گەلەکەی خۆی گوت: چۆن لە حاڵێکدا کە (بە چاوی عەقڵ) دەبینن فاحیشە (نێربازیی) ئەنجام دەدەن ﴿٥٤﴾ ئایا ئێوە بە ئارەزووەوە دەچنە لای پیاوان (نێربازیی دەکەن) لە جیاتی ئافرەتان! بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکن نەفامیی دەکەن ﴿٥٥﴾ وەڵامی گەلەکەیشی هەر ئەوەبوو کە گوتیان: **لووط** و شوێنکەوتووانی لە ئاوەدانییەکەتان دەربکەن، چونکە ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاك ڕادەگرن! ﴿٥٦﴾ ئێمەش خۆی و نیزیکەکانیمان دەرباز کرد

جگە لە ژنەکەی، کە لە فەوتاوانـدا بڕیارمانـدا ﴿٥٧﴾ بارانێـك(ی سەرسـوڕهێنەر) یشـمان بەسـەر داباراندن (ئەو بارانـە) خراپترین بـاران بـوو، بەسـەر ترسـێنراوان و ئاگادارکراوانـدا بارێنـدرا ﴿٥٨﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْفَـٰحِشَـةَ )، (الفُحْشُ والفَحْشَاءُ وَالفَاحِشَةُ: مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَالِ)، هـەر سێ وشـەی (فُحْش، فَحْشَاءُ، فَاحِشَة)، لـە زمانی عەرەبییدا، ماناکەیان بریتیە لـەو کـردەوەو قسـانەی کـە زۆر ناشـیرین و دزیـوو مـەزن بـن.

(شَهْوَةً )، (الشَّـهْوَةُ: نُـزُوعُ النَّفْـسِ إِلى مَـا تُرِيْـدُهُ)، (شـهوة) نـارەزوو، بریتیـە لـە پەلکێـش بـوونی نەفـس، بـۆ شـتێك کـە تامەزرۆیـەتی و ئـارەزووی دەکات.

(قَدَّرْنَـٰهَا )، (جَعَلْنَاهَـا بِتَقْدِيرِنَـا)، بـە ئەندازەگیریـی خۆمـان، وامـان دانـا، یاخـود (القَـدَرُ وَالتَّقْدِيـرُ: تَبْيِـيْنُ كَمِّيَّـةِ الـشَّيءِ)، (قَـدَرْ وتَقْدِيـر): واتـە: ئەنـدازەی شـتێك دیاریـی بکـرێ، (قَدَّرْنَـٰهَا)، واتـە: ئـەو ئافرەتـە وامـان بـۆ بڕیـارداو لەسـەر بناغـەی ئەندازەگیریـی کـردن، بڕیارەکانمـان دەدەیـن.

(ٱلْغَـٰبِرِينَ)، یـانی: (البَاقِيْن)، واتـە: لەوانـەی کـە مابوونـەوە، چونکـە لـووط ﷺ خـۆی و ئەوانـەی بڕوایـان پـێ هێنابـوو، دەربـاز بـوون و ڕۆیشـتن، ئەوانـەی کـە مانـەوە، کـە گاڵتەیـان بـە ترساندنەکەو هۆشـداریی پێدانەکـەی لـووط دەکـرد، ئەوانە مانـەوە لـە شـارو شـوێنەکەی خۆیـان و هیـچ باکیـان نەبـوو، ئنجـا ژنەکـەی لووطیش لەگـەڵ ئەوانـدا مایـەوە، ﴿ قَدَّرْنَـٰهَا مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴾، واتـە: وامـان بـۆ بڕیـاردا، کـە ئەویـش لـە نێـو ئەوانـەدا کـە دەمێننـەوە، بمێنێتـەوە، دەڵـێ: (الغَابِـرُ: المَاكِـثُ بَعْـدَ مُـضِيِّ مَـا هُـوَ مَعَـهُ)، (غَابِـر): بریتیـە لـە کەسـێك بمێنێتـەوە، دوای ئـەوەی ئـەوەی لەگەڵیدابـووە، ڕۆیشـتوە، هەروەهـا (غَابِـر): وەك چـۆن بـە مانـای مـاوەوە دێ، بـە

مانای تێپەڕیویش دێ، ئەوانەی تێپەڕین، واتە: بوون بە هەواڵێك لە هەواڵەكانی مێژوو و تێپەڕین و سزادران و فەوتان.

(فَسَآءَ)، (فَبِئس)، واتە: خراپترین، ﴿ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾، واتە: خراپترین باران، بارانی ئەو گەلە بووە، كە ترسێنران و ورياكرانەوەو هۆشدارییان پێدرا، بەڵام بێ باك بوون و، گوێیان پێنەدا.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

پێشتریش گوتمان، كە لە كاتی تەفسیركردنی سوورەتی (هود)دا، بە درێژیی لە بارەی بەسەرهاتی لووط عليه السلامو، گەلە ڕەوشت نزمەكەیەوەو، چۆنیەتیی فەوتێنرانیان و، سزای كەسێك كە ئەو كردەوە قێزەونە دەكات و ...هتد لەو بارەوە دواوین، بۆیە لێرەدا بە خێرایی بەسەر مانای گشتیی، ئەو پێنج ئایەتە موبارەكەدا دەڕۆین، خواش ﷻ لێرەدا بە كورتیی و پوختیی بەسەرهاتی لووط عليه السلامی هێناوە، لەبەر ئەوەی لە شوێنانی دیكەدا، بە تایبەتیی لە سوورەتی هوددا، هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)و، لە سوورەتی (الشعراء)دا، لە چەند شوێنی دیكەش دا، خوا ﷻ درێژەی ئەو بەسەرهاتەی هێناوە.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ ﴾، هەروەها یادی لووطیش بكەوە، كاتێك بە گەلەكەی خۆی فەرموو: ﴿ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴾، ئایا ئێوە فاحیشە ئەنجام دەدەن، كردەوەیەكی زۆر ناقۆڵاو دزێو ئەنجام دەدەن، لە حاڵێكدا كە ئێوە دەبینن، بە چاوی عەقڵ و دڵ دەبینن، كە چەند شتێكی خراپە، فاحیشە، یانی: كردەوەیەكی ناقۆڵاو دزێو، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی نێربازییە، جووتبوونی پیاوان لەگەڵ پیاوان، ﴿ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ﴾، ئایا ئێوە لە ڕووی ئارەزووەوە دەچنە لای پیاوان، لە

جیاتی ئافرەتـان، ﴿ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴾، بەڵکـو ئێـوە کۆمەڵێکـن، نەفامیـی و نەزانیـی دەکـەن، چونکـە ئەگـەر مرۆڤـەکان هەمـوو وەك ئێـوە بکـەن، تـۆوی بەشـەر لەسـەر زەوی دەبڕێتـەوە، ئەگـەر پیـاوان لەگـەڵ پیاوانـداو، ئافرەتـان لەگـەڵ ئافرەتانـدا، جـووت بـن، وەچـەی بەشـەر چـۆن پەیـدا دەبـێ؟!

﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ ﴾، وەڵامـی خەڵکەکـەی هـەر ئـەوە بـوو، گوتیـان: ﴿ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ﴾، شـوێنکەوتووانی لـووط واتـە، پەیـڕەوانی و ئەوانـەی کـە لەگەڵیـدان، لـە شـارو ئاوەدانییەکـەی خۆتـان دەربکـەن، وەدەریـان بنێـن، بۆچـی؟ ﴿ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوان کۆمەڵێکـن، خەڵکانێکـن، خۆیـان پـاك ڕادەگـرن، لەبـەر ئـەوە دەریـان بکـەن، دیـارە بـە توانـج و تەوسـەوە وایانگوتـوە.

﴿ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ ﴾، ئێمـەش خـۆی و نیزیکانیـمان دەربـاز کـردن، لێـرەدا (أهـل) بـە مانـای نیزیـکان دێ، ئەوانـەی کـە پەیوەندیـی تایبەتیـان لەگەڵـی هەبـوو، مەبەسـت پێـی پەیوەندیـی ئیمانییـە، ﴿ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ ﴾، جگەلـە ئافرەتەکـەی، ئەمـە هـەڵاواردنی دابـڕاو (إسـتثناء منقطـع)ە، چونکـە ژنەکـەی لـە نیزیـکانی لـووط نەبـوو، بەڵکـو لێـی دوور بـوو، لـە ڕووی ئیـمان و عەقیـدەو لـە ڕووی هەڵسـوکەوتەوە، ﴿ قَدَّرْنَـٰهَا مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴾، ئافرەتەکـەی ئەندازەگیرییـمان بـۆ کـرد، بڕیارمـان بـۆ دا، بەشـێوەیەکی ئەندازەگیریـی کراوانـە کـە لـە تێپەڕیـوان بـێ، (غَابِـر) دەگونجـێ بـە مانـای (مـاضِ) تێپەڕیـو، بـێ، لـە ڕابـردووان بـێ و سـزای بەسـەردا بسـەپێنرێ، تێپەڕبێ و بـڕواو کۆتایـی بـێ، یاخـود: (غَابِریـن) یـانی: (ماکِثیـن)، ئەوانـەی دەمێننـەوە، ئـەو خـۆی و ئەوانـەی کـە لەگەڵیـوون، دەربـاز بـوون و ڕۆیشـتن، خەڵکەکـەش مایـەوە، ژنەکـەشی لـە نێـو خەڵکـە ماوەکـەدا بـوو، لەگـەڵ وانـدا سـزادرا.

﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ﴾، بارانێـکی سەرسوڕهێنەریشـمان بەسـەردا بارانـدن، (مَطَـر) لێـرەدا کـە بـە نەزانـراو (نکـرة) هاتـوە، واتـە: (مَطَـراً لَا یُوصَـف)، بارانێکـمان

بەسەردا باراندن، وەسف ناکرێ، بارانێکی زۆر ناوازە، کە بریتی بوو لەوەی بەردی سوورەوەکراو، بەسەریاندا ببارێنرێ، لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ ﴾هود، بەردێکی لە قوڕی بە بەردبووی ڕیزکراو، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ ﴿٨٣﴾ ﴾هود، نیشانەدار کرابوو، لە لایەن پەروەردگارتەوە، گوتراوە: هەر کەسە بە چ بەردێك دەفەوتێ، ناوی ئەو کەسە لەسەر ئەو بەردە نووسرابوو، ئەوەش بۆ خوا ﷻ ئاسانە، ﴿ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾، خراپترین باران، بارانی ئەوانە بوو، کە ترسێنرابوون و هۆشداریيان پێدرابوو، بەڵام بێباك و بێ منەت بوون و، گوێیان پێنەدا، ئەوە خراپترین باران بوو کە بەسەریاندا بارێنراو هەموویان قڕە بڕ کران، تنجا هەر بەوەندەش خوا ﷻ لێیان نەگەڕا، کە بارانی قوڕی وشك بووەوەو بەبەردکراویان بەسەردا ببارێنێ، بەڵکو شارەکەشیانی هەڵگێڕایەوەو، شوێنەکەشیان بوو بەو دەریاچەی مردوو، کە ئێستا دیارەو، خەڵك بەلایدا گوزەر دەکات و دەیبینێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕەخنەو سەرزەنشتکردنی لووط ﷺ بۆ گەلەکەی لەسەر نێربازیی، کە دەشیانزانی چەند کارێکی دزێوو ناقۆڵایە: کە لە جیاتی ژنان، لەگەڵ پیاواندا ئارەزووی خۆیان تێر بکەن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلُوطًا ﴾، ئەم (و)ە، بۆ بادانەوەو گێڕانەوەیە، واتە: هەروەها بەسەرهاتی لووط ﷺ، یان بۆ باس بکە، وشەی: (لُوطاً)یش (مَنْصُوب)ە، بەکردارێکی مەزەنەکراوە، وەك (واذكر لُوطاً)، هەروەها لووطیش، یاد بکەوە.

٢)- ﴿ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ ﴾، کاتێك بە خەڵکەکەی خۆی گوت، (قَوم) لێرەدا بە مانای خەڵکێکە کە مرۆڤ لە نێویاندا دەژی، چونکە بە دڵنیایی خەڵکەکە، خەڵکی فەلەستین بوون و کەنعانیی بوون، بەڵام لووط ﷺ برازای ئیبراهیمە ﷺ و، لە ڕووی نەتەوەو ڕەچەڵەکەوە لەوان نەبووە، بەڵام لەو ڕووەوە کە ماوەیەك ژیانی لە نێویاندا بەسەر بردوە، بە خەڵکی وی دانراون، خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الشعراء)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ ﴾، کاتێك لووطی برایان پێی گوتن، ئایا پارێز ناکەن! لەبەر ئەوەی لووط ﷺ ساڵانێك لە نێویاندا بووە، وەك یەکێك لە خۆیانی

لێهاتوه، بۆیە خوا ﷻ بە برای خۆیان ناوی بردوە، یاخود لەو ڕووەوە کە لە مرۆڤایەتییدا، هەموو مرۆڤەکان دەچنەوە سەر دایکێك و باوێك و خێزانێك، برای یەکدین.

٣)- ﴿أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾، ئایا ئێوە فاحیشە ئەنجام دەدەن، لە حاڵێکدا کە دەشبینن؟ ئەو هەمزەیە (أ)ی (أَتَأْتُونَ)، هەمزەی پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە (الإِسْتِفْهَامُ الإِنْكَارِي)ە، واتە: نەدەبوو وا بکەن، (فَاحِشَة)، یانی: (الفِعْلَةُ القَبِيْحَةُ مُنْتَهى القُبْحِ)، واتە: کردەوەیەکی، ئەوپەڕی دزێوو ناشیرین، کە مەبەست پێی نێربازییە.

﴿وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾، ئەمە دوو واتای بۆ لێکدراونەوە:

أ- لە حاڵێکدا کە ئێوە دەزانن، چەند شتێکی خراپ و دزێوو ناشیرینە، چۆن دەیکەن؟

ب- هەندێکیشیان وایان لێکداوەتەوە: لە کاتێکدا کە تەماشای یەکدیش دەکەن و، لەبەر چاوی یەکدی ئەو کارە خراپە دەکەن!

لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ﴾العنكبوت: ٢٩، لە ئێو یانەکەتان دا شتی خراپ دەکەن.

بەڵام من پێم وایە: ﴿وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾، یانی: ئێوە لە حاڵێکدا بە چاوی عەقڵ و دڵ دەزانن، نێربازیی چەندە خراپە، کەچی دەیکەن.

٤)- ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ﴾، دیسان ئەو پرسیار لێکردنەش، پرسیار لێکردنی نکووڵیلێکەرانەیە: ئایا ئێوە دەچنە لای پیاوان و لەگەڵیاندا جووت دەبن، بە ئارەزووەوە، جگە لە ئافرەتان؟ یانی: بۆ تێرکردنی غەریزەی جینسییتان، لەگەڵ پیاوان جووت دەبن، لە جیاتی ئافرەتان؟

(أَئِنَّكُمْ) خوێندراوەتەوەش: (إِنَّكُم)، (إِنَّكُم لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ)، واتە: بە یەك هەمزە (أ)، بە هەردووك شێوەكان خوێندراوەتەوە، ماناكەشیان یەكە، یان لێك نیزیكە.

٥)- ﴿ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴾، بەڵكو ئێوە كۆمەڵێكن، نەفامیی دەكەن. (الزمخشري) گوتوویەتی: (تَفْعَلُونَ فِعْلَ الجَاهِلِيْنَ مَعَ عِلْمِكُم بِذَلِكَ) ئێوە كردەوەی نەفامان دەكەن، لە حاڵێكدا كە دەشزانن، كردەوەی نەفامانەو نەزانانەیە.

یاخود: (أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ )، یانی: ئێوە نازانن سەرەنجامی ئەو كردەوە خراپەیەتان چۆنە، كە هەم لە دنیادا، خوا ﷻ سزاتان دەدات، هەم لە دوارۆژیشدا سزاتان دەدات، یاخود (تَجْهَلُونَ )، مەبەست لە (جَهَالَة)، نەفامیی و بێ بەندوباریی و ڕەوشت نزمییە، بەڵكو ئێوە ڕەوشت نزمیی و بێ بەندوباریی دەكەن.

**مەسەلەی دووەم:**

**وەڵامدانەوەی گەلەکەی، کە لووط ﷺ و شوێنکەوتووانی شاربەدەر بکەن، چونکە خۆیان پاك ڕادەگرن! سەرەنجام دەربازکرانی لووط ﷺ و نیزیکانی، جگە لە ژنەکەی و، باراندنی بارانێکی سەرسوڕهێنەر، کە بریتی بوو لە قوڕی وشك بووەوەی بەردیین، بەسەر گەلی (لووط)ی ترسێنراوی هۆشداریی پێدراوی بێباکدا:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوٓا۟ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ ﴾، وەڵامی گەلەکەی بەس ئەوە بوو، کە گوتیان، یانی: هیچ وەڵامێکیان نەبوو، تەنیا ئەوە وەڵامیان بوو، ئەمە بۆ دەرخستنی زێدە ملهوڕیی و تاوانباریی ئەو گەلەیە، کە هیچ وەڵامێکی دیکەیان نەدایەوە، لە جیاتی بێن وتوێژی لەگەڵدا بکەن و بڵێن: وەرە پێمان بسەلمێنە، کەچی وەڵامیان بەس ئەوە بوو:

٢)- ﴿ أَخْرِجُوٓا۟ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ﴾ [تەنیا گوتیان:] نیزیکانی لووط، واتە: خۆی و نیزیکانی و شوێنکەوتووانی، (آل) لە قورئاندا، بە زۆریی بە مانای خەڵکێکی تایبەت بە کەسێکەوەو، شوێنکەوتووانی، دێ، چ لە خێردا، چ لە شەڕدا، (آل فرعون) واتە: شوێنکەوتووانی فیرعەون، (آل لُوط)، واتە: شوێنکەوتووانی لووط ﷺ، لە شوێنی دیکەش دا باسمان کردوە کە: (آل) و (أهل) لێك جیان، (أهل) واتە: ئەوانەی کە لە ڕووی ڕەچەڵەك و نەسەبەوە، مرۆڤ دەچێتەوە سەریان، بەڵام (آل) یانی: ئەوانەی کە لە ڕووی تایبەتمەندییەکانی ئیمان

و عەقیدە، یاخود کوفرو بێدینییەوە، دەچنەوە سەر کەسێك، گوتیان: لووطو نیزیکانی لە شارەکەدا دەربکەن و، شاربەدەریان بکەن.

بە بەڵگەو پاساوی چی؟

٣)- ﴿ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴾، چونکە بە دڵنیایی ئەوانە کۆمەڵێك، خەڵکێکن، خۆیان پاك ڕادەگرن!

کە بێگومان لێرەدا مەبەستیان مەدح و ستایشیان نیە بە پاکێتیی! بەڵکو بەتوانجەوە وایانگوتوە.

٤)- ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ ﴾، ئێمەش خۆی و نیزیکانی {لەڕووی خێزانییەوە، لەڕووی ڕەچەڵەکەوە} دەربازمان کردن، جگە لە ئافرەتەکەی.

٥)- ﴿ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴾، (ئافرەتەکەی) ئەومان بڕیاردابوو لە فەوتاوان، یاخود: لەوانەی دەمێننەوە بۆ سزادران.

٦)- ﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ﴾، هەروەها بارانێکمان بەسەردا باراندن.

٧)- ﴿ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾، خراپترین باران، بارانی ترسێنراوان و ئاگادارکراوان بوو (بِئسَ المطرُ، مَطَرُ المُنذرِين).

هەر کام لە خاوەنی: (التفسير المُنير)[1] و خاوەنی: (التحرير والتنوير)[2]، گوتوویانە: (وَالمُرَادُ بِآلِ لُوطٍ: لُوطٌ وَأَهْلُ بَيْتِهِ)، واتە: مەبەست لە ئالی لووط، لووط و خانەوادەکەینی، بەڵام بە دڵنیایی لەوەدا بە هەڵەداچوون، چونکە، وەك زۆرجاران گوتوومانە: (آلُ الرَّجُلِ هُمْ أتبَاعُهُ وَخاصَّتُهُ، آلُ فِرْعَون، أي: أتبَاعُ فِرْعَوْن، آلُ مُحَمَّد: أي أتْبَاعُ مُحَمَّد ﷺ)، واتە: ئالی پیاو پەیڕەوانی و خەڵکە تایبەتییەکەینی، ئالی فیرعەون: شوێنکەوتووانی و، ئالی موحەممەد، شوێنکەوتووانی موحەممەدن.

---

(١) ج١٠، ص٣٥٧.

(٢) ج٢٠، ص٦.

بەڵام (أهل) ئەوانەن کە لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە بە مرۆڤ دەگەن، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ( فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ )، خۆی و ئەهلەکەی، نافەرموێ: (وآلـهُ) چونکە ئاشکرایە ئالەکەی، ئەوانەی کە شوێنکەوتووی بوون، خوا دەربازی کردوون، بەڵام لە ئەهلەکەشی، هەندێکی فوتار کردوون، بۆیەش باسی ئەهل دەکات، چونکە دەیەوێ دوایی هاوسەرەکەیان لێ هەڵاوێرێ، واتە: خۆی و خانەوادەکەیمان دەرباز کردن، وێڕای (آل)ەکەی، ئەوانەی لەگەڵیدابوون، کە ڕەنگە بەس خانەوادەکەی خۆشی بڕوایان پێ هێنابێ، هەر ئەهلەکەشی (آل)ی بووبن، چونکە جاری وا هەیە، بەس ئەهلی کەسێك دەبن بە ئال و شوێنکەوتووانی، بەڵام ژنەکەیان لێ هەڵداوێرێ و دەفەرموێ: جگە لە هاوسەرەکەی.

لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ قَدَّرْنَـٰهَا مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴾، بەڵام لە سوورەتی (الأعراف) دا، دەفەرموێ: ﴿ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾، (قَدَّرْنَـٰهَا)، (ژنەکەی) ئەومان ئەندازەگیریی کرد، بەڵام لە سوورەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ: لە فەوتاوان بوو، یاخود لەوانە بوو، کە مایەوە، لەگەڵ فەوتاواندا، بۆ سزادران.

بەڵێ (آل) بە مانای (أهل) نیە، (آل) یانی: شوێنکەوتووان، ئنجا ئەگەر (آل) بە مانای (أهل) خزم و نیزیکان و خانەوادە بێ، دەبێ بڵێین: ژنەکەی فیرعەونیش کە خوا ﷻ ئەو هەموو مەدحەی دەکات، لە سوورەتی (التحريم)دا، ئەویش لەگەڵ فیرعەوندا فەوتاوە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾غافر، (ءَالَ فِرْعَوْنَ ) یانی: ئەو ڕۆژەش کە قیامەت دێ فیرعەون و شوێنکەوتووانی، ئەوانەی بە دوایی کەوتوون، لە کوفردا، بیانخەنە توندترین ئازارەوە، بەڵام ژنەکەی دیارە بە دوای نەکەوت لە کوفردا، ژنەکەی ئەهلی فیرعەون بوو، نەك (آل)ی فیرعەون، (أهل) واتە: نیزیك لە ڕووی خانەوادەییەوە، بەڵام (آل) واتە: نیزیك لە ڕووی بەرنامەو ڕێبازو موعتەقەدەوە.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بکێـڕێ، لـە دەرس و پەنـد وەردەگـرن لـە بەسـەرهاتی پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و، لـەو کەسـانەمان بکێـڕێ کـە خۆیـان دەرازێننـەوە بـە سـیفەتە بەرزەکانـی پێغەمبـەران و، لـەو کەسـانەمان بکێـڕێ کـە دەرس و پەنـدو عیبـرەت وەردەگـرن لـە غەڵـەت و پەڵەتـی، ئـەو گەلـە فەوتاوانـەی کـە بـە هـۆی خراپەکانیانـەوە خـوا فەوتاندوونـی و سـزای داون، خـوا ئێمـەو خەڵکـی ئێمـە، لـەو کـردەوە خـراپ و قێزەونانـەی کـە گەلـە پێشـووەکانیان لەسـەر سـزادراون، بـەدوور بگـرێ و بیارێـزێ و، خـوا بمانکێـڕێ لـە سـەرفرازان و شـادمانانی دنیـاو دواڕۆژ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هەشـت ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (٥٩ - ٦٦)، هەمووشـیان لـە سـوڕگەی خواناسـیی و، تەنیـا خواپەرسـتیی و، خـوا بەیەكگرتـن (توحیـد)دا، دەخولێنـەوەو، لـە میـانی خسـتنە ڕووی پـازدە (١٥) لـە دیـاردەو دیمەنـە دڵبزوێنـەكانی بوونـەوەرو دەوروبـەردا: یەكتایـی خـوا ﷻ لـە بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتییـدا، خراوەتـە ڕوو.

پاشـان یەكتایـی خـوا لـە بەدیهێنەرایەتیـی و خـاوەن بـوون و پـەروەردگار بوونیـدا، كراوەتـە بەڵگـەی یەكتابـوونی لـە پەرسـتراوێتییدا، واتـە: مـادام تەنیـا خـوا خـاوەن و بەدیهێنـەرو پـەروەردگارو مشـوورخۆری كـەون و كائیناتـە، پێویسـتە هـەر ئەویـش بپەرسـترێ و، بەندایەتیـی بـۆ بكـرێ، دەبـێ هاوبـەشی بـۆ دانەنـرێ.

ئـەو پـازدە (١٥) دیـارەدەو دیمەنـەش، ئاسـمان و زەوی و، ژمارەیـەكی زۆر لـە پێكهاتـەو حاڵەتەكانیـان دەگرنـەوە: ئـاو، چیـا، بـا، درەخـت، ڕووەك، وشـكانیی، دەریـا، تاریكایـی ، ڕووناكیـی، پەنهـان، ئاشـكرا... هتـد.

﴿ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَامٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَىٰ ۗ آللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ (٥٩) أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا ۗ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ (٦٠) أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (٦١) أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ ۗ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا

تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّنْهَا ۖ بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بڵێ: ستایش بۆ خواو، سەلام لەو بەندانەی بێ کە هەڵیبژاردوون، ئایا خوا باشترە (بپەرستریٚ)، یان ئەو (کەس و دروستکراو)انەی دەیانکەنە هاوبەش (بۆ خوا)؟! ﴿٥٩﴾ یان ئەو کەسەی ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوون و، لە سەرێوە ئاوی بۆتان دابەزاندوە، ئنجا باخ و بێستانە گەش و ڕەونەقدارەکانمان بۆتان پێی ڕواندوە، کە بە هیچ جۆرێک لە تواناتاندا نەبوو درەختەکانی بڕوێنن؟! بەڵکو ئەوانە (کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن) کۆمەڵێکن لە (هەق) لادەدەن ﴿٦٠﴾ یان ئەو کەسەی کە زەوی سەقامگیر کردوەو، ڕووبارگەلێکی لە نێودا داناون و، چیا چەسپاوەکانی تێدا داناون و، پەردەی خستۆتە نێوان دوو دەریایەکان (ئاوی شیرین و سوێر)، ئایا لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێك هەیە! بەڵکو زۆربەیان نازانن (و بە هۆی نەزانییەوە تووشی شیرك بوون) ﴿٦١﴾ یان ئەو کەسەی وەڵامی بابای ناچارو بێدەرەتان دەداتەوە، کاتێک لێی دەپاڕێتەوەو خراپە (و زیان)ی لێ لا دەبات و، دەتانکاتە جێنشینانی زەوی، ئایا لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێك هەیە؟! بە کەمیی بیردەکەنەوەو پەند وەردەگرن ﴿٦٢﴾ یان کەسێك کە لە تاریکاییەکانی وشکانیی و دەریادا ڕێنماییتان دەکات و، کەسێك کە بایەکان مژدە بەخشانە

لـە پێـش بەزەیـی (باران)ەکەیـدا، دەنێـرێ، ئایـا لەگـەڵ خـوادا هیـچ پەرسـتراوێك هەیـە! خـوا بـەرزە لـەوەی دەیکەنـە هاوبـەشی ﴿٦٣﴾ یـان کەسـێك کـە لـە سـەرەتاوە دروسـتکراوەکانی هێناونـە دی، پاشـان (دوای لـە بەیـن چـوون) دەیانگێڕێتـەوە (بـۆ بـوون)، هەروەهـا کەسـێك کـە لـە ئاسـمان و زەوییـەوە بژیوتـان دەدات، ئایـا لەگـەڵ خـوادا هیـچ پەرسـتراوێك هەیـە؟ بڵـێ: ئەگـەر لـە ڕاسـتانن، بەڵگەکەتـان بێنـن ﴿٦٤﴾ بڵـێ: جگـە لـە خـوا هیـچ کـەسی نێـو ئاسـمانەکان و زەوی، پەنهـان نازانـێ و هەسـتیش ناکـەن (نازانـن)، کـەی زینـدوو دەکرێنـەوە ﴿٦٥﴾ بەڵکـو هەمـوو ئەوانـەی لـە ئاسـمانەکان و زەویـدان، هیـچ زانیارییـان لـە بـارەی ڕۆژی دواییـەوە نیـە، بەڵکـو ئـەوان لـە ئاسـتیدا کوێـرن ﴿٦٦﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(حَدَآئِقَ ): (**جَمْـعُ حَدِيْقَـة: وَهِـيَ قِطْعَـةٌ مِـنَ الأَرْضِ ذَاتُ مَـاءٍ، سُـمِّيَتْ بذلـك، تَشْـبِيهاً بِحَدَقَـةِ العَـيْنِ فِي الهَيْئَـةِ وَحُصُولِ المَـاءِ فِيْهَـا، وَجَمْـعُ الحَدَقَةِ: حِـدَاق وَأَحْـدَاق، وَحَـدَّق تَحْدِيْقاً شَـدَّد نَظَـرَهُ**)، واتـە: (حَدَائِـق) کـۆی (حَدِيْقَة)یـە، کـە بریتیـە لـە پارچـە زەوییـەك ئـاوی تێدابـێ، دیـارە کـە ئـاوی تێدایـە، دارو درەخـت و کشـتوکاڵیشی تێدایـە، چوێـنراوە بـە بیلبیلـەی چـاوەوە، لـە چۆنیەتیەکـەی داو، لـە وەدا کـە ئـاوی تێدایـە، (حَدَقَـة) کۆیەکەی (حِـدَاق) و (أَحْـدَاق)ە، (وَحَـدَّقَ تَحْدِيْقَـاً) واتـە: چـاوی تیـبڕی و بـە وردیـی سـەرنجی دایە.

(ذَاتَ بَهْجَةٍ ): واتـە: خـاوەن ڕەونـەق، (**البَهْجَـةُ: حُسْـنُ اللَّـوْنِ وَظُهُـورُ السُّرُورِ، وَقَـدْ بَهُـجَ فَهُـوَ بَهِيْـجٌ**)، (بَهْجَـة): بریتیـە لـە ڕەنگـی جـوان، دەرکەوتنـی شـادمانیی، دەگوتـرێ: (بَهُـجَ فَهُـوَ بَهِيْـجٌ)، واتـە: ئـەو دیمەنـە ڕەونەقـدارە، سـەرنج ڕاکێشـە.

(يَعۡدِلُونَ ): (**عَـدَلَ عَـنِ الحَـقِّ، أي: جَـارَ، وَعَـدَلَ بِـهِ، أي: سَـوَّى**)، (يَعْدِلُـون) دوو واتـای هـەن:

أ- یان بە مانای لە هەق لادەدەن.

ب- یان جگە لە خوا، لەگەڵ خوادا یەکسان دەکەن و، وەك یەکیان تەماشا دەکەن، وەك: دوولابارەکەی وڵاخ (عِدلِي الدَابَّةِ)، بارێك کە لەسەر پشتی وڵاخێك دادەنرێ، بە هەر کام لە لابارەکان دەگوترێ: (عِدْل)، لەبەر ئەوەی هێندەی یەکن.

(قَرَارًا): (قَرَّ يَقَرُّ قَرَاراً: إِذَا ثَبَتَ ثُبُوتاً جَامِداً، وَأَصْلُهُ مِنَ القُرِّ، وَهُوَ البَرْدُ، وَهُوَ يَقْتَضِي سُكُوناً)، (قَرَارًا)، سەقامگیر، دەگوترێ: (قَرَّ يَقَرُّ قَرَاراً)، کاتێك شتێك چەسپا، بە شێوەیەك کە نەجووڵێ، لە ڕیشەشدا لە (قُرّ) هاتوە، یانی: (بَرْد) ساردیی، چونکە ساردیی خوازیاری وەستانە، هەروەك گەرمیی خوازیاری جووڵەو هاتن و چوونە.

(خِلَٰلَهَآ): (جَمْعُ خَلَل: وَهُوَ فُرْجَةٌ بَيْنَ الشَّيْئَيْنِ، جَمْعُهُ خِلَال، كَخَلَلِ الدَّارِ، وَالسَّحَابِ وَالرَّمَادِ وَغَيْرِهَا)، (خِلَال) کۆی (خَلَل)، واتە: بۆشایی و کەلێنی نێوان دوو شتان، وەك کەلێنی خانوو، کە لە نێوان بەردەکان و خشتەکانی دا کەلێن هەیە، هەروەها کەلێنی هەور (لە کەلێنەکانی دا ئاو دێتە دەر) هەروەها کەلێنی خۆڵەمێش کە لە ژێرەوەی دایەو، لە کەلێنەکانی دا بۆشایی تێدایە.

(ٱلْمُضْطَرَّ): واتە: ناچارو بێ دەرەتان و گرفتار، (الإِضْطِرَارُ: حَمْلُ الإِنْسَانِ عَلَى مَا يَضُرُّهُ) (إضطرار) بریتیە لەوەی مرۆڤێك ناچار بکەی لەسەر شتێك، کە زیانی بۆی هەیە، (وَهُوَ فِي التَّعَارُفِ حَمْلُهُ عَلَى مَا يَكْرَهُهُ)، لە ڕووی عورف و باوەوە، بریتیە لە ناچارکردنی مرۆڤ لەسەر شتێك کە پێی ناخۆشە، کەواتە: (مُضْطَر)، یانی: مرۆڤی ناچارو بێ دەرەتان، کە تووشی زیان بووەو، دەیەوێ زیانەکەی لێ لابچێ.

(ٱدَّٰرَكَ): کە بە (أَدْرَك)ش، خوێنراوەتەوە، (إِدَّارَك: تَكَامُلَ عِلْمُهُم فِي الآخِرَةِ، لِأَنَّهُمْ رَأَوا كُلَّ مَا وَعِدُوا بِهِ)، واتە: زانیاریيان لە ڕۆژی دواییدا تەواو بوو، چونکە هەرچی هەڕەشەیان پێی لێکرابوو، دیتیان، یاخود هەرچی گفتیان پێ درابوو، هەموویان

بینی، یان (إِدَّارَكَ: قَصُرَ عِلْمُهُمْ فِي الآخِرَةِ) واتە: زانیارییەکەیان کۆبۆتەوە سەر یەك و کورت بۆتەوەو نەگەیشتۆتە تامانج، بەڵام (أدرك) یانی: لە ڕۆژی دوایيدا زانیارییەکەیان پێدەگات و هەموو شتەکان دەزانن.

(عَمُونَ): کۆی (أَعْمَى)یە، (عَمُون) حاڵەتی (رَفْع)یەتی، (عَمِيْن) حاڵەتی (نَصْبُ وجَرّ)یەتی، واتە: ئەوان کوێرن، لە سوورەتی (الأعراف)یشدا، (عَمِين)، ئەوان کوێرن، هاتوە.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

ئـەم هەشـت ئایەتـە، بـاسی چەسـپاندنی تەنیـا خواپەرسـتیی و خـوا بەیەكگرتـن دەكـەن، بـە بەڵگـەی تەنیـا بەدیهێنـەرو خـاوەن و پـەروەردگارو مشـوورخۆربوونی خـوا ﷻ، بـۆ گـەردوون و بـۆ ژیـان و مـرۆڤ، خـوا ﷻ فەرمـان بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەكات، هەروەهـا بـە هـەر كەسـێك كـە بگونجـێ بدوێـنرێ، دەفەرمـوێ: ﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ﴾، بڵـێ: سـتایش بـۆ خـواو، سـەلام لـەو بەندانـەی بـێ، كـە هەڵبیـژاردوون.

بەنـدە هەڵبـژاردەكانی خـوا ﷻ، بـە دڵنیایـی پێغەمبـەران (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، لـە پێـشی پێشـەوایانن، لـە نێـو ئەوانیشـدا، دیسـان هەیانـە پلـەی بەرزتـرو لـە پێشـترە، بـەڵام جگـە لـە پێغەمبـەران، زانایـان و میراتگـرانی ڕاسـتەقینەی پێغەمبەران و دۆسـتانی خـواش، دەكەونـە بـەر چەمـك و واتـای ئـەو تەعبیـرە، چونكـە هـەر كامێـك لـە بەنـدە زانـاكان و، لـە بەنـدە ڕاسـتەقینەكانی خـوا، پشـك و بەشـیان هەیـە، لـەوەدا كـە لـە لایـەن خـوای پـەروەردگارەوە، هەڵبژێـردراون و گوڵبژێركـراون.

﴿ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾، ئنجـا لێیـان بپرسـە: ئایـا خـوا باشـترە، یـان ئـەو شـتانەی دەیانكەنـە هاوبـەشی؟! چونكـە (أمَّا) لـە دوو وشـە پێـك هاتـوە: (أَمْ) و (ما)، یـانی: (أَمِ الَّـذِي يُشْرِكُون)، ئایـا خـوا باشـترە، بپەرسـترێ، خـوا باشـترە بەندایەتیـی بـۆ بكـرێ و پشـتی پـێ ببەسـترێ، فەرمانبەریـی بكـرێ و، یاخـود ئـەو شـتانەی ئـەوان دەیانپەرسـتن؟ ئنجـا چ ژیانـدار بـن، چ بـێ ژیـان، چ خـاوەن هەسـت و شـعوور بـن، چ بـێ هەسـت و شـعوور، ئنجـا لەسـەر ئـەو پرسـیاركردنانە بـەردەوام دەبـێ و، ئەمـە پرسـیاركردنی یەكەمـە: ﴿ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾، ئایـا خـوا باشـترە، خـوا باشـترە كـە بپەرسـترێ، بەندایەتیـی بـۆ بكـرێ، یاخـود ئـەو شـتانەی دەیانكەنـە هاوبـەشی؟!

﴿أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ﴾، یان ئایا ئەو شتانەی ئەوان دەیانپەرستن، چاکترن، یاخود ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی و، لەسەرێوە ئاوی بۆتان دابەزاندوە، کە باخە خاوەن دیمەنە ڕەونەقدارو جوان و بە دەوەکانمان، پێ ڕواندوون، کە هەرگیز بۆتان نەدەگونجا تێوە درەختەکانیان بروێنن، ڕووەکەکانیان بروێنن، ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی دیکە هەیە؟ ئەمە پرسیارکردنی نکوولیلێکەرانەیە، واتە: نکوولیی دەکەم کە لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەبێ، نیە، ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾، بەڵکو ئەوان کۆمەڵێکن لا دەدەن، یاخود: کۆمەڵێکن دروستکراوەکانی خوا، لەگەڵ خوادا یەکسان دەکەن.

ئنجا پرسیارێکی دیکە دەکات: پێشێ باسی ئاسمانی کرد، ئاسمانەکان و زەوی کێ هێناونیە دی؟ دوایی باسی ئەوەکە خوا لە ئاسمانەوە دایدەبەزێنێ، کە بریتیە لەو ئاوەی خوا دایدەبەزێنێ بە شێوەی بەفرو باران و تەرزە، باخ و بێستانە جوان و ڕەونەقدارەکانی پێ دەڕوێن، کە مرۆڤ بۆی نەبوو بیانڕوێنێ.

ئنجا لە بارەی زەوییەوە، دەفەرموێ: ﴿أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا﴾، ئایا ئەو شتانەی ئەوان دەیانکەنە هاوبەش بۆ خواو دەیانپەرستن، باشترن، شایستەترن، یاخود ئەو زاتەی کە زەوی کردوە بە نشینگەو سەقامگیری کردوەو لە میانیدا ڕووبارەکانی داناون، لە کەلێن و نزماییەکانیدا، ڕووبارەکانی داناون، ﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ﴾، هەروەها چیایە چەسپاوەکانی تێدا گێڕاون، ﴿وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا﴾، لە نێوان دوو دەریایەکانیش دا پەردەی داناوە، کە مەبەست پێیان ئاوی شیرین و سوێرە، کە پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (الفرقان)دا، بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوە، ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەیە؟! ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾، بەڵکو زۆربەیان نازانن، ئنجا لە ئەنجامی نەزانینندا هاوبەش بۆ خوا پەیدا دەکەن، ئەگەرنا بەدیهێنەر لە کوێ و بەدیهێنراو لە کوێ!

ئنجا دوای خستنە ڕووی دیمەنە دڵبزوێن و سەرنج ڕاکێشەکانی ئاسمان و زەوی، خوا ﷻ هەندێک حاڵەتی خودیی مرۆڤ، کە بەسەر مرۆڤ دا دێن، باس دەکات، دەفەرمووێ: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ ﴾، ئایا ئەو پەرستراوانە باشترن، یان ئەو کەسەی وەڵامی بابای ناچارو بێ دەرەتان دەداتەوە، کاتێک لێی دەپاڕێتەوە، ﴿ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ ﴾، زیان و خراپەشی لێ لادەبات، کە کەوتۆتە نێو ناخۆشییەکەوە، لێی لادەبات و دەربازی دەکات؟ ﴿ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ﴾، نەك هەر ئەو بێ دەرەتانە دەرباز دەکات، بەڵکو هەمووشتان دەکاتە جێنشین لەسەر زەوی و دەتانهێڵێتەوە، تاکو کاتێکی دیاریکراو، ﴿ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە، هەیە، کە شایستەی پەرستران بێ؟ بە دڵنیایی نەخێر، چونکە وەڵامی ئەو پرسیارانە هەموویان هەر نەخێرە، بەڵام ئەوانە پرسیار لێکردنی نکووڵیلێکەرانەن، یاخود پرسیارکردنی دانپێپێداهێنەرانە: (الإستفهام التقريري)ن، بەو واتایە، کە هەمووتان دان بەوە دادێنن، کە لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە نیە، ﴿ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾، بە کەمیی بیر دەکەنەوەو، یاخود بە کەمیی بیرتان دەکەوێتەوەو، پەند وەردەگرن.

ئنجا هەر لە بارەی حاڵەتەکانی مرۆڤەوە، دوو دیمەنی دیکەمان دەخاتە بەرچاو، ﴿ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾، یان ئایا ئەو شتانەی دەیانپەرستن لە جیاتی خوا باشترن، شایستەترن بپەرسترێن، یاخود ئەو زاتەی لە تاریکاییەکانی وشکانیی و دەریادا، ڕێنماییتان دەکات، واتە: هۆکاری وای بۆ ڕەخساندوون، هەم لە تاریکایی بیابان و دەشت و سارادا، ڕێی خۆتانی پێ بدۆزنەوەو، هەم لە تاریکاییەکانی دەریادا، چ ئەستێرەکان و خۆرو مانگ و، چ نیشانەکانی دیکە ﴿ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ﴾، هەروەها ئەو کەسەی بایەکان وەك مژدە، لە پێش دەستی بەزەییەکەیەوە، دەنێرێ، کە مەبەست لە بەزەییەکەی، ئەو ئاوەیە، خوا دایدەبەزێنێ، لە شێوەی باران و بەفرو تەرزەدا، ﴿ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی دیکە هەیە، شایستەی پەرستران بێ؟

بێگومان نەخێر، ﴿ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، خوا بەرزە لەوەی کە ئەوان، دەیکەنە هاوبەشی، خوا زۆر بەرزترە، پێگەو مەقامی خوا، بەس خوا دەزانێ چەندە بەرزەو، لەگەڵ دروستکراوەکانی دا، ناگونجێ یەکسان بکرێ و بخرێتە تەرازووەوە.

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتاییدا دەیانگێڕێتەوە بۆ سەرەتای سەرەتا: ﴿ أَمَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾، یان ئایا ئەو شتانەی ئەوان دەیانپەرستن، شایستەترن بپەرسترێن، یاخود ئەو زاتەی کە دروستکراوەکانی لە سەرەتاوە هێناونە دی، ﴿ أَمَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ﴾ یان ئەو کەسەی دەست دەکات بە دروستکردن، لە سەرەتاوە دروستکراوەکانی هێناونە دی، (ثُمَّ يُعِيدُهُۥ)، دوایی ئەو دروستکراوە دەگێڕێتەوە، دوای ئەوەی لە بەینیان دەبات، جارێکی دیکە دروستیان دەکاتەوە؟ ﴿ وَمَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەروەها ئەو زاتەی کە (لە سەرێوەو لە خوارێ) لە ئاسمان و لە زەویدا بژیوتان، دەدات، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشک دەخەینە سەر هەموو ئەو ئایەتانەو ئەو پرسیارانە، ﴿ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِ ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی دیکە هەیە، شایستەی پەرستران بێ؟ بە دڵنیایی نەخێر.

﴿ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، بڵێ: بەڵگەتان بێنن، بەڵگەی ڕۆشنتان بێنن، ئەگەر لە ڕاستانن، ﴿ قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ ﴾، بڵێ: ئەو کەسانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن، هەموو ئەو خاوەن ویست و هەستانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن، هیچ کامیان نادیار نازانن، جگە لە خوا ﷻ، ﴿ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ٦٥ ﴾، هەستیش ناکەن و نازانن، کەی زیندوو دەکرێنەوە، دوای ئەوەی دەمرن، نازانن کەی زیندوو دەکرێنەوە، تەنیا خوا دەزانێ، ﴿ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ ﴾، بەڵکو زانیاریی ئەوان، لە ڕۆژیی دوایی‌دا کۆدەبێتەوە سەر یەك و تەواو دەبێ، هەموو شتەکانیان بۆ دەردەکەون، واتایەکی دیکەی: بەڵکو زانیاریی ئەوان کورتی

هێنـاوەو كۆتایـی هاتـوە، دەربـارەی ڕۆژیـی دوایـی، واتـە: نەگەیشـتۆتە ئامانـج و زانیارییـان نیـە بـە ڕۆژیـی دوایـی، کـەی دێ و چـۆن دەبـێ؟ ﴿ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّنۡهَاۖ ﴾، بەڵکـو ئـەوان لـە بـارەی ڕۆژیـی دواییـەوە، لـە دوو دڵیـی دان، ﴿ بَلۡ هُم مِّنۡهَا عَمُونَ ﴾، بەڵکـو ئەوانـە، کۆمەڵێـکی کوێـرن، واتـە: عەقـڵ و هۆشـیان ڕاسـتیی نادۆزنـەوەو هـەق ناپێکـن، لێـرەدا کوێریـی دڵ و عەقـڵ مەبەسـتە، نـەك کوێریـی چـاوی سـەر.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**فەرمانکردن بە ستایشکردنی خواو، سەلام کردن لە پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و بەراوردکردن لە نێوان خوا ﷻو، پەرستراوەکانداو، وەسفکردنی خوا بە کۆمەڵێك سیفەتی گەورەو بەرجەستەی وەك: دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و، دابەزاندنی ئاوو، ڕواندنی باخ و بێستانە جوان و دڵگیرەکان و، سەقامگیر کردنی زەوی و، ڕووبار گەل ڕەوانەکردن بە کەلێنەکانی زەویداو، تێدا دانانی چیا چەسپاوەکان و، دانانی پەردە لە نێوان دوو دەریایەکان، ئاوی سوێرو شیرین دا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ ﴾، بڵێ: ستایش بۆ خوا، ستایش هەر شایستەی خوایە.

٢)- ﴿ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ﴾، سەلام و ئاشتییش لەسەر پێغەمبەرانی بژاردە، کە ئەو هەموو خۆڕاگریی و پشوو درێژییەیان بووە، لە گەیاندنی پەیامی خواداو، لە بەرانبەر ئەو ناڕەحەتیی و گرفتارییانەدا کە هاتوونە ڕێیان.

کە دەفەرموێ: (قُلِ) ئایا ئەو فەرمانە بە کێ کراوە؟ بە دڵنیایی بە پلەی یەکەم بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ کراوە، دوای ویش بەو بڕوادارانەی یەکەمجار لە خزمەتی ئەو دابوون، کە هاوەڵانی بەڕێزن (خوا لێیان ڕازیبێ)، بە پیاوان و ئافرەتانەوە، بەڵام بێگومان بە هەر کەسێکی دیکەش کراوە، کە قورئان دەخوێنێ و، شایستەی ئەوەیە خوا بیدوێنێ و فەرمانی پێ بکات و، خاوەنی ئیرادەو عەقڵ و شعوورو توانایە.

(السَّلَامُ: إِسْمٌ يَقُولُهُ القَائِلُ لِمَنْ يُلَاقِيهُ، وَمَعْنَاهُ: سَلَامَةٌ وَأَمْنٌ ثَابِتٌ لَكَ لَا نُكُولَ فِيهِ، فَهُوَ دُعَاءٌ وَتَأْمِينٌ)، (سلام): ناوێکە بێژەرێك بە کەسێکی دەڵێ کە پێی دەگات، دەڵێ: (السلام علیکم)، ماناکەشی ئاوایە: ئاشتیی و هێمنیی بۆ تۆ چەسپاوەو پەشێمان بوونەوەو پاشەکشەی تێدا نیە، کەواتە: (السلام علیکم)، پاڕانەوەیە، کە تۆ سەلامەت بی و هەر لە خۆشیی و ئاشتیی دابی، هەروەها دڵنیاکردنەوەشە.

کە تۆ دەگەیە کەسێك و دەڵێی: سەلامت لێ بێ، یانی: لە لایەنی منەوە تۆ سەلامەتی و دڵنیات دەکەوە، هەروەها دوعا بۆ کردنیشە، سڵاوکردن لە ئیسلامدا چەندە شتێکی گەورەیە! زۆر جیایە لەوە: بەیانییت باش، نیوەڕۆت باش، شەوت باش، ئێوارەت باش، کە بەداخەوە مسوڵمانان، ئەگەر بزانن ئەو ئەدەب و ڕەوشتە بەرزانەی، ئیسلام فەرمانی پێ بە مسوڵمانان کردوون، چەند گەورەن، هەرگیز دەستبەرداریان نابن، بۆ هەندێك عادەتی نەفامیی، کە شتێکی زۆر بێ نێوەڕۆکن [بەیانییت باش] یانی چی؟ مرۆڤ ئەگەر بۆ خۆی باش بێ، بەیانییەکەشی باشەو، ئێوارەشی باشەو، نیوەڕۆشی باشەو هەموو کاتەکانی باشن، یان: [ئەم کاتەت باش] چییە؟ ئەوە مرۆڤە کە باش دەبێت و، خراپ دەبێت، ئەگەرنا کات لە خودی خۆیدا، وەك زەرفێك و توورەکەیەك وایە، کە شتی تێ دەکەی، ئەوە تۆی چاك دەبی یان خراپ دەبی، چاکبوونی کات، هیچ واتای نیە، بەڵام سڵاوی ئیسلامیی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُه)، سەلامەتیی و بەزەیی و بەرەکەتی خواتان لەسەر بێ، ئەوە دوعایەو دڵنیاکردنەوەشە، چونکە مرۆڤ ئەگەر بۆ خۆی باش بوو، کاتەکانی هەر باش دەبن.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَىٰٓ ﴾، بێگومان ئەو بەندانەی کە خوا هەڵیبژاردوون، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ) لە پێشەوەیانن، بەڵام هەموو ئەوانی دیکەش کە بە ڕێی پێغەمبەراندا دەڕۆن، پشك و بەشیان هەیە، لەو هەڵبژێردرانەی لای خوادا ﷻ، هەر بۆیەش ئێمە لە تەحیاتدا دەڵێین: (السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِيْنَ)، ئاشتیی و سەلامەتیی لەسەر ئێوەو لەسەر بەندە چاکەکانی خوا، کە بێگومان پێغەمبەران لە پێشەوەیانن.

٣)- ﴿ ءَآللَّهُ خَيۡرٌ أَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، ئایا خوا باشتر و شایستەترە، کە بپەرسترێ، بەندایەتیی بۆ بکرێ، فەرمانبەریی بۆ بکرێ، (أَمَّا يُشۡرِكُونَ)، یاخود ئەو شتانەی ئەوان دەیانکەنە هاوبەش، (ما) لە (أَمَّا)دا، کە لە ئەسڵ دا (أَم ما)یە، (ما) (اسم الموصول)ە، بۆ پرسیارکردن (إستفهام)ە، (أَمَّا يُشْرِكُون)، یانی: (أَمِ الَّذِي يُشْرِكُون)، یان ئەوەی دەیکەنە هاوبەش؟ (خير) یانی: باشترە، بە پێی عەقیدەو بۆچوونی ئەوان، ئایا خوا باشترە، یاخود: ئەو شتانەی کە دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا، عائیدەکەی قرتێنراو (محذوف)ە، (مَا يُشْرِكُونَهُ) یانی: ئەو ڕاناوەی کە (يُشْرِكُون) بۆی دەگەڕێتەوە، قرتێندراوە، بە زۆریی لە قورئاندا وایە، چونکە بە سیاق و سەلیقە دەزاندرێ، ڕستەی: (أَمَّا يُشْرِكُون)، خوێندراویشەتەوە: (أَمَّا تُشْرِكُون)، بەشێوەی دواندن (خِطاب).

٤)- ﴿ أَمَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾، ئایا ئەو شتانەی ئەوان دەیکەنە، هاوبەش، شایستەترن بپەرسترێن، یاخود ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی.

٥)- ﴿ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، لەسەرێوەش ئاوی بۆتان دابەزاندوە، زۆرجاران گوتوومانە: ئاو، واتە: بە هەر چوار حاڵەتی: شلیی و گازیی و ڕەقیی و نەرمیی، واتە: باران و هەڵم و ئاونگ و تەرزە و بەفر، بە چوار حاڵەتان خوا ﷻ لە سەرێوە ئاو دادەبەزێنێ.

٦)- ﴿ فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهۡجَةٍ ﴾، ئنجا بەو ئاوەمان ڕواند، چەند باخێکی جوان و دڵگیر، (ذَات): (صَاحِبَة) خاوەن (بَهْجَة) ڕەونەق و جوانیی و بەرچاویی، کە لێرەدا: ﴿ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهۡجَةٍ ﴾، جۆرێکە لە ئاوڕدانەوە لە

حاڵەتی قسەکردن لەگەڵ نادیاردا، بۆ حاڵەتی نامادەو دواندن، (حَدِيقة)ش، پارچە زەوییەکە ناوو ڕووەکی تێدا بێ، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەرجە دەبێ دارخورماو ترێی تێدابێ، دارخورما بۆ جۆری هەرە بەرزو، مێوو ترێ بۆ جۆری هەرە نزم، بەڵام زۆربەی زانایان گوتوویانە: (حَديقة) پارچە زەوییەکە، درەختی میوەی تێدا بێ، سەوزەو کشتوکاڵیشی تێدابێ.

٧)- ﴿مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ﴾، ئێوە هەرگیز بۆتان نەدەگونجا کە درەختەکەی و، ڕووەکەکەی بڕوێنن، (شَجَر)، ناوی کۆو جینسەو (شَجَرة) تاکەکەیەتی و، بە (أشْجَار) کۆدەکرێتەوە، بەڵام لێرەدا تەنیا بە واتای درەخت نیە، بەڵکو (شَجَر) هەموو ڕووەکێك دەگرێتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ۝٦﴾ الرحمن، واتە: ئەستێرەو ڕووەك هەردووکیان کڕنووش بۆ خوا دەبەن، ئەستێرە لە ئاسمان، ڕووەك لەسەر زەوی، کە دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ﴾، یانی: لە بنەڕەت دا بۆتان نەدەگونجاو شایستەتان نەدەبوو، کە ڕووەکەکەی بڕوێنن.

٨)- ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەیە؟ ئەمە بێگومان ئەو پرسیارکردنە، پرسیاری نکوولّییلێکەرانە (الإسْتِفْهَامُ الإنْكَارِي)یە، واتە: بە دڵنیایی نەخێر.

٩)- ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾، بەڵکو ئەوان، کۆمەڵێکن لادەدەن، یان: یەکسان دەکەن. (بَلْ: للإضْرَابِ عَنِ الإسْتِفْهَام الإنْكَارِي، تُفِيْدُ مَعْنَى لكن بِاعْتِبَارِ مَا تَضَمَّنَهُ الإنْكَار مِنْ انْتِفَاء أَنْ يَكُونَ مَعَ الله إله)، (بَلْ) بۆ گواستنەوەیە (إضرابِ) و، لێرەدا مانای بەڵام (لكن)، دەگەیەنێ، (لَكن هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُون) بەڵکو ئەوان کۆمەڵێکن، لادەدەن، یان: جگە لە خوا لەگەڵ خوادا یەکسان دەکەن، لەبەرئەوەی ئەم (بَلْ)ە، مانای نکوولّییلێکردن دەگرێتە نێو خۆی، لەوە کە لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی دیکەی شایستەی پەرستران هەبێ.

﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾، (يَعْدِلُونَ) یان لە (عُدُولٌ)ەوەیە، یان لە (عَدْل)ەوەیە،

أ- (عُدُول): (الحياد والإنحراف) لادان و ترازان لە ڕێی ڕاست (عَدَل يَعْدِلُ عَدْلاً): (حَادَ يَحِيدُ، حرَف يَنْحَرِفُ)، واتە: لای دا، ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾، واتە: ئەوانە کۆمەڵێکن لا دەدەن، لە هەق لادەدەن.

ب- یاخود لە (عَدَلَ)ەوە هاتوە، (عَدَل بِهِ، يَعدِلُ أي سوّاه به)، واتە: یەکسانی کرد لەگەڵیدا، واتە: ئەوانە کۆمەڵێکن لە هەق لا دەدەن، یاخود کۆمەڵێکن جگە لە خوا، لەگەڵ خوادا یەکسان دەکەن.

ئنجا دێتە سەر باسی زەوی:

١٠)- ﴿أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا﴾، واتە: ئایا ئەو زاتە کە زەوی بۆ کردوون، بە نشینگە، یان بۆی نیشتەجێ کردوون و سەقامگیر کردوون، شایستەترە بپەرسترێ، یاخود پەرستراوە ساختەکان؟!

١١)- ﴿وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا﴾، لە میانی کەلێن و درزەکانی و بۆشاییەکانی زەوییدا، ڕووبارەکانی بە ڕێ کردوون، چونکە ڕووبارەکان بە دابڕاویی نێو چیایەکاندا، بە شوێنە بۆشاییەکاندا دەڕۆن، کە لە ئەنجامی بەردەوام بوونی ئەو ڕووبارانەدا، ئەو شوێنانەی کە پێیان دا هاتوون، دایانبڕیون و فراوانیان کردون و کردوویاننە دۆڵ و شیو، (خِلال) کۆی (خَلَلْ)ە، واتە: (فُرْجَة)، کەلێن و بۆشاییەك کە لە شتێکدا هەبێ.

١٢)- ﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ﴾، هەروەها بۆ زەوی، چیایەکانی داناون، (رَواسِي) کۆی (رَاسي)یە، یانی: (ثابت) چەسپاو، لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ ١٥﴾النحل، بۆ ئەوەی نەتانجووڵێنێ، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ﴾، واتە: بۆ ئەوەی خێرایی سووڕانەوەی زەوی کەم بکاتەوە، دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ، کە زەوی لە خولەکێکدا سی (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا، ئنجا ئەگەر چیایەکان نەبوونایە، بە دڵنیایی خێراتر دەخولایەوە، پاشان لە ئەنجامی ئەو خولانەوەیدا، چیایەکان، وەك پەیکەری ئێسك، جەستەی مرۆڤ ڕادەگرێ، ئەو چیایانەش بە هەمان شێوە زەوی ڕادەگرن، کە وەك پێشتر لە شوێنی دیکەدا داباسمانکردوە: چیا چەندەی بە دەرەوەیە، دە (١٠) تاکو پازدە (١٥)، هێندەی لە زەویدایە، بۆ وێنە: لووتکەی ئیڤریست لە چیای هیمالایا، نیزیکەی نۆ (٩) کیلۆمەتر (٨٨٦٤)م بەرزە، ئنجا چەندی بە دەرەوەیە، دە (١٠) تاکو پازدە (١٥) هێندەی لە ناخی زەویدایە، چیایی هیمالایاو، هەر

چیایەکی دیکەش بەو شێوەیە، کەواتە: چیایەکان بە تایبەت توێکڵی زەوییان، وەك پەیکەری ئێسك ڕاگرتوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ﴾، ئەو چیایە چەسپاوانەی بۆ زەوی داناون، بۆ ئەوەی ڕاگیری بکەن، هەروەها بۆ ئەوەش کە لە خێرایی سووڕانەوەکەی کەم بکەنەوە، کە زەوی وەك لە سووڕانەی بە دەوری خۆیدا، لە هەر خولەکێك دا سی (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، بەڵام لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا، لە هەر چرکەیەکدا سی (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، واتە: (٦٠) شەست هێندەی کە بەدەورەی خۆیدا دەخولێتەوە، خێراتر بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە.

بۆیەش خوا ﷻ، وەك لە تەفسیری سوورەتی (الفرقان)دا، باسمان کردو لە چەند شوێنی دیکەش دا باسمان کردوەو، چیایەکان بە گوڵمیخ (أوتاد) ناو دەبات، لێرەش بە (راوسي) چەسپاوان، ناوی هێناون، گوڵمیخێك، سینگێك کە وڵاخی پێ دەبەسترێتەوەو، چادرو ڕەشماڵی پێ ڕاگیر دەکرێ، دیارە بەشێکی کەمی بە دەرەوەیەو، زۆری دادەکوترێ لە زەویدا، خوای پەروەردگاریش چیایەکانی تەشبیە کردوون بەسینگ و گوڵمیخ، بەر لەوەی زانیاریی جیۆلۆجیا پێش بکەوێ، بزانرێ بنك و ڕەگی چیایەکان چەند قووڵەو چ باسە؟ کەواتە: ئەو خوایەی ئەو قوڕتانەی دابەزاندوە، هەر ئەویش ئەو چیایانەی خوڵقاندوون، بۆیە چاك دەزانێ چۆنن؟ هەروەها هەموو دروستکراوەکانی دیکەش کە خوا ﷻ باسیان دەکات، بەو شێوەیە باسیان دەکات، زانیاریی کە لە کۆتاییدا پێی دەگات، هەر ئەوە پشت ڕاست دەکاتەوە، کە خوا ﷻ فەرموویەتی.

١٣)- ﴿وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا﴾، هەروەها لە نێوان دوو دەریایەکاندا، پەردەی داناوە، بە دڵنیایی مەبەست لە پەردە، وەك پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی (الفرقان)دا، باسمانکردوە، مەبەست دوو شتە:

یەکەم: لە ڕووی جوگرافییەوە ئاوی شیرین، شوێنەکەی بەرزە، چونکە ئاوی شیرین بریتیە لە ئاوی باران و بەفرو تەرزە، کە لە هەورەکان دێتە خوارێ و، لە شوێنی ساردیش ئەو جۆرە ئاوانە دێنە خوارێ و، لەوێ کۆدەبنەوە، کەواتە: شوێنی ئاوی شیرین، بەرزترە لە ڕووی جوگرافییەوە، لە شوێنی ئاوی سوێر، کە زەریاو ئۆقیانووسەکانن.

دووەم: پەردەی دووەم، دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ، کە مۆلۆکۆلەکانی ئاوی شیرین، لەگەڵ هی ئاوی سوێردا تێکەڵ نابن، بەڵکو ئێستا زانست دەریخستوە، کە مۆلکۆل (جُزَيء)ەکانی دەریاکان هەندێکیان لە هەندێکیان، جیان، دەریای سپیی ناوەڕاست لەگەڵ ئۆقیانووسی هیندیی و، ئۆقیانووسی ئارام لەگەڵ دەریای ڕەش و، دەریای سوورو ...هتد، هەموو ئەوانە لێك جیان، لە ڕێگای مانگە دەستکردەکانەوە کە تەماشا دەکەن، کاتێ لەو شوێنانەی پێك دەگەن، ئەو زەریایانە، خەتێکی باریك هەیە، کە ئاوەکانیان پێکەوە ناوێتە نابن.

١٤)- ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەیە؟ کە ئەمەش هەر پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیەو، بە دڵنیایی لەگەڵ خودا هیچ پەرستراوێکی دیکەی شایستە نیە.

١٥)- ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، واتە: زۆربەی هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێبڕوایەکان نازانن و، لەبەر بێ عیلمییە تووشی شیرك و کوفر دێن، لە ڕاستییدا زانیاریی و بەرچاو ڕوونیی، ئینسان بەرەو ئیمان دەبات، بەڵام ئەوە نەزانییە کە مرۆڤ لە خوا دووردەخاتەوە، کە دەفەرموێ: (أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ) نەیفەرمووە: (كُلُّهُمْ)، خوا ﷻ دەزانێ کە زۆربەیان نازانن و لە ئەنجامی نەزانییدا تووشی کوفر بوون، بەڵام دیارە هەندێکیان دەشزانن، بەڵام عینادیی و نکووڵیی دەکەن، بەڵێ زۆربەی کافرەکان لەبەر نەزانیی تووشی کوفرو شیرك بوون، بەڵام هەندێکیان دەشزانن، بەڵام عینادیی و کەللەڕەقیی و دانپێدانەهێنان، دەکەنە پیشەی خۆیان.

**مەسەلەی دووەم:**

**وەسفکردنی خوا ﷻ کە هەر ئەو بابای گرفتارو تێگیراوو ناچار دەرباز دەکات و، مرۆڤەکان لەسەر زەوی، دەکاتە جێنشین، تەنیا ئەویش ڕێنمایی مرۆڤەکان دەکات، لە تاریکاییەکانی وشکانیی و دەریاداو، بایەکانیش لە پێش دەستی ئەو ئاوەدا کە لە ئاسمانەوە دایدەبەزێنێ، دەنێرێ، وەك موژدەو، دروستکراوەکان دێنێتە دی و، دوای دوای فەوتان و مردن، زیندووشیان دەکاتەوەو لە سەرێو خوارێوە، بژیوی مرۆڤان دەدات:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ ﴾، یان ئەو زاتە، ئەو کەسە کە وەڵامی بابای ناچارو تێگیراو دەداتەوە، کاتێك بانگی دەکات، واتە: ئایا هاوبەشە وەهمییەکان باشترن و شایستەترن بپەرسترێن، یاخود ئەو زاتەی کە وەڵامی بابای ناچارو تێگیراو دەداتەوە، کاتێك کە لێی دەپاڕێتەوە؟ (الإِضْطِرارُ: إِفْتِعالٌ مِنَ الضَّرُورَةِ لاَ مِنَ الضُّرِّ) (إضطرار) کە لە سەرکێشی (إفتعال)ە لە (ضرورة)دوە هاتوە نەك لە (ضُرّ)دوە.**

**کە دەفەرموێ: (ٱلْمُضْطَرَّ)، ئەم (أل)ە، پێی دەگوترێ: (لَامُ العَهْدِ الجِنْسِيِّ)، واتە: هەر تاکێك بەو شێوەیە بێ و بکەوێتە حاڵەتی ناچاریی و تێگیراویی، خوا**

ﷻ وەڵامی دەداتەوە، هەڵبەتە ئەگەر حیکمەتی خوا بیخوازێ و کە کاتی مەرگ و کۆتایی هاتنی نەهاتبێ.

٢)- ﴿ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ ﴾، خراپەشی لێ لا دەبات، وشەی (كَشْف): واتە: پەردە لادان، ئنجا ئەو حاڵەتە زیانکەیاندنەی کە تووشی مرۆڤ دێ، خوا ﷻ تەشبیهی کردووە بە پەردەیەکەوە، کە لەسەر شتێك لا دەچێت، واتە: خراپەی لێ لادەبات.

٣)- ﴿ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ﴾، ئێوەش دەکاتە جێنشینانی زەوی، واتە: دەتانهێڵێتەوە لەسەر زەوی.

٤)- ﴿ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەیە؟ بە دڵنیایی نەخێر.

٥)- ﴿ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾، بە کەمیی وەبیرتان دێتەوە، لێرەدا (تَذَكُّر) دوو مانای هەن:

أ- دەگونجێ لە (ذُكْر)ەوە بێ، کە بریتییە لە پێچەوانەی لە بیر چوون و، بریتییە لە هاتنەوە یادو، ئامادەبوونی شتێك لە زەین دا، واتە: کەم وا هەیە ئەو ناچارییەی خۆتان و، ئاتاجیی خۆتان بۆ لای خوا ﷻ لە بیر بێ، هەر ئەو کاتەی کە تێدەگیرێن، لێی دەپاڕێنەوە، دواتر لە بیرتان دەچێ.

ب- یاخود (تَذَكُّر) لێرەدا مەبەست پێی پەند وەرگرتنە، یانی: کەم پەند وەردەگرن.

٦)- ﴿ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾، هەروەها ئایا پەرستراوە ساختەکان شایستەترن بپەرسترێن، یان ئەو زاتە شایستەترە بپەرسترێ، کە لە تاریکاییەکانی وشکانیی و دەریادا، ڕێنماییتان دەکات و دەربازتان دەکات، هۆکاری وای بۆ ڕەخساندوون، کە ڕێی پێ بدۆزنەوە؟

٧)- ﴿ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ﴾، هەروەها کەسێك کە بایەکان دەنێرێ، وەك موژدە لە پێش دەستی بەزەییەکەیەوە، کە مەبەست پێی ئەو باران و

بەفرو تەرزەیە، کە لە سەرێوە دێتە خوار، کە خوا ﷻ ناوی لێناوە ڕەحمەت و، وەك چۆن ڕەحمەتەکەی هەموو کەس دەگرێتەوە، ئەو ئاوەش کە دایدەبەزێنێ، هەموو دروستکراوەکان دەگرێتەوە، بەبێ هەڵاواردن ئنجا بۆیەش دەفەرموێ: بایەکان وەك موژدە لە پێش دەستی ئەو ئاوەوە کە لە ئاسمانەوە دادەبەزێنێ، دەنێرێ، چونکە بایەکانن کە هەڵمی ئاو، لەسەر ئۆقیانووس و دەریایەکان پەیدادەکەن، دوایی ئەو بایانە هەڵمەکە لەگەڵ خۆیان دەبەن، بۆ شوێنە ساردەکان و، هەور پێك دێ و، دوای متوربە بوونیان، باران و بەفرو تەرزەیان لێ دێتە خوارێ.

٨)- ﴿ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەیە؟!

٩)- ﴿ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾، بەرزە خوا لەوەی ئەوان دەیکەنە هاوبەشی.

١٠)- ﴿ أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾، یان ئایا کێیە ئەو زاتەی کە دروستکراوەکان دەست پێ دەکات و، دوایی دەیانگێڕێتەوە؟! ئەمە لێرەدا پرسیارکردنی دانپێپێداهێنان (الإِسْتِفْهَام التقْرِيرِي)یە، چونکە نکووڵییان لەوە نەکردوە، کە دروستکراوەکان خوا دروستیکردوون و دەستی پێکردوون، پاشان کە هەر ئەویش لە ئاسمان و زەوییەوە بژیویان دەدات، نکووڵییان لەوە نەکردوە، بەڵام نکووڵییان لەوە کردوە کە خوا ﷻ جارێکی دیکە بیانگێڕێتەوە، دوایی فەوتان و مردن، بیانگێڕێتەوە بۆ ژیان، بەڵام خوا ﷻ ئەویشی دەخاتە گەڵ.

١١)- ﴿ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، هەروەها ئایاکێ لە ئاسمان و زەوییەوە بژیوتان دەدات؟ هەڵبەتە بژیوی ئاسمان ئاوە، کە دێتە خوارو، تیشکی خۆرەو، شەپۆلە جیاجیاکانن، هەموو ئەو شەپۆلانەی کە مرۆڤ بەکاریان دێنێ، بۆ گواستنەوەی دەنگ و ڕەنگ و، هەموو ئەو جۆرە تیشکانەی کە زۆر جۆراو جۆرن، هەموو ئەو شتانەی کە لە ئاسمانەوە بەرەو زەوی دێن، لەسەرێ بەرەو خوار دێن، کە ژیان و بەرژەوەندیی مرۆڤیان تێدا هەیە، بژیوی زەویش بریتیە لە: ڕووەك و ئاژەڵ و لە هەموو ئەو شتانەی کە لە زەوی وەدی دێن.

١٢)- ﴿ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەیە؟ بێگومان نەخێر، پرسیارکردنەکە لێرەدا، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، بەڵام ئەوەی پێشێ بۆیە دەگونجێ پرسیارکردنی دانپێپێداهێنان بێ، چونکە نکووڵییان نەکردوە لەوە کە خوا ﷻ هەموو شتێکی هێناوەتە دی و، خواش بژیو دەدات لە ئاسمان و زەوییەوە، بەڵام نکووڵییان کردوە لەوەی خوا ﷻ مرۆڤەکان زیندوو بکاتەوەو، خوا ﷻ بە تەنیا بپەرسترێ، بۆیە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەکە، دەکەوێتە سەر ئەوەی کە ئەوان نکووڵییان لێ کردوە، نەك ئەوەی دانیان پێداهێناوە.

١٣)- ﴿ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، بڵێ: بەڵگەتان بێنن، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، (البرهان: الحُجَّة الوَاضِحَة)،(برهان) بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراو بێ پێچ و پەنایە.

واتــە: بەبـێ بەڵگـەی ڕوون و بـێ چەنـدو چـوون، هەرچـی لـە بـارەی خـواوە بگوتـرێ، پـووچ و بۆشــە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**تەنیا خوا ﷻ پەنهان و نهێنیی لە ئاسمانەکان و لە زەوی دا دەزانێ و، کاتی زیندووکرانەوەی مردووان، تەنیا لە لای ویە، مرۆڤەکان لە بارەی ڕۆژی دواییەوە هیچ نازانن، بە تایبەت مرۆڤە بێبڕوایەکان، لە بەرانبەریدا دوو دڵن، بەڵکو وەك کوێر وان، لەبەر ئەوەی نە خۆیان پەی پێ دەبەن و، نە لەبەر ڕۆشنایی وەحییشدا، سەرنجی دەدەن:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ادَّارَكَ عِلْمُهُمْ فِي الْآخِرَةِ ۚ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّنْهَا ۖ بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ﴾، ڕووی دواندن لە پێغەمبەر موحەممەدە ﷺ، بە پلەی یەکەم، لە دوای ئەویش لە هەر کەسێکە بە دوای ئەودا دەڕوات و قورئان دەخوێنێتەوەو، پەیامی خوا بە خەڵك دەگەیەنێ، بڵێ: ئەوانەی کە لە ئاسمانەکان و زەوییدان، ئەو خاوەن عەقڵ و شعوورانە، لە فریشتەو جند و لە هەر دروستکراوانێکی دیکەو، لە مرۆڤەکان کە لەسەر زەویین، هیچ کام لەوانە پەنهان نازانن، لە ئاسمان و زەوییدا، جگە لە خوا.

دەبێ ئەم هەڵاواردن (اسْتِثْنَاء)یە، (إِسْتِثْنَاءٌ مُنْقَطِع) هەڵاواردنێکی دابڕاو، بێ، چونکە خوا ﷻ لەو خاوەن ویست و شعوورانە نیە، کە لە ئاسمان و زەویدان، خوا ﷻ لە دەرەوەی ئاسمان و زەوییە، واتە: تەنیا خوا ﷻ نهێنیی و پەنهانی نێو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، بەڵام ئەوانی دیکە هیچیان نایزانن، فریشتەو جند و مرۆڤ، ئەو سێیە تاکو ئێستا بۆ ئێمە زانراون، کە خاوەنی ویست و هەست و شعوور بن.

٢)- ﴿ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾، ناشزانن و هەست ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە، نە فریشتەکان دەزانن، نە جند دەزانێ، نە مرۆڤیش دەزانێ، مرۆڤ و جند، ئاشکرایە کە نازانن، فریشتەکانیش نازانن، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا ﷻ هەم لێرەدا دەفەرموێو، هەم لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٨٧)دا، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلَّا هُوَ ﴾، بلێ: کاتی خۆی ئاخیر زەمان دەرناخات و نایدرەوشێنێتەوە، جگە لە (خوا) خۆی، هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە بە فەرموودەی جیبریل ناسراوە، لەو فەرموودەیەدا کە بوخاریی و موسلیم هێناویانە، لە عومەری کوری خەتتابەوە، گێرِراوەتەوە، فەرموودەیەکی درێژە، لە بارەی ئیمان و ئیسلام و ئیحسانەوە، جیبریل پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، هەموو جارێك کە پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دەداتەوە، ئەویش دەڵێ: (صَدَقْتَ)، ڕاستت کرد. هاوەڵان پێیان سەیر دەبێ، چونکە کەسێك بە کەسێك بڵێ: ڕاستت کرد، مانای وایە خۆی لەو باشتر دەزانێ، دوایی لە بارەی ئاخیر زەمان (سَاعَة)دوە، لێی دەپرسێ، (مَتَى السَّاعَة)، پێغەمبەر دەفەرموێ: {مَا الْمَسْؤُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ بِهَا مِنَ السَّائِلِ} (أخرجه البخاري: ٨٠، ومسلم: ٨)، واتە: پرسیار لێکراو، لە پرسیارکەر زیاتری لێ نازانێ، یانی: منیش هەر بە قەدەر تۆی لێ دەزانم، کەواتە: جیبریلیش نەیزانیوە، بۆیەش خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾، نازانن نە ئاخیر زەمان کەی دێ، نە قیامەتیش کەنگێ دێ، کە کاتی زیندووبوونەوەو هەڵسانەوەیە.

٣)- ﴿ بَلِ ادَّارَكَ عِلْمُهُمْ فِي الْآخِرَةِ ﴾، بەڵکو هەموو خاوەن هەست و شعوورەکان، لە فریشتەو جند و مرۆڤ، زانیارییان لە بارەی ڕۆژی دواییەوە بەجێماوە، (إدَّارَك) سێ واتای هەن:

أ- (إدَّارَك)، بە مانای (تَلاحق) واتە: کۆبۆتەوە سەریەك و نەگەیشتوە بە ئامانج.

ب- زانیارییەکەیان پاڵپێوەنراوەو، ناتوانێ بگاتە ئەو مەبەستە.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، واتە: زانیاریی ئەوان لە ڕۆژیی دواییدا تەواو دەبێ، تەنیا لە قیامەتدا تەواو زانیارییان بە قیامەت دەبێ، بەڵام وا پێدەچێ مانای یەکەمیان ڕاستتر بێ.

٤)- ﴿ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّنۡهَاۖ ﴾، لێرەوە دەگوازێتەوە بۆ تەنیا قسەکردن لە بارەی بێبڕوایەکانەوە، چونکە فریشتەکان گومانیان نیەو، دوو دڵ نین، لە هاتنی ڕۆژی زیندوو کرانەوە، هەروەها مرۆڤ و جندە بڕوادارەکانیش دوو دڵ نین، بۆیە لێرەدا مەبەست پێی بێبڕوایەکانە، واتە: بێبڕوایەکان دوو دڵن لە بارەی ڕۆژیی دواییەوە.

٥)- ﴿ بَلۡ هُم مِّنۡهَا عَمُونَ ﴾، بەڵکو لە بارەیەوە کوێرن، واتە: بە چاوی عەقڵ و دڵ نایبینن، چونکە ئینسان لە بارەی ڕۆژیی دواییەوە، چ ئاخیر زەمان، چ هەڵسانەوەو قیامەت، کە دوو قۆناغە سەرەکییەکەی ڕۆژیی دوایین، مرۆڤ بە بێ بەرچاو ڕوونیی و وەحیی، هیچی لێ حاڵیی نابێ و، بە عەقڵ ناتوانێ ئەو ڕاستییانە، دەرك بکات و، ئیستیعاب بکات، عەقڵ زیاتر لەگەڵ جیهانی ماددەو بەرهەستدا مامەڵە دەکات، بەڵام ئەوان لە دەرەوەی جیهانی ماددەو بەرهەستن، بۆیە مرۆڤ بە عەقڵ ناتوانێ ئەو شتانە دەرك بکات و، دەبێ پەنا بەرێتە بەر وەحیی، ئنجا ئەوانەش خۆیان لە ڕووناکیی هیدایەتی وەحیی بێ بەشکردوە، لەبەر ئەوەی بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ نیە، بڕوایان بە پەیامێك نیە، کە لە خواوە هێناویەتی، بۆیە لە بارەیەوە دوو دڵن و لە ئاستیشیدا کوێرو نابینان.

لێرەدا ئاماژە دەکەین، بە دوو فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ لە بارەی کەسانێکەوە کە بە ناوونیشانی کاهین، یان فاڵچیی و فاڵگرەوە، کە لە نێو زۆربەی میللەتاندا باوە، وەك قاوە گرتنەوە، لەسەر لم نووسین، لەپە دەست خوێندنەوە، قسەکردن لە پەنهان، بەهەر شێوازێك لە شێوازەکان:

١- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ أَتَى عَرَّافًا، فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً} (أخرجه مسلم: ٥٩٥٧ عن بعض أزواج النبي).

واتــە: هــەر کەسـێك بچێتــە لای فاڵچییــەك [(عَـرّاف) ئەوانـەن کـە لاف ئـەوە لـێ دەدەن، پەنهـان دەزانـن]و بەڕاسـتیشی بزانـێ لـەوەدا کـە دەیڵـێ، نوێـژی چـل (٤٠) ڕۆژی لـێ قبـووڵ ناکـرێ.

٢- هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [مَنْ أَتَى كَاهِنًا، أَوْ عَرَّافًا، فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ] (أخرجه أحمد: ٩٥٣٢، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَالْحَسَنِ، تعليق شعيب الأرنؤوط : حسن رجاله ثقات رجال الصحيح).

واتــە: هــەر کەسـێك بچێتــە لای کاهینێـك، یــان فاڵچییــەك (واتــە: لاف لێـدەری پەنهانیـی زانێـك)و، بەڕاسـتی دابنـێ، لـەوەدا کـە دەیڵـێ، ئـەوە بێبـڕوا بـووە بەرانبـەر بــەوەی بـۆ سـەر موحەممـەد ﷺ دابەزیـوە.

چونکـە ئـەوەی بـۆ سـەر موحەممـەد ﷺ دابەزیـوە، دەفەرمـوێ: ﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾، هەمـوو ئەوانـەی کـە لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا هـەن، نادیـار نازانـن، پەنهـان نازانـن و تەنیـا خـوا ﷻ دەیزانـێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە نۆ (٩) ئایەتە پێك دێ، ئایەتەکانی: (٦٧ - ٧٥)دا، کە تەوەری سەرەکیی ئەو نۆ ئایەتە، باسی زیندووکرانەوەو ڕۆژیی دواییە، کە چۆن کافرەکان، نکووڵیی لە زیندووکرانەوە دەکەن، بەڵگەشیان ئەوەیە کە کاتی خۆی بەڵێن بە باب و باپیرانیشیان دراوە، بەڵام کەسیان زیندوو نەکراونەوە، خوای کارزانیش چەند وەڵامێکی کورت و پوختیان دەداتەوەو، سەرنجیان بۆ چەند ڕاستییەك ڕادەکێشێ.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبٗا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدۡ وُعِدۡنَا هَٰذَا نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٦٩﴾ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُن فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ﴿٧٠﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي تَسۡتَعۡجِلُونَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعۡلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنۡ غَآئِبَةٖ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: ئایا کاتێك ئێمەو باب و باپیرانمان بووینەوە خاك، ئایا ئێمە دەردەهێنرێینەوە (زیندوو دەکرێینەوە؟) ﴿٦٧﴾ بەدڵنیایی ئەم گفتەی بە ئێمە دراوە، پێشتر بە باب و باپیرانیشمان درابوو، ئەمە تەنیا ئەفسانەکانی پێشووانە ﴿٦٨﴾ بڵێ: بە زەویدا بڕۆن، سەرنج بدەن! سەرەنجامی تاوانباران چۆن بوو؟ ﴿٦٩﴾ (بە هۆی بێبڕواییانەوە) خەمباریان مەبەو، بە هۆی پیلانگێڕانیانەوە، سەغڵەت و دڵتەنگ مەبە ﴿٧٠﴾ (بێبڕوایەکان) دەشڵێن: ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، (کاتی هاتنە دی) ئەو بەڵێنە کەیە؟ ﴿٧١﴾ بڵێ: نیزیکە هەندێك لەوەی پەلەی لێدەکەن، لە تەنیشتتان بێ ﴿٧٢﴾ بە دڵنیاییش پەروەردگارت خاوەن چاکەیە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەیان سوپاسگوزاریی ناکەن ﴿٧٣﴾ هەروەها پەروەردگارت ئەوەی سینەکانیان پەنهانی دەکات و، ئەوەی ئاشکراشی دەکەن (وەك یەك) دەیزانێ ﴿٧٤﴾ هیچ پەنهان و شێردراوەیەکیش لە ئاسمان و زەویدا نیە، مەگەر لە نووسراوێکی ڕوونکەرەوە دایە (و تۆمار کراوە) ﴿٧٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ): (الحَـزَنُ والحُزُونَـةُ: خُشُـونَةٌ فِي الأَرْضِ وخُشُـونَةٌ فِي النَّفْـسِ، لِمَا يُحْصَـلُ فِيـهِ مِـن الغَـمّ وَيُضَـادُّهُ الفَـرَحُ)، (حَـزَنٌ وحُزونَـةٌ): زبرییەکە لە زەویداو، بە زبریی دڵ و دەروونیش دەگوترێ، لەبەر ئەوەی خەم و پەژارەی تێدا پەیدادەبێ، کە پێچەوانەی (حُـزن وَحَـزَن)، (فَـرَحْ): دڵخۆشیی و شادمانییە.

(ضَيْقٍ): (**الضَّيْـقُ ضِـدُّ السَّـعَةِ، وَيُقَـالُ الضِّيْـقُ**)، هـەم (ضِيـق) دەگوتـرێ، هـەم (ضَيْـق) دەگوتـرێ، پێچەوانـەی فراوانییـە، واتـە: تەنگەبەریـی و تەسـكیی، (**والضَّيقَـةُ: تُسْـتَعْمَلُ فِي الفَقْـرِ وَالغَـمِّ وَالبُخْـلِ، وَنَحْـوِ ذَلِـكَ**)، وشـەی (ضَيقـة) بەكاردەهێـنرێ بـۆ هەژاریـی و خـەم و چرووكیـی و بـۆ هاوشـێوەی ئـەوان.

(رَدِفَ لَكُم): واتـە: لـە تەنیشـتتان و لـە پەناتـان بـێ، (**الـرِّدْفُ: التَّابِـعُ وَعُـدِّيَ رَدِفَ لَكُـمْ، بِالـلَّامِ مَـعَ أَنَّـهُ صَالِـحٌ للتَّعدِيَـةِ بِنَفْسِـهِ، لِتَضْمِيْنِـه مَعْنَـى اقْـتَرَبَ، أَوِ الـلَّامِ للتَّوْكِيْـدِ مِثْـلُ: شَـكَرَ لَـهُ**)، (رِدْف) بـە مانـای شـوێنكەوتوو دێ، كەسـێك بـە دوای شـتێكەوەیە، (رَدِفَ لَكُم) لەگـەڵ ئەوەشـدا كـە دەگونجـێ (رَدِفَ) بـە بـێ (ل) بـەركار (**مفعولٌ بـه**) بخـوازێ، بـەڵام بۆیـە بـە (ل) بـەركاری خواسـتووە، تاكـو مانـای نیزیكـە (**إقـترَبَ**)ش وە خـۆی بگـرێ، یاخـود (ل) كـە خراوەتـە سـەری: (رَدِفَ لَكُم)، بـۆ جەختكردنـەوەو تۆخكردنـەوەی واتایەكەیـەتی، وەك (**شَـكَرَهُ**)، سـوپاسی كـرد، (شَـكَرَ لَـهُ) سـوپاسی كـرد زۆر بـە تۆخیـی.

(غَآئِبَةٍ): (**إِسْـمٌ للشَّـيءِ الغَائِـبِ، وَالتَّـاءُ فِيـهِ للنَّقْـلِ مِـنَ الوَصْفِيَـةِ إلى الإِسْـمِيَّةِ، كَالتَّـاء فِي العَافِيَـةِ وَالعَاقِبَـةِ، وَالفَاتِحَـةِ، وَهُـوَ اسْـمٌ مُشْـتَقٌّ مِـنَ الغَيْـبِ ضِـدُّ الحُضُـورِ، وَالمُـرَادُ الغَائِبَـةُ مِـنْ عِلْـمِ النَّـاسِ وَاسْـتُعْمِل الغَيْـبُ فِي الخَفَـاء مَجَـازاً مُرْسَـلاً**)، وشـەی (غائِبَـة): نـاوە بـۆ شـتێكی پەنهـان، شـتێك كـە دیـار نەبـێ، پیتـی (ة) كـە لەسـەریەتی (غائِـبٌ)، یـانی: نادیـار، بـەڵام (غائِبَـة)، بـۆ ئەوەیـە كـە بیگوازێتـەوە لـە حاڵـەتی وەسـف بـۆ حاڵـەتی نـاو، وەك وشـەی (عَافِيَـة) كـە لـە ئەصڵـدا وەسـف بـووە، بـەڵام ئێسـتا بۆتـە نـاو، هەروەهـا (خَاتِمـة) و (فَاتِحَـةُ)، ئەوانـە لـە ئەصڵـدا، وەسـف بـوون، بـەڵام بـە هـۆی (ة)ەوە، كـراون بـە نـاو، وشـەی (غائِبَـة)ش، لـە (غیـب) وەرگیـراوە كـە دژو پێچەوانـەی ئامادەبوونـە، (غیـب) نـا ئامـادە، نەبیـنراوو پەنهـان، (**حضور**)یـش ئامـادە، مەبەسـتیش لـە (غائِبَـة)، ئەوەیـە كـە لـە زانیاریـی خەڵـك دا نامادەنیـە، وشـەی (غَيْـب) بـۆ پەنهـان بەكارهاتـوە، بـە شـێوەی مەجـاز.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

تـەوەری سـەرەکیی ئـەم نـۆ ئایەتـە موبارەکـە، ڕۆژیـی دوایـە، بـە تایبـەت قیامـەت، زینـدوو بوونـەوەو هەسـتانەوە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، هەروەهـا ئەوانـەی بێبـڕوان، گوتیـان، خـوا ﷻ دەیتـوانی بفەرمـوێ: (وَقَالُوا)، گوتیـان، چونکـە قسـە هـەر لەسـەر بێبڕوایانـە، بـەڵام نـاوی ئاشـکرا خراوەتـە شـوێنی ڕانـاو (وضع المُظْهَرِ مَوضِعَ المُضْمَرِ)، بـۆ ئـەوەی ئـەو سـیفەتی کوفرەیـان تێـدا زەق بکاتەوە، ئەوانـەی بێبـڕوان، واتـە: هەقیـان بـۆ هاتـوە، بـەڵام دایانپۆشـیوەو ڕەفزیـان کـردوە، گوتیـان: ﴿ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبٗا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ ﴾، ئایا ئێمـەو بـاب و باپیرانمـان کاتێـك بووینـە خـاك، ئایـا دەردەهێندرێینـەوە؟ ئەمـە پرسـیارکردنی نکوولّیلێکەرانەیـە، واتـە: هەرگیـز ناگونجـێ کـە بووینـەوە خـاك، جارێـکی دیکـە دەربهێنرێینـەوە لـە زەوی و زینـدوو بکرێینـەوە، نـە ئێمـەو نـە بـاب و باپیـرانی پێشـوومان.

ئنجـا بەڵگـە دێننـەوە، بـۆ ڕاسـتیی ئـەو دەعوایەیـان، دەڵێـن: ﴿ لَقَدۡ وُعِدۡنَا هَٰذَا نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـا ئەمـە (ئـەم بەڵێنـە) بـە ئێمـەش و بـە بـاب و باپیرانیشـمان پێشـتر درابـوو، واتـە: پێشـتر بـە بـاب و باپیرانمـان درابـوو، ئێسـتاش بـە ئێمـە دراوە، ﴿ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، بـەڵام ئەمـە بـەس ئەفسـانەی پێشـینانە، یـانی: ئـەو بەڵێنـە پێشـتر بـە بـاب و باپیرانمـان درابـوو، بـەڵام کەسـیان نەهاتۆتـەوە، بێبڕوایانـی کوردەواریـی خۆشـمان زۆر جـاران دەڵێـن: (کـەس لـە قیامەتـێ نەهاتۆتـەوە)، ئاخـر قیامـەت نەهاتـوە، تاکـو خەڵـك لەوێـڕا بێتـەوە، خـوا ﷻ ئـەم گەردوونـەی بـە سیسـتم دانـاوەو، هەڕەمەکیـی و پادشـا گەردانیـی نیـە، قیامـەت ئێسـتا بـێ و، ئاخیـر زەمـان تێکـەڵ بـێ لەگـەڵ قیامـەت داو، قیامـەت لەگـەڵ دنیـادا تێکـەڵ بێـو، بـەرزەخ لەگـەڵ ڕۆژیـی دواییـدا تێکـەڵ بـێ!! نەخێـر هـەر شـتە لـە کاتی خۆیـدا دێ، وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ

﴿أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴿٧١﴾﴾ المؤمنون، واتە: ئەگەر هەق بە دوای ئارەزووی ئەوان بکەوێ، ئاسمانەکان و زەوی و هەرکەس کە تێیاندا هەیە، تێکدەچێ، نەخێر خوا ﷻ هەر شتێك لە قۆناغی خۆیدا، ئەنجام دەدات و پەلەش ناکات، وەك خەڵك پەلە پەلیەتی، چونکە خوا ﷻ خاوەنی هەموو شتێکە، ئەو گەردوونە هەمووی لەبەر دەستی خۆی دایە، بە پەنهان و ئاشکرایەوە، بە دنیاو دوارۆژیەوە.

ئنجا ئەوانە (ماشاءالله) بەڵگەی زۆر بەهێز دەهێننەوەو دەڵێن: بەڵگەمان لەسەر ئەوە کە ئێمە بووینەوە خاك، زیندوو ناکرێینەوەو دەرناهێنرێینەوە لە زەویدا، ئەوەیە کە پێشتر ئەو بەڵێنە بە باب و باپیرانانیشمان درابوو، کەسیشیان نەهاتوونەوەو بەڵێن بە ئێمەش دراوە، بۆیە ئەوە تەنیا ئەفسانەی پێشینانە! کە لە ڕاستییدا ئەوە قسەیەکی زۆر بێ سەروبەرو بێ سەروپایە، خوا ﷻ نەیفەرمووە: لە دنیادا زیندووتان دەکەمەوە، دەفەرمویّ: لە قیامەتدا زیندووتان دەکەمەوە، لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، نەیفەرمووە: ئێستا، بەڵێ، ئێستاش کە مردین، ڕووحەکەمان دەچێتە قۆناغی بەرزەخەوەو لەوێش ژیانی لێیەو، سزای لێیەو نیعمەتی لێیە، وەك پێشتر باسێکی سەربەخۆمان کرد، لە بارەی قۆناغی بەرزەخەوە، لە تەفسیری سوورەتی (المؤمنون)دا، لە کاتی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتەدا کە دەفەرمویّ: ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾﴾، بەڵام زیندووبوونەوەی جەستەکان، خوا ﷻ بۆ ڕۆژی دوایی هەڵیگرتوە، خوا ﷻ نەیفەرمووە: لە دنیادا زیندووتان دەکەمەوەو تاکو بڵێی: ئەدی بۆچی زیندوو نەبووینەوە؟ خوا ﷻ فەرموویەتی: مرۆڤ و جند دەبێ ژیانی دنیایان، لەم سەر زەوییە بگوزەرێنن و، هەموویان تاقیکردنەوەی خۆیان بدەن، ئنجا ئەو لاپەڕەیە هەڵدەگیرێ و لاپەڕەیەکی دیکە دێتە گۆڕێ، لە دوای فووی یەکەم، ئەم گەردوونە تێك دەچێ و ئاخیر زەمان (ساعة) دێ و، لە دوای فووی دووەم، قیامەت و زیندووکرانەوەو هەڵسێنرانەوە دێ، وەك دەفەرمویّ: ﴿وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا

مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾الزمر، واتە: فوو بە صووردا کرا یەکجار (جاری یەکەم) هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەوییدا هەیە، مردن، مەگەر کەسێك خوا ﷻ بیەوێ نەمرێ، ئنجا جاری دووەم فووی پێدا کرا، هەموویان یەکسەر هەڵسان و تەماشایان دەکردو چاوەڕێ بوون [ئایا خوا ﷻ فەرمانی بە چییەو لە کوێ کۆببنەوەو چی بکەن؟!].

بۆیە خوا ﷻ لە جیاتی وەڵامی ئەو قسەیان بداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾ بڵێ: بەزەویدابڕۆن ئنجا سەرنج بدەن! سەرەنجامی تاوانباران چۆن بوو؟ چونکە ئەو قسەیە، قسەیەکە هیچ عەقڵ و لۆژیکی تێدانیە، خوا ﷻ دەفەرموێ: لە قیامەت دا زیندووتان دەکەمەوە، دەڵێن: بۆچی لە دنیادا زیندوو نەبووینەوە، بە بەڵگەی ئەوە کە باب و باپیرانمان پێشتر بەڵێنیان پێدراوەو، کەسیش نەهاتۆتەوە لە گۆڕستانەوە، لە قیامەتەوە؟ ئاخر قیامەت نەهاتوە و نیە، تاکو لەوێوە بێنەوە! جارێ قیامەت نەهاتوە، تاکو خوا ﷻ لە گۆڕەکان دەریانبێنێتەوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: بڵێ: بە زەویدا بڕۆن و، سەرنج بدەن! سەرەنجامی تاوانباران چۆن بوو؟ واتە: ئەوانەی کە وەك ئێوە نکووڵییان دەکرد، لەو هەموو ڕاستییانەی کە دەچنە چاویانەوە، نکووڵییان دەکرد لەوەی خوا ﷻ بتوانێ زیندوویان بکاتەوە، تەماشای سەرەنجام و ئاکامی خراپ و بڕ سزاو ئازاریان بکەن! گرفتی ئەوانە ئەوە بووە، کە بڕواشیان بە خوا هەبووە، بەڵام گوتوویانە: خوا ﷻ زیندوومان ناکاتەوە، ناتوانێ زیندوومان بکاتەوە، کە ئەوە دژیەکیی (تناقض)ێکی زۆر بێ واتایە، چونکە خوایەك توانیبی ژیان بە تۆ ببەخشێ، کە تۆ هەر نەبووی، دوای ئەوەی تۆ هەی، بەڵام لە بەین دەچی، خوا ﷻ دەتوانێ زیندووت بکاتەوە، گۆزەچییەك کە گۆزەکەی لێ دەشکێ، دەتوانێ دوایی لەتکە سواڵەتەکانی کۆبکاتەوەو بیهاڕێ و بیکاتەوە بە قوڕ، گۆزەیەکی چاکتری لێ دروست بکاتەوە، گۆزەچییەك ئەوەی لێ عاسێ نابێ، ئەگەر گۆزەی لێ بشکێ دروستی بکاتەوە، خوا عزو جل چۆن تۆی لێ

عاسێ دەبێ، دوای ئەوەی تۆی دروستکردوەو مراندوویی، زیندووت بکاتەوە؟! شتێکی زۆر نالۆژیکییە، دروستکراوێك ئەو توانایەی هەیە، لە دروستکراوەکانی، کە شتێکی لێ تێکدەچێ، دووبارەی بکاتەوە، خوا چۆن ئەو توانایەی نیە؟! بۆیە خوا ﷻ بە تاوانباریان ناو دەبات و دەفەرموێ: بڵێ: بە زەویدا بڕۆن و سەرنج بدەن، سەرەنجامی تاوانبارانی وەك ئێوە چۆن بوو!!

ئنجا ڕوو دەکاتە پێغەمبەر ﷺ و دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ ﴾، خەم مەخۆ و پەژارەدار مەبە، بە هۆیانەوە کە بڕوا ناهێنن، ﴿ وَلَا تَكُن فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ﴾، بە هۆی ئەو پیلانەشەوە کە دەیگێڕن، مەکەوە حاڵەتی دڵتەنگیی و، سەغڵەتیی و، نارەحەتیی، خوا ﷻ ئەو جۆرە قسانەی ئەوانە بە پیلان ناو دەبات، چونکە لە ڕاستییدا، ئەو قسانە قسەی زلە زلەکان و بڕیار بە دەستەکانیان بوون، بۆ چەواشەکردنی خەڵکە ڕەش و ڕووتەکە بووە، بۆیەش خوا ﷻ هەر دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، یانی: ئەو زلە زلانە، زانیوشیانە، کە ئەوەی موحەممەد ﷺ دەیڵێ، پەیامی خوایەو ڕاستە، بەڵام بۆیە بڕوایان پێ نەهێناوە، چونکە بەزم و بازاڕەکەیان لێ تێکدەچوو، نەگەر گوتبایان: ئەو پەیامەی خوا ڕاستە، پەیامی خوا بەس ئەوەندە نەبوو بڵێ: زیندوو دەبنەوە! باشە ئەو پەیامەی خوا ڕاستە، بەڵام ئەو پەیامەی خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەبوو جەهل و، ولیدی کوڕی موغیرەو، عوتبەو شەیبەو، ئەبوو سوفیان و فلان و فیسار!! چیدیکە ئەو خەڵکە مەچەوسێننەوە، چیدیکە دەست بەسەر موڵك و سامانی وڵات دامەگرن، چیدیکە گەندەڵیی و فۆرخکاریی مەکەن، چیدیکە خەڵك بە کۆیلە تەماشا مەکەن! ئەو پەیامەی خوا تەنیا ئەوەندە نەبوو بڵێ: زیندوو دەبنەوە! بەڵکو دەشیفەرموو: باشە مادام زیندوو دەبنەوە، ژیانەکەتان بە جۆرێك بگوزەرێنن، کە جێگای ڕەزامەندیی خوایە، ئەویش ئەوەیە کە دادگەریی هەبێ و فریی و پریی و جیاوازیی نەبێ، ئەوان دەیانزانی ئەو بەزم و بازاڕەیان هەموو لێ تێکدەچی! ئنجا ئەوان دەیانگوت: ئەی موحەممەد! ﷺ ئێمە چۆن

بێینە ئاستی بیلالی حەبەشەیی و، سوهەیبی ڕۆمیی و، بێینە ئاستی ئەو کۆیلەو ڕەش و ڕووتانە؟ دەیانگوت: دەبێ لە کۆڕو مەجلیست دەریان بکەی، ئنجا ئێمە دێین گوێت بۆ دەگرین، ئەوان گرفتی گەورەیان ئەوە بووە، بۆیەش خوا ﷻ ئەوە بە پیلان ناو دەبات: ﴿وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ﴾، دڵتەنگ و سەغڵەت مەبە، بە هۆی ئەو پیلانەوە کە دەیگێڕن.

﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾، هەروەها دەشپرسن، کافرەکان، دەڵێن: ئەو بەڵێنە کەنگێیە، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن؟! ﴿قُلْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ﴾، بڵێ: نیزیکە لە تەنیشتتان بێ و هەر بە دواتانەوە بێ، هەندێك لەوەی کە پەلەی لێ دەکەن، کە ئەوە بوو لە جەنگی بەدردا ئەو بەڵایەیان بەسەر هات، کە بەسەریان هات. یاخود مەبەست مردنی هەر کامێکیانە: (مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ)، هەر کەسێك مرد، قیامەتی دێ، مردنیش هەردەم لە بنانگوێیە، کەواتە: هەندێك لەوەی پەلەی لێدەکەن، کە سزای بەرزەخە، نیزیکە لێتان، بەس هەندێکی، بەڵام زۆرەکەی، خوا بۆ قیامەت و ڕۆژی دوایی هەڵیگرتوە.

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ﴾، بە دڵنیاییی پەروەردگاریشت، خاوەن بەخششە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەیان سوپاسگوزاریی ناکەن، خوا خاوەن بەخششە بەسەریانەوە کە لەگەڵ قسەیەکی ئاوا کوفرو شیرك و بێ ئەدەبیی دەکەن بەرانبەر بە خوا، یەکسەر نایانفەوتێنێ، خاوەن بەخششەو مۆڵەتیان دەدات، بەڵکو بگەڕێنەوەو بیربکەنەوە، پێغەمبەریان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بۆ دەنێرێ و، ئەو هەموو ئایەتانەی بۆ دابەزاندوون، بەڵام زۆربەیان سوپاسگوزاریی ناکەن، دەبوایە ئەو دوو چاکەو نیعمەتەی: ناردنی پێغەمبەرو، دابەزاندنی قورئان، کە دوو چاکەو نیعمەتی زۆر گەورەن، سوپاسگوزارییان لە سەر بکەن، سوپاسگوزاریی بۆ خوا بکەن لە بەرانبەر ئەو نیعمەتانەداو، ئەو چاکانەی خوا ﷻ قبووڵ بکەن و پەسەندیان بکەن و، نیعمەتەکانی خوا ﷻ بەسەر خوادا نەدەنەوە.

﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگاریشت دەزانێ سینەکانیان چی پەنهان دەکات و، دەشزانێ چی ئاشکرا دەکەن، واتە: ئەوەی کە پەنهانی دەکەن لە دڵ و سینەکانی خۆیانداو، ئەوەی ئاشکرای دەکەن بە زارو زمان و قسەیان، پەروەردگارت هەمووی دەزانێ، هەمووی وەك یەك دەزانێ، ئاشکراو پەنهان بۆ خوا، وەك یەکە، واتە: ئەی موحەممەد! تۆ سەغڵەت مەبە، ئەگەر تۆ تەنیا قسە ئاشکرایەکانیان دەزانی و، تەنیا حاڵی ڕواڵەتیان دەزانی، خوا ﷻ دیوی پەنهان و شێردراوەشیان دەزانێ، ئەوەش کە لە سینەکانیاندا پەنهانی دەکەن، خوا ﷻ ئاگاداریەتی، ئنجا دەزانێ کاتی خۆی چۆنیان سزا دەدا، هەم لەسەر ئەوەی لە سینەکانیاندا شاردوویانەتەوەو، هەم لەسەر ئەوەش کە بە زمانیان ئاشکرایان کردوە، چونکە وەك خوا ﷻ لەئایەتی (١١٨)ی سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ﴾، ئەوەی کە سینەکانیان شاردوویانەتەوە گەورەترە.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ ﴾، هەروەها هیچ نادیارو پەنهانێك نیە، لە ئاسمان و زەویدا، مەگەر لە نووسراوێکی ڕوونکەرەوەدا، تۆمار کراوەو، هیچ شتێك لە خوای پەروەردگار پەنهان و ون نابێت.

ئەوە هەمووی دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ لەسەرێکەوەو، لە سەرێکی دیکەشەوە: هەڕەشەیە بۆ بێبڕوایەکان، کە بزانن! خوا نێو دڵ و سینەشتان دەخوێنێتەوەو، بزانن! هیچ شتێك نیە لە خوا پەنهان و شێردراوە بێ، هەموو شتێك لەلای خوا تۆمار دەکرێ و، سەرەنجام ئەگەر خراپ بێ، ئێوە لەسەری سزا دەدرێن و، ئەگەر چاکیش بێ، لەسەری پاداشت دەدرێنەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

باسی نکوولّییکردنی بێبڕوایان لە زیندوو کرانەوەو، سەرنجڕاکێشانیان بۆ مێژوو و، سەرەنجامی شوومی تاوانبارانی بێبڕواو، ئامۆژگاریی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بەهۆیانەوە خەمبارو دڵتەنگ نەبێ:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبٗا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدۡ وُعِدۡنَا هَٰذَا نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٦٩﴾ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُن فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم چوار ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: واتە: بێبڕواییەکەیان، سەرچاوەی قسەکەیانەو، ئەو قسەیەیان لە کوفرو بێبڕواییانەوە، سەرچاوەی گرتوە، نەك لە عەقڵ و لۆژیکەوە، ئنجا بۆ زەقکردنەوەی کوفر تێیان دا، ناووسیفەتی ئاشکرایان لە جیاتی ڕاناوی پەنهان (المُظْهر بدل المضمر) بەکارهێنراوە.

٢)- ﴿ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبٗا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ ﴾، ئایا ئەگەر بووینەوە خۆڵ و خاك و خۆمان و باب و باپیرانیشمان، ئایا ئێمە دەردەهێندرێینەوە؟ (أَءِذَا) خوێندراویشەتەوە: (إذا)، واتە: بەبێ هەمزەی پرسیارکردن (هَمْزَة الإسْتِفْهَام)، هەروەها (أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ) یش خوێندراوەتەوە: (إنَّا لمُخْرَجُون)، یانی: ئاوا خوێندراوەتەوە: ﴿ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبٗا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ ﴾، ئەوە جۆرێك لە خوێندنەوەی، جۆرە خوێندنەوەیەکی دیکەشی

هەیە: (إذَا كُنَّا تُرَاباً وءابَآؤُنآ إِنَّا لَمُخرَجون)، واتاكەشیان هەر یەكە، چونكە هەردوو هەمزەی پرسیاركردنەكە، هەبن یان نەبن، هەر بە شێوەی پرسیار كردنن، بێگومان بە پرسیاركردنی سەرسوڕمان و پێ سەیر بوون، ئەو پرسیارە دەكەن و، پرسیاركردنەكەش مانای نكوولّیلێكردنە.

٣)- ﴿ لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ ﴾، بە دڵنیایی ئا ئەمە، ئێمەو باب و باپیرانمان پێشتر بەڵێنمان پێدرابوو، لە سوورەتی (المؤمنون)دا، هەر ئەم تەعبیرە هاتوە، بەڵام بەم شێوەیە: ﴿ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ ﴿٨٣﴾ ﴾.

لە سوورەتی (المؤمنون)دا، (هَـذا) خراوەتە دوایە، لێرەدا خراوەتە پێش، كە واتاكانیان زۆر لێك نیزیكن، لێرە كە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ ﴾، وشەی (هـذا) ئاماژەیە بۆ ئەوە كە زیندوو دەكرێنەوە، یانی: ئا ئەمە كە دەڵێن: زیندوو دەكرێنەوە، پێشتر بەڵێن بە باب و باپیرانیشمان درابوو، هەروەها بە ئێمەش دراوە، بەڵام لە سوورەتی (المؤمنون)دا: ﴿ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ ﴾، بە دڵنیایی ئێمەش و باب و باپیرانیشمان، ئەمەمان بەڵێن پێدرا بوو، كە زیندوو دەكرێینەوە، كە چی هیچیشی نەهاتۆتە دی! كەواتە: ناوی ئاماژە (هـذا) لە (النمل)دا پێشخراوەو لە (المؤمنون)دا دواخراوە، مەبەستیان ئەوەیە بڵێن: كەس لە قەبرستان نەگەڕاوەتەوە، كەس لە قیامەتی نەهاتۆتەوە! پرسیارەكەیان ئەوەندە شتێكی بێ جێیەو پێچەوانەی لۆژیك و عەقڵ و واقیعە، خوا ﷻ هەر وەڵامی ناداتەوە! دوایی دەڵێن:

٤)- ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، ئەمە تەنیا ئەفسانەكانی پێشینانە، (أَسَاطِير) كۆی (أُسطُورة)یە، كە بریتیە لە بەسەرهاتێك و گێڕدراوەیەك، واتە: ئەمە تەنیا قسەیەكە دووبارە دەبێتەوەو، پێشینان گوتوویانەو، كاتی خۆی نووسیویانەو، ئەوانەی دواییان ئەو قسانەیان لێوەرگرتوون و، دەماو دەم گێڕدراوەتەوە، بەڵام هیچ بنەمایەكی نیە! ئەوان وا دەڵێن، خواش ﷻ لە وەڵامی ئەو قسانەیاندا، دەفەرموێ:

٥)- ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ﴾، بلّێ: بە زەویی دا بڕۆن، یانی: بە کردەوە بەوڵات و شاران دا بگەڕێن، یان: مێژوو بخوێننەو لە مێژووی کۆمەڵگاپێشووەکانەوە ڕامێنن.

٦)- ﴿فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ﴾، ئنجا سەرنج بدەن، سەرەنجامی تاوانباران، چۆن بوو، یانی: پەند لە پێشووانتان وەربگرن، چونکە ئەو گەلە کافرانە کە سزادراون، عادو، سەموودو، گەلی نووح و، گەلی فیرعەون و، گەلی لووط، ئەوانە سزا دراون، لەسەر بێبڕواییان، شوێنەوارەکانیشیان دیارن، واتە: ئێوەش پەند لەوان وەربگرن و، هەمان شت کە بەسەر واندا هات، با بەسەر ئێوەش نەیەت، ئەوە واتایەك.

واتایەکی دیکەی: ئێوە بە زەویدا بڕۆن، سەرەنجامی ئەوان چۆن بوو، هی ئەو تاوانبارانە، بە دڵنیایی سەرەنجامی ئێوەش هەر وادەبێ، واتە: ئێرە ئەم ژیانی دنیایە، تەنیا شوێنی تاقیکردنەوەیە، ئنجا کەسێك ئەهلی ئیمان بێ، سەرەنجامێکی باشی دەبێ و، کەسێك کافرو تاوانبار بێ، سەرەنجامێکی خراپی دەبێ، بەڵام لێرەدا تەنیا تاقیکردنەوەکە هەیەو، ئەنجام وەرگرتنەوەکە لە قۆناغێکی دیکە دایە، خوا ﷻ ئەم گەردوونەی بە سیستم داناوە، جارێ قۆناغی قیامەت نەهاتوە، تاکو بگوترێ: کەس لە قیامەتەوە نەهاتۆتەوە، جارێ خوا ﷻ بڕیاری نەداوە، مردووان زیندوو بکاتەوەو، تاکو بگوترێ: بۆچی کەس زیندوو نەبۆوە؟ لە قۆناغێکی دیکەدا ئەوە ڕوودەدات.

٧)- ﴿وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ﴾، خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ و دەفەرموێ: بە هۆیانەوە خەمبار مەبە، خۆت خەفەتخان مەکە.

٨)- ﴿وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ﴾، بە هۆی پیلانگێڕانیشیانەوە سەغڵەت مەبە.

(وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ)، خوێندراوەتەوە: (ضَيْق)و خوێندراویشەتەوە: (ضِيْق)، هەردووکیان یەك واتایان هەیە، واتە: تووشی تەنگە تاویی و سەغڵەتیی و دڵتەنگیی مەبە، بە هۆی پیلانی ئەوانەوە، کە وەك پێشتر باسمان کرد، خوای پەروەردگار ئەم قسەو قاڵانەی ئەوان، بە پیلان ناو دەبات، چونکە ئەو قسانە

سەرانی کوفر کردوویانن، بۆ چەواشەکردنی خەڵك و جەماوەرە لاساییکەرەوەو شوێنکەوتووەکەیان، ئەگەرنا مەرج نیە بۆ خۆیان قەناعەتیان وابوو بێ، ئەو قسە بێسەرو بەرانە، بکەن، ئەوان لەوە ژیرتر بوون، ئەو قسانە بکەن، بڵێن: ئەدی بۆچی ئێستا کەس نایەتەوە لە قیامەت؟ چونکە زانیویانە، پێغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە: ئێستا قیامەتە، فەرموویەتی: لە قیامەتدا مرۆڤ زیندوو دەبێتەوە، بەڵام بۆ چەواشەکردنی خەڵك و جەماوەرەکەیان و شوێنکەوتووەکانیان، بۆ ئەوەی بازاڕی خۆیانیان لێ تێکنەچێ، ئەو قسانەیان بڵاوکردوونەوە لە نێو خەڵکداو، خەڵکیش وەك تووتیی، دووبارەیان کردوونەوە، خەڵك و جەماوەر زۆر جاران قسەی بەرپرسان و زلەکان، وەك تووتیی دووبارە دەکاتەوە، بە بێ ئەوەی لێی تێ بگات، جاری وایە، بەرپرسێك قسەیەك دەکات، هیچ سەروبەری نیە، عەقڵ و لۆژیك نایخوێنێتەوە، کەچی ئەو خەڵکە هەمووی وەك تووتیی دووبارەی دەکاتەوە، هەمووی چۆتە سەر سروشتی: مەڕ و بزن و ئاژەڵ، وەك چۆن شوانێك لە ئاژەڵێکەوە دەخوڕێ، دەیانبات ئاویان دەدات، هەموویان بە قسەی دەکەن و، ئێوارەش دەیانهێنێتەوە بۆ ئاغەڵ، هەموویان بە قسەی دەکەن، زۆرجار خەڵك و جەماوەر، کە لە هیدایەت و ڕۆشنایی ئیمان و خوا پەرستیی، دوور و بێبەش دەبێ، بە داخەوە سروشتی ئاژەڵ وەردەگرێ: بە عەقڵی خۆی بیرناکاتەوە، بە ئیرادەی خۆی بەڕێوەناچێ، تەماشا دەکات چی پێ دەگوترێ؟ وەك چۆن ئاژەڵ تەماشا دەکات شوان و گاوانەکەی چی پێ دەڵێن؟ ئەگەر بڵێ: بڕۆ، دەڕواو، ئەگەر بڵێ: بخۆ، دەخواو، ئەگەر بڵێ ئاو بخۆوە، دەخواتەوەو، ئەگەر بڵێ: ڕاوەستە، ڕادەوەستێ، مرۆڤەکانیش ئەگەر لە هیدایەتی خوا دوور و مەحرووم بوون، لە پەیامی خوا بێبەش بوون و، عەقڵ و دڵ و دەروونیان ڕۆشن نەبۆوە، بە هیدایەت، زیاتر حاڵەتی ئاژەڵ وەردەگرن، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ١٧٩﴾ الأعراف، واتە: ئەوانە وەك ئاژەڵن، بەڵکو لە ئاژەڵیش گومڕاترن، ئەوانە بێ ئاگان، بۆیە لە ئاژەڵ

گومڕاترن، چونکە ئاژەڵ ناتوانێ ئاژەڵ نەبێ، مەڕ هەر مەڕە، بزن هەر بزنە، گا هەر گایە، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ وەك مەڕو بزن و گا نەبێ، مرۆڤ بێ و بە عەقڵ و ئیرادەی خۆی بەڕێوەبچێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**پرسیارکردنی کافرەکان لە کاتی بەڵێنی هاتنی قیامەت و پەلەکردنیان لێی و، وەڵامدانەوەی خوا ﷻ کە بەشێکی سزای خوا، ڕەنگە زۆر لێتان نیزیک بێ، لە پەناو لە تەنیشتتان بێ، بەڵام خوا ﷻ لەسەر خەڵك، خاوەن بەخششەو، خواش نهێنیی نێو سینەکانیان و، ئەوەی ئاشکرای دەکەن، وەك یەك دەیزانێ و، هیچ نهێنییەکی ئاسمان و زەوی نیە، کە خوا ﷻ نەیزانێ و لە نووسراوێکی ڕوونکەرەوەدا، تۆماری نەکردبێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەو پێنج ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، هەروەها دەڵێن: [بێبڕوایەکان و، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان] ئەم بەڵێنە، کەنگێیە، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، کەی دێ؟ (و)ی (وَيَقُولُونَ)، ئەو ڕستەیە بادەداتەوەو دەیگێڕێتەوە بۆ ڕستەی پێشوو، کە گوتیان: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا ﴾، بەڵام لێرە بە کرداری ئێستا (**الفعل المُضارع**) دەیهێنێ، لەوێ بە کرداری ڕابردوو (**الفعل الماضي**)، هێناویەتی، وەك جۆراو جۆر کردن، لە شێوەی دواندندا، پاشان کرداری ئێستا، بۆ ئەوەیە کە دیمەنەکە بخاتە بەرچاو، (وَيَقُولُونَ)، ئێستا دەیڵێن و بەردەوام دەیڵێن، لەبەر ئەوەی بەردەوام بوون لەسەر ئەو قسەیە: ئەو بەڵێنە کەنگێیە، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن؟ واتە: بەڵێنی زیندووکرانەوەو هاتنی ڕۆژی دوایی.

٢)- ﴿ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ ﴾، بڵێ: نیزیکە، لەوانەیە، لە تەنیشتتان بێ، هەندێك لەوەی پەلەی لێ دەكەن، واتە: سزای هەندێك لەوەی پەلەی لێ دەكەن، ڕەنگە لە پەناتان بێ. ئنجا ئەوە دوو واتای هەن:

أ- دەگونجێ ئاماژە بێ، بە کاتی مردنی هەر کامێکیان، هەر کامێکیان کە دەمرێ: (**مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ**)، هەر کەسێك مرد، قیامەتی وی هاتوە، ئەگەر بێبڕواو خراپەکار بێ، سزای خۆی دەبینێ، کە سزای گۆڕی پێ دەڵێن و مەبەست پێی سزای قۆناغی بەرزەخە، با لە نێو گۆڕیش دا نەبێ، چونکە هی وا هەیە گۆڕی بە نسیب نابێ، هەیە لەو دەشت و دەرە دەمرێ، با وا نەزانرێ کە هەرکەس نەچێتە گۆڕەوە، سزا نادرێت، چونکە سزایەکە بە پلەی یەکەم لەسەر ڕووحە، بە شێوەیەك لە شێوەكانیش، ڕەنگە تاکو جەستەکە دەمێنێ، بیگرێتەوە.

ب- دەشگونجێ کە دەفەرموێ: ﴿ رَدِفَ لَكُم ﴾، یانی: (**تَبِعَ لكم، بِقُربٍ مِنْكُم**)، لێتان نیزیك بێ، لە پەناتان بێ، مەبەست پێی ئەو بەڵایانەبن کە بەسەریان دێن، وەك کاتی خۆی لە جەنگی بەدرداو، لە جەنگەکانی دیکەدا، هەروەها گرانیی و قات و قڕیی کە بە سەریان هات، بەنسبەت ئەوانەوە، بە نسبەت ئێستاشەوە: مەرج نیە تەنیا لە قیامەتدا، خەڵك دووچاری گرفتاریی و سزای خوا ﷻ ببێتەوە، خوا هەر لە دنیاش دا سزایان دەدات، وەك دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾الروم، واتە: خراپە تەڕو وشکی گرتەوە، وشکانیی و دەریای گرتەوە، بە هۆی کردەی دەستی خەڵکەوە، بۆ ئەوەی بەشێك لەوەی دەیکەن، سزایەکەیان پێ بچێژێ، بەڵکو بگەڕێنەوە.

پێشتریش گوتمان: (رَدِفَ لَكُم)، دەگونجا بۆ خۆی بەرکار (**مفعول به**)، بخوازێ، بەمجۆرە: (رَدِفَكُم)، لە تەنیشتتانە، بەڵام بۆیە بە (ل) بەرکاری خواستوە، تاکو مانای نیزیکە (إقْتَرَبَ)ی، بخرێتە نێو، یانی: نیزیکە لێتانەوە، یاخود (ل) بۆ تەئکیدە، وەك دەڵێ: (شَكَرَهُ)، سوپاسی کرد، بەڵام (شَكَرَ لَهُ)، واتە: سوپاسی کرد، بەڵام زۆر بە جەختکردنەوەو تۆخیی.

٣)- ﴿ بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ ﴾، هەندێك لەوەی پەلەی لێدەكەن.

٤)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگاریشت، خاوەن بەخششە بەسەر خەڵكەوە، واتە: خاوەن بەخششیی، یەكێكە لە سیفەتە بنەڕەتییەكانی خوا ﷻ و یەكێكە لە كارەكانی وی.

٥)- ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان (نەیفەرمووە هەموویان)، سوپاسگوزاریی ناكەن، هەندێك لە بەندەكان سوپاسگوزاریی دەكەن و، بەشێكیان سوپاسگوزارن، لە سوورەتی (سبأ)یشدا، دەفەرموێ: ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾ واتە: كەمێك لە بەندەكانم سوپاسگوزارن، بەڵام زۆربەیان ناسپاس و سپڵەو بێ نمەكن.

٦)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگاریشت زۆر چاك دەزانێ ئەوەی سینەكانیان پەنهانی دەكەن و، ئەوەش كە ئاشكرای دەكەن، واتە: ئەوەی كە سینەكانیان پەنهانی دەكات، خوا ﷻ هەمووی دەزانێ و، ئەوەش كە ئاشكرای دەكەن، یانی: ئەگەر ئێوە تەنیا ئاشكرایان دەزانن و ڕواڵەتیان دەبینن، خوا ﷻ ئێو دەروونیشیان دەبینێ، هەمووی بۆ خوا ﷻ وەك یەكە، پەنهان و ئاشكرا، بە نسبەت ئێمەوە، ئەوە پەنهانەو ئەوە ئاشكرایە، بەڵام بە نسبەت خواوە، هەموو شتێك ڕوون و ئاشكرایە.

٧)- ﴿ وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾، هیچ نهێنییەكیش نیە، لە ئاسمان و زەویدا، مەگەر لە نووسراوێكی ڕوونكەرەوەدا، تۆماركراوە.

(غَائِبة)، ناوە بۆ شتێكی نادیار، كە (ة) چۆتە سەر (غَائِبة)، بۆ ئەوەیە كە لە حاڵەتی وەسفەوە، بیگوازێتەوە بۆ حاڵەتی ناو، وەك: (عَافِيَة) و (فَاتِحَة) و (عَاقِبَة) و (خَاتِمَة)، كە هەموو ئەوانە بوون بە ناو، (عَافِيَة)، واتە: بێ بەڵایی و (فَاتِحَة)، یانی: دەرگاكردنەوە، (عَاقِبَة)، یانی: سەرەنجام، (خَاتِمَة)، یانی: كۆتایی پێهێنان.

كە دەفەرموێ: (فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ)، وشەی (كِتَاب)، لە قورئاندا جاری وا هەیە، تەعبیری پێ دەكرێ، لە زانیاریی خوا، یانی: وشەی (كِتَاب) جاری وایە

خوازراوەتەوە بۆ زانیاریی خوا، چونکە شتێك كە بنووسرێ، ساغ کراوەتەوەو، ناگۆڕدرێ و چەسپێنراوە، زانراوەکان لە زانیاریی خوادا نەگۆڕن، چەسپاون و گۆڕانیان بەسەردا نایەت.

یاخود (كِتَٰبٖ مُّبِينٍ)، مەبەست پێی دروستکراوێکی نادیارە بۆ ئێمە، کە هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەبەست لە (لوح محفوظ) و (كتاب مبين) و (إمام مبين)، تۆمارێکە، کە خوای پەروەردگار هەموو زانیارییەکانی خۆی تێدا تۆمار کردوون.

بەڵام دەشگونجێ ئەوانە تەعبیرێکی ڕەمزیی بن، بۆ حاڵیی کردنی ئێمە.

وشەی (مُّبِين)، دەگونجێ لە (أبان)ی (لازم)ـەوە بێ، واتە: (بَيِّن)، ئاشکرا، ڕوون، دەشگونجێ لە (أبان)ی (مُتَعَدِّي) بێ، یانی: ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەر.

لە کۆتایی ئەم دەرسەماندا، دەڵێین:

خوا ﷻ قسەی بێبڕوایەکان کە دێنێ، وەك خۆی دەیهێنێ و، هەر ئەوەش شایستەی خوای پەروەردگارە، بە ئەمانەتەوە چییان گوتوە، تەواوی دێنێ، ئنجا ئەگەر چ بڕ هێزو پێزێکی تێدابێ، خوا ﷻ ئەگەر بە پێویستی بزانێ، وەڵامی دەداتەوە، بەڵام ئەگەر بێهێزو پێزو بێسەروبەر بێ، خوای پەروەردگار وەڵامی ناداتەوە، یان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ وەڵامی دەداتەوە، کە هەندێك لەو قسانەی ئێرەیان، بەو شێوەیەن، وەك لە ئایەتەکانی پێشتردا گوتیان: ئایا ئەگەر باب و باپیرانمان و خۆمان بووینەوە خاك و خۆڵ، ئایا دەردەهێنرێینەوە؟ باب و باپیرانمان پێشتر ئەو بەڵێنەیان پێدرابوو، ئێمەش ئەو بەڵێنەمان پێدراوە، کەچی هیچیش دیار نیە، ئەوە ئەفسانەکانی پێشینانە؟!

خوا ﷻ بە پێویستی نازانێ، وەڵامی ئەو قسەیان بداتەوە، چونکە ئەوان قسەیەك دەکەن، زۆر نا لۆژیکیی و ناواقیعییە، ئاشکرایە خوا ﷻ لە قورئاندا

پێغەمبەریش ﷺ کە پەیامی خوای گەیاندوە، فەرموویانە: لە قیامەتدا زیندوو دەکرێنەوە، نەك لە دنیادا، قۆناغی قیامەتیش جارێ نەهاتوەو ئێستا قۆناغی دنیایە، بۆیە ئەو قسەیە، قسەیەکی نالۆژیکییەو، خوای ﷻ وەڵامی ناداتەوە، بەڵکو سەرنجیان بۆ شتێکی دیکە ڕادەکێشێ و دەفەرموێ: بڵێ بە زەویدا بڕۆن و سەرنج بدەن! سەرەنجامی تاوانباران چۆنە؟ دواییش ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەکات: لەسەریان خەمبار مەبەو، لە بەرانبەر پیلانگێڕانیاندا دڵتەنگ مەبە.

دوایی کە دەڵێن: ئایا ئەو بەڵێنە کەنگێیە، ئەگەر ئێوە ڕاستن؟

خوا ﷻ بفەرموێ: کەنگێیە! خوا تەنانەت ژوانگەو کاتی هاتنی ئاخیر زەمان و زیندوو بوونەوەو هەڵسانەوەی، بە فریشتەکانیش نەگوتوەو، بە جیبریلیشی نەگوتوەو، بە پێغەمبەری خاتەمیشی ﷺ نەگوتوە، کەواتە: چییان پێ بفەرموێ، کە دەڵێن: کەنگێیە؟! بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: بڵێ: نیزیکە هەندێك لەوەی پەلەی لێ دەکەن، لە تەنیشتتان بێ، هەندێك لەوەی پەلەی لێ دەکەن، بێ، کە هاتنی سزای خوایە، ڕەنگە لە تەیشتتانەوە بێ، لە تەفسیرەکاندا کەمتر بینیومە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی مردنی خۆیان بێ، چونکە کە مردنیان هات، ئەو کاتە بەشێك لە سزایەکەیان کە لە قۆناغی بەرزەخدا دەیچێژن، بۆیان دێتە پێشێ.

دوایی کە دەفەرموێ: بە دڵنیایی پەروەردگارت خاوەن بەخششە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەیان سوپاسگوزار نین، واتە: خاوەن بەخششە بەسەریانەوە، کە لەسەر ئەو قسانە یەکسەر سزایان نادات و، مۆڵەتیان دەدات و، دەرفەتیان پێ دەدات، بەڵکو بگەڕێنەوە، بەڵام ئەوان سوپاسگوزار نین، نیعمەتەکانی خوا ﷻو چاکەکانی خوا، کە ژیاندنیانە لە دنیاداو، لە پێش هەموویانەوە: نیعمەتی ئیمان و هیدایەت و قورئان و، ناردنی پێغەمبەر ﷺ، ئەو نیعمەت و چاکانەی خوا ﷻ، سوپاسگوزارییان لەسەر ناکەن.

دوایی خوا ﷻ هەم بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺو بڕواداران، لە لایەکەوە، هەم وەك هەڕەشەو ترساندن بۆ بێبڕوایان لەلایەکی دیکەوە دەفەرمویٚ: بە دڵنیایی پەروەردگارت دەزانیٚ سینەکانیان چی پەنهان دەکەن و چی ئاشکرا دەکەن، هیچ شتێکی نادیار نیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، مەگەر هەمووی تۆمارکراوە.

کەواتە: ئەی موحەممەد ﷺ! ئەی مسوڵمانان! بزانن کە ئەو قسانەی بێبڕوایان دەیانکەن و ئەو پیلانانەی دەیانگێڕن، لەلای خوا ﷻ هەمووی پارێزراوەو، لەسەریان لێپرسینەوەیان لیٚ دەکات و سزایان دەدات، ئێوەش ئەی بێبڕوایەکان! بزانن کە هیچ شتێك لەوەی دەیکەن، ئاشکرا بیٚ یان پەنهان لە خوای پەنهانزان شێردراوە نیەو، هەمووی تۆمارکراوەو دێتەوە ڕێتان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان هـەژدە (١٨) ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی (النمـل) دەگرێتـە خـۆی: (٧٦ - ٩٣)، کـە تـەوەری سـەرەکییان باسـی قورئـان و، باسـی ڕۆژی دواییـە، وێـڕای خسـتە ڕووی چەنـد دیـاردەو دیمەنێکـی سـەرنجڕاکیش وەك: نیشـانەکانی پەروەردگارێتیـی و، یەکتایـی خـوا ﷻ لـە پەرسـترانیدا.

هەروەهـا چەنـد ئامۆژگارییەکـی گرنـگ و مەزنیـش بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ موحەممـەد، لـە بـواری چۆنیەتیـی مامەڵـەو هەڵسـوکەوتی لەگـەڵ ئەوانـەدا کـە بـەرەو خـواو، بەرنامەکـەی بانگیـان دەکات، خراونـە ڕوو.

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٨﴾ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۖ إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴿٧٩﴾ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِى ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ۞ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِيَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٨٦﴾ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ

صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنْ أَتْلُوَا۟ ٱلْقُرْءَانَ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی ئەم قورئانە زۆربەی ئەوە کە بەنوو ئیسرائیل تێیدا کەوتوونە کێشەو ڕاجیاییەوە، بۆیان باس دەکات (ڕوونی دەکاتەوە)و ﴿٧٦﴾ بە مسۆگەریی ڕێنمایی و بەزەییە بۆ بڕواداران ﴿٧٧﴾ بێگومان پەروەردگارت بە حوکمی خۆی دادوەرییان لە نێواندا دەکات و، ئەو زاڵی زانایە ﴿٧٨﴾ ئنجا پشت بە خوا ببەستە، بە ڕاستیی تۆ لەسەر (بەرنامەی) هەقی ڕۆشنی ﴿٧٩﴾ بە دڵنیایی تۆ (پەیامی خوا) بە مردووان نابیستێنی، هەروەها دەنگی (بانگکردنی) خۆت بە کەڕان نابیستێنی، لە کاتێکدا کە بە پشتتێکردنەوە، ڕوو وەردەگێڕن ﴿٨٠﴾ هەروەها کوێرانت بۆ لە گومڕایی (دەرناهێنرێن و) ڕێنمایی ناکرێن، تۆ تەنیا (پەیامی خوا) بەوانە دەبیستێنی، کە بڕوایان بە ئایەتەکانمان هێناوە و، ئەوان (بۆ خوا) ملکەچن، ﴿٨١﴾ کاتێکیش کە قسەیان لەسەر چەسپا (مرۆڤەکان بڕیاری خوایان لەسەر هاتە دی، کە کۆتایی بە ژیانی دنیایان بێ) ژیاندارێکیان بۆ لە زەوی دەردێنین، دەیاندوێنێ (دەڵێ:) بێگومان خەڵک بڕوای پتەویان بە ئایەتەکانمان نەدەهێنا ﴿٨٢﴾ ئەو ڕۆژەش کە لە هەر کۆمەڵێک، پۆلێک لەوانەی ئایەتەکانمانیان بە درۆ دادەنان، کۆدەکەینەوە، لە حاڵێکدا کە خڕدەکرێنەوە سەر یەک (ئەوانەی

پێشی ڕادەگیرێن، تاکو ئەوانە دوایی پێیان دەگەن) ﴿٨٣﴾ هەتا کاتێك کە هاتن (خوا فەرمووی): ئایا ئایەتەکانمتان بە درۆ دانان، بێ ئەوەی (لێیان بکۆڵنەوە)، پێیان ئاشنابن، یان ئایا چیتان دەکرد؟ ﴿٨٤﴾ قسەشیان لەسەر چەسپا (بڕیاری خوایان لە بارەوە درا) لە سۆنگەی ستەمکردنیانەوە، بۆیە (لەو ڕۆژەدا) قسە ناکەن ﴿٨٥﴾ ئایا نەیاندیوە کە ئێمە شەوگارمان بۆ ڕەخساندوون، تێیدا بسرەوون و، ڕۆژگاریشمان بۆ ڕۆشن کردوونەوە، کە تێیدا ببینن (و کاسبیی تێدا بکەن)! بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن ﴿٨٦﴾ ئەو ڕۆژەش کە فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، هەموو ئەو کەسانەی کە لە ئاسمانەکان و زەوی دان (لە ترسان) ڕادەچڵەکن، جگە لە کەسێك خوا بیەوێ (ڕانەچڵەکێ)و، هەمووشیان بە زەبوونیی دێنە لای (خوا) ﴿٨٧﴾ چیاکانیش دەبینی پێت وایە وەستاون، لە حاڵێکدا کە وەك ڕۆیشتنی هەور دەڕۆن، ئەوەش دروستکراوی خوایە، کە هەموو شتێکی بە کارامەیی و وردەکاریی دروستکردوە، بێگومان ئەو شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن ﴿٨٨﴾ هەر کەس (لە ڕۆژی دوایی دا) چاکە بێنێ (پاداشتی) لەو چاکتری هەیەو، لە ترس و بیمی ئەو ڕۆژەش دڵنیاو هێمنن ﴿٨٩﴾ هەر کەسێکیش خراپە بێنێ، لەپەو ڕوو دەخرێتە ئاگر (ی دۆزەخ)ەوە، (پێیان دەگوترێ:) ئایا تەنیا بەوە سزا نادرێن کە دەتانکرد! ﴿٩٠﴾ (بڵێ:) تەنیا بەوە فەرمانم پێکراوە کە پەروەردگاری ئەم شارە (شاری مەککە) بپەرستم کە قەدەغەی کردوە (هیچ گوناهو لادانێکی تێدا بکرێ)و، هەموو شتێك هی ویەو، فەرمانم پێکراوە لە ملکەچان بم ﴿٩١﴾ هەروەها فەرمانم پێکراوە کە قورئان بخوێنم، ئنجا هەر کەس ڕێی ڕاستی گرت، ئەوە سوودی ڕێ ڕاستگرتنەکە هی خۆیەتی و، هەر کەسیش گومڕا بوو بڵێ: من تەنیا لە ترسێنەران و هۆشیارکەرەوانم ﴿٩٢﴾ هەروەها بڵێ: ستایش بۆ خوا، بەزوویی نیشانەکانیتان پیشان دەدات و، دەیانناسن، پەروەردگاریشت لەوەی دەیکەن، بێ ئاگا نیە ﴿٩٣﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَقُصُّ): واتە: دەگێڕێتەوە، باس دەکات (القَصُّ: تَتَبُّعُ الأَثَرِ، وَالقَصَصُ: الأَثَرُ، وَالقَصَصُ: الأَخْبَارُ المُتَتَبَّعَةُ)، (قَصّ): بریتیە لە شوێن شوێنەوار کەوتن، (قَصَص): بە شوێنەوار دەگوترێ، هەروەها (قَصَص): بەو هەواڵانە دەگوترێ کە بەدواداچوونیان بۆ کراوە.

(دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ): ژیانداری زەوی، زیندەوەری زەوی، (قِيْلَ إِنَّهُ حَيَوَانٌ بِخِلَافِ مَا نَعْرِفُهُ يَخْتَصُّ خُرُوجُهَا بِحِيْنِ القِيَامَةِ، وَقِيْلَ: عُنِيَ بِهَا الأَشْرَارُ الَّذِيْنَ بِمَنْزِلَةِ الدَّوَابِّ)، (راغب الأصفهاني)، دەڵێ: (دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ): گوتراوە: ژیاندارێکە جیا لەوەی کە ئێمە پێیان ئاشناین، کاتێك دەردەچێ کە ڕۆژی قیامەت و هەڵسانەوە دێ {مەبەستی پێ ڕۆژی ئاخیر زەمانە، تێکچوونی ئەم گەردوون و دنیایە}.

هەندێکیش گوتویانە: مەبەست لە (دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ): ئەو خراپەکارانەن کە وەك ئاژەڵ وان.

دەڵێم: بەڵام ئەو ڕایە بێهێزە، چونکە خوا ﷻ دیاریی کردوە، کە قسە دەکات و دەڵێ: خەڵك بڕوا بە ئایەتەکان ناهێنن.

(يُوزَعُونَ): دەگونجێ بە مانای (يُمْنَعُون) بێ، واتە: ڕادەگیرێن، ڕێیان نادرێ بڕۆن، یاخود (حُبِسَ أولهم على آخِرِهِمْ)، ئەوانەی پێشیان ڕادەگیرێن، تاکو ئەوانەی دوایی پێیان دەگەن، یاخود (يُوزَعُونَ)، واتە: (يُمْنَعُونَ مِنَ الذَّهَابِ إلى هُنَا وَهُنَاك)، ڕێیان لێدەگیرێ بە ملاولادا بڕۆن، کۆنتڕۆڵ دەکرێن، ڕێك و پێك ڕێ دەگرنە بەر بەرەو ئەو ئامانجەی خوا دەیەوێ.

(فَفَزِعَ): (الفَزَعُ: إنْقِبَاضٌ وَنِفَارُ الإنْسَانِ مِنَ الشَّيءِ المُخِيف)، (فَزَع): بریتیە لە ڕێك هاتن و سڵەمینەوەیەك كە بەسەر ئینسان دا دێ، لە ئەنجامی شتێكی مەترسیلێكراودا، یانی: داچڵەكین و ڕاچڵەكین.

(دَاخِرِينَ): (دَاخِر)، كە بە (دَاخِرُون)، یان (دَاخِرِين) كۆدەكرێتەوە، (أي: الأذِلَّاء)، واتە: زەبوونان، دەگوترێ: (أَدْخَرْتُهُ فَدَخَرَ، أي: أَذْلَلْتُهُ فَذَلَّ)، (أَدْخَرْتُهُ)، واتە: زەبوونم كرد، (دَخَرَ)، یانی: (ذَلَّ): زەبوون بوو، بێدەسەڵات بوو.

(جَامِدَةً): (أي: ثَابِتَةً وَسَاكِنَةً)، واتە: چەسپاو و نەجووڵاو.

(أَتْقَنَ): (أي: نَظَمَ وَأَحْكَمَ)، هەموو شتێكی ڕێكخستووە، مەحكەم و پتەوی كردووە.

(فَكُبَّتْ): (الكَبُّ: إسْقَاطُ الشَّيءِ عَلَى وَجْهِهِ)، (كَبّ): بریتیە لەوەی شتێك لەوپەو ڕوو، لەسەر ڕوو بخرێ، كەواتە: ﴿فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي ٱلنَّارِ﴾، یانی: دەم و چاویان دەكەوێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەدا، کە وەك لە پێناسەکەیدا گوتمان: بە باسی قورئان دەستی پێکردووە، بە باسی قورئانیش کۆتایی پێهاتووە، لەوەدا وەك سوورەتی (الشعراء) وایە، هەروەها لەوەشدا کە کۆمەڵێك لە بەسەرهاتی پێغەمبەرانی (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، تێدا خراونە ڕوو، دیسان وێکچوونی هەیە لەگەڵ سوورەتی (الشعراء)دا، ئنجا لە کۆتایی ئەم سوورەتەدا خوا دەفەرمویّ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەم قورئانە بەسەر بەنی ئیسرائیلدا، واتە: بەسەر گەلی جوولەکەدا، (﴿إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، نازناوی یەعقووبە ﷺ یانی: ئەوانەی لە یەعقووب پەیدابوون) دەخوێنێتەوە، زۆربەی ئەوە کە تێیدا دەکەونە ڕاجیایی و مشتومڕەوە، بۆیان دەخوێنێتەوە: هەق لە کوێیەو؟ ناهەق لە کوێیە؟ نەیفەرمووە: هەموو، چونکە خوا ﷻ ڕاستکردنەوەی هەموو ئەو هەڵەو لە ڕێ لادانانەی خاوەن کتێبەکان کردوویانن، بە تایبەت جوولەکە، بە پێویستیی نەزانیوە.

﴿ وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەم قورئانەش ڕێنماییەو بە بەزەییە بۆ بڕواداران، چونکە ئەوانەی لە قورئان بەهرەمەند دەبن، وەك ڕێی ڕاست پێ دۆزینەوەو، ئەوانەی بەهۆی قورئانەوە وا لە خۆیان دەکەن، شایستەی بەزەیی خوا بن، تەنیا بڕوادارانن، ئەگەرنا لە ئەصڵدا خوا قورئانی بۆ هەموو مرۆڤەکان ناردوە: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾التكوير، ﴿ وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾آل عمرن، وەك لە چەند شوێنێك لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت بە حوکمی خۆی دادوەرییان لە نێواندا دەکات، (واتە: لە سەر ناکۆکیی و

ڕاجیاییەکانیـان، دادوەریـان دەکات و، هـەق و ناهەقیـان دەخاتـە ڕوو] خـواش زاڵـی زانایـە، کـە بـە تەئکیـد لێرەدا مەبەسـت پێـی ڕۆژی دواییـەو، لـە ڕۆژی دواییـدا خـوا بـە حوکمـی خـۆی، دادوەرییـان لـە نێـوان دا دەکات، کـە لـەوێ بـەس حوکمـی خـوا هەیـە و دیـارە، بـەڵام لـە دنیـادا خـوا بـواری داوە مرۆڤەکانیـش حوکـم و دەسـەڵاتیان هەبـێ بـۆ تاقیکردنـەوە، بـەڵام لـەوێ: ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ١٦﴾ غافـر، ئەمـڕۆ حوکـم و حوکمڕانیـی و، دەسـتەڵات هـی کێیـە؟ هـی خـوای تاکـی ملپێکەچکـەرە.

خـوا لـەوێ بـە حوکمـە دادگەرانەکـەی خـۆی، دادگەرییـان لـە نێوانـدا دەکات، خـواش زاڵـی زانایـە، زاڵـەو هیـچ کـەس لـە ژێـر دەسـتەڵات و ڕکێفـی قوتـار نابـێ و، زاناشـە بـەو شـێوەیە دادوەریـی دەکات، کـە شایسـتەی زانیاریـی بێسـنووری خۆیـەتی و، دادگەریـی بێسـنووری خۆیـەتـی.

هەندێـك لە زانایانیش وایان لێکداوەتـەوە: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ﴾ پـەروەردگارت لـە دنیـادا بـەو حوکمـەی دایبەزانـدوە بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، دادوەریـی لـە نێـوان مرۆڤەکانـدا دەکات بـە گشـتیی و، بـە تایبـەت خـاوەن کتێبەکان، ﴿فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ ئنجـا تـۆ پشـت بـە خـوا ببەسـتە، ﴿إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆ لەسـەر هەقێکـی ڕۆشنی، یاخـود: لەسـەر هەقێکـی ڕوونکـەرەوەی.

﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆ بـە مـردووان نابیسـتێنی، هەروەهـا بانگکـردن بـە کەڕانیـش نابیسـتێنی، ﴿إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ﴾، لـە حاڵێکـدا کـە پشـت هەڵدەکـەن و ڕوو وەردەچەرخێنـن، ڕوو وەردەگێـڕن بـە پشـتتێکردنەوە، (أَدْبَـرَ) یانـی: پشـتی کـردەوە، (وَلَّى)، یانـی: ڕووی وەرچەرخانـد، جـاری وا مـرۆڤ ڕوو وەردەچەرخێنـێ، بـەڵام پشـت ناکاتـە شـتەکە، بەڵکـو کەلەکـەی تێـدەکات و لا تەنیشـتی تێـدەکات، بـەڵام ئەمـە بـۆ جەختکردنـەوەو تۆخکردنـەوەی ڕوو وەرگێڕانەکەیـە، کـە تەنیـا ئـەوە نیـە لاتەنیشـت و لاکەلەکـەی تێبکـەن، بەڵکـو کـە ڕووی لـێ وەردەگێـڕن، یەکسـەر پشـتیشـی تێدەکـەن، ﴿وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِى ٱلْعُمْىِ

عَن ضَلَٰلَتِهِمۡ ﴾، ئنجا وەك چۆن ناتوانیّ دەنگی خۆت، بە مردووان ببیستێنی و بانگکردنت بە کەڕان ببیستێنی، بە هەمان شێوەش: ناتوانی کوێرەکان، ئەوانەی کوێر و نابینان، لە گومڕایی دەربازیان بکەی و ڕێنماییان بکەی، ﴿ إِن تُسۡمِعُ إِلَّا مَن يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسۡلِمُونَ ﴾، تۆ تەنیا دەتوانی بەوانە ببیستێنی کە بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیەو، ئەوان بۆ خوا ملکەچن.

ئەم دوو ئایەتە موبارەکە بە هەمان شێوە لە سوورەتی (الروم)یش دا هاتوون بە تۆزێك جیاوازییەوە، مانای وایە ئەو مەبەستانەی گرتوویاننە خۆیان، گرنگن، هەڵبەتە چەمکەکەیان بە جیا جیا لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأنفال)دا هاتوە، بەڵام ئاوا بەسەر یەکەوەو بەو شێوەیە، تەنیا لەم سوورەتەو لە سوورەتی (الروم)دا هاتوون، کە ئێمە دوایی زیاتر تیشك دەخەینە سەر نێوەڕۆکیان.

دوای ئەوەی خوای بەرزو مەزن باسی قورئانی کردو، باسی ئەوەی کرد کە قورئان هاتوە دادوەریی لە نێوان مرۆڤەکاندا بکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ناتوانیّ بانگەوازی خۆی و دەنگی خۆی و بانگکردنی خۆی بە مردووان و بە کەڕان ببیستیّ و، لە گومڕایی دەریان بێنیّ، بەڵکو تەنیا بڕوادارانێك کە بڕوایان بە ئایەتەکانی خوا هەیەو، بۆ خوا ملکەچن، تەنیا ئەوانە پێغەمبەری خوا ﷺ دەتوانیّ وایان لێبکات، گوێبیستی پەیام و بەرنامەی خوا بن و، ڕاستییەکانی کە دەیانخاتە بەر چاویان، بیانبینن.

ئنجا خوای بەرز دێتە سەر باسی بابەتێکی دیکە، کە باسی ئاخیر زەمان (ساعة)ە، واتە: قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی، کە ئاخیر زەمان و تێکچوونی ئەم گەردوونەیە، دەفەرمویّ: ﴿ وَإِذَا وَقَعَ ٱلۡقَوۡلُ عَلَيۡهِمۡ ﴾، هەرکاتیش قسەیان لەسەر چەسپا، کە بە سیاق دەزانریّ، واتە: بڕیاری خوایان لەسەر هاتە دی، کە دەبیّ ژیانی دنیا کۆتایی پیّ بیّ، ﴿ أَخۡرَجۡنَا لَهُمۡ دَآبَّةً مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، لەو

کاتـەدا زیندەوەرێـك، ژیاندارێکیـان لـە زەوی بـۆ دەردێنیـن، ﴿ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴾، دەیاندوێنێ، خەڵـك دەدوێنێـو، بەشـێك لـە دواندنەکـەی ئەوەیـە کـە خەڵـك بڕوایـان بـە ئایەتەکانـی ئێمـە نیـە، بـڕوای پتەویـان پێیـان نیـە، یاخـود: ئـەو ژیانـدارە دەیاندوێنـێ بـە هـۆی ئـەوەوە کـە خەڵـك بـڕوای بـە ئایەتەکانی ئێمـە نیـە، ئنجا مـادام مرۆڤـەکان بـڕوای پتـەو و دڵ دامەزراوییـان نیـە بـە نیشـانەو ئایەتەکانـی ئێمـە، ژیاندارێـك خـوای پـەروەردگار دەری دێنـێ، خەڵـك دەدوێنـێ، ئـەو ژیانـدارەش بێگومـان بەرگریـی دەکات لـە خـوا بەیەکگرتـن و، دژی کوفـرەو، پشـتگیریی پەیامـی خـوای پـەروەردگار دەکات، کـە خەڵکەکـە زۆربەیـان لێـی پشـتپەل دەبـن و، لێـی هەڵدەگەڕێنـەوەو وازی لـێ دێنـن.

﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾، هەروەهـا ئـەو ڕۆژەش کـە لـە هـەر کۆمەڵێکـی زۆر، هەندێکیـان کۆدەکەینـەوە لەوانـەی بڕوایـان بـە ئایەتەکانـی ئێمـە نەبـوو، ئنجـا ئـەوان کۆنتـڕۆڵ دەکرێـن، یاخـود هـی پێشـتیان ڕادەگیـرێ، تاکـو هـی دوایـی پێیـان دەگات.

لێـرەدا شـتێك قرتێـنراوە، واتـە: لـەو ڕۆژەدا: چاکـەکاران پاداشـتی خۆیـان وەردەگرنـەوەو، خراپەکارانیـش سـزای خۆیـان وەردەگرنـەوە، یاخـود لـەو ڕۆژەدا کـە ئـەوە دەکەیـن: کارەسـاتی زۆر گـەورە دەقەومـێ، بـەڵام ئـەوە قرتێـنراوە، تاکـو زەیـن هـەر مانایـەك مەزەنـە بـکات، کـە لەگـەڵ فەرمایشـتی خـوادا دەگونجـێ.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَٰتِى وَلَمْ تُحِيطُواْ بِهَا عِلْمًا ﴾، هەتـا کاتێـك لـە هـەر کۆمەڵێـکی زۆر، کۆمەڵێـکی کـەم لەوانـەی بێبـڕوا بـوون بـە نیشـانەکانی خـوا، کۆدەکرێنـەوەو خڕدەکرێنـەوە سـەر یـەك، ئنجا هەتـا کاتێك هاتـن، خـوا فەرمـووی: ئایـا ئایەتـەکانی منتـان، نیشـانەکانی منتـان بـە درۆ دانـاو، شارەزاشـیان نەبـوون، هـەروا وەك تفەنـگ بـە تاریکییـەوە نـان و دارکـەری شـەوێ، بێبڕواییتـان نیشـاندا بـە ئایەتـەکانی مـن، بەبـێ ئـەوەی لێیـان وردبنـەوەو پێیـان ئاشـنابن؟ ﴿ أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، یاخـود ئێـوە چیتـان دەکـرد؟! ﴿ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُواْ فَهُمْ

﴿لَا يَنطِقُونَ﴾، بڕیاریان بەسەردا چەسپا، بە هۆی ئەو ستەمەوە کە کردیان و، لەو ڕۆژەدا زمانیان گۆ ناکات، قسە ناکەن و نادوێن، چونکە هیچ شتێکیان بە دەستەوە نیە وەڵامی ئەو پرسیارەی پێ بدەنەوە.

ئنجا خوا ﷻ باسی بابەتێکی دیکە دەکات، دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ﴾، ئایا نەیانبینوە کە ئێمە شەوگارمان بۆ گێڕاون بە هۆکاری تێدا سرەوتن، تاکو تێیدا پشوو بدەن و بخەون، ﴿وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا﴾، ڕۆژگاریشمان بۆ کردوون بە مایەی بینین، ڕۆشنمان کردۆتەوە تاکو تێیدا ببینن و کارو کاسبیی و جموجۆڵی تێدا بکەن! ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن.

بەڵام کۆمەڵێك بڕوا نەهێنن و نەخەفتێن لە بڕواهێنان و خواپەرستیی، هەرچی ببینن وەك دیاردەی سروشتیی دەیبینن، بەڵام لەبەر ئەوەی بە چاوی نیمان تەماشای ناکەن، نایبەستنەوە بە خواوە، وەك نیشانەی خوای زاڵی باڵادەست، نایبینن، ڕەنگە بڵێن: ئەم (خۆر)ە بەردەوام تیشکمان دەداتێ و، (مانگ) کە بە یەك شەوە (هلال) دەست پێدەکات، دوایی گەورە دەبێ، تاکو دەگاتە چواردەو پازدە، ئنجا دووبارە قەبارەکەی بچووك دەبێتەوە، تاکو لە کۆتایی دا، لە شەوی بیست و نۆو سییدا، وەك دەمە داسێکی لێ دێ و، دوایی دیار نامێنێ، هەروەها چیاکان، باران و بەفرو تەرزە، بایەکان، جەستەی مرۆڤ ... هتد، هەرچی تەماشای بکەی هەر وایە، بەڵام بابای بێبڕوا وەك نیشانەی خوا، نایبینێ، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾﴾، واتە: زۆرێك لە نیشانەکان لە ئاسمان و زەویدا هەن، بەلایاندا ڕەت دەبن، بەڵام لاملیان تێکردوون، واتە: وەك کەسێك کە تەماشای شتێك ناکات و سەرنجی نادات، ئەوانیش سەرنجی نادەن، لەبەر ئەوەی بە چاوی نیمانەوە تەماشای ناکەن.

ئنجا دووبارە خوا عزو جل دێتەوە سەر باسی قیامەت، دەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ ﴾، ئەو ڕۆژەش کە فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، هەرکەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، دادەچڵەکێ و ڕادەچڵەکێ، ترس و لەرزو بیم دایدەگرێ، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، نەترسێ و دانەچڵەکێ، ﴿ وَكُلٌّ أَتَوۡهُ دَٰخِرِينَ ﴾، هەمووشیان، هەموو ئەو کەسانەی لە ئاسمانەکان و زەوی دان، بە فریشتەو مرۆڤ و جندەوە، بە ملکەچیی و زەبوونیی دێن بۆ لای، بۆ لای کێ؟ بۆ لای خوای پەروەردگار.

﴿ وَتَرَى ٱلۡجِبَالَ تَحۡسَبُهَا جَامِدَةٗ وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِۚ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍۚ ﴾، چیایەکانیش دەبینی پێت وایە ڕاوەستاون، ناجووڵێن، لە حاڵێکدا وەك ڕۆیشتنی هەور دەجووڵێن، ئەوە دروستکراوی ئەو خوایەیە کە هەموو شتێکی زۆر بە وردەکاریی دروستکردوە، ﴿ إِنَّهُۥ خَبِيرُۢ بِمَا تَفۡعَلُونَ ﴾، بێگومان ئەو شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن، دوایی زیاتر تیشك دەخەینە سەر تەفسیری ئەم ئایەتەو، هۆکاری بەهەڵە تێگەیشتنی زانایانی پێشین لەبارەی ئەم ئایەتەوە، باس دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە، کە ئەم ئایەتە مەبەست پێی قیامەت نیە، بەڵکو مەبەست پێی ئێستایە.

ئەگەر سەرنج بدەین: لەم ئایەتانەدا خوا باسی چەند شتێك دەکات، جۆراو جۆرن، ئەوەش لە زۆر شوێنی قورئان هەیە، وەك (سید قطب) دەڵێ: خوا دەیەوێ، لە هەموو کەلێنانەوە، لە هەموو شوێنانەوە، بچێتە نێو دڵ و دەروونیانەوە، جارێك باسی قورئان دەکات، جارێك باسی دادوەریی دەکات لەو شتانەی تێیان دا کەوتوونە کێشەو ڕاجیاییەوە، ئنجا باس دەکات کە قورئان ڕێنمایی و بەزەییە بۆ بڕواداران، دوایی باسی باڵادەستیی خۆی دەکات لە دنیادا، کە دادوەریان لە نێواندا دەکات، هەروەها بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئاگادار بێت ئەو لەسەر هەقێکی ڕوونەو ... هتد، ئا ئەو جۆرە باسکردنانە بە دوایی یەکدا، هەموویان بۆ سەرنج ڕاکێشان و، بە هەموو شێوەیەك چوونە نێو دڵی

مرۆڤـە، كاتێـك قورئـان دەخوێنـێ، یـان دەیبیسـتێ، كـە نامانـج تێیانـدا (لـەو باسـە جۆراوجۆرانـەدا) جووڵانـدنی هەسـت و ناخـی مرۆڤـە، ئنجـا هـەر كەسـە بـە شـتێك هەسـتی دەجووڵـێ و، بەشـێوازێك سـەرنجی ڕادەكێـشرێ و ڕادەچڵەكـێ!

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا وَهُم مِّن فَزَعٖ يَوۡمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴾، هـەر كەسـێك چاكـە بێنـێ لـە ڕۆژی دوایـی دا، ئـەوە چاكـتر لـەوەی هێناویـەتی، پاداشـتی بـۆ هەیـەو، ئـەوان لـە داچڵەكیـن و ڕاچڵەكیـن و، تـرس و لـەرزی ئـەو ڕۆژەدا دڵنیـان، هێمنـن، بـێ ترسـن.

﴿ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾، هـەر كەسـێكیش خراپـە بێنـێ، ئـەوە بـە پێچەوانـەی ئـەوەوە كـە چاكـە دێنێ: لەپـەڕوو دەخرێنـە نێـو ئاگـری دۆزەخـەوەو پێشـیان دەگوتـرێ: ئایـا بـە جگـە لـەوەی دەتانكـرد، شـتێكی دیكەتـان وەك بەرانبـەر دەدرێتـەوە؟

لـە كۆتایـی دا خـوا سـێ شـتان بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلۡبَلۡدَةِ ٱلَّذِي حَرَّمَهَا ﴾، واتـە: (بڵـێ:) بـە دڵنیایـی مـن فەرمانـم پێكـراوە كـە پـەروەردگارو خـاوەنی ئـەم شـارە بپەرسـتم، كـە قەدەغـەی كـردوە، واتـە: قەدەغـەی كـردوە گوناهـو تـاوانی تێـدا بكـرێ، بێگومـان گوناهـو تـاوان لـە هەمـوو شـوێنان قەدەغەیـە، بـەڵام لـەوێ قەدەغەتـرەو سـزاشی زیاتـرە، جگـە لـەوەی هەندێـك شـت كـە لـە شـوێنی دیكـە قەدەغـە نیـن، لـەوێ قەدەغـەن، بـۆ وێنـە: شـكاندنەوەی چڵـە گیایـەكی سـەوز، یـان لقـە درەختێـكی سـەوز، یاخـود كوشـتنی هەندێـك لـە زینـدەورو ژیانـداران، ﴿ وَلَهُۥ كُلُّ شَيۡءٖ ﴾، هەمـوو شـتێكیش هـی ئـەوە ﴿ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾، فەرمانیشـم پێكـراوە لـە ملكەچـان بـم، لەوانـە بـم كـە بـۆ خـوا ملكـەچ و تەسـلیمن.

﴿ وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴾، هەروەهـا فەرمانـم پێكـراوە كـە قورئـان بخوێنمـەوە، ﴿ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦ ﴾، ئنجـا هـەر كەسـێك ڕێـی ڕاسـتی گـرت،

ئـەوە ڕێـی ڕاسـتگرتنەکەی بـە سـوودی خـۆی تـەواو دەبـێ، ﴿ وَمَن ضَلَّ ﴾، هـەر کەسـێکیش ون بـوو، یـان ڕێـی لـێ ون بـوو، یـان هیدایـەتی ونکـرد، ﴿ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴾، تـۆ بڵـێ: مـن تەنیا لـە وشیارکەرەوان و ترسـێنەرانم، یـانی: مـن نەهاتـووم، بـە زۆر هیدایـەتی خەڵـك بـدەم و، ئیـمان و دینیـان بەسـەردا بسـەپێنم، نـە سروشـتی دیـن، ئـەوە قبـووڵ دەکات، نـە ئـەرکی منیشـەو، نـە لـە تواناشـم دایـە.

لـە کۆتایـی دا، خـوا فەرمانێـکی دیکـە بـە پێغەمبـەر ﷺ دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا ﴾، هەروەهـا بفەرمـوو: سـتایش بـۆ خـوا، بەمزووانـە نیشـانەکانی خۆیتان پیشـان دەدات، مەبەسـت لـە وشـەی (ءَايَٰتِهِۦ) لێـرەدا، ئایەتـەکانی قورئـان نیـە، چونکـە ڕسـتەکانی قورئـان دەبیسـترێن و، دەخوێنرێنـەوە، بـەڵام دەفەرمـوێ: دەیانناسـن، ئنجـا ئـەوە سێ ئەگـەری هـەن:

أ- مەبەست پێی ئەوەیە، ئەو ڕووداوانەی ڕوودەدەن، نیشانەی خوان و دەستەڵاتی خوایان تێدا بەرجەستە دەبێ.

ب- مەبەست پێی ئەو ڕاستییانەن، کە ڕاستیی زانستیین و دەردەکەون، ئەو نهێنییانەی گەردوون و مرۆڤ کە بەردەوام دەردەکەون و، سەرەنجام مرۆڤەکان دەیانناسن و، زیاتر حاڵیی دەبن، کە خوا چی دروستکردووەو، چی کردوەو چۆنی کردوە؟

ج- مەبەست پێی ئەو ڕووداوانەن کە بەسەریان دێن، بۆ وێنە: جەنگی بەدر، کە زۆرێك لە زانایان و مانا لێکدەرەوانی قورئان، وایان تەفسیر کردوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، بێگومان خوا بێئاگا نیە لەوەی دەیکەن، بەڵکو زۆر چاك ئاگادارەو، هەموو شتێك لەسەرتان تۆمار دەکرێ.

کـە بێگومـان ئـەوەش هەڕەشـەیەکی لـە نێـو خۆیـدا هەڵگرتـوە، واتـە: ئـەی بێبڕواینـە! خۆتـان هەڵبگـرن بـۆ سـزای ئـەو کارە خراپانـەی دەیانکـەن!

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**قورئان ئەو شتانەی گەلی جوولەکە تێیاندا کەوتوونە ڕاجیایی و مشت و مڕەوە، لە زۆربەیدا هەقیان پێدەڵێ و، ڕەحمەت و ڕێنمایشە بۆ بڕواداران و، خواش بە حوکمی خۆی دادوەرییان لە نێواندا دەکات:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٨﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، بێگومان ئەم قورئانە بەسەر وەچەی بەنی ئیسرائیلدا دەخوێنێتەوە، چییان بەسەردا دەخوێنێتەوە؟

٢)- ﴿أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾، زۆربەی ئەوەی ئەوان تێدا کەوتوونە مشت و مڕو ڕاجیاییەوە، نەك هەمووی، بەڵکو ئەم قورئانە زۆربەی ئەوە کە بە پێویستی بزانێ، لەوشتانەدا کە تێیان دا کەوتوونە ناکۆکیی و ڕاجیاییەوە، بەسەر وەچەی بەنی ئیسرائیلدا دەیخوێنێتەوەو، بۆیان باس دەکات و، ڕوونی دەکاتەوە: کامە هەقەو کامە ناهەقە.

ئنجا ئەوەش تەنیا یەك بوارو دوو بواران ناگرێتەوە، بەڵکو هەموو بوارەکان دەگرێتەوە: بوونناسیی، ئیمان و عەقیدە، حوکم و سیاسەت، عیبادەت، مێژوو ... هتد، هەمووی دەگرێتەوە.

### حەوت نموونە لە هەڵە ڕاستکردنەوەکانی قورئان بۆ خاوەن کتێبان:

١- لە سۆنگەی ئەوەوە کە لەم سوورەتە بەپێزەدا باسی سولەیمان و شاژنی (سبأ) کراوە، دەڵێین: لە: (أخبار الأيام الثاني)دا، کە کتێبێکە لە کتێبەکانی لە پەیمانی کۆن، دەڵێین: شاژنی (سبأ) بۆ خۆی وەك گەشت و سەردان و گەڕان و، وەك ئاگادار بوون لە موڵك و دەسەڵاتی سولەیمان، لە یەمەنەوە هاتوە بۆ ئۆرشەلیم (فەڵەستین)، بۆ ئەوەی بزانێ داخۆ موڵك و دەسەڵاتی سولەیمان چۆنە؟[1] بەڵام بێگومان وا نیەو، وەك قورئان فەرموویەتی: پوپوولە سولەیمانە (هدهد) سولەیمان نامەیەکی پێدا دەنێرێ بۆ شاژنی سەبەء، شاژنیش دیاریی و خەڵاتی بۆ دەنێرێ، تاکو بزانێ داخۆ پادشایەکە بە دوای موڵك و سامانەوەیەو، بەو دیارییانە ڕازی دەبێ، یاخود پێغەمبەرێکە خاوەن پەیامەو بە کەمتر لەوە کە پەیامی خوای پێبگەیەنێ، ڕازی نابێ، لەسەر ئەو بناغەیە، شاژن چووە بۆ شام، ئنجا عەقڵ نایبڕێ، شاژنێك تەنیا بۆ ئەوەی بزانێ کە دەنگ و باس چییە لە شام و، بزانێ موڵکی سولەیمان چۆنە؟ بۆ گەشت و سەیران بچێ! ئەوە ڕێی تێناچێ.

٢)- هەروەها لەو سەرچاوەیەدا، نە باسی پەیام و بانگەوازی سولەیمان بۆ شاژنی سەبەء کراوە، نە باسی وازهێنانی لە شیرك و خۆرپەرستیی و، گەڕانەوەی بۆ تەنیا خواپەرستیی کراوە[2].

٣)- هەروەها لە قورئان دا باسی عیسا کراوە وەك بەندەی خوا، کە بە بێ باب لە دایك بووە، وەك شتێکی یاسادڕو موعجیزە، تاکو خوا پێشانی مرۆڤایەتیی بدات، کە دەتوانێ بە بێ بابیش مرۆڤ دروست بکات، کەچی لەلای نەصرانییەکان کراوەتە کوڕی خوا[3].

---

(١) بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، أخبار الأيام الثاني، زيارة ملكة سبأ، الإصحاح: ٩، ص ٩٢٨،٩٢٩.

(٢) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە، بەڵکو باسکراوە کە شاژنی سەبەء (٤٣٢٠) کیلۆ زێڕی داوە بە سولەیمان، وێڕای چەندان جۆرە بۆنی خۆش و بەردی بەنرخ!

(٣) هەمان سەرچاوە، العهد الجديد/ إنجيل متّى - الإصحاح: ٣، ص١٨٧٥، کە ئەمە دەقی قسەکەیە: [... وإذا صوت من السماوات يقول: هذا هو ابني الحبيب الذي سُررتُ به كل السرور].

٤)- هەروەها لە قورئان دا باسی لووط کراوە و، خوای بەرز بەسەرهاتەکەی روونکردۆتەوە، چۆن بووە، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لە پەیمانی کۆندا هەیە، کە گوایە لووط دوو کچی بوون، دوای ئەوەی دەربازیان بووە، هەردووکیان بە نۆرە بابیان سەرخۆش کردوەو لەگەڵی خەوتوون، بۆ ئەوەی منداڵیان ببێ![1]

٥)- هەروەها قورئان باسی هاروون دەکات، وەك پێغەمبەرێك و بەندەیەکی زۆر صاڵح، نەك وەك پەیمانی کۆن دەڵێ: ئەو گوێلکە زێرینەی بۆ گەلەکەی دروستکرد، تاکو بیپەرستن لە جیاتی خوا![2]

٦)- هەروەها قورئان باسی داوود دەکات وەك پێغەمبەرێکی پایەبەرزی خوا، کە کاتێك رازو نیازو موناجاتی لەگەڵ خوادا کردوە، باڵندە گوێیان بۆ گرتوەو لەگەڵیان گوتۆتەوە، هەروەها چیاکان لەگەڵیان گوتۆتەوە، نەك مەبەست پێی دەنگدانەوە (صدی) بێ، وەك لە بەسەرهاتی داوودو سولەیمان لە تەفسیری سوورەتی (الأنبياء)دا باسمان کرد، ئنجا داوودێکی ئاوا کە خوا باسی دەکات، زۆر جیایە لەو داوودەی کە لە پەیمانی کۆندا هاتوە، کە بە داوێن پیس و زیناکار وەسفی دەکات[3]!!

٧)- هەروەها لە باسی سولەیمان دا، لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: سولەیمان لە کۆتایی تەمەنیدا پەنای بردە بەر جادوو و بتی دەپەرستن و، خێزانەکانی هەموویان بتپەرست بوون و هەڵیانگێڕایەوە![4] بەڵام قورئان بە جوانترین و باشترین شێوە وەسفی سولەیمان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَـٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ ﴾ ص، واتە:

---

(١) هەمان سەرچاوە العهد القديم / سفر الخروج، الإصحاح: ٣٢، ص ١٩٤ (هارون يصنع عجل الذهب).

(٢) هەمان سەرچاوە العهد القديم / سفر التكوين، الإصحاح: ١٩، ص٥٣.

(٣) هەمـان سـەرچاوە العهـد القديـم / سـفر صموئيـل الثـاني، الإصحـاح: ١١، ص ١٦٥٩ (خطيئـة داود وخداعـه).

(٤) هەمـان سـەرچاوە العهـد القديـم / سـفر الملـوک الأول، الإصحـاح: ١١، ص ٧٣٢،٧٣٣ (زوجـات سـليمان، وعيـد الـرب لسـليمان).

سولەیمانمان بە داووددا، باشترین بەندە بوو، زۆر دەگەڕایەوە بۆ لای خوا، صەڵات و سەلام لەسەر هەموو پێغەمبەرانی خوا بێ.

٣)- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بێگومانیش ئەم قورئانە ڕێنماییەو، بەزەییشە بۆ بڕواداران، بۆچی تەنیا بۆ بڕواداران؟ چونکە بەس ئەوان لێی بەهرەمەند دەبن، ئەگەرنا لە ئەسڵدا خوا قورئانی بۆ هەموو جیهانییان ناردوە، بەڵام کێن ئەوانەی لە قورئان و، لە پێغەمبەری خاتەم بەرهرەمەند دەبن؟ تەنیا ئیمانداران، بۆیە تایبەتی دەکات بەوانەوە، وەك لەسەرەتای سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾، ڕێنماییە بۆ پارێزکارانە، چونکە بەس ئەوان لێی بەهرەمەند دەبن.

٤)- ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت بە حوکمی خۆی دادوەرییان لە نێواندا دەکات.

کە زیاتر وا پێدەچێ مەبەست دواڕۆژ بێ، ئەگەرنا لە دنیاش دا حوکمەکەی لە قورئاندا بەرجەستەیە، ئنجا ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر بەرجەستە کردن و جێبەجێکردنی قورئانە لەسەر ئەرزی واقیع.

٥)- ﴿ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ﴾، بەس ئەو (خوا)یش زاڵی زانایە، هیچ کەس لە ژێر دەستەڵاتی قوتار نابێ و، زاناشە، ئەو دادوەرییە کە دەیکات، لەسەر بناغەی زانیارییەکی بێسنوورو ڕەهایە.

**مەسەلەی دووەم:**

**چەند ڕێنماییەك بۆ پێغەمبەر ﷺ كە: بەس پشت بە خوا ببەستەو، تۆ لەسەر هەقی ڕوونی، بەڵام تۆ ناتوانی پەیام و قسەی خۆت بە مردووان و، كەڕان ببیستێنی و، ڕێنمایی كوێران بكەی و لە گومڕایی دەریان بێنی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّكَ عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ ﴿٧٩﴾ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَا أَنتَ بِهَادِي الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

لەم سێ ئایەتەدا خوا ﷻ چەند ڕێنماییەكی گەورەو گرنگی پێغەمبەر ﷺ دەكات، لە پشت ئەویشەوە هی هاوەڵانی بەڕێزی، پاشان شوێنكەوتووانی هاوەڵان، دوایی جیلەكانی دوای وان، هەتا دنیا بە كۆتا دێ:

١)- ﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ﴾ تنجا پشت بە خوا ببەستە، وشەی: (تَوكُّل): لەسەر كێشی (تَفَعُّل)ە، واتە: جۆرێك لە خۆ ئەزیەتدان و كار لەسەرخۆ كردنی دەوێ، (تَوكُّل) واتە: وەكیل گرتن، یانی: وەكیل پەیدا بكە، دەگوترێ: (وَكَّلَ إِلَيْهِ الأمرَ، إذا أسْنَدهُ إليْه)، ئەگەر كەسێك كارێكی بە كەسێك سپارد دەڵێ: (وَكَّلَ إِلَيْهِ الأمرَ)، ئنجا (تَوَكَّلْتُ عَلَى فُلَانٍ) واتە: كاری خۆمم بەو سپارد، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ﴾، پشت بە خوا ببەستە، ئەو بكە كارپێسپێردراوی خۆت، متمانەت بە خوای خۆت بێ، كە بێگومان پشت بە خوا بەستن، تێككیرانی نیە، لەگەڵ دەست بە هۆكار گرتن دا، دەستت بە هۆكارانەوە بێ و، دەڵت بە خواوە پەیوەست بێ، پەنا بۆ هۆكار بردن، نیشی دەستانەو، دڵ بە خوا پەیوەست كردنیش، نیشی دڵ و دەروونە.

٢)- ﴿ إِنَّكَ عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ ﴾. بێگومان تۆ (ئەی موحەممەد!) لەسەر هەقێكی ڕوونكەرەوەی، یاخود لەسەر هەقێكی ڕۆشنی، واتە: ئەی موحەممەد! تۆ لەسەر هەقێكی

هیچ تەم ومژو پەردەی بەسەرەوە نیە، کە بریتیە لە قورئان و ئەو ڕێبازە کە قورئانت پێ بەرجەستە کردوە، لە گشت ڕەهەندو بوارەکانی ژیانتدا، ئا ئەو پەیام و بەرنامەیە، ئەو هەقە ڕۆشن و ڕوونکەرەوەیە، کە تۆی لەسەری، بۆیە پشتت بە خوا ببەستە، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا لَا يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلَّا هَالِكٌ} (أخرجه أحمد: ١٧١٨٢، وابن ماجه: ٤٣، والحاكم: ٣٣١، والطبراني في الكبير: ٦١٩، عَنْ الْعِرْبَاضَ بْنَ سَارِيَةَ رضي الله عنه، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح بطرقه وشواهده)، واتە: ئێوەم لەسەر ڕێیەکی ڕوون بە جێهێشتوە، شەوەکەیشی وەك ڕۆژەکەیەتی، کەس لێی لانادات، مەگەر کەسێك فەوتاو بێت.

واتــە: تاریکایــی و لێڵیــی تێدانیــە، هەمــووی ڕوون و ڕۆشــنە، هیــچ کــەس لێــی ناتــرازێ و لانــادات، مەگــەر کەسـێك فەوتــاو بێــت.

هەروەهــا ئەمــە ئــەوەشی لێوەردەگیــرێ: ئــەی موحەممــەد! ئــەی شــوێنکەوتووانی موحەممــەد! ئێــوە پشــتتان بــە نەخشــەو پــلانی خــواو، مشــوورخۆریی خــوا بۆتــان، قایــم بــێ.

ئنجا خستنەڕووی چەند ڕاستییەك بۆ پێغەمبەر ﷺو شوێنکەوتووانی:

٣)- ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، بە دڵنیایی تۆ ناتوانی بە مردووان ببیستێنی، وشەی (أَسْمَعَهُ) واتە: پێیبیستاند، ئەمە وا پێدەچێ وەڵامی پرسیارێك بێت، کە بە مێشك دادێ، باشە مادام موحەممەد ﷺ لەسەر هەقێکی ڕۆشن و ڕوونکەرەوەیە، ئەدی بۆچی بێبڕواو هاوبەش بۆ خوادانەران، پشتی تێدەکەن و قبووڵی ناکەن پەیامەکەی لێوەربگرن؟

خــوا دەفەرمــوێ: بــە دڵنیایــی تــۆ ناتــوانی کەسـانێك کــە مــردوون، پێیــان ببیسـتێنی، واتــە: ئەوانــە وەك مــردوو وان، ڕاســتە بــە لاشــە زینــدوون، بــەڵام خــاوەن ناخێــکی تاریــك و دڵ و دەروونێــکی مــردوون و لــە حوکمــی مــردووان، ئنجــا تــۆش ناتــوانی بــە مــردووان ببیســتێنی. (موتــی) کــۆی (مَیِّــت)ە، واتــە: مــردووان.

٤)- ﴿ وَلَا تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ ﴾، هەروەها تۆ ناتوانی بانگکردن بە کەڕانێك ببیستێنی، وشەی: (صم) کۆی (أصم)ە، واتە: کەڕەکان.

(إسماع) چاوگە، پێبیستاندن، (إبْلَاغُ الكَلَامِ بالمَسَامِع) گەیاندنی قسەیە بە گوێیەکان، یانی: کۆئەندامی بیستن، گومانی تێدانیە هەر کام لە وشەی: (موتى، صم، عمي) هەموویان خوازراوەنەوە بۆ کەسانێك کە قسەی هەق وەرناگرن و، بابای هەق وەرنەگر ونەسەلمێن لە حوکمی: مردوو و کەڕو کوێر دایە.

٥)- ﴿ إِذَا وَلَّوۡاْ مُدۡبِرِينَ ﴾، کاتێك کە ڕوو وەردەگێڕن و پشتت تێدەکەن، کەڕ نابیستێ، چ جای ئەوەی پشتت تێبکات! ئەوە هەر نایبیستێ.

٦)- ﴿ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِي ٱلۡعُمۡيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمۡ ﴾، هەروەها تۆ ڕێنماییکاری کوێران نی، لە گومڕایی دەریان بێنی، واتە: لە گومڕایی دەریان بێنی و ڕێنماییان بکەی، (هدى) لێرەدا بە مانای ڕێی ڕاست پێشاندان هاتوە، بۆچی دەفەرموێ: (بِهَٰدِي ٱلۡعُمۡيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمۡ)؟ چونکە وشەی (بِهَٰدِي) مانای لادەر (صارف)ی خراوەتە نێو، بۆیە بە پیتی (عن) بەرکاری خواستوە، ئەگەرنا بە پیتی (في) بەرکاری دەخواست: بەڵام ئێستا مانایەکەی ئاوایە: تۆ لادەری کوێران و دەرهێنەریان نی لە گومڕایی و، ڕێنماییکاریان نی.

(وَمَا أَنْتَ بِهَادِي العُمْيِ فِي ضَلَالَتِهِم) تۆ ناتوانی کوێران ڕێنمایی بکەی، لە گومڕایی دەریانبێنی.

وشەی: (بِهَٰدِي) خوێنراویشەتەوە: (تَهْدِي) (وَمَا أَنْتَ تَهْدِي العُمْيَ عَنْ ضَلَالَتِهِم) واتە: تۆ ناتوانی کوێران لە گومڕاییەکەیان دەربێنی و، بیانهێنیە سەر ڕاستەڕێ.

٧)- ﴿ إِن تُسۡمِعُ إِلَّا مَن يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، ئەم (إن)ە، (إنْ النَّافِية)یە، یانی: (ما تُسۡمِعُ إِلَّا مَن يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا) تۆ ناتوانی ببیستێنی مەگەر بە کەسێك کەبڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە بێنێ، بە (فعل المضارع)یش هێناویەتی، چونکە ئیمان تێیاندا تازە دەبێتەوە، بەردەوام.

٨)- ﴿فَهُم مُّسۡلِمُونَ﴾، لە حاڵێكدا كە ئەوانە ملكەچن، چەسپاون و بەردەوامن لەسەر ملكەچیی بۆ خوا.

زانایان دەڵێن: قورئان دوو شوێنەواریی هەن و لە دوو ڕووەوە كاریگەریی هەیە:

**یەكەم:** لە ڕووی ماناو مەبەستە بەرزەكانییەوە، كە خاوەن عەقڵە سەلیمەكان، عەرەب و، جگە لە عەرەب هەموویان لەوەدا هاوبەشن و، دەگونجێ لە زمانە ئەسڵییەكەی خۆی كە عەرەبییە وەربگێڕدرێ بۆ زمانەكانی دیكە، وەك: (ئینگلیزیی، هیندیی، توركیی، فارسیی، كوردیی ... هتد)، ئەو ماناو مەبەستانەش تاڕاددەیەك پارێزراوبن.

**دووەم:** لە ڕووی ڕەوانبێژیی و شێوەی داڕێشتنەكەیەوە، كە ئەمە تایبەتە بە گەلی عەرەبەوە، یاخود بە كەسانێكەوە كە زمانی عەرەبیی دەزانن.

بۆیە بەڕاستیی ئەگەر كەسێك بیەوێ باش لە قورئان تێبگات، بەڵێ، دەگونجێ بە تەرجەمەكراویی لە ماناو مەبەستەكانی بگات، بەڵام بیەوێ وەك پێویست لێی حاڵیی بێ، بە تایبەت لە ڕووە ڕەوانبێژیی و داڕشتنەكەیەوە، ئەوە حەتمەن دەبێ زمانی عەرەبیی بزانێ.

ئنجا ئایا بۆچی خوا بێبڕوایان، بەو سێ سیفەتە وەسف دەكات؟

أ- بۆیە دەفەرموێ: (موتى) چونكە مانایەكەی تێناگەن.

ب- بۆیە دەفەرموێ: (صم) چونكە بێژەكان نابیستن.

ج- بۆیە دەفەرموێ: (العمي) چونكە ڕێی ڕاست و چەوت لێك جیاناكەنەوە.

## کورتە باسێک لە بارەی بیستنی مردووانەوە

لەبارەی ئەوەوە کە پێغەمبەر ﷺ نەیتوانیوە، بە مردووان ببیستێنێ و، وا بکات کەڕان لێ تێبگەن و، کوێران لە گومڕایی دەربێنێ، بە تایبەت کە بە مردووان ببیستێنێ، زانایان مشت و مڕێکی زۆریان بووە لە تەفسیرەکاندا، دوو فەرموودە لەوبارەوە دێنمەوە، دواییش قسەی هەندێ لە زانایان دێنمەوەو، بۆچوونی خۆشم دەڵێم:

یەکەم: {عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: ذَكَرَ لَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ يَوْمَ بَدْرٍ بِأَرْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ رَجُلًا مِنْ صَنَادِيدِ قُرَيْشٍ، فَقُذِفُوا فِي طَوِيٍّ مِنْ أَطْوَاءِ بَدْرٍ خَبِيثٍ مُخْبِثٍ، وَكَانَ إِذَا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ أَقَامَ بِالعَرْصَةِ ثَلاَثَ لَيَالٍ، فَلَمَّا كَانَ بِبَدْرٍ اليَوْمَ الثَّالِثَ أَمَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَشُدَّ عَلَيْهَا رَحْلُهَا، ثُمَّ مَشَى وَاتَّبَعَهُ أَصْحَابُهُ، وَقَالُوا: مَا نُرَى يَنْطَلِقُ إِلَّا لِبَعْضِ حَاجَتِهِ، حَتَّى قَامَ عَلَى شَفَةِ الرَّكِيِّ، فَجَعَلَ يُنَادِيهِمْ بِأَسْمَائِهِمْ وَأَسْمَاءِ آبَائِهِمْ: «يَا فُلاَنُ بْنَ فُلاَنٍ، وَيَا فُلاَنُ بْنَ فُلاَنٍ، أَيَسُرُّكُمْ أَنَّكُمْ أَطَعْتُمُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، فَإِنَّا قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا، فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا؟» قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَا تُكَلِّمُ مِنْ أَجْسَادٍ لاَ أَرْوَاحَ لَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ»} (أخرجه البخاري: ٣٩٧٦، ومسلم: ٢٨٧٥).

واتە: قەتادە دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیک، ئەویش لە ئەبوو تەڵحەوە بۆی باسکردین، پێغەمبەر ﷺ لە جەنگە بەدەردا فەرمانی کرد بیست و چوار پیاو لە زلەزلەکامی قوڕەیش (لە کافرە ملهوڕەکان) فڕێ بدرێنە نێو چاڵێک لە چاڵەکانی بەدر، وەك کەلاك و لاشەی پیس، پێغەمبەر ﷺ عادەتی وا بوو، کە لە جەنگێکدا بەسەر کومەڵێکدا زاڵ دەبوو، سێ شەوان لە مەیدان دەمایەوە (واتە: لەو شوێنەی جەنگەکەی تێدائەنجام دراوە) کاتێك ڕۆژی سێیەمی جەنگی بەدر بوو، فەرمانی کرد، وڵاخەکەیان بۆ کورتان کرد، دوایی ڕۆیشت، هاوەڵانیش شوێنی کەوتن، گوتیان: پێمان وابوو بۆ هەندێك کاری خۆی دەچێ، ڕۆیشت تاکو

چووە سەر قەراغی ئەو چاڵە کە چاك نەکرابوو، دەستی کرد بە بانگ کردنیان بە ناوی خۆیان و باب و باپیرانیان: ئەی فلانی کوڕی فلان! ئەی فلانکەسی کوڕی فلانکەس! [هەتا ناوی هەموویان، یان زۆربەیانی هێنا] فەرمووی: ئایا ئێوە پێتان خۆش بوو کە بە قسەی خواو پێغەمبەرەکەیتان کردبایە، ئێمە بە دڵنیاییەوە ئەوەی پەروەردگارمان بەڵێنی پێدابووین، بە ڕاستیی بینیمان، ئایا ئەوەی ئێوەش پەروەردگارتان بەڵێنی پێدابوون، بە ڕاستیی بینیتان؟ عومەر (خوا لێی ڕازیبێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆچی قسە لەگەڵ چەند لاشەیەکدا دەکەی، کە ڕووحیان تێدانین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی موحەممەدی بە دەستە، ئێوە لەوەی کە دەیڵێم، لەوان باشتر نابیستن، بەڵام ناتوانن وەڵامم بدەنەوە.

دووەم: [عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَفَ عَلَى قَلِيبِ بَدْرٍ فَقَالَ: «هَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا»، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّهُمْ يَسْمَعُونَ مَا أَقُولُ»، فَذُكِرَ لِعَائِشَةَ فَقَالَتْ: إِنَّمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّهُمُ الآنَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّ الَّذِي كُنْتُ أَقُولُ لَهُمْ هُوَ الحَقُّ»، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾ حَتَّى قَرَأَتِ الآيَةَ] (أخرجه البخاري: ٣٩٨٠، ٣٩٨١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازیبێ) گوتی: پێغەمبەر ﷺ لەسەر چاڵی بەدر وەستا، لاشەی زلەزلەکانی قوڕەیشی دواندن، فەرمووی: ئایا ئەوەی پەروەردگاتان بەڵێنی پێدابوون، بەڕاستتان بۆ هاتەدی؟ دوایی فەرمووی: ئەوان ئێستا ئەوەی دەیڵێم، دەیبیستن، ئنجا ئەوە بۆ خاتوون عائیشە گێڕدرایەوە، ئەویش گوتی: پێغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە، ئەوان ئێستا دەیبیستن، بەڵکو فەرمووی: ئەوان ئێستا دەزانن، ئەوەی کە پێم دەگوتن هەق بوو، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، تۆ ناتوانی بە مردووان ببیستێنی، تاکو کۆتایی ئایەتەکە.

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ) ڕەخنەی گرتوە لەم ڕیوایەتە، کە پێچەوانەی ئەم ئایەتەیە: ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، تۆ ناتوانی بە مردووان

ببیستێنی، بەڵام ڕیوایەتەکە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوان ئێستا ئەوەی دەیڵێم دەیبیستن.

سێ بۆچوون لەوبارەوە:

١)- (القرطبي) دەڵێ: (وَقَدْ عُورِضَتْ هَذِهِ الْآيَةُ بِقِصَّةِ بَدْرٍ وَبِالسَّلَامِ عَلَى الْقُبُورِ، وَبِمَا رُوِيَ فِي ذَلِكَ مِنْ أَنَّ الْأَرْوَاحَ تَكُونُ عَلَى شَفِيرِ الْقُبُورِ فِي أَوْقَاتٍ، وَبِأَنَّ الْمَيِّتَ يَسْمَعُ قَرْعَ النِّعَالِ إِذَا انْصَرَفُوا عَنْهُ، إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ، فَلَوْ لَمْ يَسْمَعِ الْمَيِّتُ لَمْ يُسَلَّمْ عَلَيْهِ، وَهَذَا وَاضِحٌ وَقَدْ بَيَّنَّاهُ فِي كِتَابِ «التَّذْكِرَةِ»)[1].

واتە: ڕواڵەتی ئەم ئایەتە {چونکە مەعقووڵ نیە، مەبەستی ئەوەبێ، کە ئایەتەکە لەگەڵ ئەوشتانەدا تێکدەگیرێ} تێکدەگیرێ لەگەڵ بەسەرهاتی جەنگی بەدردا، کە پێغەمبەر ﷺ زلەزلەکانی قورەیشی دواندو، سڵاو کردن لە گۆڕستان و، ئەوە کە گێڕدراوەتەوە ڕووحەکان لەسەر قەراغی گۆڕەکان دەوەستن، لە هەندێ کاتانداو، ئەوە کە مردوو گوێی لە دەنگی پێڵاوی بە خاك سپێردرانی دەبێ کاتێ کە دەڕۆن، هەروەها جگە لەوەش، ئنجا ئەگەر مردوو نەیبیستبایە، سڵاوی لێ نەدەکراو، ئەوەش ڕوونەو، ئێمەش لە کتێبی: (التذكرة في أحوال الآخرة)دا باسی ئەوەمان ڕوونکردۆتەوە.

کەواتە: (القرطبي) لێرەدا لە پەنادا (ضمناً) ڕەخنە دەگرێ لە بۆچوونەکەی دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازیبێ.

٢)- (ابنُ عطية) دەڵێ: (فَيُشْبِهُ أَنَّ قِصَّةَ بَدْرٍ خَرْقُ عَادَةٍ لِمُحَمَّدٍ ﷺ فِي أَنْ رَدَّ اللَّهُ إِلَيْهِمْ إِدْرَاكًا سَمِعُوا بِهِ مَقَالَهُ، وَلَوْلَا إِخْبَارُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِسَمَاعِهِمْ، لَحَمَلْنَا نِدَاءَهُ إِيَّاهُمْ، عَلَى مَعْنَى التَّوْبِيخِ لِمَنْ بَقِيَ مِنَ الْكَفَرَةِ، وَعَلَى مَعْنَى شِفَاءِ صُدُورِ الْمُؤْمِنِينَ)[2].

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص١٨٨.

(٢) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص١٨٨، (ابن عطية) زۆرجار تێبینی جوانی هەن و، زۆر جار لێی دەخوازمەوە.

واتــە: وا پێدەچــێ ئــەم بەســەرهاتە بــەدر، یاســادر (موعجیزە)یــك بووبــێ بــۆ موحەممــەد ﷺ، لــەوەدا کــە خـوا هەسـت و هـۆشی بـۆ ڕووحـەکان گەڕاندوونـەوە، بایی ئەوەنـدە کـە فەرمایشـتەی پێغەمبـەری ﷺ پـێ ببیسـتن، ئەگـەر پێغەمبـەری خـواش ﷺ هەواڵـی پێنەدابایـن، کـە مـردووان وەختێك سـڵاو لە گـۆڕەکان دەکەین، لێمان دەبیسـتن، ئـەوە بانگکردنەکـەی پێغەمبەرمـان وا لێکدەدایـەوە، کە مەبەسـتی پێ سەرزەنشـتکردنی کافـرەکان بـووە، ئەوانـەی کـە مـاون و زینـدوون، هەروەهـا مەبەسـتیش پێـی هەتـووانی دڵـی برینـداری بڕوانـداران بـووە [کـە ڕۆژانێـکی زۆر ئـەو بێبڕوایانـە مسـوڵمانانیان لـە مەککـە ئەزیەتـداوە، ئێسـتاش ئـەوە لـەوێ کەلەشـێکی مـردوون و کەوتـوون].

٣)- منیش وای تێدەگەم، کە ئەوەی پێشێ دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گوتی، تێکناگیرێ، لەگەڵ ئەوشتانەدا کە (القرطبي) هێناونی، چونکە ئەو کە بەڵگە بە ئایەتەکە دێنێتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ ﴾، تۆ ناتوانی بە مردووان ببیستێنی، مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ وەك پێ بیستاندنی ئەوە کە لێی بەهرەمەندبن، خوا دەفەرموێ: ئەوە ناتوانی، چونکە کەسێك بە زیندوویی سوودی لێ نەبینیبێ، بە مردوویی چۆن سوود دەبینێ؟ بەڵام ئەوە کە کەسێك دەمرێ، مسوڵمان، یان نامسوڵمان، ئاگای لە هیچ نەمێنێ، وانیە، چونکە ڕووحەکەی هەیەو، مەرج نیە ئەو جەستەیەی لە گۆڕەکە دایە، ببیستێ، بەڵام ڕووحەکەی ئاگادارە، ئەهلی چاکە بێ، یان ئەهلی خراپە بێ، هەروەها کە سڵاو لە گۆڕەکان دەکرێ و، ڕووحەکان ئاگاداری هەندێك شت دەبن و، مردووش گوێی لە دەنگی پێڵاوی بە خاك سپێرەرانی دەبێ، کاتێ کە دەڕۆن، ئنجا بەو شێوەیەی کە گوتمان ئەو دەقانە کۆدەکرێنەوە، بێگومانیش وەك زانایانی (أصول الفقه) دەڵێن: (إِعْمَالُ النَّصَّيْنِ أَوْلَى مِنْ إِهْمَالِ أَحَدِهِمَا) واتە: کارپێکردنی دوو دەقەکان لە پشتگوێ خستنی یەکیان باشترە.

ئیـدی بـەم جـۆرە تێگەیشـتن و کۆکردنـەوەی دەقـەکان، هیـچ پێویسـت نـاکات بڵێیـن: ئـەو هەواڵانـەی دەڵێـن: پێغەمبـەر ﷺ قسـەی کـردوە لەگـەڵ مـردووان داو دوانـدوونی، ڕاسـت نیـن، یـان نەیانپێـکاوە.

هەڵبەتـە ئـەم مەسـەلەیە دەگونجـێ قسـەی زیاتـری لەسـەر بکـرێ، بـەڵام ئێمـە لەگـەڵ سروشـت و قەبـارەی ئـەم تەفسـیرە ئەوەنـدە، بـە بـەس دەزانیـن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خستنەڕووی هەندێك ڕووداوی گرنگ و گەورەی ڕۆژی دوایی، كە بێبڕوایان تێیدا یەكجار گرفتارو شەرمەزار دەبن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم چوار ئایەتە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ ﴾، كاتێك كە قسەیان لەسەر چەسپا، وشەی **(الوقع)**: خوازراوەتەوە بۆ ڕوودان، (قول)یش لێرەدا مەبەست پێی ئەو هەواڵی هەڕەشەو سزاو ئازارەیە، كە دێتە ڕێیان، كە پێشتر بە درۆیان دادەناو گاڵتەیان پێدەكرد.

٢)- ﴿ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، كاتێك بڕیاریان لەسەر چەسپا و، كۆتایی بە ژیانی دنیا هات لەسەر زەوی: ژیانداریێكیان بۆ لە زەوی دەردێنین.

٣)- ﴿ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴾، دەیاندوێنێ، كە خەڵك بڕوای پتەویان بە نیشانەكانی ئێمە نەبوو.

بێگومان ئەمە یەكێكە لە نیشانەكانی ئاخیر زەمان، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتی صەحیحی خۆیدا، باسی **(دابة الأرض)**[1] دەكات، وەك یەكێك لە دە

---

(١) (عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ الْغِفَارِيِّ رضي الله عنه، قَالَ: اطَّلَعَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ، فَقَالَ: «مَا تَذَاكَرُونَ؟» قَالُوا: نَذْكُرُ السَّاعَةَ، قَالَ: إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ «فَذَكَرَ» الدُّخَانَ، وَالدَّجَّالَ، وَالدَّابَّةَ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عليه السلام، وَيَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَثَلَاثَةَ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ

(١٠) نیشـانەكان كۆتایـی هاتنـی دنیـا.

تەفسـیرەكان زۆر وەسـفی ئـەو زیندەوەرەیـان كـردوە، دەڵێـن: سـەری وایـەو، لاقـی وایـەو، كلـكی وایـە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا نـە ئایەتەكـە ئامـاژە بـەوە دەكات، نەفەرمایشـتەكانی پێغەمبەریـش ﷺ هەندێـك شـوێنەواری بێهێـز لە ڕووی سـەنەدەوە گێڕدراونـەوە، كـە جێـی پشـت پـێ بەسـتن نیـن و، هـەر شـتێك لەوبـارەوە لـە سـەرچاوەی ڕاسـت (صحیـح)ەوە نەهاتبـێ، زیـانی زیاتـرە لـە سـوودی.

٤)- ﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، ئەو ڕۆژە كە لە هەر كۆمەڵێكی زۆر، كە بڕوایان بە نیشانەكانی ئێمە نەدەهێنا، كۆمەڵێكیان لێ كۆدەكەینەوە.

٥)- ﴿ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾، ئنجا خڕدەكرێنەوە سەر یەك، واتە: ئەوانەی پێشێ ڕادەگیرێن، تاكو ئەوانەی دوایە پێیان دەگەن، یاخود (يُوزَعُونَ ) واتە: (يُمْنَعُونَ مِنَ الإِنْحِرَافِ) واتە: ڕێیان لێ دەگیرێ كە بەملاولادا بڕۆن.

٦)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو ﴾، هەتا كاتێك كەهاتن.

٧)- ﴿ قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَٰتِى ﴾، خوا پێی فەرموون: ئایا نیشانەكانی منتان بە درۆ دانان.

٨)- ﴿ وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا ﴾، لەگەڵ ئەوەدا زانیارییشتان لەبارەیانەوە نەبوو، لێرەدا وشەی: (آيَات) بە نیشانەی سیاقەكە دەزانین، كە مەبەست پێی ئایەتە خوێنراوەكانن، ئایا شارەزاییتان بە فەرمایشتەكەی من نەبوو، بە درۆشتان دانا؟! واتە: ئایا بە درۆتان دانا، بێ ئەوەی لێی تێبگەن و پێی ئاشنابن؟!

٩)- ﴿ أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، یاخود ئایا ئێوە چیتان دەكرد؟ لێرەدا (ذا)، لە دوای (ما)ی پرسیاركردن (إستفهامية) دێ و، مانایەكەی ڕوون دەكاتەوە.

---

بِجَزِيرَةِ الْعَـرَبِ، وَآخِـرُ ذَلِـكَ نَـارٌ تَخْـرُجُ مِـنَ الْيَمَـنِ، تَطْـرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَـرِهِمْ) أخرجـه مسـلم: ٢٩٠١.

**١٠)- ﴿ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُواْ ﴾، بڕیاریان لەسەر هاتە دی، بە هۆی ئەو ستەمەوە کە کردبوویان.**

**(بِمَا ظَلَمُواْ) [(ما) (مَصْدَرِيَّة) أي: بِسَبَبِ ظُلْمِهِم) بەهۆی ستەمەکەیانەوە.**

**١١)- ﴿ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴾، بڕیاری سزادرانیان لەلایەن خواوە، لەسەر چەسپا، بۆیە نادوێن، زمانیان قسە ناکات، لە ترسان و لە سام و هەیبەتی ئەو ڕۆژە مەزن و ترسناکە.**

**مەسەلەی چوارەم:**

**باسی ژمارەیەك لە دیاردەو دیمەنەكانی گەردوون و، باسی ئاخیر زەمان و، باسی سووڕانەوەی زەوی، هەروەها باسی سەرەنجامی سەربەرزانەی چاكەكاران و، سەرشۆڕانەی خراپەكاران:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (٨٦) وَيَوْمَ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ فَفَزِعَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَنْ شَاءَ اللَّهُ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَاخِرِينَ (٨٧) وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ (٨٨) مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِنْهَا وَهُمْ مِنْ فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ (٨٩) وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (٩٠) ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم پێنج ئایەتە، لە شازدە بڕگەدا:**

**١)- ﴿ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ ﴾، ئایا سەرنج نادەن! ئێمە شەوگارمان بۆ گێڕاون بەوە كە تێیدا پشوو بدەن! لێرەدا ئەم بینینە دەگونجێ مەبەست بینینی چاو بێ، دەشگونجێ مەبەست بینینی عەقڵ بێ، چونكە هاتنی شەوگار بە هەردووكیان هەستی پێدەكرێ.**

**٢)- ﴿ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا ﴾، ڕۆژگاریشمان بۆ كردوون بە پێبینەر، (مُبْصِرُ: اسْمُ فَاعِلِ أَبْصَرَ، أي: رَأَى)، (أَبْصَرَ): واتە: پێبینەر، لەبەر ئەوەی ڕۆشنایی ڕۆژگار هۆی بینینە، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی ڕۆژگارمان بۆ كردوون، بە پێبینەر، واتە: بە هۆی ڕۆشنایی ڕۆژگارەوە دەبینن، كەواتە: هەمزەی (أ)ی (أَبْصَرَ يُبْصِرُ مُبْصِراً) واتە: كردنی بە بینەر، ڕۆژگارمان وا لێكردوە، بیانكات بە بینەر.**

٣)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾، لەوەدا نیشانە زۆرن، بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن، کە خوا شەوگاری تاریك داهێناوە، پشووی تێدا بدەن و، ڕۆژگاریشی ڕووناك داهێناوە، تاکو کارو کاسبیی تێدا بکەن، ئنجا چۆنیەتی جووڵەی زەوی بە دەوری خۆیداو، بە دەوری خۆردا، ئنجا ماوەی شەوو ڕۆژان دوازدە سەعات بە دوازدە سەعات، کورت و درێژییش دەکەن، بە پێی کەشەکانی ساڵ و، بە پێی شوێنە جوگرافیاییەکانی گۆی زەوی، لەسەرەوەی زەوی، لە خوارەوەی زەوی، لە نێوەڕاستی، لە هەر یەکەیان جۆرێکە، بێگومان نیشانە زۆرن بۆ ئەوانەی بڕوا دێنن، بەڵام هەیە هەرچەندە نیشانەو بەڵگانیش زۆر ببینێ، کەچی هیچ سوودو بەهرەیان لێ نابینێ.

٤)- ﴿ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ ﴾، ئەو ڕۆژەش کە فوو بە صووردا دەکرێ، (صور) واتە: شەیپور، کەڕەنا (بوقي).

٥)- ﴿ فَفَزِعَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ ﴾، هەرکەس لە ئاسمانەکان و زەوییدا هەیە، دادەچڵەکێ و دەترسێ، ترس و لەرز دایدەگرێ، (فزع) بریتیە لە وەجووڵەکەوتن و ڕێکهاتن و داچڵەکین لە شتێکی ترسناك.

٦)- ﴿ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ ﴾، مەگەر ئەو کەسەی خوا بیەوێ دانەچڵەکێ، ئەوە لەو ڕۆژەدا داناچڵەکێ و ناترسێ.

٧)- ﴿ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَاخِرِينَ ﴾، هەموو ئەو کەسانەی کە لە ئاسمانەکان و زەوییدا هەن، بە ملکەچیی و زەبوونیی، دێن، واتە: دێن بۆ لای ئەو شوێنەی خوای پەروەردگار بۆیان دیاریی دەکات.

٨)- ﴿ وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً ﴾، چیایەکانیش دەبینی، پێت وایە وەستاون، بێ جووڵەن.

٩)- ﴿ وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ ﴾، لە حاڵێکدا وەك ڕۆیشتنی هەور دەڕۆن، لێرەدا مەبەست پێی جووڵەی چیایەکانە، ئنجا چونکە چیایەکان بە تەنیا ناجووڵێن، بەڵکو لەگەڵ زەوییدا، دەجووڵێن، وەك چۆن هەور لە ئاسمان دەجووڵێ، لەوێ دەچێتە ئەوێ و لەوێ دەچێتە

ئەویّ، چیایەکانیش لەگەڵ زەوی دەجووڵێن، ئەوەش ئاماژەیەکی زۆر ڕوونە بە سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیداو، بە دەوری خۆردا، کە خێرایی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا، شەست (٦٠) هێندەی خێرایی سووڕانەوەیەتی بە دەوری خۆیدا، چونکە خێرایی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا، لە هەر چرکەیەکدا سی (٣٠) کیلۆمەترە، بەڵام خێرایی سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا، لە هەر خولەکێکدا سی (٣٠) کیلۆمەترە، کە ئەمەش ئیعجازێکی زانستییە، بۆیەش زانایانی پێشین، باش لەم ئایەتە حاڵیی نەبوون، کە گوتوویانە: مەبەست پێی یەکێکە لە دیمەنەکانی قیامەت! بەڵام ئەوەی لێی تێکداون، ئەو ڕستەیە: ﴿ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍ ﴾! چونکە لە کاتی تێکداندا، چۆن دەگونجێ بگوترێ: تەماشا بکەن! چەند جوان دروستکراوە!! خوا دەفەرموێ: چیایەکان دەبینی، وا دەزانی وەستاون، بەڵام وەك ڕۆیشتنی هەور، دەڕۆن، ئەوە دروستکراوی ئەو خوایەیە کە هەموو شتێکی ڕێك دروست کردوە، واتە: ئەو چیایانە لەگەڵ زەوی دا دەخولێنەوە، وەك جووڵەی هەور، بەڵام ئێوە هەستی پێ ناکەن.

١٠)- ﴿ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍ ﴾، ئەوە دروستکراوی ئەو خوایەیە کە هەموو شتێکی زۆر بە ڕێك و پێکیی دروست کردوە.

١١)- ﴿ إِنَّهُۥ خَبِيرُۢ بِمَا تَفۡعَلُونَ ﴾، بەڕاستیی ئەو شارەزایە بەوەی دەیکەن.

١٢)- ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا ﴾، هەر کەسێك چاکە بێنێ (کە بریتیە لە ئیمان، تاعەت، بەندایەتیی بۆ خوا) ئەوە چاکتر لەو چاکەیەی هێناویەتی، پاداشتی هەیە لە ڕۆژی دواییدا.

١٣)- ﴿ وَهُم مِّن فَزَعِ يَوۡمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴾، هەروەها ئەوان لە داچڵەکین لەو ڕۆژەدا، دڵنیاو هێمن و بێترسن، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (وَهُم مِّن فَزَعِ يَوۡمَئِذٍ ءَامِنُونَ)، (فَزَعِ) دەبێتە پاڵدراو (مُضاف)، (يَوۡمَئِذٍ) دەبێتە پاڵوێدراو (مُضاف إليه)، لە داچڵەکینی ئەو ڕۆژە، دڵنیاو بێترسن، بەڵام ئەگەر بە تەنووین بخوێنرێتەوە: ﴿ وَهُم مِّن فَزَعٖ يَوۡمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴾، لە داچڵەکین لەو ڕۆژەدا، دڵنیاو بێترسن.

ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سووورەتی (فصلت) وایە، کە خوا دەفەرمویّ: ﴿ أَفَمَن يُلْقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِيٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ٱعْمَلُواْ مَا شِئْتُمْ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: ئایا ئەو کەسەی فڕیّ دەدرێتە ئاگرەوە حاڵی باشترە، یاخود ئەو کەسەی کە ڕۆژی قیامەت بەبیّ ترسیی و، بە هێمنیی و ئارامیی دێت؟!

١٤)- ﴿ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي ٱلنَّارِ ﴾، هەر کەسێك خراپە بێنێ، {بێبڕوایی، نیفاق، شیرك، تاوان و خراپە} ئەوانە دەم و چاویان لە پەوڕوو دەخرێتە نێو ئاگرەوە، (كَبّ) بریتیە لەوە ڕواڵەتی شتێك ڕووی لە زەوی بێت، بۆیە من بەلەپەوڕوو مانام کردوە.

١٥)- ﴿ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ {پێیان دەگوترێ:} ئایا جگە لەوەی کە دەتانکرد، چ سزایەکی دیکەتان بدرێتێ؟

لە بارەی کەڕەنا (الصور)ەوە، ئەم دەقە دێنین: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لَمَّا فَرَغَ اللهُ مِنْ خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، خَلَقَ الصُّورَ، فَأَعْطَاهُ إِسْرَافِيلَ، فَهُوَ وَضَعَهُ عَلَى فِيهِ شَاخِصٌ بَصَرُهُ إِلَى الْعَرْشِ يَنْتَظِرُ مَتَى يُؤْمَرُ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَا الصُّورُ؟ قَالَ: «قَرْنٌ» قَالَ: وَكَيْفَ هُوَ؟ قَالَ: قَرْنٌ وَاللهِ عَظِيمٌ وَالَّذِي بَعَثَنِي بِالْحَقِّ إِنَّ عظم دَارَةِ فِيهِ لعَرْضِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، فَيَنْفُخُ فِيهِ ثَلَاثَ نَفَخَاتٍ: الأُولَى: نَفْخَةُ الْفَزَعِ، وَالثَّانِيَةُ: نَفْخَةُ الصَّعْقِ، وَالثَّالِثَةُ: نَفْخَةُ الْقِيَامِ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ}[1].

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازیبێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێك خوا لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بۆوە، سووری دروست کردو دای بە ئیسرافیل، ئەویش بە دەمیەوە گرتوەو، بۆ عەرەش دەڕوانێ، چاوەڕێیە، فەرمانی پێ بکرێ، (فووی پێدا بکات)، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! سوور چییە؟ فەرمووی: قۆچێکە سوێند بە خوا زۆر مەزنە، سوێند بەو کەسەی کە منی بە هەق ناردوە، یەك بازنەی بە ئەندازەی پانایی ئاسمانەکان و زەوییە، سێ جار

(١) أخرجه الطبري: ١٦٦٢١، وابن أبي حاتم: ١٨٤١٢، الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص٢٣٩.

فووی پێدا دەکات، فووی یەکەم: فووی داچڵەکینە، فووی دووەم: فووی مردنە، فووی سێیەم: فووی زیندووبوونەوەو هەڵسانەوەیە بۆ پەروەردگاری جیهانییان.

هەڵبەتە ئەم دەقە لە ڕووی سەنەدیشەوە، تۆزێك مشت و مڕی لەسەرە، بەڵام هەر هێنام، تنجا ئەو دەڵێ: سێ فوو، بەڵام وەك لە ئایەتەکان دەردەکەوێ، دوو فوویە:

﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾الزمر، هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ ﴾النازعات.

هەروەها لە چەند شوێنێکی دیکەش، ئاماژە بەوە کراوە، کە دووجاران فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، جاری یەکەم تاخیر زەمانی بە دوادا دێ و، جاری دووەمیش هەڵسانەوەی بە دوادا دێ.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**ڕاگەیاندنی خوا ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمانی پێکراوە: پەروەردگاری کابە بپەرستێ و، لە ملکەچان بێ و، قورئان بخوێنێ و ڕایبگەیەنێ، کە ڕێی ڕاست گرتنی هەر کەسێك، بە سوودی خۆیەتی و، خراپەشی بە زیانی خۆیەتی، ئەو تەنیا ترساندنی لەسەرە، پاشان خوا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە ستایشی خوا بکات و بە مرۆڤەکانیش ڕابگەیەنێ، کە بە زوویی نیشانەکانیان پیشان دەدات و، خواش بێ ئاگانیە لەوەی دەیکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلۡبَلۡدَةِ ٱلَّذِي حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَيۡءٖۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە دە (١٠) بڕگەدا:**

١)- ﴿ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلۡبَلۡدَةِ ﴾ [بڵێ:] من تەنیا بەوە فەرمانم پێکراوە، کە پەروەردگارو خاوەنی ئەم شارە (کە مەبەست پێی شاری مەککەیە) بپەرستم.

٢)-﴿ ٱلَّذِي حَرَّمَهَا ﴾، دیارە کە ناوی نەهێناوە، بۆ ڕێزو بەرزکردنەوەو مەزنکردنە: ئەو خوایەی ئەو شارەی قەدەغە کردوە.

فەرمانم پێکراوە کە هەر ئەو بپەرستم، بەندایەتیی بۆ ئەو بکەم، **(حرمها)** واتە: قەدەغەی کردوە، ستەمی تێدا بکرێ، ڕاوی تێدا بکرێ، دارو درەخت و گژو گیای تێدا ببڕدرێ، وەك پێشەوا (طبري) لە تەفسیرەکەیدا گوتوویەتی[1].

---

(١) جامع البیان ج٢٠، ص٣٦.

٣)- ﴿ وَلَهُۥ كُلُّ شَيۡءٖ ﴾، هەروەها هەموو شتێك هی ئەوە، هی خوایە.

٤)- ﴿ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾، فەرمانیشم پێکراوە کە لە گەردنکەچان بم، لەوانە بم کە ئیسلامیان بە بەرنامەی ژیان قبووڵ کردوە، کە ئیسلام لە خودی خۆی دا ملکەچییە بۆ خوا.

٥)- ﴿ وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴾، هەروەها فەرمانم پێکراوە کە قورئان بخوێنم، یانی: پەیامی خوایان پێڕابگەیەنم، لە میانی قورئانخوێندن دا.

٦)- ﴿ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦ ﴾، هەر کەسێك ڕێی ڕاستی گرت، ئەوە ڕێی ڕاستی گرتوە بۆ خۆی، واتە: سوودی ڕێی ڕاستگرتنەکەی بۆ خۆیەتی.

٧)- ﴿ وَمَن ضَلَّ فَقُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴾، هەروەها هەر کەسێك گومڕابوو، ڕێی ونکرد، یاخود لە ڕێ ونبوو، تۆ بڵێ: من تەنیا لە وریاکەرەوانم، یانی: چاودێر نیم بەسەرتانەوە، نەهێڵم، لابدەن، من تەنیا گەیاندنی پەیامی خوام لەسەرە

٨)- ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ﴾، هەروەها بڵێ: ستایش بۆ خوا، لەبەر ئەوەی شایستەی هەموو ستایشێکە، هەروەها لەبەر چاکەو نیعمەتەکانی، بە تایبەت هەردووك نیعمەتە هەر گەورەکەی، کە قورئانەو، ناردنی پێغەمبەری خاتەمە موحەممەد ﷺ.

٩)- ﴿ سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَا ﴾، بڵێ: (خوا) بە زوویی نیشانەکانی خۆیتان پێشان دەدات، {لە ئاسۆیەکان و لە خۆتانداو لە زەوییداو} دەیانناسن، یان مەبەست ئەوەیە: ئەو هەڕەشانەی لێتان دەکات هەندێکیان دێنە دی، ئنجا مردنی هەرکامێکتانە، یان بەنسبەت کافرەکانی ئەو ڕۆژگارەوە، تێشکانتانە لە جەنگەکاندا، یان: دەردوبەڵاو گرفتارییەکانن، یان: گرانیی و قات و قڕییە.

کە دەفەرموێ: (سَيُرِيكُمۡ) وشەی (س) نیشانەی ئەوەیە: پێشاندانی ئەو ئایەتانە نیزیکە، یانی: بەم نیزیکانە پێشانتان دەدات، هەڵبەتە بۆ ئێمە چەند ساڵێك زۆرە، بەڵام بە نسبەت خوای پەروەردگارەوە، ئەو ماوانەی ئێمە پێمان

زۆرن، بۆ خوا سفرن، خوا بۆ خۆی لە دەرەوەی کات و شوێنە، بۆ ئێمەی دانیشتووانی زەوی، شەوڕۆژێك بیست و چوار سەعاتە، ساڵێك سێسەدو شەست و پێنج (٣٦٥) ڕۆژ و شەوەو، پێوەری خوا بۆ کات زۆر جیاوازە، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ ﴾الحج.

واتە: ... ڕۆژێك لە لای پەروەردگارت بە ئەندازەی هەزار ساڵە لەوەی ئێوە دەیژمێرن، لە شوێنی دیکە دەفەرموێ:

﴿ تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ ﴾ المعارج، واتە: .... لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا ﴾، (خوا) نیشانەکانیتان پیشان دەدات، دەینانناسن، ئەوە چەند واتایەکی هەن:

أ- یانی: نیشانەکانی خوا لە خۆتانداو لە ئاسۆیەکاندا، لە گەردووندا، تاکو زانست بەرەو پێشەوە بچێ، نیشانەکانی خوا زیاتر دەبینن و، نیعمەتەکانی خوا زیاتر دەرك دەکەن.

ب- یاخود: ئەمە هەڕەشە کردنە لە بێبڕوایەکان، کە لەمەو دوا، ئەو شتانەی گاڵتەیان پێدەکەن و، پەلەیان لێدەکەن، بە زوویی هەندێکیان دەبینن، کە مەبەست پێی تێشکانیانە لە ڕووبەڕووبوونەوە لە جەنگەکاندا، بە تایبەت لە جەنگی بەدر دا - بە نسبەت بێبڕوایانی ئەوکاتەوە -.

ج- یاخود مەبەست پێی مردنی هەر کامێکیانە، کە بێگومان پێش قیامەتی گەورە، هەر کامێك لە مرۆڤەکان قیامەتی بچووکی خۆی دەبینێ.

د- یان مەبەست هاتنی بەڵاوگرفتارییە تایبەتیی و گشتییەکانە.

١٠)- ﴿ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، پەروەردگاریشت بێئاگا نیە، لەوەی ئێوە دەیکەن، خوێنراویشەتەوە: (عَمَّا يَعْمَلُونَ)، واتە: لەوەی ئەوان دەیکەن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی زیاتر هیدایەتمان بدات، کە باشتر لە قورئان تێبگەین و، زیاتر پێیدا قووڵبینەوەو پێوەی پابەند بین، هەروەها یارمەتییمان بدات بەر لەوەی قیامەتی تایبەتیی خۆمان بەسەر بێ، ئامادە بین و خۆمان پاك و چاك بکەین، تاکو بەسەربەرزیی و بە ڕوو سووریی بچینە خزمەت خوا ﷻ.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (النمل) دێنین.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# النمل